ناوی کتێب: عەشق و خەبات و ئازادی

بابەت: بیرەوەریی

نووسینی: ئیبراهیم جەلال

هەڵەچن: باخان ئەحمەد

دیزاین: هەرێم عوسمان

چاپ: چاپخانەی تاران

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠٢١

نرخ: ٨٠٠٠ دینار

بڵاوکردنەوە: کۆشکی سەرا

لە بەڕێوەبەریتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (١١٣٨) ی ساڵی ٢٠٢١ ی پێدراوە






ناونیشان: سلێمانی - بەردەرگی سەرا - تەنیشت ئوتێل مەولەوی
کۆشکی سەرا
کۆشکی سەرا
0750 159 3939

## ڕەچەڵەکی بەندە لە چەند دێڕێکدا:

١. خەلیل مەولا

لەدایکبووی شاری ماردینە، لە سەدەی حەڤدەدا و لە عەشیرەتی قەنەسرین بووە.

٢. ئیبراهیم خەلیل مەولا، کوڕی خەلیل مەولایە و ئەمیش لە سەرەتای سەدەی هەژدەدا لەدایک بووە، پاشان لەسەر کێشەی عەشیرەتی لە سییەکانی سەدەی هەژدەدا لە ماردینەوە ڕەو دەکا و لە شارۆچکەی پردێ (ئاڵتوون کۆپری) دەگیرسێتەوە.

ئیبراهیم ئاغا لە پردێ ژن دێنێ و سێ کوڕی دەبێ بە ناوەکانی: ئاگر، جەمشید، هاوار ئاغا.

٣. ئاگر هەر بەمنداڵی بە نەخۆشی دەمرێ.

٤. جەمشید، ئەمیش چەندین کوڕ و کچ و نەوەی دەبێ و هەموویان تا نووسینی ئەم کتێبەش لە «پردێ» دەژین.

٥. هاوار، هەر بە هاوار ئاغا ناسراوە لە پردێدا و دەبێتە باپیرەگەورەی بەندە.

هاوار ئاغاش هەر لە پردێ هاوسەرگیری دەکا، دوو کوڕی بە ناوەکانی مستەفا ئاغا و مەجید ئاغا دەبێ.

٦. مستەفا دوو جار هاوسەرگیری دەکا، لە هاوسەرگیریی یەکەمیدا دوو کوڕی دەبێ بە ناوەکانی نامیق و فایەق.

لە هاوسەرگیریی دووهەمی، سێ کوڕی دەبێ بە ناوەکانی سەعدوون، سەعدد، جەودەت.

دوو کچیشی دەبێ بە ناوەکانی ترکیە، ڕەوضیە.

٧. نامیق مستەفا هاوار ئاغا کە چوار جار هاوسەرگیریی کردووە، دەچێتە شاری بەغداد و لە بەغداد خۆی و هاوسەرەکانی و کوڕەکانی و نەوەکانیشیان و هەر

دە کچەکانیشی و نەوەکانیان تا ئێستاش لە بەغداد دەژین و هەندێکشیان دەچنە کەرکووک و لەوێ هاوسەرگیری دەکەن و خۆیان و نەوەکانیان لەوێ دەمێننەوە.

٨. فایەق مستەفا هاوار ئاغا، ئەمیش دوو جار هاوسەرگیری دەکات، هاوسەری یەکەمی کچی ئامۆزای خۆی دەبێ بە ناوی وەصفیە مەجید هاوار ئاغا، لەپاش ماوەیەک لەیەک جیا دەبنەوە و کورێکیان دەبێت بە ناوی زەکی، ئەمانیش دوای جیابوونەوەیان، لە هەولێر نیشتەجێ دەبن خۆیان و نەوەیان.

فایەق، هاوسەری دووهەمی خەڵکی دهۆک دەبێ، دەچنە موسڵ و هەر لەوێ دەمێننەوە تا کۆچی دوایی دەکەن، تا ئێستاش کوڕ و کچ و نەوەیان هەر لە موسڵ دەژین.

٩. مەجید هاوار ئاغا کە دەبێتە باپیری بەندە و بەدرێژی لە لاپەڕەکانی دوایی باسیان دەکەم.

بیرەوەرییەکانم لە دووتوێی ئەم کتێبەدا بریتییە لە چەند بەشێک کە پێک هاتوون لە ڕەچەڵەک و ڕیشەم و سەردەمی منداڵیم و قوتابخانەی سەرەتاییم و ناوەندی و مێردمنداڵیم و دواناوەندیم و لاویم و سیاسەت و نیشتیمانپەروەری و پێشمەرگایەتی.

- ڕانیە و باری جوگرافی و کۆمەڵایەتی و ڕامیاریی لە ساڵانی چلەکان و پەنجاکان.
- سلێمانی و سەردەمی لاویم، باری جوگرافی و کۆمەڵایەتی و ڕامیاری لە ساڵانی شەستەکاندا.
- ئێران و ئاوارەیی لە بێتوش و تاژان و تاژەبان و بانە و سەقز و هەمەدان.
- سەردەمی فەرمانبەریم و دەردەسەریم و دەربەدەریم.
- شۆڕشی نوێ و هەندێ لە ڕووداو و سەربوردەکانی ناو شۆڕش.
- ڕەهەندەی وڵاتان و گیرسانەوەم لە وڵاتی ئەڵمانیا و تێپەڕاندنی (١٥) ساڵی تەمەن.
- گەڕانەوەم بۆ وڵات و بەسەربردنی (١٤) ساڵی تر لە تەمەنم تا نووسینی ئەم بیرەوەرییەم.
- دەستپێکردنی کاری سیاسیم لە ساڵی (١٩٥٧) و کۆتاییهاتنی لە ساڵی (٢٠٠٠).

**تێبینی:**

ئەم کتێبە بەدەر و دوورە لە هەموو ئەو ڕووداوە سیاسی و شۆڕشی و کۆمەڵایەتی و حیزبایەتییانەی کە لە دووتوێی کتێبی «شۆڕشی ئەیلوول و بنیاتنان و هەڵتەکاندن» یا کتێبی «چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە»دا هاتووە، مەگەر بەدەگمەن یا بۆ وەبیرهێنانەوە تێی کەوتبێ. ئەمە بیرەوەرییەکانی خۆمە، زۆر بەڕاشکاوانە شێوەی دەربڕین و بۆچوونی سیاسی و فەلسەفی و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و ئایینیی خۆمم دەربڕیوە، بێ پەروا لە نەریتە کۆمەڵایەتی و ئایینییەکانە و بێ پەردەش دەرمبڕیون.

## بەشی یەکەم

زۆر ئارەزووم دەکرد لە ڕووی ڕەچەڵەک و بنەچە و شارستانییەوە، منیش یان لەناو تایەفە و بنەماڵە و تیرەی باپیرانی خۆم و عەشیرەتەکەی خۆمدا بوومایە لە ئابادمەوە، واتە باپیرانم لە باوکمەوە دەربەدەری شارە و شار و پارچە و پارچەی کوردستان نەبوومایە، یان هەر لە بنەڕەتەوە ڕەچەڵەکمان لە باشووری کوردستاندا بووایە، بەڵام قەدەر و ستەمی زۆردارانـە و داگیرکەرانی کوردستان، بە هەزاران ستەمی وایان لە هەموو گەلی کورد کردووە لە هەموو پارچەکانی کوردستان.

بەپێی درەختی ڕەچەڵەکمان کە بەندە تەنیا حەوت پشتی خۆم دەزانم و ئەوەشم لە باپیری ڕەحمەتیم مەجید ئاغای هاوار ئاغا وەرگرتووە کە لە ساڵی (١٩٦٣)دا کۆچی دوایی لە شاری ڕانیە کرد، ئێمە لە عەشرەتی «قەنەسرین»ین لە دەڤەری «ماردین» لە باکووری کوردستان، پشتی حەوتەممان ناوی «مەولا» بووە، باوکی خەلیل بووە و خەلیلیش باوکی حاجی ئیبراهیم ئاغا بووە. حاجی ئیبراهیم ئاغا لە ساڵی (١٨٥٢) لە ماردینەوە ڕەو دەکا بۆ باشووری کوردستان و لە شارۆچکەی پردێ (ئاڵتوون کۆپری) دەگیرسێتەوە و نیشتەجێ دەبێ. حاجی ئیبراهیم ئاغا لە پردێ لەگەڵ بنەماڵەی باپیرانی حاجی تاهیر ئاغای پردێ کە ئەوانیش ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ ئاغاکانی دەشتی دزەییان، هاوسەرگیری دەکا و تەنیا یەک کوڕی لەو هاوسەرەی دەبێ بە ناوی «هاوار ئاغا». حاجی ئیبراهیم ئاغا سێ کوڕی هەبووە لە دوو ژن: ئاگر، جەمشید لە دایکێک و هاواریش بەتەنیا لە دایکێکە. هاوار ئاغا لە ساڵی (١٨٥٦) بەپێی پەرتووکی عوسمانی لەدایک بووە لە پردێ و هەر لە پردێش ژنی هێناوە. هاوار ئاغا دوو کوڕی بووە: مستەفا (١٨٧٧)، کوڕی دووهەمی؛ مەجید (١٨٨١). مستەفا هاوار ئاغا دەبێتە زەفتیەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لە ساڵی (١٨٩٧) لەگەڵ سوپای عوسمانیدا دەبرێتە

هیندستان و حەوت ساڵی لەوێ دەباتە سەر، لەو ماوەیەدا تەنیا کەسێک کە ئەرکی بەڕێوەبردنی دایک و خێزان و منداڵی مستەفا بگرێتە ئەستۆ؛ مەجید دەبێ. مەجید دەکەوێتە بەر ئەرک و قورسایی بەخێوکردنی دایکی و براژنی و دوو کوڕی مستەفادا بە ناوەکانی فایەق و نامیق تا تەواوبوونی حەوت ساڵ و لە (١٩٠٤)دا مستەفا لە ڕێگەی کوێتەوە دەگەڕێتەوە عیراق و پردێ. غوربەتی براژنی مەجید دەکەوێتە فیتنەیی لەنێوان مستەفا و مەجیددا، ئەنجام مەجید هاوار سوێند دەخوا کە هەتا ئەو لە ژیاندا بێ، نابێ نەوەی و نەوەی نەوەی چاویان بە پردێ بکەوێ. لە ساڵی (١٩٠٦) دەچێتە سلێمانی و لەوێ ژنی دووهەمی لە تایفەی شیرگەرەکان دەهێنێ.

کاتێ کە برایم پاشای بابان پایتەختی میرنشینەکەی لە قەڵاچوالانەوە دەگوازێتەوە بۆ سلێمانی یان بڵێین بۆ خوار گوندی مەلکەندی، کۆمەڵێک مانیفاکتەرە (پیشەگەریی دەستی) لەگەڵ خۆیدا دەیهێنی بۆ دروستکردن و ئاوەدانکردنەوەی سلێمانی، لەوانە: (شیرگەرەکان، قەزازەکان، شال چنەکان، سابوونچییەکان... هەتا دوایی). مەجید لە ساڵی (١٩١٠) غوربەت خان دەکاتە هاوسەری دووەمی خۆی کە لە تایەفەی شیرگەرەکان بووە، لە ساڵی (١٩١٢) یەکەم کوڕی دەبێ ناوی دەنێ جەلال. مەجید هاوار لە ژنی یەکەمی (ئامینە خان)، یەک کچی بووە بە ناوی وەصفیە، خەڵکی هەولێر بووە و هەر لە هەولێر ژیاون و تا ئێستاش کوڕە بچووکەکەی وەصفیە هەر لە هەولێرە و ناوی حاجی یونسە و لەدایکبووی (١٩٤٤) و کوڕە گەورەکەشی ناوی حاجی زەکی بوو، خوا لێی خۆش بێ، کۆچی کردووە. لە ژنی دووهەمی؛ غوربەت، دوو کوڕی دەبێ: جەلال و کەمال. برایم پاشای بابان لە دروستکردنی سلێمانیدا، پیشەگەرەکان بە جۆرێک دابەش دەکا کە بەدەوری سەنتەری پایتەختەوە بن، تا وای لێ دێ ئەو مانیفاکتەرانە دەبنە گەڕەک، وەک: گەڕەکی سابوونکەران، گەڕەکی قەزازەکان، گەڕەکی شاڵییەکان... هتد. مەجید هاوار ژنی یەکەمی لە خزمی خۆی دەهێنێ کە ناوی ئامینە بووە، لەو ژنە تەنیا کچێکی دەبێ بە ناوی وەصفیە دەبێ. ژنی دووهەمی لە سلێمانی دەهێنێ لە تایەفەی شیرگەرەکان بە ناوی غوربەت. لەوێش کچێک و دوو کوڕی دەبێ (ڕەحمە، جەلال، کەمال). جەلال لە ساڵی (١٩١٢) لە سلێمانی گەڕەکی سەرشەقام لەدایک دەبێ.

بەندە ئیبراهیم جەلال مەجید هاوار ئاغا، لە (١٩٤٣/١١/٢٥) بەپێی دەفتەرنفوسی ساڵی (١٩٤٧) هاتوومەتە ژیانەوە. باوکم دوو ژنی هێناوە، یەکەمیان ئامینە خان کە زۆر کەم بەیەکەوە ژیاون و بەسەر منداڵەوە خۆی و مناڵەکە کۆچیان کردووە. ژنی دووهەمی؛ دایکم بووە، لە ساڵی (١٩٤٢) هاوسەرگیرییان کردووە لە شارۆچکەی تەیناڵ لە بازیان، ئەوکات باوکم چاخانەکەی گۆپاڵەی بەدەستەوە بووە کە باپیرم لە فەقێ محەممەدی هەمەوەندی بەکرێ گرتووە. دایکم، زینەت مستەفا محەممەد لە عەشیرەتی هەمەوەند لە تایفەی کافرۆش. بەو سەربوردەیەی کە دایکم و باوکم بۆیان باس کردووم، باپیرم؛ مەجید هاوار منی بە ناوی ئیبراهیمی باپیری خۆیەوە ناو دەنێ، لە شەوی ناونانەکەشمدا عەلی والی بەگ (عەلی قامچی ڕەش) کە قۆمیسەر (مەئموور مەرکەز) لە تەیناڵ بووە، ئەو بانگی بە گوێدا هەڵداوم. دوای لەدایکبوونی من بە دوو مانگ، باوکم ماڵ دەباتەوە سلێمانی، لەوێ لەسەر گەڕەکی سەرشەقام ناونووسم دەکا. دوای دوو ساڵ، لە ساڵی (١٩٤٥) باوکم خۆیشی دەگەڕێتەوە سلێمانی و باپیرم چاخانەکە دەداتەوە بە فەقێ محەممەدی هەمەوەندی، بە هۆی ناکۆکیی شێخ مەحموودی حەفید و فەقێ محەممەد لەسەر خاوەندارێتیی چاخانەکە. باپیرم خانەکەی بەر شارەوانیی کۆن کە ناسراوە بە «ئوتێل شەعب»ی بەربەلەدییەکە؛ دەگرێ بە کرێی مانگانە، ماوەی دوو ساڵیش لەگەڵ باوکم و مامم (کەمال مەجید هـاوار) ئەو خانە بەڕێوە دەبـەن. لە ساڵی (١٩٤٧)دا باپیرم دەست دەکا بە کاری «ئاڵوویڵی» کڕین و فرۆشتنی وشکەی وەک: (مازوو، کەتیرە، جەوت، خوری) کە لە ناوچەی بیتوێن و ڕانیە دەیانکڕێ و ڕەوانەی بەغدادیان دەکا، بەو بۆنەوە داوا لە باوکم دەکا کە ماڵ بەرێتە ڕانیە و لەوێ دوکان دابنێ، خۆشیی سەرپەرشتیی کڕین و کۆکردنەوە و ناردنی کەلوپەلەکان بکات. باوکم ماڵ دەبا بۆ ڕانیە، بەڵام مامم خۆی بەسەڵتی دەڕوا و ماڵ نابات. دوای شەش مانگ، مامم دوکان بەجێ دەهێڵێ بەسەر باوکمدا و دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی، ناهەقیشی نەبووە، چونکە هەرگیز کاسبیی دوکانداریی نەکردبوو، ئەو خەلفەی وەستای دیوار و بەرد و خشت بوو. ئیتر ڕانیە لە ساڵی (١٩٤٧)ەوە بوو بە جێ نزرگەمان، جگە لە شەهید خەلیلی برام کە لە ساڵی (١٩٤٥) لە سلێمانی گەڕەکی

سەرشەقام لەدایک بووە، هەموو خوشک و براکانم لە ڕانیە هاتوونەتە ژیانەوە و چواریان هەر لە ڕانیەش لە دنیا دەرچوون و نێژراون، تاکوو ساڵی (١٩٦٧)؛ ساڵی کاولکاریی بەعسییان. دەڵێن بیری منداڵی تیژە، بەڵام ڕاستە، بیرمە کە چووینە ڕانیە باوکم پێش بردنی ماڵەکەمان، دوو ژووری گڵی لە حەوشەی خانووی «قادر سلطان» لە گەڕەکی قەڵات گرتبوو، ماڵمان چووە ئەو خانووەوە.

## کورتەباسێکی دیموگرافیی شارۆچکەی ئەوسای ڕانیە

ڕانیە شارۆچکەیەکی بچووک بوو، تا ساڵانی پەنجاکانیش دەکرا بە دێیەکی گەورە ناو ببرێ. ڕانیە دەکەوێتە نێوان زنجیرەشاخی کێوەڕەش و دەلوبزمار و کلکەی کۆلێن، تا ساڵانی ناوەڕاستی پەنجاکانیش ڕانیە لە دوو گەڕەکی مامناوەندی پێک هاتبوو. گەڕەکی قەڵات کە بریتی بوون لەو خانووانەی بەدەوری قەڵای ڕانیەوە دروست کرابوون، ئەو کاتە گەورەترین گەڕەکی ڕانیە بوو و کۆنترین گەڕەکیشی بوو، وە دەتوانم بڵێم بناغەی دروستبوونی شاری ڕانیەی ئێستا بووە. ئەم گەڕەکە هەم هەموو ماڵە ڕانیەییە کۆنەکان و هەم بەگەکانی ڕەوکردووی دارەشمانە و مەرگەی بابانی گرتبووە خۆ. ئەو گەڕەکە لەبەر ئەوەی کۆنترین گەڕەکی ڕانیە بوو، هەموو فەرمانگەکانیشی گرتبووە خۆی: شوێنی قائمقام، بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس، شارەوانی، نەخۆشخانە، بەرید و تەلەفون و قوتابخانە سەرەتاییە تاقانەکەش و بەشی دارایی. تا ناوەڕاستی پەنجاکانیش دادگا لە ڕانیە نەبوو، ئەرکی دادگا؛ قائیمقام و معاونی پۆلیس دەیانکرد. بەشی بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس پێک هاتبوو لە معاونێک و یەک قۆمیسەر و نزیک بە ١٠ پۆلیس و هەموویان لە دوو ژووری حەوشەی سەرادا بوون. بەشی قائمقامیەتیش پێک هاتبوو لە قائمقام و نووسەرێک (کاتب تحریر) و دوو کارگوزار (فراش) کە لە دوو ژووری حەوشی سەرادا بوون. شارەوانی پێک هاتبوو لە نووسەری شارەوانی (کاتب بلدیە) کە خەڵکی ڕانیە بوو، لە بەگەکان بوو بە ناوی «جەمال بەگی سەعید بەگ» و چوار کارگوزار (کەناس) ئەرکیان پاککردنەوەی شار بوو لە خۆڵ و خاشاک. نەخۆشخانەی ڕانیە لە خانوویەکی قوڕدا بوو، دوو ژوور بوو، ژوورێک بۆ دکتۆر، ژوورێکیش بۆ برینپێچ و کارگوزارێک. من تا ساڵی (١٩٥٥) یەک دکتۆرم تیا

دیبوو کە ناوی «دکتۆر کیش» بوو، کوردیی زۆر کەم دەزانی. پۆست و تەلەگراف لە خانوویەکی دوو ژووریدا بوون، دوو فەرمانبەریان هەبوو بە ناوەکانی (عەویزی بەرید، میرزای بەرید) کە پێیان دەوتن «تێلچی». قوتابخانەی سەرەتایی ڕانیە کە تەنیا قوتابخانە بوو، لە خانوویەکی قوڕی چوار ژووری پێک هاتبوو لەگەڵ مەیدانێکی ٤٠٠م[٢] کە پێیان دەگوت «باخچەی مەکتەب». تا سەرەتای ساڵی (١٩٥٠)، قوتابخانەی ڕانیە تا پۆلی شەشی سەرەتایی هەبوو، پۆلەکانی یەک و دوو لە ژوورێک و پۆلەکانی سێ و چوار لە ژوورێک و پۆلی پێنج و شەش لە ژوورێک بوو، ژوورێکیش بۆ بەڕێوەبەر و مامۆستاکان. ژمارەی مامۆستاکانی ڕانیە تا ناوەڕاستی پەنجاکان چوار مامۆستا بوون، یەکێک لەوانە مەلای مزگەوت بوو، دەرسی ئایینیی دەوتەوە، بە ڕەچەڵەک خەڵکی عەسکەر بوو، ناوی مەلا حامید بوو. کتێبەکان و وانەکان لە پۆلی یەکەوە تا پۆلی شەش بە عەرەبی بوو. موختاری ڕانیە (کوێخا کەریم) لە نیشتەجێ هەرە کۆنەکانی ڕانیە بوو. ئەمانەی تا ئێرە باسم کردن، هەموویان لە گەڕەکی «قەڵات» بوون و ژمارەی نیشتەجێکانی ئەم گەڕەکە دوو لەسەر سێ دانیشتووانی ڕانیە بوون. گەڕەکی دووەم ناسراو بوو بە گەرەکی «قوله»، بە ناوی ئەو سەرچاوە پاک و ڕوون و سازگارەی کە لەخوار گەڕەکی قەڵاوە بوو و ئێستا بۆتە ناوەندی شاری ڕانیە. قووله سەرچاوەی ئاوێکە کە لە چاڵاییەکی دەورەدراو بە کۆسپی بەرز و تەمتەمدایە، ئەو سەرچاوەیە لە چلەکان و پەنجاکاندا ڕووبەرێکی بەرفراوانی بازنەیی هەبوو کە لەناوەڕاست و لە هەموو کەنارەکانیەوە ئاوێکی ڕوونی سازگاری لێ هەڵدەقوڵا. لە هاوینان زۆر سارد و لە زستانان شلەتێن هەڵمی لێ هەڵدەستا، ئاوەکەی ئەوەندە زۆر بوو؛ دوو جۆگەی پانی لەبەر دەرۆیشت و بەشێکی زەوییەکانی نێوان ڕانیە و زێی بچووکی ئاو دەدا. هەڵکەوت و جوانیی «قوله» بە جۆرێک دڵڕفێن بوو کە «دڵدار»ی شاعیری عاشقی خۆی کردبوو، جوانترین هەڵبەستی پیاهەڵدانی (وەصف)ی لەسەر نووسیوە کە بەندە بەشێکی کەمی لێرەدا بۆ خوێنەر دەخەمە ڕوو.

**کەوسەرە ئاوی قووله شیرین و سارد و سازگار**
**صنعەتی دەستی طەبیعەت موعجیزەی پەروەردگار**
**وەک دووڕ و یاقوت و مەرجانە چەو و بەردی بنی**
**بڵق ئەدا هەردەم لە ناوەند و لە گشت بۆس و کەنار**

ئەو سەرچاوەیە ساڵ بە ساڵ خەڵکانێکی زۆری بەدەوری خۆیدا کۆ کردبۆوە، تا ورده ورده گەڕەکێکیان لێ دروست بوو بە ناوی ئەو سەرچاوەیەوە ناوی دەرکرد و بوو بە گەڕەکی قوولە. گەڕەکی قوولە لە ڕووی گوزەرانەوە و جۆری بیناسازییەوە نوێگەرایی زیاتری پێوە دیار بوو، چونکە ئەو گەڕەکە هەر ماڵ و کەسێک لە دێهاتی دەوروبەر یا لە قەڵادزە و کۆیە و سلێمانی بهاتنایەتە ڕانیە جا بە کاری کەسابەت یان کاری فەرمانبەری، لە گەڕەکی قوولە نیشتەجێ دەبوون، لەبەر ئەوەی لە گەڕەکی قەڵات پانتایی زەوی بەتاڵ زۆر کەم بوو بۆ نیشتەجێبوون، قەڵات خەڵکە کۆنەکانی ڕانیە واتە ڕەسەنەکانی ڕانیەی تیا بوو، دەوری گەڕەکەکەش هەمووی موڵکی دانیشتووانەکەی بوو، کردبوویان بە باخ وەک: باخی مام ساڵح (ساڵح لاق بەگو)، باخی سەعید بەگ، باخی عەلیە درێژ، باخی کوێخا کەریم، باخچەی مەکتەب، باخچەی مام سەعید. بەڵام گەڕەکی قوولە پانتاییەکی زۆر فراوانی چۆڵی بەخۆیەوە گرتبوو لە کۆتایی ساڵەکانی شەستەکان و دواتر بوو بە گەورەترین گەڕەکی ڕانیە. ڕانیە تا ئەوکات (٢٥) دوکانی تێدا بوو کە (١٠) دوکانی کەوتبوونە گەڕەکی قەڵات لەمبەری و لەوبەری جۆگەی ئاوی «کوێرەکانی»، (١٥) پانزە دوکانیش لەژێر ئوتێلەکەی «برایم ئاغا» و لەوبەری جۆگەی کوێرەکانی کەوتبوونە سەر گەڕەکی قوولە.

تا ناوەڕاستی پەنجاکان ڕانیە بەو جۆرە بوو، پیشەگەرەکانی ڕانیە بریتی بوون لە بەرگدرووەکان، سێ بەرگدروو هەبوو، ئەبرەهە جوولەکە بوو، عزەت خەیات بە ڕەچەڵەک ئازەری بوو، میرزای خەیات کۆیی بوو، یەک زێڕینگەر ئەویش جوولەکە بوو. یەک دارتاشی تیا بوو ناوی بەهجەت قادر سوڵتان بوو، یەک مسگەر هەبوو قاپ و مەنجەڵی مسی ماڵانی سپی دەکردەوە، ناوی عەوڵای مسگەر بوو. ڕانیە یەک چاخانەی تێدا بوو، پێیان دەوت چاخانەکەی «مام عەلی شکاک»، تاکە وێنەگریش لە ڕانیە؛ شەهید مەلا فاتح عەسکەری بوو، باوکیشی؛ مەلا حامید عەسکەری، هەم مەلای مزگەوتی گەورە و هەم مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی ڕانیە بوو. تاکە دوکانی سەرتاشینیش لە ڕانیە، ئەوسا سەرتاشخانەکەی نوورەددین بەربەر و مستەفا بەربەر بوو کە پێکەوە یەک سەرتاشخانەیان هەبوو. یەک دوکانی پینەچی و کەوش دروو، هەبوو ئەویش وەستا شەفیق پینەچی بوو. دوکانێکی زیندرووش هەبوو کە ناسرابوو

بە دوکانی حاجی ئەحمەدی زیندروو، پێیان دەوت حاجی ئەحمەدی سەراج، تەنانەت کورەکانیشی هەر نازناوی سەراجیان بۆ خۆیان هەڵگرتبوو (عەبدلوەهاب سەراج و عەبدولهادی و عەبدولحەمید و عەبدلواحید سەراج). ڕانیە کاروانسەرایەکی تیا بوو ناویان لێ نابوو ئوتێلەکەی برایم ئاغا، ئەو کاروانسەرایە دوو قات بوو، سەرەوەی چەند ژوورێک بوو، غەریبە و کاروانچییە کۆییەکان کە لە کۆیەوە سەوزە و کەلوپەلیان بە ولاغ دەهێنا بۆ ڕانیە، لەو کاروانسەرایەدا دەحەوانەوە، ژێرەکەشی ٥ بۆ ٦ دوکان بوو. ڕانیە ڕێک لە گوندێکی گەورە دەچوو کە لە شێوەی «مانیفاکتەر»، هەموو پیشەیەکی تێدا بوو. لە ڕانیەدا تۆڕی ئاو و کارەبایی تیا نەبوو، دوو سێ کەس هەبوون پێیان دەوتن «سەقاو»، یەکی گوێدرێژێکیان هەبوو، حەماڵێکیان لە دار دروست کردبوو، چوار تەنەکەیان پیا هەڵواسیبوو، لە قوولە تەنەکەکانیان پڕ ئاو دەکرد و دەیانبرد بۆ ماڵان، یەکێکیان ناوی کاک محەممەد نەبی شین بوو تەمەن درێژ بێ تا نووسینی ئەم ژیاننامەیەش ماوە بە حاجی محەممەد ناسراوە. دوکاندارەکانی ڕانیە ئەوەندەی لەبیرم مابێ، لای ڕاستی جۆگەی کوێرەکانی: (شەنگە ئەحمەد، حاجی ئەحمەدی سەراج، قادری چایچی، قالەی مامە سوورە، نووری جو، مام جەرجیس، شێخەی گەورە، شێخەی گچکە، حاجی مەجید هاوار، جەلال مەجید هاوار، وەستا بەهجەت، سەیید فەیزولا، عیززەتی خەیات، حوسێنی حاجی تایەر، سەیید قادر، فەرەجی دوکاندار، مەلا فاتیح عەسکەری). لای چەپی جۆگەی کوێرەکانیش: (میرزای خەیات، مام یاسین، عەلی شکاک، محەممەدی وەستا قادر، کاک ئەمینی عەزیز ئاغا، فوئادی لۆقنتە، سەیید عەبدوڵڵا، حسامەددین، حەسەن بۆڕیەژەن، محەممەد دەرباز... هتد)، بەداخەوە ناوی هەندێ لە دوکاندارەکانم بیر نەماوە، لە ڕانیەدا یەک نانەواخانە و یەک کەبابخانە هەبوو، هەردووکیان ناویان سەییدی نانەوا و سەییدی کەبابچی بوو. شارۆچکەی ڕانیە، سێ سەرچاوەی ئاوی لە ناوخۆیدا هەبوو.

١. سەرچاوەی قوولە کە زۆرم باس کرد و ئاوەکەی هەمیشەیی و زۆر و پاک بوو.

٢. سەرچاوەی کوێرەکانی، کە ناوەکەی پڕ بە پێستی بوو، ئەم سەرچاوەیە وەرزی بوو لە مانگی سێ سەرەتای بەهار هەڵدەقوڵا و پێیان دەوت کوێرەکانی

ژیایەوە، لە مانگی (٧-٨) وشکی دەکرد، ئەو پێنج مانگە ئاوێکی ڕوونی جوان و سارد و پڕی هەبوو کە بە جۆگەیەک لە سەرچاوەکەیەوە بە ناوەڕاستی شاردا دەڕۆیشت تا کۆتایی دەڕژایەوە ئاوی قوولە.

خەسڵەتی جوانیی ئەم ئاوە لە بەهار و هاوین، ناو شارۆچکەکەی پاک و جوان ڕادەگرت، دوکاندارەکان بۆ خواردنەوە و شتنی کەلوپەل و ئاوڕشێنی بەر دوکانەکانیان بەکاریان دەهێنا و خاشاکی ناو بازاڕەکەشی بەرەو خوار ڕادەدا، جگە لەوە هەندێ پارچە زەویی کشتوکاڵییشیان پێ ئاو دەدا، لەوانەش گرنگتر بۆ دەستنوێژ و دەستبەئاوگەیاندن و پاککردنەوەی زێرابی ئاودەستەکانی مزگەوتی گەورەش بەکار دەهێنرا. سەرچاوەی کوێرەکانی و مزگەوتی گەورەی ڕانیە، دووانەی پێکەوە ژیاوی مێژووی ڕانیە بوون، پاش سێهەم کاولکاریی ڕانیە کە دروست کراوەتەوە، ئەو مزگەوتەیان لەتەنیشت کانی کوێرەکانی دروست کردەوە. لە پێشدا تەنیا هۆڵێکی لە خشت و قوڕ دروستکراوی بچووک بوو، پاشان لە ساڵی (١٩٥٣) حاجی مەجید هاوار؛ نۆژەن و گەورەی کرد بە جۆرێک کە سێ هێندەی لێ کرد. ئیمامەکانی ئەو مزگەوتە، لە سەرەتاوە مەلا حامید عەسکەری و دوای ئەویش مەلا پیرۆت کە وا بزانم لە گوندی «ماخۆ بزنانەوە» هاتبووە ڕانیە، پیاوێکی بەتەمەن و شارەزا لە دین و عالمی ناو مەلاکانی سەردەمی خۆی بوو. مجێور و بانگدەری مزگەوتەکە «سۆفی محەممەد» ناسراو بوو بە مەلا لوکس. لە ڕانیەدا باجگرێک هەبوو کە پارەی بارانەی لەو ولاخانە دەستاند کە کەلوپەلیان لە کۆیە و لادێکانەوە دەهێنایە ناو شار، ناوی «قادر فەرەج» ناسراو بە قالە فەرەج بوو. کەسایەتییە هەرە کۆنەکانی ڕانیە، جگە لەو ناوانەی لە پێشەوە باسم کردن، چەند کەسایەتییەکی ناسراو و قەدیمی و بناغەی ڕانیە هەبوون. (عەلی بەگ، سەعید بەگ، حەمەد بەگ، فەتاح ئاغا)، ئەمانە لە بەگەکانی بابانەکان بوون لە ڕەچەڵەکدا. مەلا یەحیا، قادر سوڵتان، عەزیز ئاغا، فەقێ سمایل، مام عەلی ناسراوە بە عەلیە درێژ، مام مارف ناسراوە بە مارفە سوور، مام مەحموود ناسراوە بە مەحموود شێخانی و گەلێکی تری کۆنی ڕانیەیی ڕەسەن کە ناوەکانیانم بیر چۆتەوە. دانیشتووانی شاری ڕانیە لەو سەردەمەدا بەشێکیان بنیاتنەری ڕانیە بوون و هەندێکیان لە کۆیەوە ڕەویان کردووە بۆ ڕانیە و بەشێکیشیان لە سلێمانییەوە چوونەتە ڕانیە

بە هۆی کەسابەت یان فەرمانبەری میری بوون. لە چلەکان و پەنجاکاندا جگە لە بابانەکان، زۆربەی دانیشتووانەکەی لە عەشیرەتی (ئاکۆ، یان بلباس، یا مەنگور) بوون، بەو پێیەی کە ڕانیە کەوتۆتە نێوان دەڤەری ئەو سێ عەشیرەتە.

٣. لە ڕانیەدا سەرچاوەیەکی ئاوی تر هەبوو کە ناسرابوو بە «کانیی مەلا سلێمان»، ئەو سەرچاوەیەش هەر وەرزی بووە و ئەمیش لەگەڵ ژیاندنەوەی سەرچاوەی کوێرەکانی دەژیایەوە، ئەم سەرچاوەیە ئاوێکی کەمی هەبوو کە دەکەوتە خوار کوێرەکانی و نزیک لە سەرچاوەی قوولە.

٤. سەرچاوەی «ڕەشەمێرگ»، ئەمیش هەر لە بەهاراندا دەژیایەوە.

٥. سەرچاوەیەکی زۆر بچووکی تەنیشت ئاوی قوولە هەبوو، ئاوەکەی جۆرێک لە توێژێکی چەوری بەسەرەوە بوو کە ژنانی گوندەکانی دەوری ڕانیە (کونەسێ، هەنجیرە، تیتۆکە) ئەو ئاوەیان بۆ خۆشکردنی مەشکە بەکار دەهێنا، ئەو کانییە لەژێر تەمتەمێکا هەڵدەقوڵا کە ئاوەکەی ئەوەندە کەم بوو؛ بەشی بەکارهێنانی بۆ خواردنەوە نەدەکرد، ناویان لێ نابوو کانییە مەشکە.

ڕانیە ئەوکات واتە لە چلەکان و پەنجاکاندا کە کەوتبووە پانتاییەک، ناوەڕاستی شار قەڵایەکی دەستکردی تیا بوو کە تا ئێستاش وەک خۆی ماوە، گوایە پاشماوەی سەدەکانی ڕابردووی تیایە، چواردەوری ڕانیە بە شاخ و گوند دەورە دراوە کە ئێستاکە گوندەکان بوونەتە گەڕەکێکی شارەکە، وەک گوندەکانی (هەنجیرە، تیتۆکە، کونەسێ، سەییداوا، بوسکێن، قوڕەگۆ). لەلای ڕۆژهەڵاتی ڕانیە، شاخی بەرز و ڕووت و ڕەشی کێوەڕەشە کە لە سەرەتای دۆڵی ئاکۆیەتییەوە دەست پێ دەکات تا دەگاتە سەر زێی بچووک کە بە دەربەندی ڕانیە ناسراوە. لای ڕۆژئاوای، شاخی (دەلوبزمار، کلکەی کۆڵێن)ە، لە خوارووی ڕۆژئاوایشەوە پانتایی دەشتی بیتوێنە کە لە ڕانیەوە دەست پێ دەکات تا کەناری زێی بچووک کە ئێستا پێی دەڵێن بەحرەکە (واتە کەنداوی دوکان) و درێژ دەبێتەوە تا دەچێتە خوارووی گوندی کانی ماران بە دەشتایی چوارقوڕنە و حاجیاواشەوە. ئەو دەشتی بیتوێنە یەکێکە لە دەشتە هەرە بەپیتەکانی باشووری کوردستان. شاری ڕانیە و دەشتی بیتوێن ئەودەم بە کشتوکاڵی توتن و گوڵەبەڕۆژە و گەنم و جۆ ناسراو بوو کە بەرهەمێکی زۆری هەبوو، بەناوبانگ بوو لە

پیتوبەرەکەتیدا، پاشان پەمۆ و چەوەندەری شەکریش. کلکەی کۆلین دەروازەیەکە لە ڕانیەوە بە ڕووی شارۆچکەی چوارقوڕنەدا کراوەتەوە. دەلوبزماریش دەروازەیەکە لە ڕانیەوە بەڕووی دۆڵی ئاکۆیەتیدا کراوەتەوە. دەربەندی ڕانیەش کە زێی بچووک ئەمبەر و ئەوبەری شاخی کێوەڕەشی کردووە بە دوو لەتەوە، «دەر»یشی پێ دەگوترێ، کە عەشرەتی پشدەر واتە پشتی ئەو دەرە لە «دەر»ە لەوەوە هاتووە. دەربەند لە کوردستان چەندین ناوی هەیە وەک: (دەربەند، گەلی، گەلوو). شاخی کێوەڕەش شاخێکی بەناوبانگە لە ڕۆژهەلاتی کوردستاندا، شاخێکی بەردەلانی ڕەشی دووروودرێژە کە لە وەرتێ درێژ دەبێتەوە تاکوو دەربەندی ڕانیە، شاخێکی زۆر وشک و بێ ئاو و بێ دار و بارە. ڕانیەی چلەکان و پەنجاکان مەیدانێکی هەبوو کە فولکەی ناوەڕاستی بازاڕی شار؛ ڕانیەی ئێستایە، ئەم مەیدانە بەیانیان زوو ماست فرۆش و دار فرۆش و خەڵووز فرۆشەکانی دێهاتەکانی ئەوسای دەوروبەری ڕانیە بە گوێدرێژ و بە کۆڵیش ماست و شیر و پەنیر و فرۆ و لور و ژاژی و قەیماغ و داری سووتاندن و خەڵووز (ڕەژی)یان تیا دەفرۆشت. کڕین و فرۆشتن بە پارەی ئەوسا پەنجا فلس (درهەم) و عانە و فلس و ڕبع و نیودینار و دینار بوو، دوو جۆر عانە هەبوو: عانەی چوار فلس و عانەی پێنج فلس کە بە عانەی بابەکر ئاغایی ناسرابوو، ئەو عانەیە لە قەلادزێ و پشدەر و ڕانیە بەکار دەهات، لە هیچ شارێکی تر بەکار نەدەهات.

لە ڕانیەدا هەندێ نەریتی کۆمەلایەتی هەبوو کە ڕانیەی پێ ناسرابوو، وەک کاری هەرەوەزی، بەشداریی کۆمەڵی شین و شایی، بۆ نموونە لە ژنهێنان و شووکردندا خەڵکی ڕانیە چونکە هەموویان خۆیی بوون و تێکەلاوی یەک بوون، هاوکاریی تەواوی ماددی و هەڵسووڕاندنی ئەرکی بەڕێوەبردنی شاییەکەیان دەکرد یان لە پرسەدا تا سێ ڕۆژ ماڵی خاوەن پرسە نەدەبووایە بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە خواردنیان بکردایە، دانیشتووانی ڕانیە هەرسێ ژەمەکە تا سێ ڕۆژ خواردنیان بۆ ماڵی پرسەدارەکە دەنارد بە سینی، خاوەن سینییەکانیش پیاو و ژن دەچوونە ماڵی خاوەن پرسەکە و لەگەڵ ئەوان نانیان دەخوارد، ئەم نەریتە بۆ ئەوە بوو کە هەم لە خەموپەژارەی ماڵە پرسەکە کەم کەنەوە و هەم ئەرکی خواردن دروستکردن و پاکوخاوێنیی ماڵەکەش بپارێزن (بەم نەریتەیان دەگوت سینی بردنەوە). لە جەژناندا هیچ پیاو و لاوێک لە ماڵی

خۆی نانی نەدەخوارد، هەر ماڵێک سینیی خواردنی خۆی دەنارد بۆ مزگەوت، لەوێ دوای نوێژی جەژن بەکۆمەڵ هەموویان لەسەر ئەو سینییانە نانیان دەخوارد کە مەرج نەبوو هەموو کەس سینیی خۆی بەر بکەوێ. لایەنێکی باشی ئەم نەریتەش جگە لە بەهێزکردنی تێکەڵاوی و دۆستایەتیی نێوان خەڵکی شار، دەبووە هۆی ئاشتبوونەوە و پێکەوە دانیشتن و نانخواردنی دڵڕەنجاوەکان لە یەکتری، جگە لەوەش هەر غەریبەیەک بە شارەکە لە مزگەوت بووایە، هاوبەشیی ئەو خواردنە بەکۆمەڵەی دەکرد.

کارە کۆمەڵایەتییە هەرەوەزییەکانی ڕانیە کە بەڕاستی مایەی یەکگرتوویی و ئاشتیخوازی و ڕێز و بەپەرۆشی خەڵکەکە بوو بۆ یەکتری، وەک ساوەر کوڵاندن، ساوەر کوتان، دروێنە، جۆماڵ، دەستەوایی، بەفر ماڵین و ڕێ پاککردنەوە، لە منداڵبوونیشدا دیسان دەرودراوسێکانی گەڕەک وەک شین و شایی تا حەوت ڕۆژ بۆ ماڵە منداڵبووەکە سینییان دەبرد و ژنان هاوبەشیی خواردنیان لەگەڵ مامان و زەیساندا دەکرد. بە هەموو تەمەنی منداڵیم لە ڕانیەدا تا سەرەتای شەستەکانیش، یەک جار پزیشکم لە ڕانیەدا دیوە، لەگەڵ ئەوەی نەخۆشخانەکەی دوو ژووری قوڕ بوو بێ دکتۆر و دکتۆرەکانمان یان مضمید یان «معاون طبی»، ئەو جارەش کە لە ڕانیە ئەو دکتۆرەیان بۆ ناردبوو نە کوردی، نە عەرەبیی دەزانی و نە ئەو لە کەس دەگەیشت و نە کەسیش لەو دەگەیشت، ناوی «دکتۆر کیش» بوو، نایەتە بیرم چ نەتەوەیەک بوو و خەڵکی چ وڵاتێک بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ڕانیە بێبەش بوو لە هەموو خزمەتگوزارییەکی تەندروستی، خۆیشی شارێکی دواکەوتوو و پڕ لە نەخۆشی بوو وەک (مەلاریا و ئەنفلۆنزا و سکچوون و ڕشانەوە، دووپشکی زەرد و ڕەشیش لەولاوە بوەستێ کە هێندەی ژمارەی کوللەی هاوینان دووپشکی هەبووە).

«دڵدار»ی شاعیر شیعرێکی لەسەر جوانیی ڕانیە نووسیوە کە بەڕاستی دەقاودەق پێچەوانەکەی بوو.

**دڵدار دەڵێ لە یەک دوو کۆپلەیدا کە لەبیرم ماوە:**

**جێو و هەواری بەختیاری خۆشە شاری ڕانیە**
**بێشکە هەردەم بەهەشتێکە لە دونیای فانییا**
**لای سەرووی ڕۆژهەڵاتی کێوەڕەشی بەرز و بڵند**
**دەورەکەی دێهاتی زۆرە و پڕ لە ئاوەدانییە**

**وەک دووڕ و مەرجان و یاقووتە چەو و بەردی بنی لایەکی ئاوی قوولە و ناوەندی کوێرەکانییە... هتد.**

دانیشتووانی ڕانیە لەبەر بێ داودەرمانی و دکتۆر و نەبوونی خزمەتگوزاریی تەندروستی و زۆریی مێشوولە و مەگەز و دووپشک و مار بەزۆری ڕەنگیان زەرد و نەخۆش و ورگن بوون، قەبرسانی منالان؛ دوو بگرە سێ ئەوەندەی قەبرسانی گەورەکان بوو. ماڵی ئێمە، سێ برا و خوشکێکمان بە نەخۆشی لە ڕانیەدا مردوون، کە هیچیان تەمەنیان لە سێ ساڵ تێنەدەپەڕین. ژنانی ڕانیە جگە لە ئەرکی ڕاگرتنی ماڵ و بەخێوکردنی منداڵ، بەتایبەت بە هاوینان ئەرکێکی تریشیان هەبوو کە شەوانە پاش چوونە سەربان ژوورەکانیان پڕ لە ئاو دەکرد و دەرگایان دادەخست و دوای دوو سێ سەعات بە فانۆسەوە دەچوونە ژوورەکان و دەکەوتنە دووپشک ڕاوکردن.

ڕانیە لەگەڵ ئەوەی کە شارێکی کشتوکاڵیی بەناوبانگ بوو، بەتایبەت لە چاندنی دانەوێڵە و تووتندا کە تووتنی بیتوێن ساڵانە لە ١٥-٢٠ هەزار فەردەی٧٠-٨٥ کیلۆیی پلە نایابی بەرهەم دەهێنا، شارێکی بازرگانییش بوو کەوتبووە نێوان سنووری دەستکردی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان و سەرەڕێگەی بازرگانیی نێوان شارەکانی ڕۆژهەڵات و نێوان کۆیە و سلێمانی و هەولێر بوو لە باشوورەوە. لە ڕووی بەڕێوەبەرایەتییەوە تا سەرەتای پەنجاکانیش ڕانیە سەر بە هەولێر بوو، لەدوای سەرەتای پەنجاکانەوە بەسترایەوە بە سلێمانییەوە. لە چلەکان و پەنجاکانیشدا گەرچی بە ڕواڵەت قەزا بوو، گوایە حکومەت بەڕێوەی دەبرد، بەڵام لە ڕاستیدا شارێکی خێڵەکی بوو، جگە لە ژمارەیەکی کەمی دوکاندارەکانی کە لە سلێمانی و کۆیە و هەولێر هاتبوون بۆ کاسبی و لەوێ نیشتەجێ بووبوون یان تاکوتەرای فەرمانبەری میری و پۆلیس بوون لە شوێنی ترەوە گوێزرابوونەوە بۆ ڕانیە، زۆربەی دانیشتووانی یان لە عەشیرەتی ئاکۆ بوون کە لە گوندەکانی ئاکۆیەتییەوە هاتبوونە ناو شار، یا لە عەشیرەتی بڵباس بوون یان لە عەشیرەتی مەنگوڕ بوون. عەشرەتی ئاکۆ بە دەسەڵاتداریتیی عەباس مامەند ئاغای ئاکۆ، گەورەترین عەشیرەتی ناوچەی ڕانیە بوون کە پتر لە (٨٥) گوند بوون. عەشرەتی بڵباس دووەم عەشیرەتی دەسەڵاتداری

هەرێمی ڕانیە بوون کە پێک هاتبوون لە دێهاتەکانی سەردەشتی بیتوێن لە چۆمی هیزوپەوە تا شارۆچکەی چوارقوڕنە کە سنووریان لەگەڵ عەشیرەتەکانی ئاکۆ و خۆشناو دەگەڕایەوە. عەشرەتی مەنگوڕ ئەمانەش لەپشتی دەربەندی ڕانیەوە، لە سەنگەسەر و بەستەستێن و دێهاتەکانی نێوان پشدەر و دەربەندی ڕانیەوە هاتبوونە ناو شاری ڕانیە، ئەم عەشیرەتە بە ژمارە لەناو شاری قەڵادزە بوونیان پتر بووە وەک لە ڕانیە. لە ڕانیەدا ڕۆژانی ڕەمەزان و جەژنان نەریتێکی تایبەت بە خۆی هەبوو، هەموو ئێوارانی ڕەمەزان پێش بانگ، پیاوێک هەبوو ناوی مام عەبدوڵڵا بوو، پێیان دەگوت «عەولا کوێر»، چاوێکی تانەی لەسەر بوو، سەڵت بوو لە ڕۆژهەلاتەوە هاتبووە ڕانیە، بە خۆی و دەهۆڵەکەیەوە دەڕۆیشتە سەر قەڵای ڕانیە، هەرکە سۆفی محەممەد (مەلا لۆکس) دەستی بە یەکەم «الله اکبر» دەکرد و ئەویش دەستی بە دەهۆڵ لێدان دەکرد و خەڵکی ڕانیەی بە دەنگی دەهۆڵەکەی ئاگادار دەکردەوە کە ڕۆژووەکانیان بشکێنن. لەسەر قەلاتەوە بە دەهۆڵلێدان دەهاتە خوارەوە تا کۆتایی جۆگەی کوێرەکانی گۆرانیی دەگوت و منداڵانیش دەیانگوتەوە، گۆرانییەکانیشی چەند ڕستەیەکی کورت کەم بوو وەک «مشک مشکی دەرکونی»، منداڵانیش دەیانگوت «بە خوای کاکە خۆشت گوت»، مام عەولا جار جار دەیگوت «عەولا کوێری دەلالان... داکی منداڵان»، مناڵەکانیش لەباتیی «بە خوای کاکە خۆشت گوت»، دەیانگوت «بە خوای کاکە خۆشت...» پارشێوانیش مام عەولا بە هەموو کۆڵانەکانی ڕانیەدا بەتەنیا بە دەهۆڵلێدان خەڵکی خەبەر دەکردەوە، لە جەژنانیش یەکەم ڕۆژی جەژن بەیانی زوو دەهۆڵی دەکوتا و مالانیش پارەی ڕەمەزان و جەژنانەیان دەدایە. ئەم پیاوە، سێ ژەمەکەی خەڵکی گەڕەک و دەرودراوسێکانی خواردنیان بۆ دەبرد. شەوانی ڕەمەزان لاوەکانی ڕانیە لە سێ چوار شوێنەوە کۆ دەبوونەوە و دەستە دەستە یاریی سینی و زەرفیان دەکرد یان گورەویبازی و کڵاوکڵاوێنە، منداڵانیش بە شەو یارییەکانی (قەلا قەلا، گەنم گرد و جۆ بڵاو، قاوە گۆزە) و بە ڕۆژیش یاریی (قەڵمردارە، کەلایین (هەڵماتێن)، هێلکەشکێنە، سێ باز و سنگە و باز، تۆپی داری، کەوشەک، فڕی فڕی، مزراحێن، کۆلارەهەڵدان، تۆپتۆپێن، ئەوە چییە لەبن پێم). یاریی ئەوە چییە لەبن پێم، کۆتایی هەموو یارییەک بوو کە دەیانگوت «ئەوە چییە لەبن پێم»، یەکێ دەیگوت:

ئاردە، کەسی سێهەم دەیگوت «هەر کەس بۆ ماڵی خۆی غار دا». لە زستانان و پاییزان سەردانی شەوانەی ماڵانی کۆڵانێک یا گەڕەکێک زۆر باو بوو، هەموو شەوێک دوو ماڵ یان سێ ماڵ لە ماڵێک پێکەوە کۆ دەبوونەوە بە گفتوگۆ سەرگوزەشتە و گێڕانەوەی حکایەت و بە پێکەنین و چەرەس خواردن کە بەزۆری گوڵەبەڕۆژە بوو شەو تا درەنگیان بەسەر دەبرد. خێزانی ماڵی ئێمە تا کۆتایی چلەکان پێک هاتبوو لە باوکم و دایکم و بەندە و خەلیل و ئیسماعیل و سمکۆ، وە تا ناوەڕاستی پەنجاکان ئیسماعیل و سمکۆ بە نەخۆشیی مەلاریا و ڕشانەوە مردن، پاشان بەختیار و نەسرین لە تەمەنێکی زۆر کورتدا بە هەمان نەخۆشی مردن، بەڵام پەروین (١٩٥١)، هاوار (١٩٥٥) و ڕزگار (١٩٥٧) و نەکەرۆز (١٩٦٣) و خۆشبەختانە لە تەمەندا مان تا ساڵی (١٩٨١) کاک خەلیل شەهید بوو و لە (١٩٨٢)دا کاک هاوار شەهید بوو.

خاڵم؛ وەستا محەممەد مستەفا ناسراوە بە «حەمەی مەجید هاوار»، یەکێک بوو لە خێزانەکە و هەر لە تەمەنی شەش ساڵییەوە لەگەڵ باوکم و دایکم و ئێمەدا ژیاوە بە هۆی کۆچی دوایی باوکی و دایکی کە ئەو لە تەمەنی زۆر منداڵیدا بووە، تەنانەت لە ڕانیە کەس نەیدەزانی کە خاڵمانە، وایان دەزانی برای باوکمە. خاڵم تەنیا حەوت ساڵ لە من گەورەترە. لە ڕانیەدا خاڵم هەر بە «حەمەی مەجید هاوار» وەک باوکم ناسراوە بە «جەلالی مەجید هاوار». سەرجەم مناڵەکانی باوکم و دایکم لە ڕانیە لەدایک بوون، جگە لە من و شەهید خەلیل لە سلێمانی، ڕانیە بۆ من وەک شاری لەدایکبوونم وایە، چونکە لە ساڵی (١٩٤٧)ەوە کە تەمەنم چوار ساڵ بووە، لە سلێمانییەوە چووینەتە ڕانیە تا تەمەنی نۆزدە (١٩) ساڵیم، جگە لە کاتەکانی خوێندنم لە سلێمانی؛ هەر لە ڕانیە ژیاوم، واتە هەموو بیرەوەرییەکانی منداڵی و مێردمنداڵیم هیی ڕانیەیە. باوکم لە تەمەنی پێنج ساڵییەوە منی برد بۆ حوجرەی مزگەوتی گەورەی ڕانیە و لەوێ لای مامۆستا عومەر ناسراو بە «مەلا عومەر» داینام و پیتەکان و سوورەتەکانی جزئی «عم و تبارک»ی فێر کردم. مامۆستا عومەر؛ لاوێکی ڕەبەن و سیمایەکی زۆر جوان و دەمبەپێکەنینی هەبوو، زۆر هێمن و لەسەرخۆ بوو لەگەڵ سوختە «قوتابی»یەکانیدا. مامۆستامان حەزی لە کچێک کردبوو، هەر جارە و بە یەکێکماندا دەسڕی بۆندار و گوڵ و مێخەکی بۆ دەنارد. لە تەمەنی شەش ساڵیدا خرامە قوتابخانە (مەکتەب).

قوتابخانەکەمان لە گەڕەکی قەڵات بوو، خانوویەکی لە بەرد و قوڕ دروست کرابوو، پێک هاتبوو لە پێنج ژوور، بە چواردەوری حەوشەیەکی بەرز و نزمدا دروست کرابوو. لە پۆلی یەک بووم، مامۆستایەکمان ناوی «عورەیبی» بوو، عەرەب بوو، لە دوایيدا زانیم کە شیوعی بووە و دووریان خستۆتەوە. پیاوێکی زۆر ڕەق و توند و تووڕە بوو، هەر لە مانگی یەکەمی خوێندنمەوە لە ترسی ئەو وازم لە قوتابخانە هێنا. بە ڕۆژ بە جانتاکەمەوە کە لە خام کیسەیەکیان بۆ هەڵدووریبووم، بەیانیان بەبەردەمی دوکانی باوکمدا دەچووم بەرەو قوتابخانە، بەڵام لەتەنیشت قوتابخانەکە مەیدانێکی چوار سەد مەتر دووجای لێ بوو، هەندێ گوڵی بەدەوردا چێنرابوو، پێیان دەگوت «باخچەی مەکتەب»، منیش جانتاکەم لەژێر گوڵێکدا دەشاردەوە و خۆشم دەچووم بۆ یاری، نیوەڕۆ لەگەڵ تەواوبوونی دەرس و دەرچوونی مناڵەکان، جانتاکەم هەڵدەگرت و لەگەڵ ئەوان دیسان بەبەردەم باوکمدا دەڕۆیشتمەوە بۆماڵەوە تا بزانێ کە لە قوتابخانە بووم. ئەم خۆدزینەوەیە هەفتەیەکی خایاند، ڕۆژێک جانتاکەم دەشاردەوە، یەکێک لە دواوە پشتی ملی گرتم و یەک زللەی لێ دام، وام زانی باوکمە، کە سەیرم کرد، کوڕێکی ناسیاومان بوو ناوی حەمە سەعید خورشید ئەفەندی بوو، قوتابی پۆلی شەش بوو، باوکم و باوکی هاوڕێ بوون، بە خێزانی زۆر تێکەڵی یەک بووین وەک خزممان لێ هاتبوو، بە پەلراکێشان بردمیەوە بۆ قوتابخانە، لێی پرسیم بۆ ناچمەوە، وتم لە ترسی «عورەیبی ئەفەندی». بە مدیرەکەی وت کە من لەبەر ئەو هۆیە مەکتەبم تەرک کردووە، مدیر و حەمە سەعید هەڕەشەیان لێ کردم کە بە باوکم دەڵێن، منیش تۆبەم کرد و وازم لەو ئەتوارە هێنا. لەو قوتابخانەیەدا سێ مامۆستای هەبوو، «کەمال ئەفەندی» هەم بەڕێوەبەر و هەم مامۆستاش بوو، «عورەیبی ئەفەندی» و «مامۆستا مەلا حامید». کەمال ئەفەندی خەڵکی کۆیە بوو، عورەیبی ئەفەندی موسڵاوی بوو، مەلا حامید خەڵکی عەسکەر بوو، یەک کارگوزاری هەبوو ناوی مام صەمەد بوو، بەتەمەن بوو، خەڵکی کۆیە بوو. لە ڕانیە یەک قوتابخانە هەبوو کە کوڕ و کچ پێکەوە دەیانخوێند، ژمارەی قوتابیی کچ بە پەنجەی دەست دەژمێردرا. لە پۆلی دوو و سێی سەرەتایی بووم کە هەموو دەرسەکانمان واتە کتێبەکان بە عەرەبی بوو، بەڵام مامۆستاکان بۆیان دەکردین بە کوردی. سروودی بەیانیانی ڕۆژی پێنجشەمووان دوو

سروود بوو کە بە عەرەبی بوون، ئەم سروودانە هەموو پێنج شەمووانێک هەموو پۆلەکان لە حەوشەی قوتابخانە ڕیز دەکران و یەک کەس لە پۆلی پێنج یا شەش بانگ دەکرا و سروودەکەی دەوتەوە، سروودەکان یەکێکیان بە ناوی «ایها العلم» بوو، کە تا ئێستاش یەکە و دێڕێکم لەبیر ماوە:

**عش هكذا في علو ايها العلم　　فأننا بك بعد الله نعتصمم**

**عش غافقا في الاعال للبقاء وثق　　بأن تؤيدك الاحزاب كلهم**

سروودەکەی تریش ناوی «مليكنا» بوو:

**مليكنا مليكنا نفديك بالأرواح　　عش غافقا عش سالما بوجهك الوظاع**

**سر دائما يا فيصل حليفك النجاح　　حلق بنا الى العلى مرفرف الجناح**

باشم لەبیرە دایکم هەندێ هەڵبەستی کوردیی فێر کردم و هانی دەدام لە قوتابخانە بە مامۆستاکان بڵێم منیش ئەو سروودانەم لەبەرە بیانخوێنم، تا ئێستاش نازانم سروودێکیان هیی کام شاعیری کورد بووە، سروودەکە بە ناوی «پۆلە چۆلەکەی سەرچڵ» بوو.

**پۆلە چۆلەکەی سەرچڵ　　مشکی ناو کون کرمی گڵ**

**هەر چی بیخوا　　دەیگرێ خوا**

**دەنکەگەنم**

**دەرکی عەمبار دەشکێنم　　بە بار گەنم دەردێنم**

**لەناو وەردا دەیچێنم　　فەقیری پێ دەژێنم**

**هەر چی بیخوا　　دەیگرێ خوا**

**دەنکەگەنم**

**ڕوو دەکەینە بەختیاری　　یەک دەگرێ کوردەواری**

**نامێنێ هیچ هەژاری　　ئیتر بۆچی بێزاری**

**هەر چی بیخوا　　دەیگرێ خوا**

**دەنکەگەنم**

لەبەرامبەر شیعرەکەی «دڵدار»ی نەمریش (جێ و هەواری بەختیاری)، دایکم

میعرێکی دانابوو کە تەواو پێچەوانەی شیعرەکەی دڵدار بوو، ئەوەی لەبیرم مابێ:

**ئەی چەند بێبەخت و کڵۆلم لەم دنیایی فانییە**
**بە ئاخری عومرم داوم کەوتە شاری ڕانیە**
**ڕانیەم لێ بوو بە مەسکەن**
**دەشتی بیتوێنە وەتەن**
**لە هەزاردا ساغێک نەبوو**
**کە شەو و ڕۆژ ناڵەی نەبوو**
**ڕۆژ لەبەر ئاگری جەحەنەم**
**شەو لەبەر مێشوو تەپۆ**

من لە پۆلی چوار بووم لە ساڵی (١٩٥٣-١٩٥٤) کە یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی سەردەمی ئەوسا دروست کرا و ناو نرا قوتابخانەی سەرەتایی ڕانیە یان قوتابخانەی ڕانیەی سەرەتایی کە لەتەنیشت باخچەی ناوەڕاستی ئێستای ڕانیە بوو. ئەوسا قوتابخانەکە لە هەشت ژوور پێک هاتبوو لەگەڵ هۆڵێکی گەورە لەسەر ڕاڕەوێکی لاکێشەیی شکاوە کە دوو دەرگای تیا بوو. پۆلەکان لە یەکەوە تا شەش، هەریەکەیان لە ژوورێکدا بوون و ژوورێک بۆ مامۆستاکان و ژوورێک بۆ بەڕێوەبەر بوو. بەڵام ژمارەی مامۆستاکان زۆر زیادی کرد، بوون بە شەش مامۆستا و بەڕێوەبەرێک، ئەوانەی لەبیرم ماون: (ئیسماعیل سەرهەنگ، شەفیق تاهیر کاکە خان، قادر ئەفەندی، کەمال ڕەشید حویزی (کەمال سێ لچ)، ڕەسوول ئەفەندی، مەلا حامید... بیرم نەماوە). قوتابخانەکە لە پێشەوە و دواوەی واتە لە ژوورووی ڕۆژهەڵات و لە خوارووی ڕۆژئاوای دوو مەیدانی فراوانی لێ بوو، ئیسماعیل سەرهەنگ، کە جگە لەوەی مامۆستا بوو، ڕووەکناسێکی بەتوانا و باخەوانێکی زۆر بەسەلیقەش بوو، بە هاوکاریی قوتابییەکان، مەیدانەکەی ژووری ڕۆژهەڵاتی بەردەم قوتابخانەکەی کرد بە باخێکی ڕازاوە و گوڵزارێکی سەرنجڕاکێش کە لە دواییدا ناو نرا بە باخچەی سەرەکیی ڕانیە و هەر بە باخی مایەوە تا نووسینی ئەم یادەوەرییەش، بەتەمەنەکانی ڕانیە کاتی بێکاری و ڕۆژانی گەرمای تێدا بەسەر دەبەن. لەناو مامۆستاکاندا، سێ مامۆستایان کوردپەروەر و پارتییش بوون: (ئیسماعیل سەرهەنگ، شەفیق تاهیر، ڕەسوول ئەفەندی)، بەڕێوەبەریش کەمال ڕەشید حویزی شیوعی بوو، ڕەوانی شاد

لە (١٩٦٣) بەعسییەکان لە کۆیە شەهیدیان کرد. سەرەتای هەستی کوردبوون و خۆشەویستیی کوردستانم لە پۆلی پێنجەوە بوو، بە کاریگەریی مامۆستاکانمان (شەفیق تاهیر، ئیسماعیل سەرهەنگ). ئەو هەستە وای لێ کردم لەگەڵ چەند قوتابییەکدا کە لە من بە تەمەن گەورەتر بوون، هەست بەوە بکەین بۆ بە عەرەبی بخوێنین و بۆ بە کوردی نەخوێنین. ئەو هەستکردنە وای لێ کردم حەز و ئارەزوویەکی زۆرم بۆ لەبەرکردنی شیعری شاعیرە کوردەکان لا دروست ببێ، بەتایبەتی ئەوانەی کە شیعرە نیشتیمانییەکانیان زۆر بوو، وەک: (حاجی قادری کۆیی، مامۆستا قانع، میری شاعیران ئەحمەد حەمدی)، کە باوکم دیوانەکانی ئەوانەی لەگەڵ مەولوودنامە و داستانی (ڕۆستەم و زۆراب، سیاوەحش، گیو گودەرز) بۆ کڕیبووم. بەیانیانی بەهاران زوو یەکێک لە دیوانەکانم دەگرت بە دەستەوە و دەچوومە دەرەوەی شار بە ناوی سەعییەوە شیعرەکانم لەبەر دەکرد. شیعرەکانیان جیاوازییان هەیە لە ڕووی داڕشتن و سەردەم و ماناوە، بەڵام هەموویان بۆ من وەک یەک بوون لە ڕووی هەستی نیشتمان خۆشەویستی و کوردپەروەرییەوە. قانع ئەوسا لە ژیاندا بوو، ناسراو بوو بە شاعیری هەژاران، لیقەوماوان، میللی، هەموو شیعرەکانی لە ناخی ستەملێکراوان و هەستپاکی و گەلپەرستی و نیشتیمانپەروەرییەوە هەڵدەقوڵا، بە حەق دژی بەگ و شێخ و مەلا و ئاغا چاوچنۆکەکان بوو. منیش لە ڕانیەی ژێر دەسەڵاتی ئاغا و شێخ و بەگەکانی ئاکۆ و بلباس و مەنگوڕدا دەژیام و بەباشی هەستم بە چەوساندنەوەی جووتیار و تووتنەوانەکان دەکرد. باوکم دوکاندار بوو، مشتەرییەکانی هەموویان لەو کەسانە بوون کە بە درێژایی ساڵ پێویستییەکانی خۆیان بە وام (قەرز) لای باوکم دەکڕی تا کاتی فرۆشتنی بەرهەمەکانیان کە دەبووایە یان نیوە یان سێ یەکیان بدایەتە خاوەن موڵک کە ئاغا و بەگەکان بوون، ڕەنج بۆ هەژاران، گەنج بۆ حازرخۆریی بەر سێبەر. جووتیار و تووتنەوانی وا هەبوو بەرهەمەکەی بەشی دانەوەی وامەکانی نەدەکرد، پاشماوەی قەرزی دوو ساڵ و سێ ساڵی دەکەوتەوە سەریەک. خۆراک و بژێوییان لە زۆربەی ڕۆژەکانی هەفتە لە نان و چاو و نیسک و لۆبیا و نۆک پتر نەبوو، نەیاندەتوانی ساڵێک یەک جار زیاتر بەرگ و پۆشاک بۆ خۆیان و خێزانیان بکڕن. شیعرەکانی قانع و حەمدی و حاجی کاریگەرییەکی زۆر زۆریان لەسەرم هەبوو

تا ئەو ڕادەیەی کە لە شەشی سەرەتایی بووم، بەیانییەکی پێنجشەممەی سەرەتای کردنەوەی قوتابخانە منیان بانگ کرد بۆ «تحیە العلم» لەباتیی «عش هکذا»، شیعرێکی حاجی گەورە شاعیرم پێشکەش کردن، کە سەرەتاکەی ئەم شیعرە بوو:

**ئودەبا چاکە لێم نەبن دەرهەم     لەو قسە و حکایەتانەی دەیکەم**

تا دەگاتە

**کوردی ئێمە نەزان و پاشکەوتن     هەموو پێکەوە پووش و ئاگر و نەوتن**

**بێو ئەگەر دەستی یەکتری بگرین  وەک ئەسکەندەر هەموو جیهان دەگرن**

لەسەر خوێندنەوەی ئەو شیعرە، بەڕێوەبەرەکەمان بانگی کردم بۆ ژوورەکەی خۆی و زۆری لێ کردم کە پێی بڵێم کێ فێری کردم ئەو شیعرە بڵێم و منیش وتم هەر خۆم لەبەرم کردووە، دە داری شووڵی هەناری لە هەردوو لەپی دەستم دا. لەناو قوتابییەکانی پۆلی شەش، چواریان کچ بوون کە بۆ ئەو کاتە کچ لەگەڵ کوڕدا لە پۆلێک بوونایە، زۆر جێی سەرسوڕمان بوو، بەڵام کچەکان کچی پیاوی خوێندەوار بوون و خەڵکی ڕانیەش نەبوون، سێ کچیان (پاکیزە، نەسرین، پەروین) کچی «حەمە سەعید قاضی» بوون کە باوکیان معاون پۆلیس بوو، کچەکەی تریش «گەلاوێژ» کە کچی «خورشید ئەفەندی»؛ بەرپرسی ڤێتەرنەری ڕانیە بوو. لەو پۆلە من و عیزەددین نوورەددین، بچووکترین قوتابیی پۆلەکە بووین، بەڵام زیرەکترینیان بووین. قوتابیانی پۆلی شەش، ئەوانەی ناوەکانیانم لەبیر مابێ، ئەم زاتانە بوون: (عیزەددین نوورەددین، برایم جەلال،  ئەنوەر سۆفی عەلی، محەممەد سۆفی، ئەکرەم عەلی بەگ، ئەدهەم عەلی بەگ، ڕەشید جەلیل (کاکۆ)، سوورە ساڵح، وسوو حەمد بەگ، عەلی مەعروف، عبدولڕەزاق مەحموود، عەبدولڕەزاق محەممەد گاخۆر، وەهاب حەمە سەعید چاوەش، پاکیزە محەممەد سەعید، نەسرین محەممەد سەعید، پەروین محەممەد سەعید، گەلاوێژ خورشید، سەلاح شەفیق، عەبدوڵڵا شەفیق، خدر ئیسماعیل ئەبو بەکر، عەبدولواحید سەراج)، داوای لێبوردن لەو بەڕێزانە دەکەم کە لە ژیاندا ماون و ناوەکانیانم بیر چۆتەوە، زۆربەی ئەو بەڕێزانە خانەی مامۆستایان یا بەشی کشتوکاڵیی بەکرەجۆ یا پیشەسازییان تەواو کرد، وا بزانم دووانیان یا سیانیان دانشگایان تەواو کرد و

بەندەش هەر ئامادەییم تەواو کرد.

لە ساڵی (١٩٥٥- ١٩٥٦) یەکەم تەلاری سەرای ڕانیە دروست کرا، کە بەڵێندەرەکەی ڕەمزی فەتاح خاڵی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بوو، ئەو تەلارە بوو بە کۆمەڵگە (مجمع)ی هەموو فەرمانگەکانی ڕانیە، قائمقامیەت، پۆلیس، پۆست، دارایی، تاپۆ، دادگا، زیندان... هتد. لە ڕانیەدا ئەوسا پۆلیسی هاتوچۆ، فریاکەوتن، ئاسایش، تاوان نەبوو، هەردوو جۆر پۆلیس هەبوو، پۆلیسی سواری کە بە فەرمان بە سواری ئەسپەکانیان دەنێردران بۆ گوندەکان و پۆلیسی پیادە کە فەرمانی ناو شاریان جێبەجێ دەکرد. تا ساڵی (١٩٥٨)، نە تەلاری دادگا و نە تەلاری بانک لە ڕانیە نەبوو، هەریەک قوتابخانەی سەرەتایی تێکەڵی کوڕان و کچان هەبوو، بۆ خوێندن لە ناوەندی یا پیشەسازی یا کشتوکاڵی دەبووایە قوتابی بڕۆشتایە بۆ کۆیسنجەق، یا سلێمانی، یا هەولێر. هەر ساڵی (١٩٥٨)دا تەلاری نەخۆشخانەی ڕانیەشیان دروست کرد کە لەپشتی سەرچاوەی قوولە بوو، ئەو نەخۆشخانەیە لە یەک هۆڵی گەورە و چەند ژوورێکی بچووک پێک هاتبوو، هۆڵەکە بۆ یەکەم جار بوو لە ڕانیە بەکار دەهێنرا بو ئەو نەخۆشانەی کە پێویستیان بە مانەوە بوو لە نەخۆشخانە بۆ چارەسەر. ئەگەر بیرم بە هەڵەیدا نەبردبم، وا بزانم دە قەرەوێڵەیی بوو.لە ڕانیە یەک مەنزڵگای مردووان (قەبرستان) هەبوو کە ئەو قەبرستانە زۆر لە شارەوە نزیک بوو (ئێستا نەماوە، کراوە بە بازاڕ و دوکان)، ئەوسا دەکەوتە پشتی ماڵی قائیمقام، لە ڕانیەدا چوار مەزارگەی پیرۆز هەبوو، واتە (چاک یا شەخس). مەزاری سەیید عەلی کە لە ناوەڕاستی قەبرستانەکەدا بوو، گەورەترین مەزاری ڕانیە بوو، خەڵکی بۆ نزا و داخوازی دەچوونە سەر ئەو مەزارە کە دوو داری گەورەی لەسەر بوو، هەر گەڵایەکی ئەو دارە پارچە پەڕۆیەکی پیا هەڵواسرابوو کە زۆربەی سەوز (کەسک) بوون. باپیرم لەسەر داوای خۆی کە کۆچی دوایی کرد، لەتەنیشت «سەیید عەلی» نێژرا، کە ئێستاکە تاکە گۆڕە لەو قەبرستانە کۆنە بێ شوێنەوارەدا ماوە لەگەڵ گۆڕی «سەیید عەلی»دا. سێ برا و خوشکێکم بە ناوەکانی (ئیسماعیل، سمکۆ، بەختیار، نەسرین) لەو گۆڕستانەدا نێژراون، کە ئێستاکە شوێنەواریشیان نەماوە. مەزاری دووهەم بە ناوی «چاکە چکۆلە» بوو. مەزاری سێهەم بە ناوی «سەییدە فەقیرە» بوو. مەزاری چوارەم بە ناوی «چاکی بەستەهێزێ» بوو

کە دەکەونە سەر جۆگەی بەستەهێزە. بەستە هێزە، بەستێک بوو تەنها بە زستانان ئاوی باراناوی تیا دەڕۆیشت و کۆ دەبۆوە. شوێنەوار لە شاری ڕانیەدا، ئەو کاتە تەنیا «قەلات»ی ڕانیە هەبوو کە کەس نەیدەزانی ئەو قەلاتە گردێکی دەستکردە، تا کۆتایی پەنجاکان کە سەر قەلاکەیان هەلکەند و تەختیان کرد بۆ دانانی تانکی عەمباری ئاوی ڕانیە کە لە ئاوی قوولەوە، بۆریی ئاویان بۆ ئەو تانکیە ڕاکێشا. لە کاتی هەلکەندنی و تەختکردنی سەر گردەکە، دوو سێ گۆزەی گەورەی تێدا دەرکەوت کە ناوەکەیان جگە لە خۆلەمێش، هیچی تری تیا نەبوو، هەر بەو گۆزانەشدا کۆنیی شاری ڕانیە سەلمێنرا.

شارۆچکەی ڕانیە گەرچی (قەزا بوو) قائیمقام نیشین بوو، بەلام شارێکی نزیکەی (٥٠٠) بۆ (٦٠٠) خێزان دەبوو، واتە لە (٢٥٠٠-٣٠٠٠) کەس تێپەڕی نەدەکرد، ڕێگاوبانی هاتوچۆی زۆر خراپ بوو، تەنیا ڕێگایەکیش کە ڕانیەی بە دەرەوەی خۆی ببەستایەتەوە، ڕێگای (ڕانیە- دەربەند-مەرگە-میرزا ڕۆستەم-دوکان-سلێمانی بوو)، ڕێگاکە قیرتاو نەبوو، قوڕ و ئاو بوو، (ڕانیە-کۆیە، ڕانیە و قەلادزە) بە ڕێگای ولاغ واتە بارگیر و ئێستر و قەتارچییەوە پێکەوە بەسترابوو. ڕێگایی ڕانیە-سلێمانییش تەنها دوو پاسی نەجەفی هاتوچۆیان تیا دەکرد، ناسراو بوون بە پاسەکەی «شێخ عەلی» و پاسەکەی «عەلی شێخە». هەر پاسەی یەک سەفەری لە هەفتەیەکدا پێ دەکرا، چونکە سلێمانی-ڕانیە دوو ڕۆژی دەویست. بەیانی لە سلێمانی دەردەچوو، ئێوارە دەگەیشتە میرزا ڕۆستەم، بۆ سبەینی لە میرزا ڕۆستەمەوە دەردەچوو، عەسر دەگەیشتە ڕانیە، گەڕانەوەش هەر بەو جۆرە بوو لە بەینی ڕانیە و سلێمانی دەبووایە سێ جار لە ئاوی زێی بچووک بپەڕیایەتەوە بە هۆی «قایەغە»وە جارێک لە دەربەندی ڕانیە، جارێک لە میرزا ڕۆستەم، جاری سێهەم لە دوکان. لە میرزا ڕۆستەم چاخانەیەک هەبوو بە ناوی «چاخانەکەی حەمە بێلوت»، ئەو چاخانەیە میوانخانەی پێنج ئەستێرەیی سەفەرچییەکان بوو کە شەو تیایدا دەحەوانەوە. ڕێگای ڕانیە-سلێمانی جگە لەوەی چەو و قوڕ بوو، لە هەندێ شوێن زەوییەکە زۆنگ بوو، نەفەرەکانی پاسەکە لە هەر سەفەرێکدا بە زستان و بەهار و هاوین و پاییز دەبووایە کە دەگەیشتنە شوێنی مەبەست، خۆیان و جلەکانی بەریان بشۆن، چونکە ئەوەندە پالیان بە پاسی چەقیوی ناو قوڕەوە دەنا، هەموو لەشیان دەبوو بە پریشکی قوڕی تایەی سەیارەکە. قایغ بریتی

بوو لە دوو دوببەی گەورە لە لەوحی ئەستوور دروستکراو بەتەنیشت یەکەوە بە شلمان و تەختە بەیەکەوە بەستراو بە چواردەوریدا شووری ئاسنی بۆ کرابوو بە دوو سیمی ئەستووری درێژ و دوو بەکرەی لە ئاسن دروستکراو پێکەوە بەسترابوونەوە، سیمێکیان لە بەری ڕاست بوو، بەری چەپی زێیەکە کە قاییم داکوترابوون، ئەو سیمانە یەکیان لە ڕاستەوە قایەغەی دەبردە ئەوبەر و ئەوی تریشیان بەپێچەوانەوە، قایەغەکان جێگای پاسێک و قەمەرەکیان تیا دەبۆوەوە، ئەو قایەغانە بەکار دەهێنران بۆ پەڕینەوەی پیادە و سواری ولاغ و ئۆتۆمبێلیش.

## بەشی دووەم
## دوا قۆناغی خوێندنم لە ڕانیە و یەکەم پەتای خۆشەویستیم

دوای دەرچوونم لە پۆلی شەشی سەرەتایی، بەناچاری دەبووایە شاری ڕانیەم بەجێ بهێشتایە، بڕۆشتمایە بۆ هەولێر یا کۆیە یا سلێمانی، چونکە لە ڕانیە قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندیی تێدا نەبوو. سەرەتا بڕیار وا بوو کە باوکم بمنێرێ بۆ کۆیە کە لەگەڵ سادق مەعرووف پێکەوە خانوو بگرین و یا خونچەی خوشکی کاک سادق بنەوانمان بێ، بەڵام ئەو بیرۆکەیە سەری نەگرت، چونکە سادقیش دوا ساڵی خوێندنی بوو لە کۆیە، دەبووایە بچێت بۆ بەعقوبە بۆ خوێندن لە خانەی مامۆستایان. دوا بڕیار لەسەر ئەوە درا بڕۆم بۆ سلێمانی و لە ماڵی خوالێخۆشبوو «کەمال مەجید هاوار»ی مامم بم. ماڵی مامم لە گەڕەکی سەرشەقام نزیک لە گومرگە سووتاو (بەر خانەقا) بوو. وشەی گومرگە سووتاو، لە سووتانی خانووی گومرگی سلێمانییەوە هاتووە کە لە مەیدانەکەی بەردەم خانەقای «مەولانا خالید» دروست کرابوو. بەرخانەقاش بەو مەیدانە دەوترێ کە کەوتبووە بەردەم مزگەوتی «خانەقای مەولانا خالید»ەوە. دیارە خانەقا و تەکیە مانایەکی فراوانتری لە مزگەوت بەخۆوە دەگرێ کە تەنیا شوێنی نوێژ و حوجرەیەکی بچووکی فەقێ نییە بۆ فێربوونی زانستە ئایینییەکان، خانەقا هەم مزگەوت و قەلەندەرخانە و ماڵی ئەو فەقێ و سوختە و مەلایانە بوو کە بۆ خوێندن و فراوانکردنی زانستی ئایینییان ڕوویان تێ دەکرد، لەباتیی ماڵ و چێشتخانە و قوتابخانە بەکار دەهێنرا. خانەقای «مەولانا خالید» بە ناوی مەولانا خالید نەقشبەندییەوە ناو نراوە. لە سلێمانی سێ خانەقا هەبوون: خانەقای مەولانا خالید، خانەقای حاجی مەلا عەلی، هەردووکیان کەوتوونەتە گەڕەکی سەرشەقام، «خانەقای مەحوی»، ئێستا هیچیان وەک خانەقا نەماون و تەنیا مزگەوتێکن بۆ نوێژ

و ئەرکە ئایینییەکانی ئایینی ئیسلامی. لە سلێمانیدا تەنیا یەک قوتابخانەی ناوەندیی کوڕان هەبوو لە پۆلی یەکەوە تا پۆلی سێ کە لە خانوویەکی بەکرێگیراودا بوو لەپشتی «خانەقای مەولانا خالید»ەوە، هەر بۆیەش پێیان دەوت قوتابخانەی ناوەندیی بەر خانەقا یا قوتابخانەی ناوەندیی سلێمانی. یەک قوتابخانەی دواناوەندی هەبوو کە ناوی «ثانوی سلێمانی» بوو کە پێک هاتبوو لە پۆلەکانی یەک و دوو و سێی دواناوەندی و پۆلی چوار و پێنجی زانستی (علمی)، ئەو قوتابخانەیە لە گەڕەکی چوارباخ بوو، یەک قوتابخانەی دواناوەندیی (ثانوی) کچانیش هەبوو کە پێک هاتبوو لە پۆلەکانی یەک و دوو و سێی دواناوەندی و پۆلی چوار و پێنجی ویژەی (أدبی) کە پێی دەوترا «ثانوی سلێمانیی کچان» لە گەڕەکی کانی ئیسکان لەتەنیشتی «مزگەوتی حاجی کاک ئەحمەدی شێخ» بوو. لەبەر نزیکیی ماڵی مامم لە «متوسطەی بەر خانەقا»وە، من چوومە ئەو قوتابخانەیە. قوتابخانەکە خانوویەکی لە بەرد و قسڵ و قوڕ دروست کرابوو، خانووی «عومەر بەگ» بوو، پێک هاتبوو لە دوو دەستەی سەرخان و ژێرخانی دار. لای دەرگای حەوشەکە هەیوانێک و دوو ژوور بوو، ژوورێک بۆ بەڕێوەبەر کە مامۆستا «ئەحمەدی قازی» بوو، ژوورێکیش بۆ مامۆستاکان، ئەوسا واتە ئەو ساڵە (١٩٥٦) ئەم بەڕێزانە بوون، مامۆستا بابە عەلی شێخ لەتیف دانساز، مامۆستا عومەر شاڵی، مامۆستا حەوێز ئەفەندی کۆیی، مامۆستا عەبدوڵڵا شاڵی، مامۆستا عەبدوڵڵا زێباری، مامۆستا ئازاد شەوقی. دەستەی یەکەمی خانووەکە دوو ژووری سەرخان لەسەر هەیوانێک کە پۆلی یەک و دووی تیا بوو و ژێرخانەکەشی کەلوپەلی قوتابخانە و حانوتی قوتابخانە بوو، دەستەی دووەم ژوورێکی گەورە بوو، پۆلی سێی تیا بوو لەسەر خانەکەی. ئەگەر بیرم سەری لێ تێک نەدابم، قوتابییەکان بە هەموویان نزیکەی (٧٠) قوتابی دەبوون، پۆلەکەمان پۆلی یەک کە لەبیرم مابێ: (نەوزاد عومەر عەبدولڕەحیم، نەوزاد نووری عەبدوڵڵا (نووری عەبەکە)، نیهاد نووری عەبدوڵڵا، کەمال ئەحمەد، عەلی جۆڵا، عەزیز موراد حەڵواچی، عیزەددین نوورەددین، عەلی باوە دەروێش، کەمال، ئەنوەر ئەحمەد، حەمە نووری حاجی فەتاح، محەممەد عارف، ئیبراهیم جەلال، نەوشیروان مستەفا، نووری سەعید).

سلێمانی ئەوکات واتە (١٩٥٦)، شارێکی بچووک بوو، پێیان دەوت لیوای

سلێمانی، پێک هاتبوو لە (٩) گەڕەک: (جوولەکان، سەرشەقام، چوارباخ، کانی ئەسکان، شێخان، مەڵکەندی، دەرگەزێن، سابوونکەران، گاوران). شەقامە سەرەکییەکانی: (شەقامی سابوونکەران، شەقامی سەرشەقام، شەقامی دەرگەزێن، شەقامی سەیوان، شەقامی مەڵکەندی، شەقامی مەولەوی، شەقامی کاوە). ڕۆژهەڵاتی سلێمانی؛ کۆتایی سابوونکەران بوو، ژووررووی ڕۆژهەڵاتی سجنی سلێمانی بوو، ئێستای پارکی دایک، کۆتایی شەقامی شێخان و کانی ئاسکان، لە ڕۆژئاواشەوە ماڵی حەمە ئاغا و باخی گشتی، لە خوارووی ڕۆژئاواشەوە شیوی جوولەکانە. مرۆڤ دەیتوانی بە سێ بۆ چوار سەعات بە چواردەوری سلێمانیدا بخولێتەوە، جگە لە دەبۆکە و تاوڵەی سواری، هەموو فەرمانگەکانی لیوای سلێمانی لەناو سەرای سلێمانی دابوو کە ئێستا بۆ شوێنەوارێکی بەنرخی شاری سلێمانی نۆژەن دەکرێتەوە. شوێنی ئێستای «کاسۆ مۆل» خانوویەکی گەورە بوو، پێی ئەوترا «مەعاریف»ی سلێمانی، واتە بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی سلێمانی. ژوورەکانی قوتابخانە لەبەر ئەوەی کە خانووی تایبەت دروستکراو نەبوو بۆ قوتابخانە، ژوورەکانی پەنجەرەی شێوە تاق دروست کرابوو، لە ژوورەکانیشدا چەندین تاق هەبوون بۆ شت دانان و لەلای بنمیچەکەش بە چواردەوری ژوورەکاندا ڕەفەی لە گەچ دروستکراو هەبوو. هەندێ لە قوتابییەکان جگەرەکێش بوون کە منیش یەکێک بووم لەوان، لە کاتی پشووەکاندا جگەرەمان دەکێشا و یەکێکمان بە (حەسحەس) ئێشکچی دادەنا نەوەک مامۆستا یا چاودێر بهاتایە، کە جگەرەش تەواو دەبوو، ئەغزە جگەرەکانمان هەڵدادەیە سەر ڕەفەکان.

بەیانییەک لە ماڵی مامم بێتاقەت بووم و دڵگرانیان کردم، نانم نەخوارد و سەعاتێک پێش دەستپێکردنی وانەی قوتابخانە؛ لە ماڵ چوومە دەرەوە دەستم کرد بە جگەرەکێشان تا کاتی وانەی یەکەم هات چوومە قوتابخانە، لە دەرسی دووهەم بوورامەوە، بردبوویانم بۆ نەخۆشخانە، بەڕێوەبەر و مامۆستا بابە عەلی گیرفانمی پشکنیبوو، پاکەت و شقارتەکەی دەرهێنابوو. کە لە خەستەخانەوە گەڕامەوە بۆ قوتابخانە، بەڕێوەبەر بانگی کردم و لێی پرسیم باوکت و کەسوکارت دەزانن جگەرەکێشی، وتم نەخێر، وتی گەر لەمەودوا جگەرە بکێشی و بەڵێنم نەدەیتێ کە تەرکی کەی، جواب بۆ باوکت و کەسوکارت دەنێرم کە جگەرەکێشی و لە قوتابخانەش

دەرتدەکەین.

لە پۆلی یەک بووم، بەڕێوەبەری قوتابخانە ئاگاداری کردین کە دەبێ هەموومان چاکەت و پانتۆڵ لەبەر بکەین، مۆڵەتی یەک مانگی پێ داین، قوتابییەکان کەوتنە خۆیان، وردە وردە کەوتنە قاتی چاکەت و پانتۆڵ لەبەرکردن، ماوەی مانگەکە تەواو بوو، من هەر بە جلی کوردییەوە دەچووم بۆ قوتابخانە، بەڕێوەبەر ماممی ئاگادار کرد ئەگەر تا هەفتەیەکی تر قاتم بۆ دروست نەکەن، من لە قوتابخانە دەردەکرێم. مامم باوکمی ئاگادار کرد، باوکم هات بۆ سلێمانی و بردمی بۆ دوکانی «ئیسماعیل خەیات» لەسەر شەقامی کاوە بوو، «ئیبراهیم خەیات»یش لای ئیسماعیل کاری دەکرد، باوکم پێی وتن قاتێک بۆ ئەم کوڕەم بە چەند بۆ دەدوورن، بە چەندیش تەواو دەبێ، ئیسماعیل وتی بیست ڕۆژ تەواو دەبێ، باوکم وتی بە سێ ڕۆژ بۆی تەواو بکەن، یەک دینار زیاتر لە نرخەکەی دەدەم. قات تەواو بوو، بەڵام من ڕووم نەدەهات لەماڵەوە بە قاتەوە بچمە قوتابخانە، ڕۆژانە لە ماڵەوە شەرواڵەکەم بەسەر پانتۆڵەکەدا لەبەر دەکرد و چاکەتەکەشم بە دەستەوە دەگرت، لە ئاودەستەکانی مزگەوتی خانەقا شەرواڵەکەم و چۆغەکەم یا مرادخانییەکەم دەکردەوە توورەکە خامەکە و چاکەتەکەم لەبەر دەکرد و خۆم دەکرد بە دەرگای قوتابخانەدا، دەرگای مزگەوتەکە و دەرگای قوتابخانەکە بەتەنیشتی یەکەوە بوون، نیوەڕوانیش بە هەمان شێوە لە ئاودەستێکدا خۆم دەگۆڕی ئەوسا دەڕۆیشتمەوە. ئەو ساڵەم زۆر بەناخۆشی لێ ڕۆشت، منێک کە تا ئەو کاتەی لە ماڵی باوکم دوور نەکەوتبومەوە، بەو تەمەنە کەمەوە لە دایک و باوک و برا و خوشک دابڕام خۆم بە نامۆ دەزانی، جگە لەوەش ماڵی مامم دوو مێردمنداڵی تری وەکوو منی تێدا بوو، یەکێکیان کوڕی مامم؛ جەمال، ئەوی تریشیان وریا کە کوڕی خوشکی ئامۆژنم بوو ماڵیان لە پێنجوێن بوو، ئەویش هاتبوو بۆ سلێمانی بۆ خوێندن هەر لە ماڵی مامم بوو، ئامۆژنم بە یەک چاو سەیری ئێمەی نەدەکرد. لە هەموو ڕوویەکەوە منی لەوان جیا دەکردەوە، لە ڕووی سۆز و خۆشەویستی، لە ڕووی خواردن، لە گرنگیپێدان، بۆیە هەستم زۆر بە نامۆیی دەکرد، ئەوەی کە وای لە من کرد بوو خۆڕاگر بم؛ هاوڕێکانی قوتابخانەم، بەتایبەت شانەی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بوو کە زۆر دڵخۆش بووم بەوان، بەتایبەتی لەناو هاوڕێکانما

یەکێکیان کاک نووری حاجی فەتاح جگەرەچی بوو. کاک نووری گەرچی ساڵێک لە من گەورەتر بوو، بەڵام بووبووینە هاوڕێی گیانیبەگیانی، هەم لەناو قوتابخانە و هەم لە دەرەوەی قوتابخانەش، جگە لەوەی کە لە یەک پۆلدا بووین، لە دەرەوەش ماڵمان زۆر لەیەکەوە نزیک بوو لە سەرشەقام، هاوڕێیەتیمان تا نووسینی ئەم یادەوەرییەش بەردەوامە. کاکە نووری پیاوێکی زۆر هێمن و لەسەرخۆ و بەڕەوەشت، مامناوەندیش لە زیرەکی، هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویست و بەشەرەف، هەرگیز وشەیەکی نەدەوت کە دڵم گەرد بگرێ، هاوینان پێکەوە دەچووین بۆ ڕانیە لە پشوودا، یان دەچووین بۆ پێنجوێن ماڵی کاکی کاکە جەلال لەوێ بوو، تا پۆلی پێنجی دواناوەندی پێکەوە بووین لە بەشی وێژەیی، دوای ئەوە چووە بەشی یاسا لە بەغدا و چارەنووس وا بوو منیش چوومە زانکۆی شاخ لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول. من و کاکە نووری هاوڕێی بیروباوەڕ و سیاسەت نەبووین، بە پێچەوانەی منەوە لەگەڵ ئەوەی کوردێکی کوردپەروەر و کوردستان خۆشەویست بوو، بەڵام ئارەزووی لە سیاسەت نەبوو.
پۆلی یەکی ناوەندی بۆ من وەچەرخانێکی گەورە بوو لە ژیانی مندا، پێشتر تەنیا ئالوودەی کوردایەتیی سەرەڕێیی و شیعری شاعیرانی کوردپەروەر و هەژارپەروەری وەک (قانع و حاجی قادر و ئەحمەد بەگ و صافی هیرانی بووم)، بەڵام لە پۆلی یەکدا دوچاری پابەندبوون بووم بە کاری ڕێکخراوەییەوە لە شانەی ڕێکخستنی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان کارم دەکرد. یەکێتیی قوتابیانی کوردستان گەرچی ڕێکخراوێکی بەناو پیشەیی بوو، بەڵام سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، لە ڕاستیدا وەک پەیمانگایەکی پارتی وا بوو کە خوێندکاری بۆ ڕێکخستنەکانی پارتی تیا پەروەردە دەکرا. ئەوسا دوو ڕێکخراوی پیشەیی خوێندکاران هەبوو، یەکێکیان سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەوەی تریش سەر بە حزبی شیوعیی عێراقی کە ناوی «اتحاد طلبة العراق» بوو.

## لافاوەکەی سلێمانی

لە پۆلی دووی ناوەندی ساڵی خوێندنی (١٩٥٧-١٩٥٨)، دوو ڕووداوی گەورە ڕووی دا کە هەردووکیان بوونە ڕووداوی مێژوویی. یەکەمیان لە (١٩٥٧/١٠/١٨)

لە ڕۆژێکی نە سارد و نە گەرم و لە ئاسمانێکی سامالّی ئەو ڕۆژەدا لە کاتژمێر دوای دووی پاشنیوەڕۆ لە ماوەیەکی زۆر کورت و سەرسوڕهێنەردا، پەڵە هەورێکی ڕەشی تاریک ئاسمانی سلێمانیی داپۆشی و بوو بە تەرزە بارین بۆ ماوەیەکی زۆر کەم، بەلاّم زۆر بەخوڕ و دەنک گەورە، لافاوێکی وای دروست کرد کە ئەو ساڵە بەو لافاوە بناسرێتەوە. ئاوی باران و تەرزە لە شاخی گۆیژەوە بەرەو گەڕەکی مەڵکەندی و بەرەو خوار بەناو بازاڕ و قەیسەرییەکاندا بەرەو سەرشەقام و شیوی جوولەکان هێرشی دەبرد، لە دوکانەکانی شەقامی کاوە و قەیسەرییەکانەوە سەدان لوولە قوماش و سندووقە چا و فەردە شەکر و کەلوپەلی دوکانەکانی بەرەو گومرگە سووتاو و شەقامی سەرشەقام و شیوی جوولەکانی ڕادەدا، چەند کەسێکی لە منالّی سەر بێشکە و گەنج لە ژن و پیاوی تیا خنکا و بریندار بوون، چەند ئۆتۆمبێلێکی بەتەپاوتل بەرەو شیوی جوولەکانی برد ترنجاندنیە ناو شیوەکەوە. زۆر شیعر و شانامە و بەندوباوی لەسەر نووسرا. ئەو ڕۆژە تا تاریکایی ئێوارە، ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن بە بڵندگۆ هاواری دەکرد: «کێ مالّی وێرانە، ڕوو بکاتە خەستەخانە!» ناخۆشترین دیمەنی ئەو ڕۆژە لای من، دیمەنی کچێکی تازەپێگەشتوو بوو، ئاو هێنای لە سەرشەقام خۆی بە دارێکی کارەباوە گرتەوە، سێ چوار کەس لە سەربانەوە هەوڵیان دا بە پشتێنەکانیان هەڵیکێشن بۆ سەربان، بەلاّم لەو کاتەدا بەرمیلێکی خۆڵ ئاوەکە هێنای و دای لە کچەکە و دەستی پێ لە دارتەلەکە بەر دا، ڕاپێچی ئاشێکی لەکارکەوتووی خوارووی شەقامەکەی کرد، بوو بە ژێر خۆڵ و خاشاک و تەرزەوە، دوای دوو ڕۆژ بەمردوویی دەرهێنرایەوە. دۆزینەوەی پاشماوەکانی ئەو لافاوە چەند ڕۆژێکی خایاند، تەنانەت مەلیک فەیسەڵ و عەبدول ئیلاهـ خالّی مەلیک و نووری سەعید سەرەکوەزیران هاتنە سلێمانی بۆ بینینی پاشماوەکانی لافاو لە خانووبەرەی گەڕەکەکان و دوکان و قەیسەرییەکان بۆ کۆمەک و هاوکاریکردنی زیانپێکەوتووەکان.

## مانگرتنە مەزنەکەی خوێندکاران

ڕووداوی دووەم، ئەو مانگرتنە گەورەیەی خوێندکاران بوو لە سەرتاسەری عێراق و دژی پەیمانی سەنتوکە پتر لە (١٥) ڕۆژی خایاند، بە هاندان و سەرپەرشتیکردنی

هەردوو حزبی (پارتی، تحرر)، واتە پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی شیوعیی عێراق. حکومەتی عێراقی زۆر پێی شڵەژا، بۆیە بە حکومەت و بەڕێوەبەرایەتیی قوتابخانەکان کەوتنە ئاگادارکردنەوەی کەسوکاری قوتابییەکان کە ئەگەر نەگەڕێنەوە قوتابخانە و دەرس خوێندن، ئەوا خوێندنی ئەو ساڵەیان بۆ ئەژمار ناکرێ و هەموویان بە دەرنەچوو لە پۆلەکانیان دادەنرێن. باش بیرم نەماوە چ ڕۆژێک بوو، بەڵام دەزانم لە مانگی (١٩٥٨/٥) دوادوایی خوێندنی ئەو ساڵە بوو. لە سلێمانی ئەو ساڵە هەرکە خوێندن تەواو بوو، زۆربەی هاندەرانی مانگرتنەکەیان لە قوتابیانی ناوەندیی بەر خانەقا و دواناوەندییەکانی سلێمانی و کشتوکاڵی و پیشەسازی کران بە چاودێر لە مانگەکانی پشوودا و نێردران بۆ شەریکەکانی دوکان و دەربەندیخان و شەریکەی «بلغور بیتی» لە دۆڵی شەهیدان لە ناوچەی سەنگەسەر، بەندەش ئەوسا بە بەر شەریکەی «بلغور بیتی» کەوتم. ئەوانەی بەر ئەو شەریکەیە کەوتن: حەمە چاوشین، حەمە ئەمین حسێن، حاجی تایەر، ئەحمەد میرزا مەنگوڕی، خوالێخۆشبوو حەمە چاوشین ئەوسا بۆی گێڕاینەوە کە پاش مانگرتنەکە، «متصرفی» ئەوسای سلێمانی (عومەر عەلی) تورکمانێکی عەسکەریی توندڕۆ بوو، بانگی هەندێ لە قوتابییەکانی کردبوو، کە چووبوون دیبوویان نووری ئەحمەدی تەهاش لەوێ بووە، عومەر عەلی. نووری ئەحمەد تەهای بەسەری مارەکە دەزانی، لە ڕاستییشدا هەر وا بوو، چونکە ئەوسا کاک نووری لێپرسراوی لقی سلێمانیی پارتی بوو. کاکە حەمە گێڕایەوە وتی عومەر عەلی بەسەر نووری ئەحمەدی تەهادا قیڕاندی و وەرەقەیەکی خستە بەردەمی وتی «پڕ بیکە»، واتە ئەم وەرەقەیە پڕ بکەرەوە، وەرەقەکە بریتی بوو لە «اعتراف وبراء»ە، کاک نووریش وتوویەتی «نیوەی دەکەم»، عومەر عەلی تووڕە بوو و قیڕاندوویەتی و وتوویەتی: «املی الاستعارە یا مجنون»، واتە پەڕەکە پڕ بکەوە هەی شێت، کاک نووریش وتوویەتی: «گالو عومەر عەلی مجنون، لکن مو مجنون مخبل»، واتە وتیان عومەر عەلی شێتە، بەڵام شێت نییە، بێعەقڵە. هەر دوای مانگرتنی قوتابیان بە چەند مانگێک، ئەوەی لە مێژوودا بە «شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ» ناسراوە لە (١٤ی تەمموزی ١٩٥٨)دا ڕووی دا و ڕژێمی پاشایەتی بۆ دواجار ڕووخا. مانگرتنی خوێندکاران لە هەندێ شار، کرێکار و کاسبکارانیشی گرتەوە، کاریگەریی گەورەی

کردە سەر دەسەلأت، تا ئەو ڕادەیەی کە ترسی کودەتای هەبوو ڕوو بدا، بۆیە ئەو لیوا سەبازییەی کە لە حەبانیە بوو گوایە بۆ پاراستنی بەغداد، ئەو لیوایەیان بە ناوی بەرگری لە فەڵەستین نارد بو ئەردەن، بەڵام ئەو لیوا سوپایە شەوی (١٣ لەسەر ١٩٥٨/٧/١٤) کە بەرەو ئەردەن بەڕێ کەوتبوو، گەڕایەوە سەر بەغداد و بە کودەتایەکی سەربازی کۆتاییان بە دەسەڵاتی شایەتی هێنا.

## شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ

سەرکردەکانی ئەو کودەتایە ناو نران «ئەفسەرە ئازادیخوازەکان» کە لە کورد و عەرەب پێک هاتبوون، لەوانە: (عەبدولکەریم قاسم زەعیم، عەبدوسەلام محەممەد عارف عەقید، جەلال ئەحمەد فەهمی ڕەئیس، مستەفا عەبدوڵلا بانەیی ڕەئیس...). ئەگەرچی کودەتا کە سەربازییەکی ڕووت بوو، بەڵام کەسایەتیی شیوعی و پارتییش لەناو ئەفسەرەکاندا هەبوو. سەبارەت بە ڕۆڵی بەهێزی قوتابیان لەو ساڵەدا، عەبدولکەریم قاسم بڕیاری دا کە هەموو قوتابییە دەرنەچووەکانی ساڵی خوێندنی (١٩٥٧-١٩٥٨) بە دەرچوو ئەژمار بکرێن، بەو ساڵەیان دەوت «سنه العبور»، واتە ساڵی تێپەڕاندن. ساڵی (١٩٥٨-١٩٥٩)، ساڵی خۆپیشاندان بوو بۆ پشتوانیی عەبدولکەریم قاسم با بژی و پیشاندانی قەبارە و دەسەڵاتی حزبی شیوعیی عێراقییش بوو. نە خوێندکار خوێندنی بۆ دەکرا، نە کاسبکار کاسبیی بۆ دەکرا، نە کرێکار و جووتیار بە کارەکانی خۆیان هەڵدەستان، ئەرکی هەر هەموو چینوتوێژەکان بووبوو بە یەک ئەرک، ئەویش خۆپیشاندان و چەپڵەڕێزان و با بژی و هاندانی جووتیارانە لە دژی دەرەبەگ و خاوەن موڵکەکان. حزبی شیوعیی عێراق لەبەر ئەوەی هیچ ئەزموونێکی لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا نەبوو و دەشیویست بە پڕوپاگەندە هەلی کودەتاکە بقۆزێتەوە بۆ پەرەسەندن و دەسەڵات گرتنە دەست، کەوتە دژایەتیکردنی بێبنەما و نارەوای ناکامڵی پارتی. لە لایەکەوە کەوتە هاندانی جووتیاران و دژایەتیی سەختی دەرەبەگەکانی کوردستان بێ فەراهەمکردنی فاکتەرەکانی چارەسەری کشتوکاڵی (الاصلاح الزراعی)، کە بووە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕێکی بێبنەما و بێ ئامادەکاریی نێوان جووتیاران و خاوەن زەوی و موڵکەکان. تا کار گەیشتە ئەوەی زۆربەی موڵکدارە کشوکاڵییەکان و دەرەبەگەکان لە

باشووری کوردستان ڕەو بکەن بەرەو ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ئاستی بەروبوومی کشتوکاڵییش لەو دوو ساڵەدا بگاتە نزمترین ئاستی بەرهەمهێنان. لە لایەکی ترەوە کەوتنە دژایەتیکردنی خواستی نەتەوایەتیی گەلی کورد لە کوردستان کە ئەو کاتە پارتی دیموکراتی کوردستان ئاڵاهەڵگری بوو. ڕکابەرییەکی زۆر توند کەوتە نێوان شیوعییەکان، پارتییەکان لە لایەک و نێوان شیوعییەکان و جوتیاران وەک بەرەیەک و نێوان ئاغا و موڵکدارەکان لە لایەکی ترەوە، چەندین درووشمی سەیروسەمەرە لەو ساڵەدا سەری هەڵدا. درووشمەکانی جووتیاران کە شیوعییەکان خوڵقێنەری بوون، وەک: «فەلاح موڵکی خۆیەتی، ئاغا بابە ڕووتی، یان مەترێ فەلاح بوو بە گوریس...»، یان درووشمەکانی «کە ئاڵای سوور هەڵکرا، داس و چەکوش لەناویا...»، «فەقیری بنبڕ دەکەین، دەحەسێیەنەوە لە بنیا...»، یان درووشمی «حزبی شیوعی گەورەیە، پێشڕەوی ئەحزابی کەیە، لە عالەمدا ناوی هەیە...» ئەو ململانێیەی نێوان حزبی شیوعی و پارتی گەیشتە ڕادەی پەلاماری بارەگای پارتییەکان لەو شارانەی کە حزبی شیوعی تیا باڵادەست بوو.

من ئەو کاتە لە پشووی هاوینی ساڵی (١٩٥٨- ١٩٥٩) چووبوومەوە بۆ ڕانیە، ڕانیە زۆربەی دانیشتووانەکەی لە عەشیرەتی ئاکۆ بوون کە عەباسی مامەند ئاغا سەرەک عەشیرەتیان بوو. بە هاندانی حزبی شیوعی، پیاوێک کە ناوی حەمە قیرە بوو، فەردەیەک کای بە گوریسێکەوە بەست و ڕایدەکێشا و خێرا خێرا بە دارێک لە فەردە کاکەی دەدا و دەیوت ئەوە عەباس ئاغاییە دەریدەکەین. حەمە قیرە دەڵاڵی ئۆتۆمبێل بوو لە گەراجی ڕانیە، دوای هەفتەیەک عەباس ئاغا بە خۆی و نزیکەی سەد سوارە و بە تفەنگ و فیشەکدانەوە هاتنە ڕانیە، حەمە قیرە ترسا وای زانی بۆ ئەو هاتوون، بەپەلەپرووزە خۆی گەیاندە ئەسپەکەی عەباس ئاغا و پێڵاوەکانی ماچ کرد.

حزبی شیوعی لەبەر بێئەزموونییان وایان دەزانی عەبدولکەریم قاسم پشتوپەنایانە، شیوعییەکان هەستان بە دروستکردنی «مقاومە الشعبی»، بە بۆچوونی خۆیان وردە وردە شوێنی سوپای عێراقی کۆنەپەرستی پێ بگرنەوە. ئەو کاتە لە ڕانیە دوو شاعیر هەبوون، یەکێکیان میرزا محەممەد ئەمین مەنگوڕی لە عەشیرەتی مەنگوڕی دیوی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، پارتی بوو، دەمێک بوو لە ڕانیە لە بەڕێوەبەرایەتیی ئاوی

ڕانیە دامەزرابوو، ئەوی تریان ناوی سەیید محەممەد بوو، سەییدی لوقنتەچییان پێ دەوت، لەبەر ئەوەی (لوقنتە، مطعم، خواردنگا)ی هەبوو، ئەمیان شیوعی بوو، ئەمیش هەر لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتبووە ڕانیە و چەند ساڵێک لە ڕانیە دەژیا، کۆنە تودەی بوو، ئەو دووانە بەندی شیعریان بەسەر یەکتریدا هەڵدەدا.

**بە میرزا مەنگوڕیان دەوت: شعارنا درکەزی میرزا مەنگوڕی بەزی**

**بە سەییدیشان دەوت: سەییدی لوقنتەچی دایم باوکەڕۆیەتی**

**حەوێز وەهاب مامۆستای سەرەتایی بوو، شیوعی بوو، بەویشان دەوت:**

**شعارنا شیش کباب ملت بشکێ حویز وەهاب**

پیاوێکی زۆر بەتەمەنی دوکاندار هەبوو ناوی مەلا سدیق بوو، خەڵکی کۆیە بوون، بەڵام خۆی و دوو کوڕی و ماڵ و منداڵی لە ڕانیە دەژیان، هەردوو کوڕەکەی؛ دوو پیاوی زۆر بەڕێز و خۆشەویست بوون، ماوەیەکی زۆر کوڕێکیان کە ناوی مەلا توفیق بوو؛ لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی پارتیی ڕانیە بوو، تەنانەت بۆ ئەو پیاوە پیرە بەتەمەنەشیان هەڵبەستبوو: «شعارنا دار لاستیق، برۆ دەرێ مەلا سدیق». ئەو سەردەمە سەردەمی «مد»ی باوی شیوعییەکان بوو لە هەموو شارەکانی (کۆیە، ڕانیە، قەڵادزە، هەڵەبجە، پێنجوین)، تەنگیان بە پارتییەکان هەڵچنیبوو، لەو کاتەدا پارتی داوای «مەعاریفی کوردستان»یان لە حکومەتی قاسم دەکرد کە ناوەڕۆکەکەی بریتی بوو لە خوێندن بە زمانی کوردی، شیوعییەکان «مەعاریفی کوردستان»یان ناو لێ نابوو مەعاریفی قلیاسان، تەنانەت گەڵتەجاڕییان بە وشەکانی ڕۆژباش، شەوباش دەکرد و بەتەنزەوە دەیانوت «پاشەوپاش عەنتەرناش». بە کورتییەکەی، شیوعییەکان دژی هەموو وشە و مۆرکی نەتەوایەتیی کوردی بوون، بەتایبەت وشەی کوردستان. محەممەد کاسترۆ: ئەم پیاوە لە چوارقوڕنە دەژیا، ئامێرێکی تەلەفۆنی ئەو سەردەمەی کە بە دەست با دەدرا بە دوو سێ مەتر وایەرەوە بە دەستیەوە بوو بەناو جووتیارەکاندا دەگەڕا و هەندلی تەلەفۆنەکەی بە دەست با دەدا و گوێی پێوە دەنا و دەکەوتە هەلاو هەلاو. کاک عەبدولکەریم قاسم، ئەوە جووتیارەکانی گوندی (پووکە، یا

قەرەنی ئاغا، یا شکارتە، یا سەروچاوە... هتد)، داوای ڕاکێشانی ئاو و کارەبا دەکەن بۆ ماڵەکانیان، هەر خۆیشی دەیوت باشە باشە چەند مانگی تر بۆیان دەکەین، بەو جۆرە ئەو جووتیارە هەژارانەیان هەڵدەخەڵەتاند.

ساڵی (١٩٥٨- ١٩٥٩) لە پۆلی سێی ناوەندی بووم، لە ماڵی مامم (وەستا کەمال مەجید هاوار بەنا) بووم لە گەڕەکی سەرشەقام، ماڵی مامیشم کرێچیی ماڵێک بوون لە دوو هۆدە لەسەر هەیوانێک بوون، لەو حەوشەیەدا سێ ماڵی تری تیا بوو، ماڵێکیان کچێکی نەخوێندەواری کورتەباڵای جوانیان هەبوو، کچە لەگەڵ مندا کەوتە چاوبڕکێ و دەست بە قژدا هێنان، منیش لەگەڵیا کەوتمە داوی خۆشەویستییەکی کاتیی هەرزەکارانەوە، ماوەی چەند مانگێکی خایاند کە هەموو شەوێ هەردووکمان لەسەر تەنووری خانووەکە جێژووانمان دەگرت، تا شەوێک پیاوی ماڵی سێیەم کە پۆلیس بوو، هات بەسەرماندا و گوێی هەردووکمانی ڕاکێشا و هەڕەشەی ئاشکراکردنی لێ کردین ئەگەر بەردەوام بین، دواتر هەردووکمان نەماندەوێرا بە تیلەچاویش تەماشای یەکتری بکەین، خۆشەویستییەکەمان چونکە بە سۆز و عەقڵ نەبوو، زۆر کورتی خایاند و جگە لە هەوا و هەوەسی هەرزەکاری، شتێک نەبوو مانای خۆشەویستی بگەیەنێ. گەرچی پەیوەندییەکەمان زۆر کورتخایەن و منااڵانە و لە سنووری دووان بۆ یەکتری تێپەڕی نەکرد، بەڵام لای خۆمەوە پاش دابڕانم لێی، زۆر سەرزەنشتی خۆمم کرد و پێم وا بوو هەڵەیەکی زۆر گەورەم کردووە لەبەر دوو هۆ:

یەکەم: من کە لە شانەیەکی یەکێتیی قوتابیان و شانەیەکی پارتییشدا ئەندام بووم، نەدەبوو کاری وام لێ بوەشێتەوە. پێم وا بوو کە کەسی حزبی و ڕێکخراوەیی، زۆر پاک و بێگەرد بێ.

دووەم: من هەر لە منداڵییەوە لە پۆلی پێنجی سەرەتاییەوە لەگەڵ کچێکی پاک و بێگەرد و بەڕەوشتی ناسیاوی خۆماندا بەڵێنی خۆشەویستیمان بە یەکتر دابوو تا ڕادەی هاوسەرگیری و بنیاتنانی ژیانی دواڕۆژمان.

هەر ئەو هەستکردن بە شەرمەزارییە وای لێ کردم کە بکەومە بیانووگرتن بە باوکم کە لە ماڵی مامم بڕۆم و ژوورێک بگرم، هەر چۆنێک بوو باوکم قایل کرد، لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆم ئەویش خەڵکی ڕانیە بوو بە ناوی «عەبدولڕەحمان هەمزە»

بوو، ئەویش لە ماڵی حاجی عەلی بەگ باوکی حەمە جەزا دەیخوێند وەک من بێزار بوو، بەیەکەوە ژوورێکمان گرت لە خانوویەکی حاجی قادری جەبار لەخوارووی سەرشەقام و ژیانێکی نویمان دەست پێ کرد.

## ژیانی زگورتێتی

دەرچوونم لە ماڵی مامم بووە هۆی پەیداکردنی ئەزموونێکی نوێ لە ژیانم، ئەزموونی خۆبەڕێوەبردن و خۆبەخێوکردن، کە دەبووایە هەموو ئەو کارانەی ماڵی مامم بۆیان دەکردم لە جلشتن و خواردن دروستکردن و سەرپەرشتیکردن، هەمووی خۆم بیکەم و متمانە بە خۆم بکەم، واتە هەم ئەرکی ماڵ و پاکوخاوێنی و خواردن دروستکردن بەڕێوە بەرم و هەم ئاگاداری خوێندنەکەم بم. ئەو مانگانەیەی کە باوکم لە ڕانیەوە بۆی دەناردم، ئەوەندە نەبوو بەشی ئەوە بکا کە سێ ژەمە لە دەرەوە خواردن بخۆم، بۆیە ناچار بووین لەگەڵ عەبدولڕەحمان خۆمان خواردن دروستکردن و قاپ شتن و و ماڵ پاککردنەوە بکەین، کە بەڕاستی ئەو زگورتێتییە ئەزموونێکی زۆر باشی پێ بەخشیم کە لە ئایندەی ژیانی پێشمەرگایەتیمدا کەڵکم لێ وەرگرت...

## شەڕەکەی سانەویی سلێمانی

ساڵی (١٩٥٩-١٩٦٠)، ساڵی خۆپیشاندان و با بژی و کێشمەکێشی نێوان ئەندام و لایەنگرانی حزبی شیوعی لە لایەک و هیی پارتی دیموکراتیش لە لایەکی ترەوە، لە هەموو شەقامەکان، لە کۆڵان و گەڕەکەکان، لە خوێندنگاکان، هەر دوو کەسی و سێ کەسی زیاتر کۆ دەبوونەوە، دەکەوتنە گفتوگۆ و چەلەحانێ و پاشان دەبووە شەڕەقسە و لێکهەڵبەزینەوە و شەڕ دروست بوون. لە دواناوەندیی «سانەویی سلێمانی» لەنێوان قوتابییەکان شەڕ لەنێوان دوو قوتابیی پارتی (کەمال سەلیم بەگ، شەوکەتی مەحموود شا محەممەد) و قوتابییەکی شیوعی (حسێن حەسەن) دژەیی دروست بوو، حسێن لە قوتابخانە دەچێتە دەرەوە ئاگاداری براکانی دەکا کە غەدری لێ کراوە، براکانی لە سەندیکای کرێکاران بوون و کرێکار و وەستا بوون لەگەڵ کۆمەڵێک کرێکار خڕ دەبنەوە و دەچنە سەر ڕێگای قوتابییەکان بە بێڵ و خاکەناز و تێڵا و خەنجەرەوە،

لەپشتی سلێمانی پالاسی ئێستا کە ئەوسا فەرمانگەی گومرگی توتنی سلێمانی بوو، خۆیان بۆ لێدانی قوتابییەکان ئامادە دەکەن. سەرەنجامی ئەو شەڕە، حەسەنی برای حسێن دڕەیی کوژرا و کەمال سەلیم و قادر شەریف کوردەش بریندار بوون، ئەو شەڕە بوو بە برینی تیراوێ لە شەڕێکی سیاسییەوە گوێزرایەوە بۆ شەڕی تایفەیی و بووە هۆی کوژرانی چەندانی تر کە چەند ساڵێکی خایاند، لەوانەی بیرم مابێ: کەمال سەلیم و شەوکەتی مەحمودی شا محەممەد و قادر شەریف کوردە لە لایەنگران و ئەندامانی پارتی کوژران و لە لاکەی تریش حسێن و سەعیدی برای کوژرا.

## ئەدەبی یا عیلمی (وێژەیی یا زانستی)

ساڵی خوێندنی ١٩٦٠-١٩٦١ لە پۆلی چواری سانەوی بووم لە بەشی ئەدەبی (وێژەیی)، ئەو ساڵەی خوێندنم بە خۆشی و ئارەزووی خۆم نەبوو، لە بەکەلۆریی پۆلی سێی ناوەندی نمرەکانم باش بوو، هەندێ لە هاوڕێکانم لەدوای پۆلی سێ چووبوون بۆ خولی فێربوونی «نائب ظابطي يان مفوضي يان موظف صحي يان دار المعلمين»، منیش ئارەزووی خوێندنی یەکێک لەوانەم هەبوو. باوکم دەویست دواناوەندی (ثانەوی) تەواو بکەم و بچمە دانشگا و کۆلێجێک بخوێنم، کاتی دەستپێکردنی خوێندن سەرەڕۆییم کرد و نەچوومەوە بۆ سلێمانی بۆ خوێندن، من خوێندکاری علمی (زانستی) بووم، چونکە لە ماتماتیک و فیزیا و کیمیا و حەیوان و نەباتدا زۆر باش بووم، بەڵام لەبەر ئەوەی نەچوومەوە بۆ خوێندن و پتر لە مانگێک لە خوێندن دوا کەوتم، نەمتوانی بچمە بەشی زانستی. ڕۆژێک لەگەڵ هاوڕێیەکمدا بەناو بازاڕی ڕانیەدا بەرەو «کوێرەکانی» دەڕۆیشتین، لە دوکانی کاک سەیید فەیزە گوێم لێ بوو سەیید فەیزە لە کاک محەممەدی وەستا قادری پرسیی: ئەوە کوڕەکەی جەلال بۆ ناخوێنێ، خۆ زیرەک بوو؟ کاک محەممەد وتی منداڵ کە لاسار و بێگوێ بوو، باوک چی بکا! هەرکە گوێم لەو گفتوگۆیە بوو، وازم لە پیاسەکە هێنا و گەڕامەوە بۆ دوکانی باوکم، کات چێشتەنگاو بوو، بە باوکم وت کە دەڕۆمەوە بۆ سلێمانی و لە سانەوی دەخوێنم، باوکم زۆری پێ خۆش بوو. کاتێ گەڕامەوە سلێمانی، چووم بۆ بەڕێوەبەرایەتیی ثانەویی سلێمانی، وتم دەمەوێ بخوێنم لە پۆلی چواری زانستی

(علمی)، بەڕێوەبەر پێی وتم کە ناتوانم لە عیلمی بخوێنم، چونکە ئەوان مانگێک زیاترە دەخوێنن و دەرسەکانیش هەمووی عیلمییە و ناتوانی فریایان بکەوی. بەناچاری لە بەشی ئەدەبی (ویژەیی) دەستم بە خوێندن کرد.

## کرێکاری

هاوینی دوای خوێندنی سالی (١٩٦٠-١٩٥٩)، گەڕامەوە ڕانیە بۆ بەسەربردنی سێ مانگی پشووی هاوین، خالم (حەمەی مەجید هاوار) وەستای دروستکردنی خانوو، بە بیروباوەڕیش شیوعی بوو، لەگەڵ ئەوەی لە ڕووی بیروبۆچوونەوە زۆر لەگەڵ یەک ناکۆک بووین، بەلام هەرگیز وەک خاڵ و خوارزا هەڵسوکەوتمان لەگەڵ یەکتری نەدەکرد، بەڵکە دوو برای زۆر گونجاو بووین. هەر لە هەفتەی یەکەمی دەستپێکردنی پشووەوە پێی وتم کە برۆم بۆ کرێکاری لەگەڵیدا، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی دێرینم وەک خوالێخۆشبوو: عەلی مەعروف، وەهاب حەمە سەعید چاوەش و...، منیش قایل بووم و زۆریش پێم خۆش بوو، بەلام بەو مەرجەی باوکم نەیزانێ تا قایلی دەکەین. بارودۆخی گوزەرانمان باش بوو، باوکم پێی خۆش نەبوو کوڕەکانی کرێکاری و میوە فرۆشیی بەردەم دوکانەکەی بکەن، بەلایەوە خەوش (عەیب) بوو. ماوەی سێ چوار ڕۆژ چووم بۆ کرێکاری تا باوکم پێی زانی، زۆر لە من و خالم تووڕە بوو، بەلام خالم هەولی لەگەڵ دا کە دەیەوێ من فێری بڕوابەخۆبوون و پشتبەخۆبەستن بکات و فێری گوزەران لەگەڵ سەختیی بارودۆخی ژیان بکات. باوکم بەزۆرەملێ قایل بوو، ئیتر ئەو هاوینە هەمووی لەگەڵ خالم بە کرێکاری بردە سەر و ڕۆژی بە شەش پەنجایی، خالم خۆی بە ژیانێکی زۆر سەختدا ڕێی کردبوو، هەر لە تەمەنی (٧) سالییەوە باوکی و دایکی مردبوون، تەنیا یەک خوشکی شک بردووە کە دایکم بووە، هەر لە (٧) سالییەوە لەگەڵ دایکم و باوکم ژیاوە و حەوت سالیش لە من گەورەتر بووە، بۆیە لە ڕانیە کەس نەیزانیوە خالمە و ناوی «حەمە مستەفا محەممەد»ە، هەر وایان زانیوە برای باوکمە و ئەمیش بە «حەمەی مەجید هاوار» ناسراوە. خالم هەر لە تەمەنی (١٥) سالییەوە کەوتووەتە بەر گورزی بێبەزەییانەی باوکم و ژیان، لەبری ئەوەی بنێرێتە قوتابخانە و بخوێنێ، نێردراوەتە بەر کاسپی، هەر بۆیەش بەتەواوی لەناو بۆتەی سەختی و

خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیاندا قاڵ بووبوو.

چەندین جار لێم بیستووە کە دەیگوت کرێکاری و کاسپیکردن:

١. هیچ نەنگی نییە، بەڵکوو سەربەرزییە کە بە ڕەنجی شانی خۆت؛ خۆت دەژیەنی.

٢. کرێکاری مرۆڤ فێری بەرگەگرتنی ناخۆشی و نەبوونی و سەختیی ژیان دەکا.

٣. کرێکاری وا لە مرۆڤ دەکا کە هەستی مرۆڤایەتیی بەهێز بکا.

بەڕاستییش خاڵم بێ هیچ پشتیوانییەکی باوکم یا کەسانی تر توانیی هەر لە منداڵییەوە پشت بە هێزی باز و توانای خۆی ببەستێ و خۆی و پاشان ژیانی خێزانییشی بەخۆشییەوە دابین بکات.

## بەشەناوخۆیی (قسم الداخلي)

لەدوای تەواوکردنی پۆلی سێی ناوەندی، ئیتر باوکم پێمدا ڕادەپەڕمی کە بتوانم لە بەشەناوخۆییدا بژیم و بەردەوام بم لەسەر خوێندن. هەر لە سەرەتای ساڵی خوێندنەوە منیش داخوازی نامەیەکم دا بە (دائرەی معاريف) بەڕێوەبەرایەتیی زانستی، لەبەر ئەوەی ماڵمان لە ڕانیە بوو و ماڵم نەبوو لە سلێمانی، وەک خاڵێکی سەرەکی بۆ ئەو قوتابیانەی خەڵکی دەرەوەی شاری سلێمانی بوون، شانسێکی باشم هەبوو بۆ وەرگرتن لە بەشەناوخۆیی. بەشەناوخۆیی ئەو کاتە هێشتا «ئاپارتمانێکی» گشتی نەبوو بۆ خوێندکارانی هەموو پۆلەکانی بەشەناوخۆیی، هەر چەند قوتابییەکی دوو سێ پۆل لە خانوویەکیان لەنزیک سانەویی سلێمانییەوە بۆ بەکرێ گرتبوون. من و چەند هاوڕێیەکم لە خانوویەکی بەشەناوخۆییدا بووین، لەپشتی «وەیس». «وەیس» قەبرستانێکی بچکۆلە بوو، نزرگەی گوایە پیاوچاکێکی تیا بوو بە ناوی وەیس، کەوتبووە بەرامبەر خانووەکەی ماڵی قادر ئاغا، شوێنی ئێستای لقی پارتی، جێگای باڵەخانەکەی ماکسی مۆڵ. وەیس ئەوسا شوێن سەیرانگای خەڵکی شار بوو، کە چەندین بەندوباڵورەی پیا هەڵدرابوو، وەک:

**با بچینە سەر وەیس، وەیسی خۆمانە**

**لە وەیس بپرسین خەتای کاممانە**

**گەر خەتای من بوو، بمکا شێت و وێت**

**گەر خەتای تۆش بوو، خێر نەیەتە ڕێت**

**با بچینە سەر وەیس بۆ تۆبەکاری**

**تۆبە لە کشتی، غەیرەز دڵداری**

بەشەناوخۆیی چونکە خانووی خەڵکی بوو و بەکرێ گیرابوو، ژوورەکانی وەک یەک نەبوون، ژوور هەبوو پێنج قەرەوێڵەی تیا بوو، هەبوو کەمتر و ٣ و ٢ قەرەوێڵە جێی دەبۆوە، ژوورەکەی ئێمە سێ قەرەوێڵە بوو. من لەگەڵ وریا عەبدوڵڵا کە کوڕی پووری جەمالی مامم بوو، ماڵی باوکی لە پێنجوێن بوون، جەبار جاف ئەویش ماڵی باوکی لە سووورداش بوو، شەوێک من و وریا لە سینەما دەگەڕاینەوە، شەوی هەینی بوو، بەسەر شەقامی مەولەویدا لە پشتمانەوە تەقەی پێڵاوی ژنانە دەهات، ئاوڕمان دایەوە ژنێک بە عەباوە لە دواوەمانەوە زۆر بەخێرایی بەرەو لای ئێمە دێ، لە دواشیەوە دوو گەنج دەڕۆشتن، عەبابەسەرەکە کە گەیشتە لامان و سڵاوی کرد و بەشڵەژاوییەوە وتی: ئێوە قوتابیی مەکتەبی خالیدیە نین؟ ئەو مەبەستی بەشەناوخۆیی بوو، ئێمە وەڵامان دایەوە بەڵێ، ئەویش شانبەشانی ئێمە دەڕۆیشت و هەر لەگەڵمان دەدوا و وتی ماڵی ئێمە دراوسێتانە، بەدەم گفتوگۆوە ورده ورده لە بەشەناوخۆیی نزیک بووینەوە، وریا دەستێکی خستە سەر شانی عەبابەسەرەکە، ژنە زۆر تووڕە بوو و وتی: من ئێوەم بە پیاو زانی و لەگەڵ ئێوە ڕێم کرد، ئەو دوو گەنجە لە دوامەوە بوون هەر توانجیان تێ دەگرتم، ترسام لەوەی هەڵەیەکم بەرامبەر بکەن، بۆ پاراستنی خۆم هاتمە لای ئێوە، دەستت لا بە ئەوە ماڵەکەمانە، سوپاستان دەکەم، خواتان لەگەڵ. وریا لاڵ بوو نەیزانی چی وەڵامی ئەو ژنە بداتەوە، دەمی تێکەڵوپێکەڵ بوو، هەر ئەوەندەی وت: «هەر وا... هەر وا».

## حەمە سەعیدی عەلی عوسمان

کێشەی نێوان پارتی و شیوعی، ڕەنگدانەوەیەکی توند و خراپی لەناو ڕێکخراوی قوتابیاندا هەبوو بە جۆرێک «اتحاد الطبه» کە سەر بە شیوعییەکان بوو، بە

خوێنی سەری «یەکێتیی قوتابیانی کوردستان» کە سەر بە پارتی بوو؛ تێنوو بوون. یەکێتیی قوتابیانی کوردستان، پارتی چەند درووشمێکی فێر کردبوون کە لە خۆپشاندانەکاندا بیڵێینەوە، وەک: کردنەوەی مەعاریفی کوردستان، خوێندن بە زمانی کوردی، دانی دەسەڵاتی لامەرکەزی بە کورد، داهێنانی وشەی شەوباش و ڕۆژباش. لە بەشەناوخۆییەکەدا قوتابیی هەردوو ڕێکخراوەکەی تیا بوو، ئێوارەیەکی درەنگ گەڕامەوە بەشی ناوخۆیی، حەمە سەعید عەلی عوسمان؛ زڕبرای عەبدولمەلیک و نصرالدین لە حەوشەکە بوو بەهاتوچۆوە دەرسی دەخوێند، منیش شەوباشم لێ کرد و ڕۆیشتم، لەپڕ لەدواوە شتێک دوو جار کێشرا بە سەرما، ئاوڕم دایەوە حەمە سەعید بوو کە پێمان دەوت سەعە کوێر لەبەر ئەوەی کێشەی بینینی هەبوو، بۆکسێکی ئاسنی بە دەستەوە بوو، منیش هەمان کاردانەوەم هەبوو بەرامبەری، بەو شەوە پۆلیس هات و هەردووکمانیان برد بۆ نەخۆشخانە، دوای تیمارکردن لەبەر ئەوەی من بێخەتا بووم، منیان ناردەوە بۆ بەشەناوخۆیی، ئەویشیان نارد بۆ «تەوقیفخانە». باوکی حەمە سەعید؛ ئەفسەری پۆلیس بوو لە ناحیەی بنگرد، حەمە سەعید براکانی وەڵامیان بۆ باوکی ناردبوو کە بچێتە ڕانیە بۆ لای باوکم و یەک دوو کەس بەرێتە لای بۆ داوای لێخۆشبوون، باوکم هێشتا ئەو هەواڵەی نەزانیبوو، بە چوونی عەلی عوسمان بۆ لای؛ هەواڵەکە وەک برووسکە وا بوو لەلای، باوکم هاتە سلێمانی و پێی وتم کە لە حەمە سەعید خۆش ببم، چونکە قوتابییە با خوێندنەکەی لەکیس نەچێ، منیش لێی خۆش بووم، لەو ڕۆژەوە حەمە سەعید بوو بە برای بڕبڕەپشتەم.

ساڵی (١٩٦٠) سەرەتای هەڵکردنی گێژەڵووکەی سیاسیی دەدا بە گوێی دانیشتووانی باشووری کوردستاندا، لە لایەکەوە عەبدولکەریم قاسم کەوتبووە پاشەکشە لەو بەڵێنانەی کە لە (١٤ی تەممووزی ١٩٥٨)دا بە گەلانی عێراقی دابوو، بەتایبەت پاشگەزبوونەوەی لە مادەی (٣)ی دەستووری کاتیی عێراقی کە بریتی بوو لە «أن العرب و الأكراد شركاء في هذا الوطن»، واتە کورد و عەرەب هاوبەشن لەم وڵاتەدا، لە لایەکی ترەوە بارودۆخی پارتی دیموکرات، چ لەناو کوردستان و چ لەبەرامبەر حوکمی قاسم بەرەو وەرچەرخان دەچوو. سەبارەت بەو گۆڕانکارییانەی کە مەلا مستەفا لەناو سەرکردایەتیی پارتیدا کردی، لەناو ڕیزەکانی خوارەوە ڕەنگی دایەوە، من یەکێک

بووم لەو ئەندامانەی پارتی کە لە هەموو گۆڕانکاریانەییەکانی ناو سەرکردایەتی و کۆنگرەی پێنجی پارتی ئاگادار کرابوومەوە لەلایەن سەرەک شانەکەمانەوە کە شەهید مەلا فاتیح عەسکەری بوو کە ئەندامی لیژنەی ناوچەی ڕانیە بوو. سەبارەت بە بارودۆخی ئەوسای باشووری کوردستان و عێراق و هەلومەرجەکانی سەرهەڵدانی سەرەتای گرژیی نێوان عەبدولکەریم قاسم و نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان، بەتێروتەسەلی لە کتێبی «شۆڕشی ئەیلوول، بنیاتنان و هەڵتەکاندن»دا باسم کردووە کە لێرە پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات.

## چاودێریی مەلاریا

هاوینی ساڵی (١٩٦١)، دەرچووی پۆلی چواری بەشی وێژەیی بووم، لە ڕانیە لە تیپەکانی مەلاریا کرام بە چاودێریی تیپی دێهاتەکانی خۆشناوەتی تا ئەو سنوورەی کە لەسەر بەڕێوەبەرایەتیی قەزای ڕانیە بوو، زۆربەی کرێکارەکانی تیپەکە لە ڕێکخراوی قوتابیانی کوردستان بوون، بە هۆی شێخ جەعفەری شێخ محەممەد گوڵانییەوە کە فەرماندەی فرقەی مەلاریای ڕانیە بوو، ئەندامی پارتی بوو. لەلایەن لێپرسراوی حزبیمەوە کە شەهید مەلا فاتیح عەسکەریی وێنەگر بوو، پێم سپێردرابوو کە لەگەڵ کارەکەمدا دەبێ ڕاپۆرتێک لەسەر بارودۆخی دەڤەرەکە بنووسم کە ئاستی دەرامەتی دانیشتووان و باری گوزەران و ژمارەی ئەو کەسانەی کە چەکیان هەیە و جۆری چەکەکانیان و بیروباوەڕی سیاسییان و ڕادەی پابەندبوونیان بە میرەکانی خۆشناوەتی تیا ڕەنگ بداتەوە. پاش دوو مانگ ئاوڕشێنکردنی ماڵەکانی دێهاتەکان، هەر لە چوارقوڕنە و پوکە و زنگزنگە تا بالیسان گەڕامەوە ڕانیە، جگە لە ڕاپۆرتی هەفتانە کە بۆ ناوچەم دەنارد، ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلم لەو ڕووانەی کە داوایان کردبوو؛ دامێ.

لیژنەی ناوچەی ئەوکاتی ڕانیە پێک هاتبوون لەم زاتانە:

تۆفیق مەلا سدیق: لێپرسراوی لیژنەی ناوچە

مەلا فاتیح عەسکەری: وێنەگر

مامۆستا شەفیق تاهیر: مامۆستا

حسێن حاجی تاهیر: کاسبکار

سدیق خەیات: بەرگدروو
حسێن عەلی ڕەزا: فەرمانبەر

## ساڵی ١٩٦١، سەرەتای کارەساتەکانە

پشووی هاوین بەسەر چوو، خوێندنی ساڵی (١٩٦١-١٩٦٢) دەستی پێ کرد و منیش بەرەو سلێمانی لە بارودۆخێکی زۆر ناخۆشدا گەڕامەوە. ڕژێمی قاسم لە هەموو بەڵێنەکانی پاشگەز بووبۆوە، کەوتە دژایەتیکردنی حزبە دیموکرات و نیشتمانی و نەتەوەییەکانی عەرەبی و کوردی وەک حزبی دیموکراتی و وطنی و حزبی وطنی دیموکراتی و حزبی بعث و پارتی دیموکراتی کوردستان و تەنانەت حزبی شیوعیی عێراقییش کە گەورەترین پشتیوانیی قاسم بوون، قاسم کەوتە بڕوبیانووگرتن بە پارتی و سەرکردایەتەکەی و بارزانییەکانیش تا گەیشتە دەرکردنی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان و دەرکردنی بڕیاری گرتنی سرکرتێرەکەی (ئیبراهیم ئەحمەد). دیسان نامەوێ لێرەدا بکەومەوە باسی بارودۆخی ئەو کاتە، چونکە لە کتێبی «شۆڕشی ئەیلوول» زۆر بەڕوونی باسم کردووە. من هێشتا لە ڕانیە بووم، لە ڕۆژی (٦ی ئەیلوولی ١٩٦١) بە بۆنەی یادی ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلوولی (١٩٣٤)، پارتی بڕیاری مانگرتنی سەرتاسەری لە باشووری کوردستاندا ڕاگەیاند وەک ئۆلتیماتۆمێک بۆ عەبدولکەریم قاسم، ئەو مانگرتنە ٣ ڕۆژی خایاند، بەڵام لە ڕۆژانی (٦، ٧)ی ئەیلوول زۆر سەرکەوتووانە لە شارەکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکووک و هەموو قەزا و ناحیەکانیش بەڕێوە چوو. لیژنەی ناوچەی ڕانیە کەوتە کۆکردنەوە و بەسەرکردنەوەی ئەو چەکانەی لە دەڤەرەکانی (باڵەکایەتی و ئاکۆیەتی و خۆشناوەتی و بیتوێن)، لە ڕێگەی پەیوەندیکردن بە سەرەکعەشرەتەکانی: (ئاکۆ، بلباس، مەنگوڕ، خۆشناو، پشدەر، پشدەرەرەقە، جاف، جافە ڕەشکە و تیرە و بەرەبابەکانیانەوە).

من گەڕامەوە سلێمانی، خوێندنی پۆلی پێنجی وێژەیی دەستی پێ کرد، بۆ من ساتێکی زۆر ناخۆش بوو، سەرەتای دەستپێکردنی جموجووڵی چەکداری لە ناوچەکەی ئێمەوە سەری هەڵدا، لە لایەکەوە کەفوکوڵی سیاسی و نیشتمانپەروەری

بە بیروهۆشی هەرزەکارانەوە و لە لایەکی ترەوە بیرم لەلای ئایندەی ماڵە باوک و کەسوکار بوو، هەر ڕۆژەی هەواڵێکی نوێم دەبیست، دەمێک دەیانگوت ڕانیە دەستی بە خەباتی چەکداری کرد، عەشرەتەکانی ئاکۆ و بڵباس و مەنگوڕ ڕێگای ڕانیە و کۆیەیان گرت و دۆڵی خەلەکانیان گرت و هاتوچۆی نێوان سلێمانی و ڕانیە و قەڵادزەیان گرت، دەمێک هەواڵ بڵاو دەبۆوە ڕژێم هێرشی بۆ کۆیە و بەرەو ڕانیە برد و لە سلێمانییشەوە بەرەو دوکان و خەلەکان بەرەو ڕانیە هێرشی کرد، دەمێک دەمانبیست دەربەندی بازیان و دەربەندیخان چەکداری کورد گرتوویەتی، دەمێک هەواڵ دەهات لە دەڤەری هەڵەبجە و پێنجوێن و پاشان دەڤەری بادینانیش بزووتنەوەی چەکداری دەستی پێ کرد، من و هاوڕێکانیشم لە قوتابخانە گیرۆدەی مشتومڕ و چەلەحانی بووبووین لەگەڵ «أتحاد طلبة العيراق» کە سەر بە شیوعیەکان بوون، ئەوان دەیانگوت ئەو بزووتنەوە چەکدارییە سەر بە ئەمەریکا و ئیمپریالیزمی جیهانییە و دژی شۆڕشی (١٤ی تەممووزە)، دژی یاسای چارەسەری کێشەی کشتوکاڵییە، ئێمەش دەمانوت ئەوە شۆڕشی گەلی کوردە دژی چەوساندنەوە و داگیرکاری بۆ بەدەستهێنانی مافەکانمانە، هەر ڕۆژەی بە جۆرێک هەواڵمان دەبیست، دەمێک دەیانگوت حکومەت لە فڵان شوێن شکا، دەمێک دەیانگوت کورد لە فڵانە قوڵەوە سەر کەوت، هەر چۆنێک بوو خوێندنی ئەو ساڵەمان بەسەر برد، بۆ تاقیکردنەوەی «بەکەلۆری» واتە وزاری نەچوومەوە ڕانیە لە پشووەکەدا، نەبادا ڕێم لێ بگیرێ و نەتوانم تاقیکردنەوەکە ئەنجام بدەم.

تاقیکردنەوەکەش تەواو بوو، هەر قوتابییە و باسی لە ئایندەی خۆی دەکرد، بۆ کام دانشگا و کام کۆلێج دەچێ، منیش لە خەمی ئەوەدا بووم چۆن بڕۆمەوە بۆ ڕانیە، ڕێگای سلێمانی-ڕانیە نەبوو، ڕێگای هاتوچۆ گیرابوو، ناچار بووم بە ڕێگای کەرکووک، پردێ، تەق تەق بچم بۆ کۆیسنجەق. ئێوارە بوو گەیشتمە کۆیە لە ماڵی هاوڕێیەکی قوتابخانەی سەرەتاییم کە ماڵیان چووبوو بۆ کۆیە، ئەو شەوەم بەسەر برد. وتیان سبەی ئێوارە دوای بانگ کاروان بەڕێ دەکەوێ بۆ گوندی «سەرکەپکان» لە پشتی ڕانیە، لەگەڵ هاوڕێیەکی ترم ناوی «محەممەد صۆفی» بوو، ئەویش خوێندکاری کشتوکاڵی بەکرەجۆ بوو، دەیویست وەکوو من لە کۆیەوە بڕواتەوە بۆ ڕانیە، یەکمان گرت، ئێوارە دوای بانگ؛ کاروان کەوتە ڕێ، کاروانەکە جۆراوجۆر کەلوپەلیان بار

کردبوو، ئارد، شەکر، چا، قوماش، تاید و سابوون، کەلوپەلی تریش. کاروانچییەکان هەریەکەیان وڵاخێکیان بۆ سواری خۆیان تەرخان کردبوو کە زۆر سووکبار بوون، جار جارە هەڵیاندەکردە غار و ئێمەش بەپیادە دەبووایە بەڕاکردن دوایان بکەوتینایە تا ونیان نەکەین، چونکە ئێمە نەشارەزا و قاچاغەڕێگەمان نەدەزانی.

من و محەممەد هەردووکمان جگەرەکێش بووین، یەکی دوو پاکەت جگەرەمان پێ بوو، هەر جارێک کاروان لە شوێنێک لای بدایە بۆ پشوویەک، دەبووایە ئێمە هەر کاروانچییەک سکریتێکمان بدانایەتێ. «سکریت» بە زاراوەی ئەوان، واتە جگەرەی پاکەت. لە دێیەک وڵاغ و وڵاغدار لە چەمێکی ئاوی بچووکیان دا کە ژێری چەمەکە قوڕولیتە بوو، ئێمەش بۆ ئەوەی لەوان دانەبڕێین، ناچار بووین بە پێڵاوەوە لە چەمەکەماندا و پێڵاوەکانمان لەناو لیتەکە نقوم بوو، بەپێخاوسی ماینەوە. کات هەوەڵی هاوین بوو، دەشتودەر هەمووی پووش و دڕک و پەیکول بوو، ئەو بێویژدانانە بە سواری وڵاخەکانیانەوە هەڵیاندەتیزاند و غاریان دەکرد و بە ئێمەشیان دەوت «هەڵێن»، واتە ڕاکەن تا ڕووناکی دانەهاتووە، لە مەترسی ڕەبایە و سەبازگە دەرچین، ئێمەش بە پێی پەتی ڕاماندەکرد بەناو ئەو هەموو پووش و دڕک و پەیکولانەدا، پشتی پێ و بنی پێمان خوێنی لێ دەچۆڕا. لە شوێنێک کاروانیان ڕاگرت و پێیان وتین لە شوێنی مەترسی دەرچووین وا گەیشتنە پەنای سەرکەپکان، وتیان ئێمە لێرە پشوو دەدەین سەعاتێک، ئێوەش کەیفی خۆتانە دەڕۆن یان پشوو دەدەن. من و محەممەد ئەوەندەیان ئازار دابووین، ڕێک کەوتین کە زیانێکیان پێ بگەیەنین ئەوسا بڕۆین، بە نووکی چەقۆیەک کونمان کردە چەند فەردە شەکر و چایەک ڕۆیشتین، بەو سەعاتەی ئەوان لە پشوودا بوون، ئێمە گەیشتینە دۆپی بەستە، هێزەی پێش ڕانیە و ڕووناکیمان بەسەردا هات، ناچار لەو بەستە تا ئێوارە تاریک داهات، بێ ئاو و بێ خواردن خۆمان مات دا. کە تاریک داهات، هەر بەپشتی ڕانیەدا خۆمان گەیاندە گەڕەکی گلینجان، ماڵی محەممەد زۆر نزیک و پەناش بوو، چووین بۆ ئەوێ، مام مەعرووفە سوور دراوسێیان بوو، بەو شەوە منی لەگەڵ خۆیدا بردەوە ماڵی خۆمان. دوای دوو سێ ڕۆژ یەک لە کاروانچییەکان شەکر و چای بۆ دوکانی باوکم هێنابوو، لای باوکم باسی کردبوو دوو بێژیمان (زۆل) لەگەڵ بوو لە کۆیەوە پێرێ شەوێ چەقۆیان لە فەردە

شەکران دابوو، گەیشتینەوە گوندی؛ نیوەشی تێدا نەمابوو.

## لیژنەی ناوچەی ڕانیە و یەدەگ

هاوینی ساڵی (١٩٦٢) بۆ من زۆر بەناخۆشی بەسەر چوو، لە لایەک نەمدەزانی بڕۆم بۆ بەغداد و درێژە بە خوێندن بدەم لە زانکۆ، یان بمێنمەوە و بەردەوام بم لە چالاکیی سیاسی نواندن و چاودێریکردنی بارودۆخەکە. لیژنەی ناوچەی ڕانیە لە ڕانیەدا نەمابوون، بارەگایان لە گوندی سەروچاوە دانابوو، ڕۆژێک تەتەر هات بۆ لام و نامەیەکی دامێ، کە کردمەوە نامەی لیژنەی ناوچە بوو، بانگیان کردبووم بچمە سەروچاوە، هەر ئەو ڕۆژە ئێوارە درەنگ لە ڕێگەی سەرکەپکانەوە چووم بۆ ئەوێ، نزیکی نیوەشەو گەیشتم، بۆ بەیانی زانیم هەر من نیم، چوار کەسی تریشیان بانگ کردبوو بێ ئەوەی ئاگاداری یەکتری بین. یەکێکیان کاک محەممەد سۆفیی هاوڕێم بوو کە لە شەوە شوومەکەدا پێکەوە بووین، دووهەم کاک خورشید دوکاندار بوو، سێهەم خاڵە حەمەی مەجید هاوار بوو، چوارەم عەریف ڕەفیق بوو، عەریفی سەرای ڕانیە بوو، کۆیان کردینەوە، کاک مەجید گورگ کە ئەو کاتە لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی ڕانیە بوو، پێی وتین ئێوە هەر چوارتان لیژنەی یەدەگی (احتیاطي) لیژنەی ناوچەی ڕانیەن و سەرپەرشتیی هەموو ڕێکخستنەکانی شاری ڕانیە دەکەن، پەیوەندیی ڕاستەوخۆتان بە لیژنەی ناوچەی ڕانیەوە دەبێ، تا دەتوانن بەنهێنی کار بکەن، کاکە حەمەش ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان ئێمە و ئێوە دەبێ، ئێوەش لەناو خۆتان بەرپرسێکی خۆتان دیاری بکەن بە ڕەچاوکردنی گونجاویی تواناتان. کاک خورشید ئەرکی بەڕێوەبردنی هێڵی کاسبکارانی گرتە ئەستۆ، کاکە حەمە ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان لیژنەی یەدەگ و لیژنەی ناوچە بوو، عەریف ڕەفیق لەگەڵ کەریم کابان و مەلا عەبدوڵڵا ئەرکی ڕێکخستنی پۆلیسەکان و فەرمانگەکانی ناو سەرایان گرتە ئەستۆ، لەسەر داوای ئەوان و پەسەندکردنی لیژنەی ناوچەش؛ بەندە کرام بە لێپرسراوی لیژنەی یەدەگ، کاک محەممەد سۆفی هەر لە سەرەتای کارەوە خۆی کێشایەوە و گەڕایەوە سلێمانی و نەگەڕایەوە ڕانیە تا خانەنشینبوونی لە (٢٠٠٧)، هەر لە خوارووی عێراق فەرمانبەر بوو. پشووی هاوین خەریک بوو نزیک دەبۆوە لە تەواوبوون، منیش

بیرم لە وەرگرتنی ڕەزامەندیی ناوچە دەکردەوە کە ڕێگەم بدەن بڕۆم بۆ بەغداد بۆ خوێندن. ئەوسا دانیشگا هەر لە بەغداد و موسڵ و بەسرەدا هەبوو، بەڵام ڕووداوەکان بە جۆرێک هاتنە پێش کە نەک هەر نەمتوانی لە خوێندن بەردەوام بم، بەڵکە بۆ هەموو ژیانم بێبەشیان کردم لە خوێندنی دانشگا.

## گەنجینەکانی توووتنی ڕانیە و گرتنی قەزای ڕانیە

ڕۆژێک نامەیەکمان لە ناوچەوە بۆ هات، دەڵێ «م. س» پارتی داوای کردووە کە هەوڵی گرتنی سەرای ڕانیە و قائیمقامیەت بدەن لەگەڵ بردنی لانی کەم چوار هەزار فەردە توووتنی پەزمەنەکراو لە گەنجینەکاندا. ئێمە ئاگادارمان کردنەوە کە هێشتا پشکنینی توووتنەکان تەواو نەبوون و بەشێکی زۆریان لەسەر زەوین و ئامادەی پشکنینن، هێشتا لە «ذمة»ی جووتیاران و خاوەن توووتنەکانن و نەچوونەتە «ذمة»ی میرییەوە، چەند ڕۆژێکی کەمی ماوە هەمووی تەواو دەبن، ئەوسا بەو کارە هەڵدەستین. پشکنینی توووتن تەواو بوو، هەمووی لەلایەن فەرمانگەی توووتنەوە (مدیر انحصارە) و بە لیستەوە وەرگیران و چەکی پارەکەیان دران بە خاوەن توووتنەکان و لە عەمبارەکاندا پەزمەنە کران، ئەوسا پاش فەراهەمکردنی هەموو ئامادەکارییەکان؛ بڕیارمان دا کە سەرای ڕانیە بگیرێ و پاشان عەمباری توووتنەکانیش ئەوەندەی بکرێ توووتنی لێ دەربهێنرێ و بنێردرێ بۆ قەڵادزە بۆ فرۆشتن بە ئێران و پارەکەشی بدرێ بە بەشی دارایی سەرکردایەتیی حزب و شۆڕش. لە ڕانیەدا جگە لە چەند پۆلیسێکی هێزی ئامادە (قوە السیار) کە عەرەب بوون و قائیمقامیش هەر عەرەب بوو، چەکدارەکانی تر هەموویان کورد بوون و زۆربەیان لە ڕێکخستندا بوون و عەریف ڕەفیق لێپرسراویان بوو.

لیژنەی یەدەگ کۆ بووینەوە، ئەم بڕیارانەمان دا:

١. لە شەودا لەنێوان کاتی (٨-٩)ی شەو، ئەو کاتەی کە عەریف ڕەفیق خۆی سەر ئێشکچی دەبێ و ئێشکچییەکان لە خۆیاندا دەنێ، ئاگاداریی بەندە دەکەن کە لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی ناوچە بچینە سەر سەراو بە هاوکاریی عەریف ڕەفیق جبەخانەکەی ناو سەرا و هەموو چەکەکان بدەن بەدەستەوە.

٢. هەر لەو کاتەدا دەستەیەک بچینە سەر قائیمقام و بیگرن و بیبەن بۆ سەنگەسەر.

٣. کەریم کابان و مەلا عەبدوڵلا بەردەوام بن لەسەر کاری بێتەلیی خۆیان و لە پەیوەندیدا بن لەگەڵ دامودەزگاکانی سەربازی و مەدەنیی حکومەتدا، تا شک نەکرێ لە گرتنی سەرادا، لانی کەم دوو سێ ڕۆژ.

٤. لە دوو سێ ڕۆژدا خەڵکی گومانلێکراو بتوانن ڕانیە چۆڵ بکەن و بگەنە دیوی سەنگەسەر یا قەڵادزە.

٥. ئەوەندەی دەکرێ توتنی ناو عەمارەکان دەربهێنرێ و بنێردرێتە قەڵادزە، بەپێی ئەو نەخشەیەی دامانابوو، هەم ئەوەندەی کرا توتنمان ڕەوانە کرد و هەم سەرا و قائیمقام و هەموو فەرمانگەکانی قەزاکە گیران بە بەشیماڵیشەوە، بەڵام ڕژێم بە هۆی سیخوڕەکانیەوە لە ڕۆژی دووەم هێرشی بۆ سەر ڕانیە لە کۆیەوە دەست پێ کرد، تا سوپا لە ڕانیە نزیک بۆوە، هەم پتر لە چوار هەزار فەردە توتن ڕەوانە کرا، هەم پاشماوەکەشی لە عەمبارەکاندا سووتێنرا و ڕانیەش لەو شەو و ڕۆژەدا چۆڵ کرا. ئێمەش واتە لیژنەی ناوچەی پەدەگیش، چووین بۆ پشتی دەربەندی ڕانیە و پاشان چووینە سەنگەسەر.

## بەشی سێیەم
## خوێندکاری کۆلێجی لیژنەی ناوچەی ڕانیە

دوای گرتنی قەزای ڕانیە و سووتانی عەمبارەکانی تووتنی ڕانیە، ئیتر بیرۆکەی خوێندنی کۆلیجی یاسام لەبیر خۆم بردەوە و بە بڕیاری «م. س» پارتی و ڕەزامەندیی لیژنەی ناوچەی ڕانیەش لە سەرەتای مانگی (١٩٦٢/١٠) بووم بە ئەندامی لیژنەی ناوچەی ڕانیە و پێشمەرگەیەکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و هەڵگری درووشمی «کوردستان یان نەمان» و کادری لێبڕاو بۆ کاری ڕێکخستن، لێرەوە ڕێڕەوی ژیانی من لە قوتابییەکی هەڵەشە و پەلەپەلکەری لاوەوە گۆڕا بۆ کادرێکی هێمن و ئامۆژگاریکەری ناو جەماوەر، بەتایبەت جەماوەری جووتیاران. لێرەوە ژیانی شاخ و شۆڕش و خەباتی سیاسی و چەکداریم دەستی پێ کرد، بەسترامەوە بە ڕەوتی سیاسەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و لێبڕاوانە قۆڵم لێ هەڵماڵی و لە ناز و نیعمەتی خوێندکاری و ماڵە باوک و هاوڕێکانی قوتابخانەم دوور کەوتمەوە، دوور لە هەواڵی دایک و باوک و خوشک و برا و خۆشەویستەکەم. لێرەوە فریشتەی خۆشەویستی و دڵداری و عەشقی پیرۆزم بانگی لێکدابڕان و بەئاکامنەگەیشتین و سووتانی هیوا و ئاواتم؛ ڕووخانی کۆشکی بەختیاریمی بە گوێدا دام، هەر لێرەشەوە هەستم بە دەرکەوتنی ڕاستییەکان و لاچوونی پەردەی ڕەشی هەڵبەستراوی سەرکردایەتیی پارتی بۆ سەرۆکی حزبیم بۆ دەرکەوت. لە کتێبی «شۆڕشی ئەیلوول، بنیاتنان و هەڵتەکاندن»دا بەدرێژی بەناو کون و قوژبن و بەرزایی و نشێویی شۆڕشدا گوزەرم کردووە کە پێویست ناکات لێرە دووبارەی بکەمەوە.

## ئاوارەبوونی ماڵی باوکم لە ڕانیەوە بۆ دۆڵی شەهیدانە و پاشان بۆ مەرگە

ڕۆژی گرتنی سەرای ڕانیە و قائیمقامەت، ماڵی باوکیشم بە هۆی منەوە لە ڕانیە بەسەڵتەزەلامی هەندێ پێخەف و ئارد و شەکر و چا لە ڕانیەوە ڕەو دەکەن بەرەو دۆڵی شەهیدان و گوندی دەروەکۆتر. پاش دوو سێ مانگ، ماڵ بار دەکەن بەرەو گوندی شارستێن و مەرگە. هەتا منیش گوێزرامەوە بۆ ڕێکخراوی سرۆچک، هەر لە مەرگە دەبن و پاشان لە کاتی وتووێژی بارزانی و عەبدولسەلام عارفدا دیسان بنەوبارگە دەگوێزنەوە بۆ سەنگەسەر و لەوێ باوکم دوکانی بەکر چوار قاڵب سابوون دادەنێ و بە هاوینان بە «سێیەک» دەکەونە تووتنەوانیکردن. بەو حاڵەشەوە بارزانی کە دەزانێ ماڵی باوکم و کەسوکارمن، فەرمانی شاهانەی لەسەریان دەردەکات کە نابێ بە هیچ جۆرێک لە هیچ شوێنێک تا دەگاتە پشتی دوکان؛ نیشتەجێ بن، دەست بەسەر هەموو تووتنی بەروبوومی ئەو ساڵەشیان و دوکانەکەشیاندا دەگرێ و لە سەنگەسەر دەریاندەکات، کوێخا حسێنی هەناران پێنج ئیستریان لە هەنارانەوە بە دۆڵی سیدەردا بۆ دەنێرێ بۆ سەنگەسەر، بەسەڵتەزەلامی و بە جلوبەرگی کاری تووتنەوانییەوە دەیانهێنێتە هەنارانە و سەرچنار و سلێمانی.

## یاداشتی گرتنی سەرای ڕانیە

لەدوای گرتنی سەرای ڕانیە و پێکهێنانی لقێکی پێشمەرگەی شۆڕش بەسەر لقی عەریف ڕەفیق و هاوڕێ و پۆلیسەکانی، لەوانەی کە مانەوە لە سنووری ناوچەی ڕانیە و پاش گرتنی پتر لە چوار هـەزار فـەردە تووتنی پلە مومتاز و ناردنی بۆ سەرکردایەتیی شۆڕش و فرۆشتنی و پەیداکردنی ئەو دەستکەوتە داراییە بەنرخە لەو کاتەدا، دوای یەک دوو هەفتە نامەیەکمان لە مەکتەبی سەرۆک بارزانییەوە بۆ هات، داوای کرد کە ئەندامانی لیژنەی ناوچە بچن بۆ بارەگای بارزانی لە گوندی بێتواتە. ئێمە وامان دەزانی کە سەرۆکی پارتی پاداشتمان دەکا و دەستخۆشیمان لێ دەکا کە قەزایەکمان گرتووە بێ خوێنڕشتن، کاتێ گەیشتینە بارەگای بارزانی، بە چەکداری جامانە سوور دەورە دراین و بێ چۆن و بۆچی ڕاپێچی ناو زیندان کراین کە کۆمەڵێک

سخوڕی حکومەت و گومانلێکراوی بوونە جاشی تێدا بوو کە هەندێکیان لەسەر داوا و ڕاپۆرتی خۆمان گیرابوون.

دوای چەند ڕۆژێک بانگ کراین بۆ دادگاییکردن لەلایەن خودی مستەفا بارزانییەوە، تۆمەتەکان بریتی بوون لە:

١. بردنی پارەی بەشی دارایی قەزای ڕانیە و ناردنی بۆ «م. س» و نەناردنی بۆ بارەگای بارزانی.

٢. بردنی ئەو تووتنانە و ناردنی بۆ «م. س»، بێ ئاگاداری و ڕەزامەندیی بارزانی.

٣. سووتاندنی پاشماوەی تووتنەکان و عەمبارەکان کە ئاغاکانی ناوچەکە تەماحیان لە بردنیدا هەبوو، بێ ئاگاداریی بارەگای بارزانی.

٤. شکاتی سەرەکعەشیرەتەکانی ناوچەکە لێمان کە لیژنەی ناوچەی ڕانیە بڕیاری نیوەیی دانی بەرهەمی جووتیارانی بەو ئاغا و خاوەن زەوییەکان کردووە بە چواریەک، واتە لە چوار بەش؛ بەشێکی بدرێ بە خاوەن موڵکەکان کە هەموویان ئاغا و سەرەکعەشیرەتەکانی ناوچەکە بوون.

٥. بڕیاری دا کە ئێمە لە ئەندامیەتیی حزب دەربکرێین و هەندێک لە پیاوەکانی خۆی کە لەگەڵیدا بوون، کران بە لیژنەی ناوچەی ڕانیە و ئێمەش براینەوە زیندان بۆ چاوەڕێکردنی ڕۆژی دەرچوونی سزادانمان و جۆری سزاکەمان.

لە مانگی (١٩٦٣/١) بە پلانێکی سەرکەوتووانە کە ڕێکخراوی چوارقوڕنە بە زیرەکیی لێپرسراوی ڕێکخراو؛ شەهید عەباس و شەهید ئەمین داڕێژرابوو، لە زیندانەوە ڕامانکرد و هەر بەو شەوە گەیەنراینەوە سەنگەسەر کە لە ڕووی دەسەڵاتی پێشمەرگەکانەوە لەژێر دەسەڵات و کۆنترۆڵی خۆمان (م. س)دا بوو. سەرکردایەتی پێی باش بوو بۆ وەبەریەکنەکەوتن لەگەڵ بارزانی و دوورخستنەوەشمان لە بارزانییەوە، هەریەکێ لە ئێمە وەک کادری پیشەیی بنێرێ بۆ لق و لیژنەی ناوچە و ڕێکخراوەکانی پارێزگای سلێمانی:

مەجید گورگ نێردرا بۆ بارەگای «م. س» لە مالومە.

حسێن عەلی ڕەزا نێردرا بۆ لێپرسراویەتیی لیژنەی ناوچەی ماوەت.

حسێن حاجی تایەر بڕیاری دا لە ماڵی خۆی دابنیشێت و بڕوات بۆ سلێمانی.

وەستا سدیق بڕیاری دا لەماڵی خۆی دابنیشێت و بڕوات بۆ کۆیە.
بەندەش نێردرام بۆ لیژنەی ناوچەی قەزای سلێمانی-ڕێکخراوی سرۆچک.

## ئەو نامەیەی کە بەشێکی گرنگە لە یادگارییەکانم

بڕیاری گوێزانەوەمان بۆ دەرچوو، گەرچی زۆر لام ناخۆش بوو کە لە زێدی خۆم لە هەواڵی بەردەوامی خۆشەویستەکەم دوور دەکەومەوە، بەڵام نامەی خۆشەویستەکەم پاڵنەرێکی بەهێز و ورەبەخشێکی گەورە بوو بۆم کە بۆی نووسیبووم:

**خۆشەویستەکەم، ئەی هیواکەی دوارۆژم و کۆشکی ئاواتی ئایندەم، زۆرم پێ ناخۆشە کە دوور دەکەویتەوە لێم، بەڵام وەک بۆت ڕێک نەکەوت درێژە بە خوێندن بدەی لە دانشگا؛ هیوادارم لەم بواری سیاسەتەدا سەکەوتوو بیت و داواکارم لە یەزدان بە هۆی دروستبوونی وتووێژێکەوە لەگەڵ حکومەت بگەڕێیتەوە لامان، بۆ دواجار هەردووکمان کۆتایی بە تەنیایی و دووری لە یەکتر بهێنین. ئاگات لە خۆت بێ و هەمیشە منت لەبیر بێت و ئەم وێنەشم لای خۆت بپارێزە بۆ سەبووریی خۆت. خوات لەگەڵ، خوا ئاگادار بێ و بتپارێزێ.**

لە کۆتایی مانگی (١٩٦٣/١)، ڕێگای بنگرت، هەنجیرە، سیدەر، بەرگەڵو، مالوومەم گرتە بەر، ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتمە ئەشکەوتەکەی مالوومە کە بارەگای مامۆستا برایم ئەحمەد و «م. س» لەوێ بوون، یەکەم کەس کاک ئەحمەدی ئوتووچیم بینی و بردمی بۆ بارەگای لقی سلێمانی، مەحموودی حاجی تۆفیق ئەندامی لق لەوێ بوو، ئێوارەیەکی درەنگ بوو گەیشتم، زۆر ماندووی ڕێگا بووم، یەکەم جارم بوو مەودایەکی ئەوەندە دووری پتر لە دە سەعاتی ببڕم بەپیادەڕۆیی. شەو مامەوە، بەیانی لەگەڵ شەهید مەحموود یەکمان بینی[1].

---

[1] مەحموود حاجی تۆفیق ماستاو: ئەندامی لقی سلێمانی و پاشان یەدەگی کۆمیتەی ناوەندی لە ساڵی (١٩٦٥) لای مەلا مستەفا لە سەنگەسەر زیندانی کرا، چونکە باڵی "م. س" بوو، لەگەڵ مامۆستا عەلی حەمدی، هەردووکیان بە بڕیاری مەلا مستەفا شەهید کران.

## ڕێکخراوی سرۆچک

دوای مانەوەم، ڕۆژێک لە بارەگای لقی (٤)ی سلێمانی و گفتوگۆم لەگەڵ مەحموودی حاجی تۆفیق و ئاگادارکردنم لە ئەرک و کاری داهاتووم وەک ئەندامێکی لیژنەی ناوچەی قەزای سلێمانی، بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ تەتەری خۆیان کەوتینە ڕێ بەرەو بارەگای لیژنەی ناوچەی قەزای سلێمانی لە گوندی «هومەر ئامان» لە ناوچەی قەرەداغ. ڕۆژی (١٩٦٣/٢/٢) گەیشتمە بارەگای ناوچەکە، تەنیا سێ کەس لەوێ بوون:

- کاک بەکر جاهد (مەلا مارف)
- کاک شیخ ڕەئووف شێخ عارف
- کاک عەبدولمەجید ماوەتی (مەلا عومەر)

ئەمانە کارگێڕیی لیژنەی ناوچەی قەزای سلێمانی بوون.

لیژنەی ناوچەی قەزای سلێمانی، لیژنەیەک بوو پێک هاتبوو لەم ڕێکخراوانەی خوارەوە:

١. ڕێکخراوی بازیان، لێپرسراوەکەی ئەندامی لیژنەی ناوچە بوو.
٢. ڕێکخراوی سەرچنار، ئەندامی لیژنەی ناوچە بوو.
٣. ڕێکخراوی سەیدسادق-تانجەرۆ، ئەندامی لیژنەی ناوچە بوو.
٤. ڕێکخراوی وارماوا-دەربەندیخان، ئەندامی لیژنەی ناوچە بوو.
٥. ڕێکخراوی سرۆچک-بەرزنجە، ئەندامی لیژنەی ناوچە بوو.
٦. ڕێکخراوی قەرەداغ، ئەندامی لیژنەی ناوچە بوو.

واتە لیژنەی ناوچەکە پێک هاتبوو لە (٩) ئەندام و نازناوەکەشی «٨ ق. س»، واتە لیژنەی ناوچەی ژمارە (٨)، قەزای سلێمانی سەر بە لقی (٤) سلێمانی. دوای میوانداریکردنم، هەفتەیەک ناردیانم بۆ ڕێکخراوی سرۆچک کە شارەدێکەی بەرزنجە بوو. ڕێکخراوی بەرزنجە، سنووری کارکردنەکەی شەست و حەوت دێ بوو، بارەگای ڕێکخراوەکە لە گوندی حاجی مامەند بوو، ئەندامانی ڕێکخراو پێک هاتبوون لە مامۆستا حەمە ئەمین ژاژڵەیی و مامۆستا عەبدولعەزیم ماوەتی و شێخ عوسمان شێخ ڕەشید سەرسپی و مەلا یوسف باراوی و شێخ عەلی شێخ غەریب باساکی و

بەندە. زستانی ئەو ساڵە زۆر سەخت و سارد و بەفراوی بوو، دەردەماڵاتێک پەیدا بوو هیچ دێیەک نەبوو دەیان سەر حەیوانی مەڕ و بزنی مردار نەبێتەوە، پێشمەرگە هەر فریای شاردنەوە و سووتاندنی لاشەی ئەو حەیوانانە دەکەوتن. لە لایەکی ترەوە هاتنی حزبی بەعس بۆ سەر حوکم لە (١٩٦٣/٢/٨) و دەستپێکردنی وتووێژی نێوان مەلا مستەفا و عەبدولسەلام عارف، سەرهەڵدانی سەرەتای ناکۆکیی توندی نێوان مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی و کاریگەریی لەسەر هەموو حزب لەناو ڕێکخستنەکان و هێزی پێشمەرگەدا لە مەکتەبی سیاسی و لیژنەی ناوچەوە، پەیتا پەیتا بڕیارمان بۆ دەهات کە لەناو دێهاتەکان و جووتیاراندا چۆن باسی وتووێژ بکەین، لەولاشەوە بە بڕیاری ڕاگرتنی شەڕ لە مەکتەبی بارزانییەوە دەرچوو بە برووسکەی «لە ئاراسەوە بۆ هەموو بنکە و بارەگاکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان». مەکتەبی سیاسی گفتوگۆی بە پەسەند نەدەزانی لەو کاتەدا کە کودەتای بەعسییان کرا بوو و حکومەت لاواز بوو، هێشتا سەقامگیربوونی دەسەڵاتی بەعسییان نەڕسکابوو، خواستەکانی بارزانییش لە گفتوگۆدا لە ئاستی پێویست و داخوازیی خەڵکی و شۆڕشدا نەبوو. پارتی دیموکراتی کوردستان و شۆڕشی ئەیلوول کەوتنە بارودۆخێکی زۆر ناهەموار و نەخوازراوەوە، سەرەتای گەورەترین دەلاقەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و پێشمەرگایەتی کەوتە ناو ڕیزەکانی ڕاپەڕینی کوردایەتی لە باشووری کوردستاندا.

### نەورۆزی (١٩٦٣)

لە (١٩٦٣/٣/٢١)دا بەپێی ئەو بڕیارەی کە لە «م. س»ەوە هاتبوو، هەموو شانە سەرەکییەکان و ڕێکخراو و لیژنەی ناوچەکان دەبوو لە ڕۆژی نەورۆزدا کۆبوونەوەی جەماوەریی فراوان پێک بهێنن و چۆنیەتی و ناوەڕۆکی ڕێککەوتنەکەی موشیر عەبدولسەلام عارف و بارزانییەوە بۆچوونەکانی «م. س» و هەوڵەکەی لەگەڵ مەلا مستەفا بۆ جەماوەر ڕوون بکەنەوە. منیش ڕۆژی نەورۆز لە شارۆچکەی بەرزنجە لە کۆبوونەوەیەکی فراواندا وتارێکی تێروتەسەلم لەو بارەیەوە بۆ خەڵکەکە خوێندەوە، لە تەواوبوونی وتارەکەدا بووم کاک شێخ عەلی شێخ غەریبی باساک هاتە تەنیشتم و

بە گوێمدا چرپاندی کە هەست بە جموجووڵێکی نامۆی پێشمەرگەکانی لقی بەرزنجە دەکات، بە کاک شێخ عەلیم وت کە ئاگاداری عەریف تاڵب موریاسی بکات خۆی و پەلەکەی لەو ناوە دوور نەکەونەوە. دوای تەواوبوونی وتارەکە، شێخ ڕەزای شێخ محەممەد گولانیی سەرلق و کاک تەها بابان حاکمی شۆڕش لەو سنوورە و بەندە دانیشتنی بکەین، لەسەر داوای ئەوان لەو کۆبوونەوەیە شێخ ڕەزا بەڕاشکاوی ڕای خۆی دەربڕی کە خۆی و لقەکەی پابەندی تەواون بە مەلا مستەفا و بڕیارەکانیەوە، وە بشرۆن بۆ لای فەرماندەی هێزی خەبات کە شەهید عەلی عەسکەری بوو بۆ زانینی بیروڕای هێزی خەبات لەسەر ئەو دوو لایەنە، حاکم تەها بابان بێلایەنیی خۆی دەربڕی، هیوای خواست هەردوو لا بگەنە یەک و ترازان لەناو پارتی و هێزی «پ. م»دا ڕوو نەدات. بەندەش لایەنداریی خۆم بۆ ڕاوبۆچوونەکانی «م. س» دەربڕی و بڕیار درا بڕۆم بۆ گوندی هومەر ئامان لە بارەگای لیژنەی ناوچە و ڕای ئەوان وەربگرم و بگەڕێمەوە[٢].

## عەریف تاڵب موریاسی

لقی سرۆچکی هێزی پێشمەرگە سەر بە هێزی خەباتی ناوچەکانی شارەزوور و شارباژێڕ و سیوەیل و دۆڵی جافایەتی تا دوکان و عەسکەر و ئاغجەلەر بوو، هێزێکی گەورە و فراوان و بەجووڵە و پڕ چالاکی بوو. عەریف تاڵب موریاسی یەکێک بوو لە سەرپەلەکانی سەر بە لقی پێشمەرگەی سرۆچک، پیاوێکی لاوی پڕ جووڵە و وریا و دڵسۆز و ناسراو بە یەکێک لە چالاکترین پەلەکانی ئەو لقە لە چالاکیی پێشمەرگانەدا. ئەم زاتە جگە لەوەی کە سەرپەل بوو، لە هەمان کاتیشدا ئەندامێکی دڵسۆز و حزبی و ڕێکخەری سیاسی بوو، ئاستی خوێندەواری و وشیارییشی لەو کاتەدا زۆر باش بوو، زیاتر وەک کادرێک هەڵسوکەوتی دەکرد وەک لە سەرپەلێکی سەربازی. ئەویش پاش یەکلاییبوونەوەی کێشەی نێوان «م. س» و مەلا مستەفا، وەک زۆربەی بەرپرسە سەربازییەکان کەوتە بەر زەبری لێکترازان. ڕۆژی (٣/٢٢) بەرەو هۆمەرامان کەوتمە

---

[٢] لە کتێبی "شۆڕشی ئەیلول" بەدرێژی باسی ئەو لێکترازانەی ناو پارتی و ئەنجامەکانیم کردووە، بۆیە بە پێویستم نەزانی دووبارەی بکەمەوە.

ڕێ و ڕۆژی دوایی کۆبوونەوەی لیژنەی ناوچە بە ئامادەبوونی سێ کارگێڕ و لێپرسراوی ڕێکخراوەکان کە ئەندامی ناوچە بوون، کرا. لە کۆبوونەوەکە باسی هەوڵ و تەقەلاکانی «م. س» کرا لەگەڵ بارزانی، بە ناردنی وەفد بۆ لای بە مەبەستی پەشیمانبوونەوەی لەو وتووێژە یان پێشکەشکردنی پرۆژەکەی «م. س» بە عارف کە پرۆژەیەکی هەمەلایەنە و چڕوپڕ بوو سەبارەت بە ڕێککەوتن و بەدەستهێنانی داخوازییەکانی شۆڕشی ئەیلول[3]. «م. س» وەک دوا هەوڵی لەگەڵ بارزانی، بڕیاری دا کۆنفرانسێک لە ماوەت بگرێ بە بەشداریی سەرکردایەتی و لقەکانی حزب و نوێنەری لیژنە ناوچە و ڕێکخراوەکان. کۆنفرانس لە (١٩٦٤/٤/٤) گیرا و بڕیار درا بۆ دواجار نوێنەرانی کۆنفرانس بنێردرێن بۆ لای مەلا مستەفا بۆ دانانی ڕێگەچارەیەک بۆ ڕێککەوتن[4].

## ڕێکخراوی سووورداش و گرتنی خەلیلی برام

دوای کۆنفرانس، لە لقی سلێمانی بڕیاری گواستنەوەیان دام لە ڕێکخراوی سرۆچکەوە بۆ ڕێکخراوی سووورداش لە شوێنەکەی حەمە ڕەشید ئەحمەد شانە. بارەگای ڕێکخراو لە سەرگەڵوو بوو، لەو ڕێکخراوەدا دەستبەکار بووم، تەمەنی بەرپرسیارێتیم لەو ڕێکخراوەدا زۆر کورت بوو، هەتا هێرشی عەشایەری بارزانیی خایاند بۆ سەر «م. س» و ناوچە و ڕێکخراوەکانی پاش کۆنگرەی مەلا مستەفای ناسراو بە کۆنگرەی ئەودیو دەربەند لە سەنگەسەر گیرا و ناوی کۆنگرەی شەشی پارتیی لێ نرا. هێرش و پەلامارەکانی بارزانی بە پشتبەستن بە ئەفسەرەکان و زۆربەی پۆلیسەکان و سەرەکعەشیرەتەکان، زۆر بەفراوانی کرایە سەر بارەگا و دەڤەرەکانی سەر بە «م. س». مەلا مستەفا بە جۆرێک فەرماندە و ئاغاکانی تێگەیاندبوو کە هەر چی ئازووقە و پارەوپولی شۆڕش هەیە، هەمووی لای «م. س» و لە ئەشکەوتەکەی عیساوی پەزمەنە کراوە. هەموویانی سەرپشک کردبوو کە سەر بۆ مەلا مستەفا و ماڵ بۆ خۆیان بەرن. خەڵکی وا هاتبوون بۆ شەڕی «م. س» کە لەباتیی چەک، گوریس و

---

٣ بۆ زانینی دەقی پرۆژەکە، سەیری کتێبی "شۆڕشی ئەیلول، بنیاتنان و هەڵتەکاندن" بکە.
٤ سەیری کتێبی "شۆڕشی ئەیلوول" بکە.

ولاخیان هێنابوو بۆ تالانکردنی خەزینەکانی عیساوی، وایان زانیبوو ئەشکەوتەکانی عیساوی؛ عەمارەکانی سوپای چینە. لەو کاتانەدا زۆر بێزار و دڵتەنگ بووم، لە بارەگای ڕێکخراودا زۆربەی شەوانە بەتەنیا دەمامەوە، بیرم لە نەهامەتی و نەگبەتیی گەلەکەم دەکردەوە کە ئەو شۆڕشەی لە شاخەوە بە جۆرێک پەلوپۆی هاوێشتبوو بۆ هەندێ لە شار و شارۆچکەکان و دەسەلاتی ڕژێمی لە شارەکانی کەرکووک و هەولێر و سلێمانی وا لەرزۆک کردبوو کە لە شەودا ڕژێم هیچ دەسەلاتێکی بەدەستەوە نەمابوو، بگاتە ئەو ڕادەیەی ئێستا برا؛ برا بکوژێ، وە بە دەستی خۆمان؛ ماڵی خۆمان وێران و کاول بکەین، لە شەوێکدا تەنیا بووم ئەم چەند دێڕە هەڵبەستەم هات بە بیردا و نووسیم:

**دەترسم نیشتیمان بمرم نەبینم بەختیاریی تۆ**
**نەبینم من بە چاو، جوانیی بەهەشت و مێرگوزاری تۆ**
**نەهێڵن سەوز و گەش بێ خونچەی جوانی بەهاری تۆ**
**لەبن ببڕن گوڵی سەربەستیی گەشبووی خوێنی ئاڵی تۆ**
**بەوەش لێت ناگەڕێ و دەست هەڵناگرێ هەرگیز لە لێدانت**
**هەتاکوو یەک بە یەک نەکوژێ دڵسۆز و پیر و لاوانت**
**وەکوو مالۆس هەتا بنبڕ نەکا گشت چینی بێستانت**
**بەجێ ناهێڵێت بۆ قەومی هەژارت مێرگوزاری تۆ**

هەتا دوایی، کە (٢٥) بەیتە شیعر بوو. بۆ بەیانی هەندێ لە ئەندامانی ڕێکخراو و چەند پێشمەرگەیەک هاتنە ڕێکخراو، منیش ئەو شیعرەم بۆ خوێندنەوە، یەک دوو دێڕی شیعرەکە بە ڕەشید سەندی گەیشتبۆوە کە سەر بە مەلا مستەفا و فەرماندەی هێز بوو، بارەگایان لە قەمچوغەی لای دوکان دانابوو، خەلیلی برام؛ باوکم بەپیادەڕۆیی دەینێرێ بەرەو سەرگەڵوو تا هەواڵی من بزانێ و گەر توانییشی قایلم بکات بە وازهێنان لە باڵی «م. س» و گەڕانەوەم بۆ سەنگەسەر بۆ ماڵی باوکم. چەکدارەکانی ڕەشید سندی لە بەینی قەمچوغە و شەدەلە دەیگرن، کە دەزانن برای منە؛ زۆر ئازاری دەدەن لەسەر ئەو شیعرەی کە نەمدەزانی چۆن گەیشتۆتەوە دەست ئەوان، تا دواجار

پاش سزا و ئازارێکی زۆر بەو مەرجە کە من بەرێتەوە بۆ سەنگەسەر و قایلم کات واز لە باڵی «م. س» بهێنم و لەسەر داوای کوێخا سمایلی تەلان کە شەوقیی کوڕی زۆر هاوڕێی خەلیل بوو؛ بەری دەدەن.

## بەشی چوارەم
## شەڕی سێ ڕۆژە و ڕەوکردن

هێرش و پەلاماری مەلا مستەفا و هاوکارەکانی بەرەو سەرگەڵوو و دۆڵی جافەتی دەستی پێ کرد، هێزەکانی «م. س» کە مابۆوە سەر چەند سەد کەسێک، لە هەموو لایەکەوە و ڕاو نران بەرەو دیوی شارباژێر و ناوچەی ماوەت، لەلای ئێمەشەوە پاشەکشە دەستی پێ کرد، ڕۆشتین بەرەو قەشان لەوێ شەڕێکی چەند سەعاتی کرا، پاشان بەرەو ماوەت و ژاژڵە، لەوێش توانرا دوو ڕۆژی تر بەرهەڵستی بکەین، ئێمە پێک هاتبووین لە مەفرەزەیەکی دروستکراو لە کادرانی سیاسی لە ئەندام لقەوە تا لیژنەی ناوچە و ڕێکخراوی تێدا بوو، مەفرەزەکەی ئێمە کەمئەزموون لە شەڕدا، بۆیە دراین بە پەلەکەی عەریف مەجید شوانی (ماوەتی). لە ڕۆژی سێهەمی شەڕدا، بەرەی (جبهە) بەرزاییەکانی پشتی ماوەتیان بەو پەلە سپارد کە ناسراو بە بەرەی ترشەکانی پشتی ماوەت، ئەو ڕۆژە تا ئێوارە «جاسووس هەڵگیرا*»، شەڕ بەردەوام بوو، ئێمە پێیان وتبووین کە لە پشتمانەوە ئەو هێزەی خۆمان هەیە کە کەمال موفتی (ڕەئیس کەمال) لێپرسراویەتی، بۆیە پشتمان بەوان قایم بوو. بەیانی پێش هەتاوکەوتن تەقەی شەڕ دەستی پێ کرد، ئێمە بەرگریمان لە سەرکەوتنی هێزی مەلایی دەکرد، کەچی لە پشتمانەوە تەقەیان لە سەنگەرەکانی ئێمە دەکرد. عەریف مەجید هەستا لە سەنگەرەکەی کە بە تەقەکەرەکانی پشتمانەوە بڵێ تەقەمان لێ نەکەن، ئەوسا زانیمان جامانە سوورن، چووبوونە سەنگەرەکانی کەمال موفتی و هاوڕێکانی، دوایی زانیمان هەر ئەو شەوە ئەوان پاشەکشەیان کردووە بۆ سەر چەمی «تەپەت» و بە ئێمەیان نەگوتووە. ئەو ڕۆژە بە شەڕەتەقە و پاشەکشە هەر چۆنێ بوو خۆمان گەیاندە

* جاسووس هەڵگیرا: واتە ڕووناکی زۆر کز بوو بەرەو تاریکی، ئیتر بەرامبەر لە جاسووسی تفەنگەوە دەرناکەوێ.

دۆڵەکانی نێوان ماوەت و ژاژڵە و بۆ شەوێ بە هیممەت و شارەزایی عەریف مەجید و بە چاوساغیی دۆستێکی ژاژڵەیی ئەو؛ گەیشتینە سەر چەمی تەپەت و بەیانی زوو بە کەڵەک لە ئاو پەڕیینەوە دیوی ڕۆژهەلاتی کوردستان. من لەو شەڕەدا بریندار بووم، گوللە بەر قاچی چەپم کەوت.

## گوندی بێتوش

گوندی بێتوش زێدی مەلا عەبدوڵلای بێتوشی کە یەکێکە لە شاعیرە زۆر ناودارەکانی عەرەبی ناسراوە بە «البیتوشی»، بەداخەوە جگە لە چەند کۆپلە شیعرێکی زۆر کەم کە بە کوردی نووسیویەتی، شیعرەکانی تری هەمووی بە عەرەبی نووسیوە و لە مەیدانی زمانزانی و هەڵبەست ڕەوانی لە شیعر و ئەدەبی عەرەبیدا شۆڕەسواری سەردەمی خۆی بووە لەناو ئەدیب و شاعیرانی عەرەبی سەردەمی ئەودا، جگە لەوەی کە زانا و شارەزاییەکی ناسراوی مەیدانی شەریعە و فیقهی ئایینی ئیسلامی بووە. گوندی بێتوش لەدوای چەمی تەپەت، یەکەم گوندی ڕۆژهەلاتی کوردستان بوو کە چووینە ناوی بەرەبەیان بوو، فەرمان درا کەس نەچێتە ناو دێکە، هەموو لە دەرەوەی دێکە بمێنێتەوە و پشوویەکی کورت بدەن لەناو باخەکانی دەرەوەی دێکە. بێتوش دێیەکی گەورەی فراوان بوو، ئاوێکی زۆر و سازگار و باخ و دێبەرێکی زۆریان هەبوو، باخەکانی میوەی جۆراوجۆر و چۆنایەتیی زۆر باش و ڕەسەنی هەبوو، فراوانیی دێکە لەوەوە هاتبوو زۆربەی ماڵەکان خانووەکانیان لەناو باخ و دێبەری خۆیاندا کردبوو، مام جەلال و شەهید عەلی عەسکەری و کاک عومەر دەبابە کۆبوونەوەیەکیان لەگەڵ کادرە سیاسییەکان کرد و ئاگاداریان کردین کە ئامۆژگاری و چاودێریی پێشمەرگەکان بکەین بە هیچ جۆرێک بە هیچ بیانوویەک نەچنە ناو ماڵەکان، چونکە لە ڕوودانی مەترسییەک دەترسان روو بدات، زۆربەی پێشمەرگەکان گەنج و ڕەبەن بوون، ئەو دێیەش ناسراو بوو بە ژن و کچی جوان و نەریتی ڕەدووکەوتن و ژنهەڵگرتن لە ناویاندا باو بوو. لەپاش چەند ڕۆژێکی کەم، ڕۆژێک لەپڕ وتیان ئاغای سەرهەنگ شەهریاری هاتووە بۆ دیدەنی ڕەهبەرانی سەرکردەکانی ئێمە. مام جەلال بەپەلە هەموومانی کۆ کردەوە و ئاگاداری کردین ئەگەر سوپای ئێرانی کە لەگەڵ سەرهەنگ

بوون؛ ویستیان بەرزاییەکانی دیکە بگرن، دەبێ پێشمەرگەکان خێرا بچنە پشتی ئەوانەوە. لەناو باخێک لەپەنا بەردێکی گەورەدا (گابەرد)، مام جەلال لەگەڵ سەرهەنگ شەهریاری کەوتنە گفتوگۆ، پاش ماوەیەکی کەم مام جەلال بە تووڕەبوونێکی زۆر سەرنجڕاکێشەوە هەستا و پەلاماری گۆچانەکەی دا و هاواری کرد لە پێشمەرگە خێرا پشتی ئەرتەشیانی بگرن و ئامادە بن. پێشمەرگە بە خێراییەکی زۆر سەرسوڕهێنەر کەوتنە پشتی ئەرتەشە دابەشبووەکە و سەنگەریان گرت. ئێمە کە کەمێک دوور لە مام جەلال بووین؛ گوێمان لەتووڕەبوون بوو، بەڵام نەمانزانی چی ڕووی داوە. دوای ڕۆیشتنی سەرهەنگ و ئەرتەشەکەی، مام جەلال هەموومانی کۆ کردەوە و پێی وتین: «سەرهەنگی سەرسەگبابی، سەرقەحپەباب»، بە منی گوت یان دەبێ تا سێ ڕۆژی تر ناو ئێران چۆڵ بکەن و بچنەوە دیوی عێراق، یان دەبێ چەکەکانتان تەسلیم بە دەوڵەتی ئێران بکەن و ئامادە بن دەوڵەت کوێتان بۆ دیاری دەکا وەک ئۆردووگای پەنابەری تیا بژین، منیش قایل نەبووم بە چەککردن، دەگەڕێینەوە ئەگەر هەموومان بکوژرێین بەسەربەرزی لە خاکی خۆماندا، لە ژیانی سەرشۆڕی و چەککراوی لای ئەم سەگبابانە باشترە. بەپەلە مام جەلال و کاک عەلی عەسکەری و کاک عومەر دەبابە لەسەر داوای مام جەلال هەموومانیان کۆ کردەوە کە بە سەرکردە و کادر و سیاسی و پێشمەرگەوە، (٤٢١) کەس بووین. مام جەلال بڕیارەکەی حکومەتی ئێرانی لە زاری سەرهەنگەوە پێ ڕاگەیاندین و ڕای خۆیشی بە ئێمە گوت، کە ئەو ئامادە نییە سێ سەعاتی تر لە خاکی ئێراندا بێت[٦].

## دووبارە گەڕانەوەمان بۆ بێتوش

هەر چەندە هیچ کام لە سەرکردایەتی و تەنانەت کادرە سیاسییەکانیش بە گەڕانەوە قایل نەبوون، بەڵام مام جەلال و دەستە پێشمەرگەکانی بڕیاری گەڕانەوەیان دا و کەوتنە ڕێ. مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دیسان کۆی کردینەوە و مام جەلالیشی گەڕاندەوە و پێی وتین من لەگەڵ گەڕانەوە نیم لەم کاتەدا کە مەلا مستەفا لە برەودایە و هەموو هێزی چەکداریی هێناوەتە سەر ئێمە، ئەگەر ئێمە چەند مانگێکی تر خۆمان

٦ لە کتێبی "شۆڕشی ئەیلوول" بەدرێژی باسم کردووە.

بگرین؛ وتووێژە درۆینەکەش بۆ هەموو خەڵک ئاشکرا دەبێ و پەیوەندیی مەلا مستەفا و عەبدولسەلام عارفیش تێک دەچێ و خەڵک بڕوا بە ئێمە دەکەن کە دەمانوت مەلا هیچ بۆ کورد وەرناگرێ جگە لە مۆز و پرتەقاڵ، بەڵام لەبەر سووربوونی مام جەلال لەسەر گەڕانەوە، با هێزەکەمان بکەین بە سێ قۆڵەوە:

١. قۆڵێک بەرەو قەڵادزە بە سەرپەرشتیی کاک عومەر دەبابە.

٢. قۆڵێک بەرەو چوارتا بە سەرپەرشتیی کاک عەلی عەسکەری.

٣. قۆڵێک بەرەو پێنجوێن بە سەرپەرشتیی مام جەلال.

لەبەر عینادیی مام جەلال، هێزەکە بوو بە سێ قۆڵ، هەر قۆڵەی بەرەو ئەو شوێنەی بۆی دیاری کرابوو؛ کەوتە ڕێ. من بەر قۆڵی کاک عەلی عەسکەری کەوتم، ئێمە تا سەر چیای گمۆی پشتی چوارتا پێشڕەویمان کرد بەنیازی چوونە چوارتا و بەرەو سلێمانی. بەڵام هەردوو قۆڵەکەی تر شکان و گەڕانەوە بەرەو بێتوش، ناچار ئێمەش گەڕاینەوە دیسان بە زۆرەملێی مام جەلال[٧]. هەموو گەڕاینەوە بێتوش و لەوێشەوە بەرەو گوندی تاژان و تاژەبان و چەکدانان و ڕەوانەکردنمان بۆ سەقز.

## زستان و ئۆردووگای سەقز

کاتێ ناچار کراین بە چەکدانان، سەرکردایەتی بڕیاری دا دوو پەلی پێشمەرگە بە باشترین چەکەوە بنێرێتەوە سەر سنوور وەک ئەڵقەیەکی پەیوەندیی نێوان سەرکردایەتیی ناو وڵات و ئێران، ئەوان نزیکەی (٤٠-٥٠) «پ. م» دەبوون و بە سەرپەرشتیی عەریف مەجید و حەمە ئەمین ئاغای باری و نزیکەی ١٠-١٥ دەمانچەش بشارینەوە بۆ کاتی پێویست. ئێمە لە تاژانەوە بە لۆریی زیلی سەربازی براین بەرەو بانە و پاشان بۆ سەقز لەناو شاری بانە، هەندێ لە منداڵ و مێردمنداڵی بانە بەدوای زیلەکاندا ڕایاندەکرد و دەیانوت: «ئەوە کوردستانی ئێراقیان ڕزگار کردووە، هاتوون هیی ئێرانیش ڕزگار دەکەن.» لە بانە نەیانهێشت بمێنینەوە، براین بۆ سەقز. لە بەرزاییەکانی پشتی سەقز خەیمەیان بۆ هەڵداین، خەیمەکان بچووک بوون، هەر خەیمەیەک دوو کەسی تیا دەبوو، من لەگەڵ دکتۆر ئەحمەد شاڵی لە خەیمەیەکدا

[٧] بۆ زانیاریی زیاتر، سەیری کتێبی "شۆڕشی ئەیلوول" بکە.

بووین. چەند مانگێکی زستانێکی زۆر سەختمان لەوێ بردە سەر، ئەو شوێنە لە سەقزدا ناسراو بوو بە ساردی و بۆ بێشانسیی ئێمە؛ زستانێکی زۆر بەفراوی بوو. پەیوەندیی نێوان سەرکردایەتیی ئێمە و ناو وڵات ئاسان بوو، بە هۆی تەتەری نێوان «م. س» لە سەقز و ناو وڵات لە ڕێگەی کاک عەبدولڕەحمان ڕووتەوە. سەرەتای بەهار بوو، دەشتودەر سەوز و کەشوهەواش تەواو بەهاری بوو، سەقزیش شارێکی جوان و بە بەرزاییەوە بوو، دڵمان خۆش بوو کە هێشتا نزیکین لە وڵاتەوە، بەو هیوایەی وتووێژێک دەکرێ لەگەڵ مەلا مستەفا و دەگەڕێینەوە، بەڵام بەپێچەوانەوە، ڕۆژێک لە پڕ ئاگاداریان کردین کە خۆمان ئامادە بکەین بۆ ڕۆیشتن. لەو ماوەیەدا مەلا مستەفا لەگەڵ ئێران پەیوەندیی دروست کردبوو و داوای کرد بوو کە یان ئێمە بەگیراوی بدرێینەوە بە باڵی مەلایی، یان دەبێ لەنزیک سنوورەکان دوور بخرێنەوە تا بەتەواوی هەموو پەیوەندییەکمان بە وڵاتەوە بپڕدرێ.

دەوڵەتی ئێران داخوازیی دووهەمی پەسەند کردبوو کە دوورمان بخاتەوە، لەبەر دوو هۆ:

١. ئێمە وەک بارمتەی داهاتوو لەلای خۆی بهێڵێتەوە تا هەر کات پێویستی کرد بەکارمان بهێنێ بۆ مەرامی خۆی لە باشووری کوردستان.

٢. لەبەرامبەر مەلا مستەفاش وەک کوتەکی پشتی عەبا بەکارمان بهێنێ بۆ بەتەواوەتی کڕینی مەلا مستەفا و کردنیان بە قفڵی دەستی شا و هەر کات بیەوێ شۆڕش بەردەوام کات و هەر کاتیش ویستی بە کلیلەکەی خۆی شۆڕش دابخات.

## هەمەدان و دوا مەنزڵی ئاوارەییم

ئێمە بە زیلی عەسکەری ئێرانی و بەچەککراوی براینە شاری هەمەدان، لە کارگەیەکی شقارتەی سووتاودا نیشتەجێیان کردین، دوو قاعەی گەورە و چێشتخانەیەک و چەند ژوورێکیان بۆ نۆژەن و پاک کردینەوە، من لە مانگی (٤) هەتا مانگی (١٢) لەو ئۆردووگایەدا مامەوە، لەو ماوەیەدا جگە لەوەی کە چوومە یانەیەکی لەشجوانی کە ناوی «باشگاه ورزشی تاج» بوو، لە ڕووی تەندووستییەوە زۆر سوودم لێ بینی، چووشمە خولێکی فێربوونی زمانی فارسی بۆ ماوەی (٦) مانگ، لەو خولەدا لەوانەی

کە ماون لە ژیاندا: (مامۆستا حەمە ئەمین چەمچەماڵی، کاک حەمید ڕەشاش، لەگەڵ دکتۆر ئەحمەد شاڵی، خوالێخۆشبووان خالید دلێر، جەعفەر عەبدولواحید، شێخ لەتیف بابە عەلی نوورە بابی، لەو خولەدا لە تاقیکردنەوەدا دووهەم بووم و کتێبێکی شیعری بابا تاهیری هەمەدانیم بەدیاری وەرگرت. هەندێ لە چوارینەکانیشم وەرگێڕایە سەر کوردی، هەمەدان شارێکە بە لاپاڵی شاخێکی بەرزەوە دروست کراوە بەرەو خوار شۆڕ دەبێتەوە بەرەو دەشتایی، لە هەمەداندا دوو مەزاری زۆر ناوداری لێیە، مەزاری ئەبو عەلی سینا (ابن سینا) و مەزاری بابا تاهیری هەمەدانی (بابا تاهری عوریان). ئەو کاتە مەزاری ئەبو عەلی سینا پێک هاتبوو لە گڵکۆکەی[8] و کتێبخانەیەک و ژوورێکی زیوانەکەی[9] زۆر پاک و جوان ڕاگیرابوو، گومەزێکی شایستە لەسەر گڵکۆکەی بوو، بەڵام مەزاری بابا تاهیر تەنیا یەک ژوور و گومەزێک بوو کە گڵکۆکەی تیا بوو، لە ناویدا دوو سێ تاقی تیا بوو کە نووسینە شرەکانی خۆی لە تاقەکاندا دانرابوو. لە شاری هەمەدان هەرسێ نەتەوەی کورد و ئازەر و فارسی تێدا دەژیا، بە شێوەیەکی جوگرافی دابەش بووبوون لە شارەکەدا کە گەڕەکی کوردەکان کەوتبووە دامێنی شاخەکەوە (شاخی ئەڵوەند) و فارسە کە لە ناوەڕاستدا و ئازەرەکان لە بەشی خوارووی شارەکەوە. شاری هەمەدان ئەو کاتە پیاوەکانیان بەزۆری چاو پڕ و پووشاوی بوون بە هۆی کێشانی تریاکەوە، بەڵام ژنەکانیان زۆر جوان و چاو گەورە و سەرنجڕاکێش بوون. لە ڕووداوێکی خۆش و سەرنجڕاکێشدا خەڵکی دانیشتووی نزیک لە ئۆردووگاکەمان ڕۆژێکی ڕەمەزان شکاتیان لێ کردین، لەبەر ئەوەی «ئیبراهیم سەعید» ناسراوە بە بلەی سەعە کەر، شەو سەعات (١٢ی نیوە شەو) بە بڵندگۆ بە فارسی بانگی دا بە شێوەی «ملک الصلاة» بە فارسی،ماڵەکانی دەوروبەرمان هەموو هەڵسان و چرایان داگیرساند لە پەنجەرەکانیانەوە دیار بوو، وایان زانیبوو بانگی بەیانییە، شەویان لێ گۆڕا، بۆ بەیانی سکاڵایان لەسەر کردین. یەکێکی تر لە ڕووداوە دڵتەزێنەکان: لەناو ئۆردووگاکەدا چێشتخانەیەک هەبوو بۆ چێشتلێنان، ئاگردانی چێشتلێنانەکە بە شێوەی تەندووریان دروست کرابوو واتە دوو مەنجەڵی زۆر گەورە کە خواردنی (٤٠٠) کەسی

---

٨ قەبرەکەی

٩ زیوان: مجێوری مەزارگاکە

تیا بکرێ، ڕێک وەک تەنووری نانەواخانە و مەنجەڵەکان لە سەکۆیەکی بە قوور دروستکراو گیرابوون و ژێرەکەشیان وەک ئاگردان دروستکرابوو بۆ دار و پەرەمێز تیا سووتاندن، ڕۆژێک ئەو پێشمەرگانەی کە نۆرەیان بوو هاوکاریی چێشتلێنەرەکان بکەن لە کاتی تێکدانی شلەی ناو مەنجەڵەکە بە کەوچکی داری زۆر گەورە و درێژ، یەکێکیان قاچی بە هۆی چەوریی سەر سەکۆکەوە خلیسکا و کەوتە ناو مەنجەڵە کوڵاوە شلەکەوە، زۆر بەداخەوە گیانی لەدەست دا. لە مانگی (١٢/١٩٦٤)، ڕۆژێک مام جەلال هاتە ئۆردووگاکە و لە هۆڵێکدا هەموو کادر و ئەندام لق و ناوچە و ڕێکخراوەکانی کۆ کردەوە کە ژمارەمان (٣٠-٣٥) کەس دەبووین، پێی وتین: «سەرکردایەتی لە وڵات پێویستی بە (٤) کادرە، بەنهێنییش بگەڕێنەوە و لەوێ لەو شوێنانەی بۆیان دیاری دەکەن، بەنهێنی خەباتی ژێرزەمینی بکەن، کێ ئامادەیی تێدایە سبەینێ بێتە لای کاک خالید دلێر؛ لێپرسراوی لقی ڕێکخستنی پێشمەرگە، ناوی خۆیان بنووسن.» من بۆ ڕۆژی دوایی چووم ناوی خۆم نووسی، کاک خالید پێی وتم کە لای کەس باسی نەکەم کە ناوی خۆمم نووسیوە بۆ ڕۆشتنەوە. هەفتەیەک دواتر ڕۆژێک کاک عەلی عەسکەری و کاک خالد دلێر کە هەردووکیان ئەندامی سەرکردایەتی بوون، هەر ئەو دووانەش لەگەڵ ئێمە لە ئۆردووگاکەدا دەژیان، ناردیان بە دوامدا کە چووم کاک حسێن عەلی ڕەزا لێپرسراوی ناوچەی ماوەت لەوێ بوو. پێیان وتین دوای نیوەڕۆ جیبێکی سەربازیی ئێرانی بە سێ چەکداری ئەرتەشەوە دێن، هەردووکتان وەک دوو زیندانی دەبەن تا دەتانگەیەننە شاری بانە لەوێ زیندانیتان دەکەن، پاشان ئاغا سمکۆ عەلیار لەگەڵ عەبدولڕەحمان ڕووتە دێن بەرتان دەدەن و لەگەڵ کاک عەبدولڕەحمان دەڕۆنە بنکەکەی حەمە ئەمین ئاغا و عەریف مەجید لەسەر سنوور لە گوندی تاژان، وتیان ئێمە بە دەوڵەتی ئێرانمان گوتووە ئەم دوو کەسە بەنهێنی پەیوەندییان بە پارتیی مەلا مستەفاوە هەیە، نامانەوێ لێرە بن. بەکورتی: ئێمە بە ڕۆژێک و نیو گەیشتینە بانە، لەوێ لە ژوورێک بەندیان کردین دوو ڕۆژ و پاشان سەرهەنگ سمکۆ عەلیار هات و بەری داین و بەدەستبەسەری براینە گوندی «ئەنجینە». بەو سەرمایە زۆریان لێ کردین کە دەبێ لەو چەمی «تەپەت»ەوە بپەڕینە بەری عێراق، ئێمە نەپەڕیینەوە، چەماوچەم بەو شەوە تاریکە بەرەو بنکەکەی خۆمان لە تاژان ڕۆیشتین.

## حەمە ئەمین ئاغا باری و حسێن عەلی ڕەزای کەرکووکی

شەو نزیکی سەعات دە گەیشتینە بارەگاکە و بەخێرهاتنێکی گەرم و زۆپای گەرمیشیان بۆ داخستین و نانیان داینێ و پاشان ئێمە هەواڵی حەمە ئەمین ئاغامان پرسی، وتیان لە ماڵەوەیە دەنێرین بەدوایدا. لەپڕ ژنێک بە ڕووپۆشێکی ڕەشەوە بەس چاوی دیار بوو، هاتە ژوورەوە و بە دەنگێکی نوژەلی ژنانەوە وتی کامەیان مامۆستایە، پێشمەرگەیەکیش دەستی بۆ کاک حسێن ڕاکێشا و وتی ئەوەیە، ژنەش چووە تەنیشت حسێنەوە زۆر نزیک لەو دانیشت، حسێنیش نەختێ چووە ئەولاترەوە، ژنەش پتر چووە تەنیشتی تا خۆی بە کاک حسێنەوە نووساند، کاک حسێن لە شەرمان دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو، ئارەقە لە دەموچاوی دەتکا، لەپڕ هەستا و دەرپەڕی لەسەر جێگاکەی، کاک حەمە ئەمین ڕووپۆشەکەی فڕێ دا و دەستی کرد بە قاقای پێکەنین. دوو ڕۆژ لە بارەگاکەی ئەوان ماینەوە، دوای ئەوە ڕۆژی سێهەم لەگەڵ دوو شارەزای ڕێگاکان و بارەگای مەلاییەکان، هەردووکیان برا بوون (بابە عەلی و بابە ڕەسوول) کەوتینە ڕێ. زستانێکی زۆر سارد بوو، ڕێگاکەمان بەڕاستی ناخۆش و بەفراوی بوو، بە شاخی سورکێودا سەر کەوتین و ئاودیو بووین بە سێ شەو گەیشتینەوە سلێمانی، چونکە هەر بە شەو ڕێمان دەکرد، بە ڕۆژ خۆمان دەشاردەوە، لە شەوی سێهەمدا گەیشتینە قرگە، لەوێ کەسێک چاوەڕێی دەکردین، هات لەگەڵمان بردینی بۆ ماڵی خوالێخۆشبوو «سالح کارگەچی[١٠]».

## ژیانی هەمەدان

ئەو ماوەیەی کە لە هەمەدان بووین، هیچ هەواڵێکی کەسوکارمان نەدەزانی. ژیانی ئاوارەیی خۆی ژیانێکی ناخۆشە، لەوەش سەختتر؛ بێئاگایی لە کەسوکار و خۆشەویستان. بەسەربردنی ژیانی ڕۆژانە لەناو حەوشەی ئۆردووگایەکدا، دەبێتە هۆی ئەوەی هەموو جووڵە و هەڵسوکەوتێک ببێتە پانۆرامای بەشێکی ژیانی مرۆڤ و یادگارییەکی خۆش و ناخۆش. لە ژوورەکان و دوو هۆڵە گەورەکەدا تەختی نووستنی دوو قاتیان بۆ دانابووین، یەکێک لە سەرەوە و یەکێکیش لە خوارەوە. من هاوڕێ

---

[١٠] سەیری کتێبی "شۆڕشی ئەیلوول، بنیاتنان و هەڵتەکاندن" بکە.

تەختەکەم مامۆستا مەلا عومەر و لاغلویی بوو، پیاوێکی ڕووخۆش و دەمبەپێکەنین، ئەو دەیزانی قەزازی[11] جەمەدانی بکات، منیشی فێر کردبوو کە پێوەی خەریک بم و کاتی پێ بەرمە سەر، کاتی ڕۆژانەم بە خولی فێرکردنی فارسی و وەرزش و خوێندنەوەی شیعر دەبردە سەر، بۆیە ئارەزوویەکی زۆرم بۆ شیعر خوێندنەوە و لەبەرکردن و نووسینم لا پەیدا بوو. ئەوکات لە کرماشان ئێزگەیەکی کوردی هەبوو، بەرنامەیەکی تایبەتی بە ناوی «لە هەر باخە، گوڵێک» هەبوو کە مامۆستا «شوکروڵای بابان» بەڕێوەی دەبرد، ئێمە چەند کەسێک بووین، هەفتانە شیعری شاعرە کلاسیکییەکانمان بۆ دەنارد لەگەڵ ناوی خۆمان لەو بەرنامەیەوە دەخوێنرایەوە. ئەو بەڕێزانەی کە شەیدای شیعر بوون: ئەحمەد حەمکوڵ، جەعفەر عەبدولواحید، بەندە، د. ئەحمەد شاڵی. ئێمە جگە لە شیعر دۆستی و شیعر خۆشەویستیمان، مەبەستیشمان بوو کە کەسوکارمان لە وڵات کە گوێ لەو بەرنامەیە دەگرن؛ هەواڵی سەلامەتیی ئێمەش و شوێنیشمان بزانن. لە ڕێگەی ئەو بەرنامەیەوە ماڵی باوکم دڵنیا بووبوون کە من ماوم، چونکە دوای شەڕی ترشەکانی ماوەت من بەبریندارى چوومە ئێران، باوکم یەک دوو ڕۆژ دوای شەڕەکە چووبووە ماوەت و «خولە ئامە»ی ناسیبوو، هەواڵی منی لێ پرسیبوو، ئەویش وتبووی برایمی کوڕت لە شەڕەکەدا کوژراوە و جەلالییەکان تەرمەکەیان لەگەڵ خۆیان بردۆتە دیوی ئێران. ماڵی باوکم لە سەنگەسەر پرسەیان بۆ دانابووم، بەڵام لە ڕێگەی بەرنامەکەی شوکروڵای بابانەوە زانیبوویان کە ماوم و لە شاری هەمەدانم. هاوڕێیەکی نزیکم؛ (رائد جەلال) جەلال محەممەد ئیبراهیم میرزا ڕۆستەمی کە هاوڕێی سەردەمی خوێندنی ناوەندی و دواناوەندیم بوو، ڕۆژێک گوێی لە ناوی من دەبێ لەو بەرنامەیەوە، بەپەلە دەچێتە ماڵی باوکم و پێیان دەڵێ برایم ماوە، خۆم گوێم لە ناوەکەی بوو کە شیعری ناردووە بۆ ڕادیۆی کرماشان. ماڵی باوکم جارێکی تر دوای دانانی پرسە بۆم، دەکەونە خۆشی و شادی. بەڵام هەواڵی ناڕاستی کوژرانم، کۆشکی ئاواتی دوارۆژی ڕووخاندم، ئەو هیوایەی هەر لە سەردەمی منداڵی و مێردمنداڵیمدا چەکەرەی کردبوو، بوو بە بلقی سەر ئاو.

[11] قەزازی: هۆنینەوەی گولنگەی دوو لای جامانە.

## گەڕانەوەم بۆ سلێمانی و هەواڵە جەرگبڕەکە

دوو ڕۆژ لە ماڵی کاک ساڵح کارگەچی بووم کە هەرگیز من ئەو ڕێز و خۆشەویستی و خزمەتەی ئەوانم لەبیر ناچێ و توانای بەرزنرخاندنەکەشیم نییە، کاک حەمە چاوشین هات بەدوامدا و بردمی بۆ ماڵێک لە مەڵکەندی، یەکێک لە خانووە زۆر بچووک و کۆنەکان، پێک هاتبوو لە سەرخان و ژێرخان. سەرەتا نەمزانی ماڵەکە کێن، کە چوومە ماڵەکە؛ ئێوارەیەکی درەنگ بوو، لە حەوشەکەدا پەنجەرەیەک بە پەردەی ئەستوور داپۆشرابوو، دەرگایەک بە قفڵ داخرابوو، دەرگاکەیان کردەوە لەگەڵ کاک حەمە چووینە ژێرخانەکەوە، بینیم کاک شێخ ڕەئووف شێخ عارف لەوێیە، ئەوسا تێگەیشتم کە ئەم ژێرخانەکە شوێنی نیشتەجێی منە لەگەڵ شێخ ڕەئووفدا، ئیتر ژیانی ژێرزەمینیی من لەم ژوورەدایە، کاک شێخ ڕەئووف تێیگەیاندم کە ئەو ژوورە بارەگای لیژنەی ناوچەی قەزای سلێمانییە، لەمەودوا لێرەوە پەیوەندی بە ڕێکخراوەکانەوە دەکەین لەگەڵ لقی (٤)ی سلێمانی. ئەڵقەی پەیوەندیمان بە لقەوە؛ کاک حەمە چاوشین دەبێ و لەگەڵ ڕێکخراوەکانیش؛ کاک حەمەی وەستا مارف دەبێ کە ماڵەکەی خۆی لەگەڵ دایکیدا لە قاتی سەرەوەن و لێپرسراوی ڕێکخراوی «وارماوا»یە.

لە مانگی (١٩٦٤/١٢) تاکوو مانگی (١٩٦٥/٨)، ئێمە لەو ژوورەدا دەژیاین و کاری نهێنیی حزبیمان بەڕێوە برد. ئەگەر کارێکی دەرەوەمان هەبووایە، بە شەو وەک شەمشەمەکوێرە دەچووینە دەرەوە، یان بەیانمان لە ژوورەوە بە تایپ چاپ دەکرد و بە شەو یا خۆمان یان بە جەباری (هاوڕێ جەبار) خوشکەزای کاکە حەمەدا دەماننارد بۆ شوێنە پێویستەکان. بۆ کاری سەرتاشین، شەهید قادر کابان مانگی جارێک بە شەو دەهاتە لامان، پێویستیی سەرتاشینی لەگەڵ خۆی دەهێنا. کاک قادر کابان خۆی یەکێک بوو لە ئەندامانی ڕێکخراوی ناو شار و پەیوەندیی بە ڕێکخستنەکانی ناو شارەوە هەبوو. دوای گەیشتنی ئێمە بە ماڵی کاکە حەمە بە (٥) ڕۆژ، هەواڵیان بۆ هێناین ئەو دوو پێشمەرگە برایە (بابە عەلی، بابە ڕەسوول) لە سیوەیلەوە لە گەڕانەوە بۆ بارەگاکەیان لە شاخی سورکێو، هەردووکیان بە هەرەسی بەفر شەهید بوون، بەڕاستی داخێکی یەجگار زۆر بوو لە دڵمدا، دوو پیاوی بەجەوهەر و ئازا، ڕووخۆش، دەمبەپێکەنین، بەورە، دڵسۆز، گونجاو، ئەگەر خۆیان نەیانوتایە براین؛ کەس نەیدەزانی.

چونکە ئەوەندە لەگەڵ یەکدا گونجاو و هاورێ بوون، ڕۆحیان شاد. تا دوو هەفتەش دوای گەڕانەوەم، ئاگاداری ماڵی باوکم نەکرد کە گەڕاومەتەوە. لەوە زیاتر ئارامم نەگرت، هەواڵی ئەوان و «پ. خ»ی خۆشەویستم نەزانم، شەوێک بە شێخ ڕەئووفم وت دەڕۆم بۆ ماڵی مامم هەواڵی ماڵی باوکم بزانم، نامەیەکم بۆ باوکم نووسی بە ناوی مامەوە کە جەمالی کوڕی مامم ژن دێنێ، بەشکم بێت بۆ بەشداربوون لە شەکراوخواردنەوەکەی. چووم بۆ ماڵی مامم، لە دەرگام دا، ئامۆژنم کردیەوە و یەکسەر پێمی وت تاکە چۆلەکەیەکم هەیە مەبە بە هۆی بەفەتارەتدانی، پێم وت بەس مامم ببینم، مامم هاتە حەوشە نامەکەکەم دایە دەستی و وتم ئەم نامەیە بنێرە بۆ باوکم لە سەنگەسەر. بەو شەوە نەگەڕامەوە بۆ لای شێخ ڕەئووف، ڕۆیشتم بۆ جوولەکان بۆ ماڵی ئامۆزایەکی دایکم (پوورە بەهێ)، پوورە بەهێ بە بینینم سەرسام بوو، بە چەند چرکەیەک هیچی پێ نەوترا، دوایی باوەشی پیا کردم و گریا، پێم وت من هاتوومەتەوە، ڕەنگە ماڵی باوکم بێن بۆ سلێمانی، کە هاتن؛ حەمە بنێرە بەدوامدا. ئەو شەوە لەوێ مامەوە، بۆ سبەی شەو لەگەڵ حەمەی پوورە بەهێ چووینە شوێنەکەی خۆم، دوای دوو ڕۆژ مامم نامەکەی نارد بۆ باوکم بە کاک سابیری پوورزای باوکم، باوکم کە نامەکەی دیبوو؛ زۆر توورە بووبوو، وای زانیبوو بەڕاستی جەمال ژن دێنێ، نامەکەی بردبوو بۆ ماڵەوە، دایکم کە نامەکەی دیبوو؛ بە باوکمی وتبوو ئەوە دەستوخەتی برایمە، برایم ماوە با بڕۆین بۆ سلێمانی. کاک سابیر لەگەڵ دایکم و باوکم هاتن بۆ سلێمانی لە ماڵی پوورە بەهێ یەکمان بینی، دایکم کە منی دی؛ سەرەتا بڕوای نەکرد، بێدەنگ وەستا سەیری دەکردم و لەپڕ کەوت بە زەویدا و بوورایەوە، دوای ماوەیەک هۆشی هاتەوە و باوەشم پیا کرد، بەگریانەوە هەر لە خوا دەپاڕایەوە. شەو دوای هێوربوونەوەی دایکم و باوکم و هەموو خاوەن ماڵەکە، هەواڵی ماڵی خاڵم و خەڵکی ڕانیەم لە دایکم پرسی، باوکم لە پێشدا کەوتە گێڕانەوەی ماندووبوونی خۆی کە لە کاتی شەڕی ئێمە و مەلایی چەند بەدوامدا گەڕاوە و سۆراخی کردووم، پاشان کەوتە قسەوتن بە خولە ئامە کە چۆن بە درۆ هەواڵی شەهیدبوونی منی پێ داوە. دایکم باسی پرسەکەی کرد کە لە سەنگەسەر بۆیان داناوم بەبێدەنگی، لەبەر مەلاییەکان کە بارەگای مەلا مستەفا لە سەنگەسەر بوو. دوای کەوتنە باسی خەڵکی

کە کێ ماوە و کێ مردووە و کێ ژنی هێناوە و کێ شووی کردووە، هەتا وردە وردە هاتنە سەر باسی شووکردنی خۆشەویستەکەم، باوکم وتی: دوای دانانی پرسە بۆ تۆ؛ باوکی «پ. خ» هاتە ماڵەوە بۆ لام و پێی وتین تازە برایم شەهید بووە و دەسەڵاتمان نییە لەگەڵ کاری خوادا، هاتووم داواتان لێ بکەم کە دڵتەنگ نەبن لە بەشوودانی «پ. خ»ی کچم. لەگەڵ قسە گێڕانەوەکەی باوکمدا، من لە دڵەوە دەکوڵام و دەگریام بە دڵ نەک بە چاو، نەمدەزانی لەو کاتەدا چۆن هەستی خۆم لەبەردەمی ئەواندا دەربڕم، تەنیا ئەوەندەم وت کە شووی کردووە و تەواو یان هەر داخوازی کراوە، وتیان تەواو بەشوو دراوە بە «ع. ب» کە براکەی کارگوزار بوو لای باوکی «پ. خ». بێ توانا و دەسەڵاتی خۆم لەتاوا فرمێسک لە دڵەوە سەری کردە هەردوو چاوم، دایکم هەستی بە دڵتەنگی و فرمێسکەکانی من کرد و کەوتە بەرگری لە «پ. خ» و وتی «پ. خ» بە هیچ جۆرێک قایل نەبووە، تەنانەت دوو جار پەتی بە شیشی پانکەی ماڵی خۆیاندا هەڵواسیوە و ملی خۆی پێدا کردووە، بەڵام براژنی فریای کەوتووە و نەیهێشتووە بخنکێ، جارێکیش نەوتی بە خۆیدا کردووە و ئاگری بەر داوەتە خۆی، دیسان براژن و خوشکە بچووکەکەی فریای کەوتوون و نەیانهێشتووە زۆر بسووتێ، تا ئێستاش هەر چاودێریی دەکەن کە گوێزراویشەتەوە. «پ. خ» هەر لە پۆلی شەشی سەرەتاییەوە ئالوودەی یەکتر بووبووین، ئێمە لەگەڵ ئەواندا خێزانی ئەوەندە تێکەڵی یەک بووین کە ماڵی دوو براش ئەوەندە تێکەڵ نابن. باوکم و باوکی لە سەردەمی زگورتێتییان بەر لە ژنهێنان هاوڕێی یەک بوون، سەرەتای خۆشەویستیمان؛ من و ئەو خۆشەویستییەکی هاوڕێیانە و خوشک و برایانە بوو، بەڵام ئەو خۆشەویستییە سەری کێشا بۆ عاشقبوون. پشووی سەری ساڵی خوێندنی من لە پۆلی یەکی ناوەندی بووم و ڕۆیشتمەوە بۆ ڕانیە، شەو ماڵی ئەوان هاتن بۆ سەردانمان و بەخێرهاتنەوەی من، لە کاتی ڕۆشتنیان؛ «پ. خ» هەلی ڕەخساند نامەیەکی پێچراوی کرد بە گیرفانمدا. ئەو شەوە هەر بەدوای جێگایەکدا دەگەڕام نامەکەی تیا بخوێنمەوە، دەرفەتم نەبوو، چونکە ماڵی ئێمە لە حەوشەی خانووی ماڵی کاک ئەحمەد ڕەزادا بووین، تەنیا دوو ژوورمان هەبوو، جگە لە ماڵی ئێمە؛ ماڵی کاک ئەحمەد خۆیان، ماڵی کاک شێخ محەممەد شێخ ڕەشید کە هەر خزمی خۆمان بوون، ئەوانیش لە هەمان حەوشەدا بوون. ئارامم لێ

هەڵگیرابوو، خۆمم بۆ نەگیرا تا بەیانی چاوەڕێ بکەم، هەستام و دەستم دایە فانۆسە داگیرساوەکە و بە بیانووی سەرئاو چووم بۆ تەوالێتی حەوشەکە کە بە هەموو ماڵەکان هەر ئەو تەوالیتە هەبوو، گەر شەو درەنگ نەبووایە؛ دەبووایە ڕیز بگیرایە، خۆم کرد بە تەوالێتدا و پارچە کاغەزەکەم دەرهێنا و دەستم کرد بە خوێندنەوەی، هەموو لەشم کەوتە لەرزین و ئارەق ڕشتن، کە سەرەتای نامەکە چاوم بە وشەی خۆشەویستەکەم کەوت. ئەوەندەی لەبیرم مابێ لەم شێوەیە بوو:

**برایم گیان، خۆشەویستم، بۆ یەکەم جارە دان بەوەدا دەنێم کە لە دڵەوە، لە هۆشەوە خۆشم دەوێیت، هەست دەکەم وەک جاران نیم لەگەڵتدا، وەک دوو هاوڕێی منال هەڵسوکەوتت لەگەڵدا بکەم، جاران کە یەکترمان دەبینی؛ دڵخۆش دەبووین پێکەوە، ئێستاکە دەتبینم؛ هەموو لەشم دەلەرزێ، هەست بە موچرکێک دەکەم لە گیانمدا، خۆشم دەوێیت، عاشقتم، لە هەموو کەسم زیاتر لێم نزیکی، نازانم تۆش ئەو هەستەت هەیە. وەڵام وەڵام...**

**خۆشەویستت «پ. غ»**

لەو ڕۆژەوە ئیتر دەستمان کرد بە دانانی بەردی بناغەی خۆشەویستی و خەیاڵپڵاویی دوارۆژمان، ڕۆژ بە ڕۆژ، مانگ بە مانگ، ساڵ بە ساڵ، پەیوەندی و خۆشەویستی و عیشقی نێوانمان پتر دەبوو، هەردووکمان کێبرکێمان دەکرد لە خوێندندا، بەو هیوایەی سانەوی (دواناوەندی) تەواو بکەین و بڕۆین بۆ دانیشگا و پێکەوە هەنگاو بەرەو کۆشکی ئاوات و هێلانەی بەیەکگەیشتنمان بنێین، بەڵام کەس نازانێ قەدەر چیی لە هەگبەکەیدا بۆ هەڵگرتووە. بەڵێ، گەڕانەوەم لە تاراوگە زۆر خۆش بوو کە بە دایکی نیشتیمان و دایک و باوک و خوشک و برا و کەسوکارم و هاوڕێکانم شاد دەبوومەوە، بەڵام ئەو هەواڵە جەرگبڕە ئاگری بەر دایە خەرمانی هەموو خۆشییەکانم. پاشان هەواڵی کتێبەکانم پرسی، دایکم دیسان داخێکی تری نا بە دڵما کە پێی وتم کتێبەکانت هەمووی لە هێرشە سەربازییەکەی ڕژێم بە جاش و سوپاوە بۆ سەرسەنگەسەر، لە ترسا هەموویمان سووتاند و کردمان بە ئاگری ناو تەندوور، کولێرە و ساوەرمان پێ کرد. ئەوە یەکەم شاڵاوی لەناوبردی کتێبەکانم بوو تا ئەو ساڵە، کە زۆربەیانم بە

پاشەکەوتی ئەو مانگانەیە کرِیبوو کە باوکم کاتی خوێندنم بۆی دەناردم، لە دەمی خۆم و پێویستییەکانم دەگرتەوە و دەمدا بەو کتێبە نایابانەی کە لای خۆم پەسەند بوون، بەتایبەتی دیوانی شعری شاعیران. دوای ماوەیەک کە «پ. خ» کە بە گەرِانەوەمی زانی، لە رِێگەی خوشکە گەورەکەیەوە بەدەمی جوابی بۆ ناردم کە ئەو ئێستا کورِێکی هەیە، بەڵام ئامادەیە کە واز لە مێرد و ماڵ و تەنانەت کورِەکەشی بهێنێ گەر من ئامادە بم. من ویژدانم رِێگەی نەدام و قایل نەبووم، بەڵام خۆزیا قایل بوومایە، چونکە هەر لە سەرەتای ژیانی خۆی و مێردەکەشی هەتا مردنی هەردووکیان؛ هەر بە شەرِ و ئاژاوە و ئازارەوە دەژیان، تەنانەت لەبەر ئاژاوەی ناو ماڵ کورِە گەورەکەیان کە گەیشتبووە دانیشگا، خۆی کوشت. ئەوە یەکەم خۆشەویستیی ژیانم بوو کە هەتا نووسینی ئەم یادەوەرییانەش ئازارەکەی دڵ و دەروونی بەر نەداوم، ئێستا کە نزیکەی دە ساڵ بەسەر کۆچی دوایی تێپەرِیوە و شەست و دوو ساڵیش بەسەر یەکەم رِۆژی ئاشکرابوونی خۆشەویستیمان، هێشتا کوانووی ئاگر و گرِی ناو دڵم دانەمرکاوەتەوە، جار جار کە بەتەنیا سەردانی گۆرِەکەی دەکەم، ئارامیم پێ دەبەخشێ. دوای دوو رِۆژ، ماڵی باوکم رِۆیشتنەوە بۆ سەنگەسەر و من و کاکە حەمەی پوورە بەهێش لە شەودا گەرِاینەوە بۆ ژێرزەمینەکەم[١٢]. لە شاری سلێمانیدا هەر لە سەرەتای دروستبوونی ئەم شارە، زۆر کەسانی هەڵکەوتوو و ناسراو و لێهاتوو لە زۆر رِووەوە بە ناوی دایکیانەوە ناسراون، لەبەر ئەوەی کە بەساوایی باوکیان کۆچی دوای کردووە، دایکیان شانی داوەتە بەر ئیشکردن و نان پەیداکردن بۆ بژێویی منداڵەکانی و پێگەیاندنیان، کە گەورە بوون لە کۆڵان و گەرِەکدا لەلایەن منداڵانی هاوسێ و هاوتەمەنەکانیانەوە ئەو بێباوکانە بە ناوی دایکیانەوە بانگ کراون، دواتریش هەر ناوی دایکیان بۆتە پاشگری ناوەکانیان.

---

[١٢] خوالێخۆشبوو "محەممەد مەجید" کە هەر بە حەمە سوور یا حەمەی بەهێ ناسرابوو، هەر لە منداڵی واتە دوو ساڵان بووە کە باوکی کۆچی دوایی کردووە و دایکیشی شووی کردۆتەوە، حەمە کەوتۆتە لای باوەژنی واتە بەهێی ئامۆزای دایکم، ئەویش لەگەڵ کچەکەی خۆیدا بەخێوی کردوون بە کرێکاری و ئیشی کارگەی پاککردنەوەی توتن. لەبەر بێباوکی لە گەرِەکدا، هەر بە حەمەی بەهێ ناسراوە.

## خەباتی ژێرزەمینیم

لە پێشەوە کەمێک باسی ئەو ژێرزەمینەم کردووە، بەڵام دەمەوێ ئێستا وەک یادگارییەکی زیندوو لە ژیانی سیاسیمدا کەمێک بەدرێژی باسی بکەم. زەوییەکی بچکۆلەی ٨٠م٢ لە گۆشەی کۆڵانێکی کورتی گەڕەکی مەڵکەندی، خانوویەکی کۆنی دوو قاتیی لەسەر دروست کرابوو کە پێک هاتبوو لە ژێرخانێک و گەنجینەیەک لە ژێرەوە، لەسەریەوە ژوورێک و پشتەهەیوانێک و هەیوانێک. ئەم خانووە بچووکە بۆ ماوەیەک بوو بە ئەڵقەی یەکانگیرکردنی سەرکردایەتی و سلێمانی و ناحییەکانی سەر بە شاری سلێمانی (قەزای سلێمانی). ئەو خانووە هیی یەکێک لە پیاوە زۆر ناسراوەکانی شاری سلێمانی بوو (وەستا مارفە دریژی بەننا) و وەستا مارف باوکی کاکە حەمە بوو کە ناسرابوو بە حەمەی جابی. کاکە حەمە ئەندامی لیژنەی ناوچەی قەزای سلێمانی و لێپرسراوی ڕێکخراوی «وارماوا» بوو، خۆی و هاوسەری و منداڵێکی و دایکی لە ژوور و پشتەهەیوانەکەدا دەژیان، ئەو ژێرخانەشی وەک وەکر دابوو بە لیژنەی ناوچە، کە کاک شێخ ڕەئووف وەک لێپرسراوی لیژنەی ناوچە و بەندەش وەک جێگیر و کارگێڕی لیژنەی ناوچە کارمان تێدا دەکرد.

لیژنەی ناوچەی قەزای سلێمانی لە حەوت ڕێکخراو پێک هاتبوو، ڕێک وەکوو دابەشکردنە بەڕێوەبەرایەتییەکەی (ئیدارییەکەی) ئەو کاتە:

١. ڕێکخراوی وارماوا کە ناوەندەکەی دەربەندیخان بوو، حەمەی جابی لێپرسراوی بوو.

٢. ڕێکخراوی شارەزوور کە ناوەندەکەی عەربەت بوو، مەلا ڕەسووڵ خەراجیانی لێپرسراوی بوو.

٣. ڕێکخراوی سرۆچک کە ناوەندەکەی بەرزنجە بوو، لێپرسراوەکەی مامۆستا حەمە ئەمین ژاژڵەیی بوو.

٤. ڕێکخراوی سەرچنار کە ناوەندەکەی سەرچنار بوو، لێپرسراوەکەی ڕەسووڵ مامەند بوو.

٥. ڕێکخراوی سورداش کە ناوەندەکەی سەرگەڵوو بوو، لێپرسراوەکەی ڕەسووڵ حەمەزێڕ بوو.

٦. ڕێکخراوی بازیان کە ناوەندەکەی تەیناڵ بوو، لێپرسراوەکەی شەوکەتی حاجی عەلی بوو.

٧. ڕێکخراوی قەرەداغ کە ناوەندەکەی قەرەداغ بوو، لێپرسراوەکەی کارگێڕ سەرپەرشتیی دەکرد.

هەر ڕێکخراوێک لە سێ ئەندام پێک هاتبوو، لێپرسراوێک و دوو ئەندام ڕێکخراو لەبەر پاراستنی نهێنی و پاراستنی ڕێکخراوەکەش لە پەلاماری مەلاییەکان. ئێمە ماوەی هەشت مانگ هەموو زستان و بەهار و نیوە زیاتری هاوینمان لەو ژێرخانەدا بەسەر برد کە زۆربەی کاتەکان جیاوازیی شەو و ڕۆژمان ئەوەندە نەبوو لەبەر ئەوەی کە پەنجەرەی ژوورەکە لە دەرەوە بە بەتانییەکی ڕەشی سەربازی داپۆشرابوو، دەرگاکەش بە قفڵێکی زل لە دەرەوە لەلایەن دایکی کاکە حەمەوە قفڵ دەدرا، لە ژێرخانەکەوە زەنگێکمان بە پەت کە سەرێکی لای ئێمە بوو سەرەکەی تری بە زەنگەکەوە لە ژووری سەرەوە لای پووری بوو کە پێویستمان بە دەرەوە ببووایە؛ پەتەکەمان ڕادەکێشا لە سەرەوە زەنگۆڵەکە لێیدەدا و دەرگای لێ دەکردینەوە. وەک شەمشەمەکوێرە بە ڕۆژ لەو ژێرخانەدا کارمان دەکرد و بە شەویش لە کاتی پێویست دەچووینە دەرەوە بۆ پەیوەندیکردن بە نوێنەری ڕێکخراوەکانەوە و دانەوەی وەڵامی ڕاپۆرتەکانیان و ئاگادارکردنەوەیان لە بڕیار و ئامۆژگارییەکانی لق و سەرکردایەتی و هەواڵە سیاسییەکان، لەو ماوەیەدا کەوتینە پەیوەندیکردن بە هەندێ لە لقەکانی پێشمەرگەی ناوچەی شارەزوور و وارماوا و قەرەداغەوە بە نامە لەسەر پێشنیاری لقی سلێمانی و سەرکردایەتی، لەوانە: کاکە حەمەی فەرەج، کاک تالیب موریاسی و کاک حەمە موریاسی، کە هەرسێکیان سەرلقی پێشمەرگە بوون و ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ پەیوەندیکردن بە ئێمەوە و لە ڕێگەی ئێمەشەوە بە لق و سەرکردایەتییەوە. ئەو پەیوەندیکردنە بارودۆخی کار و چالاکیی ئێمەی زۆر لەبارتر و گونجاوتر کرد، چونکە توانیمان بە ناوی ڕاکردووی شارەوە لەو ژێرخانە ڕزگارمان بێت و بچینە دێی قڵیجە و میرەدێ کە پتر سنووری چالاکیی لقەکەی عەریف تاڵیب موریاسی و کاک حەمەی فەرەج بوو. ئیتر بە ئازادییەکی زیاترەوە کارمان دەکرد، قوتابخانەکەی قڵیجەمان کرد بە بارەگای خۆمان، دێکانی ئەو ناوە پارێزراو بوون بە هۆی ئەو ڕێزەی

کە مەلاییەکان لە بەگەکانی ئەوێیان دەگرت، قڵیجە و میرەدێ؛ ماڵی سەعید بەگ و عەزیز بەگ و مستەفا بەگی لێ بوو، مەحموودی عەزیز بەگ ئەندامی ڕێکخراوی وارماوا بوو، ڕەئووف مستەفا بەگ یەکێک بوو لە جەلالییە هەرە تۆخەکان، عوسمانی سەعید بەگ یەکێک بوو لە بەرپرسەکانی یەکێتیی قوتابیانی باڵی «م. س»، ئەمانە هەموویان کەسایەتییەکی بەهێزیان هەبوو لە ناوچەکە، لەو ماوەیەی لە قڵیجە بووین لەگەڵ شەهید عوسماندا کە هاوڕێی نزیکی شەهید خەلیلی برام بوو لە قوتابخانەی دواناوەندیی نیشتمان (ثانوی وطن) بوو بە هاوڕێیەکی زۆر نزیکی منیش. ئای مێژوو چەند قۆناغی خۆش و ناخۆش، چەند ڕەفتار و کرداری شۆڕشگێڕانە و جوامێرانە و نامرۆڤانە و تاوانکارانە، چەند ڕووداوی بارگاوی بە لە خۆبووردەیی و دڵسۆزی و ملشکێنەر و پاشقولکاریت دیوە و لە هەناوی خۆتدا هەڵگرتووە! ئای مێژوو چەند سەرکردەی بوودەڵە و کاسەلێس و خۆفرۆش و ترسنۆکی ڕاکردوو لەبەردەم دوژمن و سازشکار و خزمەتکاری دوژمنانی کوردت لە دووتوێی لاپەڕەکانی خۆتدا شاردۆتەوە! ئەی چەند ڕاپەڕین و هەڵوێستی مەردانە و شۆڕشگێڕانەی جەماوەری کوردیشت لە هەناوی خۆتدا شاردۆتەوە کە هەرگیز چۆکیان بۆ دوژمن دانەداوە و کۆڵیان لە خەبات و تێکۆشان نەداوە، بەڵام سەرکردەکانیان چۆکیان بۆ دوژمن پێ داداون! مقۆمقۆی گەڕانەوەی هەڤالانی هەمەدان و «م. س» کەوتە ناو زاری خەڵکی، ناحەزانی یەکڕیزی و یەکگرتنەوەی هەردوو لاکەی مەلایی و جەلالی کەوتنە نانەوەی ئاژاوە و خۆشکردنی شەڕی براکوژی و کورد بە کورد بەکوشتدان، چەندین ڕووداوی قیزەونی وەک کانی ماسی و تانجەرۆ و سەنگەسەر و قەسرۆ ماکوز بە دزێوی و ڕووڕەشی بوونە بەشێکی مێژووی ئەم گەلە بێکەسە و سەرمەشقی گەیاندنی بانگی شەڕی براکوژی.

من نامەوێ لێرەدا ئەو مێژووە پڕ شەرمەزارییەی شەڕی جەلالی و مەلایی و هاندەرە ناوەکی و دەرەکییەکان دووپات بکەمەوە، هەر کەس مەبەستیەتی با سەیری کتێبی «شۆڕشی ئەیلوول و بنیاتنان و هەڵتەکاندن» بکات.

مانگی هەنگوینیی نێوان بارزانی و مشیر عەبدولسەلام زۆری نەخایاند، لە سەرەتای مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٦٥)ەوە وردە شەڕ و وردە بیانوو لە

هەردوو لایانەوە سەری هەڵدا، لەگەڵیدا سەرەتاتکەی ڕێککەوتنی نێوان بارزانی و «م. س» سەری هەڵدا. مەلا مستەفا لەگەڵ ڕژێمی ئێرانی کەوتە سەودا و سەوداکاری، مەلا مستەفا دەیویست بە تیرێک؛ دوو نیشان بپێکێ:

١. بە هۆی ڕێککەوتنی لەگەڵ ئێران، شوێنی «م. س» لەوێ لەق بکات و ناچار بە گەڕانەوەیان بکات بۆ ژێر دەستی خۆی.

٢. «م. س» ناچار بکات بە هەموو مەرجەکانی مەلا مستەفا قایل بن.

لەولاشەوە «م. س» دەیویست بۆچوونەکانی خۆیان سەر بکەوێ و بە هەژموونی ئێرانی، شەڕی نێوان بارزانی و مشیر عەبدولسەلام دەست پێ بکاتەوە.

٣. ئێرانیش کە باڵی «م. س»ی گرتبووە خۆی، وەک «ماڵی سپی بۆ ڕۆژی ڕەشی» هەڵگرتبوو، تا هەر کات بیەوێ، بیانکاتەوە بەگژ حکومەتی عێراقیدا.

مقۆمقۆکەی گەڕانەوەی باڵی «م. س» بوو بە ڕاست و لە مانگی (١٩٦٥/٦)دا هەموویان گەڕانەوە، بەڵام مەلا مستەفا قایل نەبوو، لە هەر کوێ بیانەوێ؛ خۆیان سەرپشک بن بە نواندنی چالاکیی سیاسی و پێشمەرگانە. پێشمەرگەکانی سەر بە «م. س» و هەمەدانی دابەش کرد بەسەر بەرەکانی شەڕدا لەژێر فەرماندەیی فەرماندە مەلاییەکانی خۆی. سەرکردایەتیی «م. س» ناردە دۆڵەڕەقە لەژێر پاسەوانێتی و چاودێریی عەباس مامەند ئاغادا بن، بۆ ئەوەی هەر کات بیەوێ؛ وەک دەستبەسەرێک بیانگرێ و لەناویان بەرێ. دوای چەند مانگێک، کاک عەلی عەسکەری بە عەبدولڕەحمان ڕووتەدا نامەیەک بۆ مەلا مستەفا دەنێرێ و دەنووسێ کە زۆر دەمێکە ماڵ و منداڵی خۆیان نەدیوە، ڕێگەیان بدا وەک پشوو بۆ چەند ڕۆژێک بچنەوە لای ماڵ و منداڵیان. ئەوانەی کە لە دۆڵەڕەقە بوون: عەلی عەسکەری، مام جەلال، عومەر دەبابە، حلمی عەلی شەریف، مەلا مستەفا جوابەکەی بە عەبدولڕەحمان ڕووتەدا بۆ ناردبوونەوە کە ڕێگەیان نادا و نابێ بڕۆن، کاک عەلی هەر زۆر لە عەبدولڕەحمان ڕووتە دەکا کە دەقی جوابەکەی مەلا مستەفای پێ بڵێ. ئەویش بە هۆی زۆرلێکردنی کاک عەلی، دەقی قسەی مەلا مستەفای پێ دەڵێ کە وتبووی ڕێگەیان نادەم با ژنەکانیان بێڕەوشت بن، کاک عەلی دەڵێ دیارە خۆی ئەزموونی چواردە ساڵ دووریی لە ژن و منداڵەکانی خۆی هەیە، بۆیە وای گوتووە. پلانەکەی مەلا مستەفا سەری نەگرت کە دایتابوو

لە کاتی دیاریکراودا وەک عەلی حەمدی و مەحموودی حاجی تۆفیق و عومەر و عەباسی چوارقورنە و مەلا فاتیح عەسکەری ڕانیە بیانکوژێت و تیرۆریان بکات. جواب بۆ عەباس ئاغا دەنێریّ کە هێزێک دەنێریتە دۆڵی ئاکۆیان بۆ کاری تایبەت ئاگادار بێ، عەباس ئاغاش ئەو چوارە ئاگادار دەکات کە بڕۆن و ئەو ناوە بەجێ بهێڵن و هەواڵەکەی مەلا مستەفایان دەداتێ. ئەوانیش بەنهێنی دەڕۆن بەرەو سلێمانی و کەرکووک و خۆیان دەشارنەوە تا ئەو کاتەی دەکەونە وتوویژ لەگەڵ «عەبدولڕەحمان بەزاز» و ئیتر بارەگای سەرکردایەتیی ئاشکرا لە بەکرەجۆ دادەنێن، لەو کاتەوە نازناوی جاشی شەست و شەشیان بەسەردا دادەبڕن. بەڵام بۆ مێژوو دەیڵێم کە هەر لەو کاتەی کە «م. س» لە وتوویژ بوو لەگەڵ عەبدولڕەحمان بەزاز لە ساڵی (١٩٦٦)، هەر لە هەمان کاتیشدا مەلا مستەفاش لەو وتوویژە بوو لەگەڵ بەزازدا، واتە گەر بۆ جەلالییەکان جاشایەتی (٦٦) بسەپێنرێ، بۆ مەلاییەکانیش هەر هەمان شت دەبێ.

## تاڵانکردنی ماڵی باوکم و ڕەوکردنیان

بە گەڕانەوەی باڵی «م. س» و دەستکردنیان بە وتوویژ لەگەڵ عەبدولڕەحمان بەزاز، ئێمەش وەک لیژنەی ناوچەی قەزای سلێمانی لە کاری ژێرزەمینی و نهێنییەوە کەوتینە کاری ئاشکرا و پەیوەندیکردن بە ڕێکخستنەکان و هێزی پێشمەرگەوە، بەتایبەت لەوانەی کە هەستمان بە نزیکییان دەکرد لە ئێمەوە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٦، لقی سلێمانی ئاگاداریان کردین کە ڕەئیس کەمال (کەمال موفتی) دەنێرنە بەری قەرەداغ و گەرمیان، پشتگیریی بکەین و فەرماندە و «پ. م» کاتی سەربەخۆمان ئاگادار بکەین کە پەیوەندی (التحاق) بەوەوە بکەن. کاک کەمال هات، ئەو کاتە کاک نووری مەلا حەکیم؛ فەرماندەی هێزی قەرەداغ و گەرمیان هیی مەلایی بوو، ئەو هێز و ناوچەیەی بەجێ هێشت و چووە بەرەی شارباژێڕ، لەو کاتەوە ئیتر سەرجەم ناوچەکانی قەرەداغ و وارماوا و عەربەت و بازیان و سورداش هەمووی بە سلێمانییشەوە کەوتە دەست هێزەکانی جەلالی «م. س». بە هۆی بوونی من لەناو باسکی جەلالیدا، باسکی مەلایی پارتی ماڵی باوکمیان لە سەنگەسەر تاڵان کرد و ئاگاداریان کردن کە سەنگەسەر چۆڵ بکەن و لە ئاوی دوکان بە بەری خەلەکانەوە بۆیان نییە نیشتەجێ بن. وەڵامیان بۆ

من نارد، منیش کوێخا حسێن هەنارانم شک دەبرد کە هاوکاریم بکات، زۆر دۆستانە و بێ بەهایەک، (٥) ئێستری بە وڵاغدارەوە نارد بۆ سەنگەسەر، دایکم و خوشکەکانم و برا بچووکەکانم بە سواری و بەسەڵتەزەلامی بۆ هێنام بۆ سلێمانی. لە خانووی کاک ساڵح کارگەچیدا لە ژوورێک و پشتەهەیوانێک جێگیر بووین، بە هاوکاریی دۆست و هاوڕێکانم کەرەستە پێویستییەکانی ناوماڵیان بۆ دابین کردین، بەتایبەتی هاوڕێ لەدەستانچووم کاک مەجید سوڵتان.

## وتووێژی «م. س» لەگەڵ ڕژێم

وتووێژی «م. س» لەگەڵ حکومەتی عێراقی بووە هۆی ئاشکرابوونی پارتی، باسکی جەلالی لە ئیشکردنی ڕێکخراوەیی و سیاسی و پاشان هەوڵدان بۆ پێکهێنانی هێزی چەکداری.

١. ڕژێمی عێراقی لەگەڵ هەردوو باڵەکە کەوتە گفتوگۆ و دانوستاندن بە مەبەستی سوودوەرگرتن لە کات بۆ خۆقایمکردن و تەیارکردن لە هەموو ڕوویەکەوە.

٢. درێژەدان بە ناکۆکیی نێوان هەردوو باسکەکە، بە مەبەستی لەتوپەتکردنی هێز و توانای سیاسی و پێشمەرگانەی کورد لەسەر بنەمای فەلسەفەی «فرق تَسُد».

٣. حکومەتی عێراقی هاوکاریی هەردوو لای باسکی مەلایی و جەلالیی دەکرد بە پارە و چەک و فیشەک بۆ لێدانی یەکتری و لاوازکردنی هەردوو لایەنەکە بە یەکتری.

هەموو لایەنگرانی «م. س» لەناو پێشمەرگەکانی لای بارزانی کەوتنە سەنگەر گواستنەوە لەوبەرەوە بۆ ئەمبەر و هەموو ڕێکخستنە نهێنی و شاردراوەکانی باڵی جەلالی خۆیان ئاشرا کرد و بە کاری پێشمەرگانە یا کاری ڕێکخراوەیی کەوتنە سەنگەر گواستنەوە لە لق و لیژنەی ناوچە و ڕێکخراوەکانی پارتی، باسکی مەلاییەوە بۆ لای باسکی جەلالی، بەو جۆرە شەڕە براکوژی و کورد بە کورد بە کوشتدانەکە زۆر بەسەختی و بەخەستی سەری هەڵدایەوە، سەرەتا لە بازیان و سورداش و دۆڵی جافەتی و قەرەداغ، پاشان گەرمیان و شارەزوور و هەڵەبجە و شارباژێر، دواتر هەموو مەیدانی کوردستانی گرتەوە، تا کار گەیشتە ئەوەی باسکی مەلایی تەنیا سەر سنورەکانی ئێران و تورکیایان بەدەستەوە مایەوە تا ساڵی ١٩٧٠ باڵی مەلایی بۆ شکاندنی باڵی جەلالی و بەهێزکردنەوەی

خۆیان کەوتنە وتوویژ لەگەڵ حکومەتی بەعسییان بە دەستپێشکەریی سەدام حسێن. ئەو شەڕە نزیکەی چوار ساڵی خایاند، جگە لەو چەند مانگەی هاتنی بەعسییەکان لە ١٩٦٨دا بۆ سەر حوکم و گفتوگۆیان لەگەڵ بارزانی. من نامەوێ لێرەدا درێژەی شەڕی جەلالی و مەلایی و هۆکارەکان و هاندەرەکان و ڕۆڵی دوژمنانی کورد لەو شەڕی براکوژییەدا باس بکەم کە من خۆم یەکێک بووم لە بەشداربووانی تا ساڵی ١٩٦٧ و بەشەرمەزارییەوە لەبەردەم گەلەکەمدا نەفرەتی لێ دەکەم و بەدرێژی لە کتێبی شۆڕشی ئەیلول، بنیاتنان هەڵتەکاندن»دا باسم کردووە، هیوادارم خوێنەری ئازیز لێم ببوورن. من ئیتر کادرەکەی جاران نەمام، هەر تەنیا بەرپرسیار بم لە بژێوی و پێویستییەکانی خۆم، کۆمەڵێ ئەرک و بەرپرسیارێتیی ترم کەوتە سەر شان، بە هاتنی ماڵی باوکم بۆ سلێمانی بە گیرفانی بەتاڵ و بەسەڵتەزەلامی؛ ئەرکی بەڕێوبردنی ماڵ و کرێ و خانوو و خەرجیی سێ برای قوتابیم (شەهید خەلیل، شەهید هاوار، ڕزگار) و دوو خوشکم (پەروین، نەکەرۆز) و دایکم، بە مووچەی کادرێکی پیشەیی کە (٧) دینار بوو؛ نەدەچوو بەڕێوە. ئاگاداری سەرکردایەتیم کرد کە یان مووچەکەم بۆ پتر بکەن وەک زگورتی سەیرم نەکەن، یان بمبەخشن لە کاری کادری پیشەیی، تا بتوانم لەپاڵ ئیشکردن و خەرجی پەیداکردن بۆ خێزانەکەم، کاری حزبییش بکەم. وەڵامەکەیان نەرێنی بوو، واتە نەیانتوانی مووچەکەم پتر بکەن و سەرپشکیان کردم لە مانەوەم بە کادری پیشەیی یان ئازاد بم لە کارکردن لە هەر شوێنێک دەتوانم. ئەوان واتە سەرکردایەتی هەستیان بەرامبەر من گۆڕابوو، لەبەر ئەوەی دوو مانگ پێش ئەو بەخشیننامەیە؛ نامەیەکم بۆ ناردن لەپاش هەڵسەنگاندنێکی بابەتییانەی بارودۆخی کوردستان و کێشەی کورد و بارودۆخی ئەوسای ڕژێمی عێراقی، پێشنیارم بۆ سەرکردایەتی کرد کە هەنگاوی گفتوگۆی نێوان هەردوو لامان واتە باسکی جەلالی و مەلایی با وەک دەستپێشخەرییەک لە ئێمەوە بێ، لانی کەم خوێنی ڕۆڵەی کورد بە دەستی کورد بەهەدەر نەڕوا[١٣]، لە نووسینی ئەو پێشنیارەوە کەوتبوونە گومان لێم، ئەو داوای بەخشینەشیان بە هەل زانی کە پەسەندی بکەن بە بیانووی ئەوەی کە توانای زیادکردنی مووچەکەمیان نییە.

---

١٣ بۆ بینینی درێژەی ئەو نامەیە و ئەنجامەکەی، سەیری کتێبی "شۆڕشی ئەیلوول و بنیاتنان و هەڵتەکاندن" بکە.

## بەشی پێنجەم
## ژیان بە ئارەقەی ناوچەوان

گەرمەی پەیوەندیی نێوان باسکی جەلالی و ڕژێمی عێراقی بوو، باسکی جەلالی هەر چی بیانویستایە؛ دەیانتوانی بیکەن، مامۆستایان دەکرد بە بەڕێوەبەری ناحیە و بە قائیمقام، دەرنەچووانی ئامادەییان دەکردە مفەوەض و معاون، دەیانتوانی چییان بویَ لە دامەزراندنی فەرمانگەکان بیکەن، پێش ئەوەی دەستم لە کاری کادری پیشەیی بکێشمەوە، بەڵێنیان دابوو پێم بمکەن بە بەڕێوەبەری ناحیە، بەڵام من قایل نەبووم، چونکە دەرچووی کۆلێجی یاسا نەبووم، کەچی دوای وازهێنانم بە نووسەری فەرمانگەیەکیش دانەدەمەزرام، ناچار شانم دایە بەر کرێکاری. مانگی (١٩٦٧/٧) بوو، ڕۆژێک هات بە بیرمدا پرسیار بکەم بزانم چەند فەرمانگە هەیە لە سلێمانیدا، دوای بژاردنی، (٢٠) قەبالە (عریضە) نامەم نووسی کە من دەرچووی ئامادەیی ساڵی (١٩٦١-١٩٦٢)م و دەمەویَ بە فەرمانبەر دابمەزرێم، قەبالەکانم بەسەر هەموو فەرمانگەکاندا دابەش کرد، تەنیا لە فەرمانگەی گومرگی تووتن (دائرە الاخصار) وەڵامم بۆ هاتەوە کە بە کۆڵهەڵگیری کاتی (حمال وقتی) وەرگیرابووم بۆ ماوەی سێ مانگ بۆ تووتن کۆڵکردن و گوێزانەوە لە مەیدانەوە بۆ عەمبارەکان، مانگی بە ٥٠٠،٧ دینار. ناچار بۆ ڕۆژی دوایی بە قاتێ جلی جوانی کوردییەوە چووم بۆ فەرمانگەی پشکنینی تووتن، وتیان بچۆرە لای ئەو چاودێرە، منیش چوومە لای سەیرێکی کردم و وتی: «ئەی کۆپان و قولاپەکەت کوا؟ تۆ دەبێ کۆڵ هەڵگری.» قوتوویەکی پڕ لە بۆیاخی سوور و فڵچەیەکی دامێ و وتی ئەمڕۆ ژمارەی پشکنین لە فەردەکان بدە، بەڵام سبەینێ بێ کۆپان و قولاپ نەیەیتەوە. تا نزیکی نیوەڕۆ ئیشم کرد، لەپڕ بینیم کەسێک شەقێکی لە فەردە تووتنەکەی بەردەمم هەڵدا و باوەشی بە منا کرد و ماچی کردم، ناسیمەوە کاک

عەبدوڵڵا وسوو ئاغا بوو، هاوڕێی قوتابخانەم بوو، ئەو لەوێ فەرمانبەر بوو. دوای هەواڵپرسین و چاک و خۆشی، قوتووە بۆیاخەکەی پێ دانام و دەستی گرتم و بردمی بۆ لای بەڕێوەبەر (ئەمین مەولوود)، پێی وت ئەم پیاوە دەرچووی ئامادەییە و زۆر لە ماتماتیکدا وریایە، گوناحە بەو پارە کەمە ئەو ئیشە قورسەی پێ بکەن، خۆ تاوانی نەکردووە بووە بە پێشمەرگە. ئەمین مەولوود پێی وت بیبەرە بەشی ژمێریاری و مووچەی مانگانەکەمیان کرد بە (١٢،٠٠٠) دوانزە دینار. سێ مانگ لەوێ کارم کرد لە بەشی ژمێریاری، داوام کرد بمکەن بە فەرمانبەر و قەباڵە نامەیەکم نووسی، «ئەمین مەولوود» بۆی واژۆ کردم، وتی بیبە بۆ بەغداد بۆ لای «ئەکرەم جاف»؛ بەڕێوەبەری گشتی. چووم بۆ بەغداد بۆ بەڕێوەبەرایەتیی گشتی (اختصار)، بەڵام لەباتیی ئەوەی قایل بێ، ڕێگەی ئەنجوومەنی ڕاژە (مجلس الخدمە)ی پیشان دام.

## من و مام یوسف و ئوتێل سیروان

یەک تەختم لە ژوورێکی ئوتێل سیروان لای مام یوسف بەکرێ گرت بە مانگانە، مانگی بە یەک دینار و نیو، هەموو ڕۆژێک دەچوومە ئەنجوومەنی ڕاژە و دەگەڕامەوە بێ ئەنجام. ناو سکی خۆم دانابوو، ئەوەندە بەیانیان نان و نیسکێن و نیوەڕوان کولێرە و تاعین و ئێوارانیش فەلافل بخۆم. ڕۆژێک لە شەقامی ڕەشید دەچووم بەرەو مەیدانی ئازادی (ساحە التحریر)، لەنزیکی مەیدانەکە لە باڵەخانەیەکی (٩-١٠) قات، دەیان قەطعە بەسەر دەرگاکەیدا هەڵواسرابوو، هەر لە نووسینگەی بەڵێندەر و ئەندازیار و پارێزەر هەتا دکتۆر و نووسینگەی تریش، ناوی پارێزەرێک زۆر سەرنجی ڕاکێشام، بۆ یەکەم جارم بوو ناوی وا ببیستم، نوسرابوو نووسینگەی پارێزەر «علاء الدین الوسواسی»، هات بە بیرمدا بچم بۆ نووسینگەکەی، بزانم نووسەرێک (کاتب) دابەشکەری داوایەکی «موزع الدعاوی» ناوێت، سەر کەوتم بۆ قاتی (٤)، لە دەرگام دا، پیاوێک دەرگای کردەوە بە عەرەبی فەرموو فەرمووی لێ کردم. وتم دەمەوێ «استاذ علاء» ببینم، بردمی لە ژووری چاوەڕوانی دانیام، وتی هێشتا نەهاتووە، بەڵام کاتی هاتنیەتی. «استاذ علاء» هات، پیاوێکی کەڵەگەتی تەمەن لەنێوان (٤٥-٥٠) ساڵ، زۆر شیکپۆش بوو، بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم، وای زانی کێشەیەکی گەورەی دادگام

هەیە. وتی فەرموو کێشەت چییە، منیش بۆم باس کرد کە بێئیشم، گەر پێویستی هەبێ لە نووسینگەکەی داوا و نووسینەکانی بۆ چاپ بکەم و بۆشی دابەش بکەم بەسەر دادگاکاندا. پێکەنی و لێی پرسیم شەهادەم چییە، چ نەتەوەیەکم، لە کەیەوە بێئیشم، چەند زمان دەزانم، منیش وەڵام دایەوە کە کوردم، دەرچووی ئامادەیی (١٩٦١-١٩٦٢) و لەو ساتەوە بێئیشم و کوردی و عەرەبی و فارسی دەزانم، سەرەتا بەپێکەنینەوە پێی وتم بۆ ناچم ببم بە سەفیر و پاشان لێی پرسیم لە ساڵی (١٩٦٢) تا ئێستا (١٩٦٧) بۆ کارێکت دەست نەکەوتووە، دیارە تۆش... لە دڵی خۆمدا وتم ئێستا دەڵێ «عُصاة» بوویت، بەڵام زۆر بەڕێزەوە وتی دیارە لە شاخ بوویت، منیش ڕاستییەکەیم پێ وت، بە ڕوویەکی خۆشەوە وتی بەیانی سەعات دە وەرەوە بۆ ئۆفیسەکەم. زۆر دڵخۆش بووم، لەبەر دوو هۆ: یەکەم: زۆر ڕووخۆش و بەڕێز بوو، دووەم: کە وتی بەیانی وەرە. لەو ڕۆژەوە من بووم بە تایپیستی ئەو لە ئێواران، لە بەیانیانیش داواکانم بەسەر دادگاکاندا دابەش دەکرد، پارێزەرێکی زۆر شارەزا و ناسراو بوو، زۆربەی خەڵکە بەتواناکان لە ڕووی گیرفانەوە دەهاتنە لای ئەو، زۆر ناسراو و ڕێزلێگیراویش بوو لەلای دادوەرەکان. ئیتر نانم کەوتە ڕۆنەوە، مانگی (٢٥) دیناری دەدامێ، لە نان و نیسکێنە و حەڵوا پوشکە و فەلافل ڕزگارم بوو، هەموو مانگێکیش پانزە دینارم دەنارد بۆماڵەوە. «علاء الدین» زۆر لە من دڵنیا بوو، عەسران خەڵکانێک دەهاتن بۆ لای کە هەموویان کەسانی سیاسی بوون، وەک بابا عەلی شێخ مەحموود، عومەر عەلی و محەممەد حبوبی و کەسانی تر. دوای شەش مانگ، باوکم وەڵامی بۆ ناردم کە فەرمانی دامەزراندنم بە نووسەر لە شارەوانیی شارۆچکەی ماوەت دەرچوو.

## بەغداد و خۆشەویستیی یەک لایەنە

پاش تێپەڕبوونی سێ مانگ لە مانەوەم لە بەغداد، نیوەڕۆیەک لە کار دەگەڕامەوە، زۆر ماندوو بووم، ڕۆشتمەوە بۆ ئوتێل، ویستم بچمە ژوورەکەم، مام یوسفی ئوتێلچی بانگی کردم و پێی وتم ئەمڕۆ دۆستێکم هات بۆ ئێرە، لام دانیشت، لە گفتوگۆکردندا لەسەر مشتەرییە هەمیشەییەکانی ئوتێلەکە ناوی تۆش هات، لەپڕ برادەرەکەم هەستا و سەیری لیستی ناوەکانی کرد، وتی ئیبراهیم ناو خزمی منە، پێی بڵێ سبەی نیوەڕۆ

دێم بۆ لای با چاوەڕێم بکات. پرسیم ناو چی بوو، وتی ناوی «نامق مستەفا هاوار ئاغا»یە، یەکسەر زانیم کە ئەوە ئامۆزاکەی باوکمە کە چەندین ساڵە یەکیان نەدیوە، ڕۆژی دوایی نیوەڕۆکەی لە چاوەڕوانی ئەودا بووم، دیم پیاوێکی باڵا مامناوەندی زۆر لاواز و بە تەمەن لە باوکم گەورەتر دیار بوو، هاتە ژوورەوە، لە مام یوسفی پرسی ئیبراهیم هاتەوە، منیش زانیم کە ئەوە کاک نامیقە، هەستام و چووم بەرەو پیری و وتم من ئیبراهیمم. من پێشتر هەرگیز نەمدیبوو، باوەشی پێدا کردم و وتی من ئامۆزای باوکتم. دوای ماچوموچ و چاکوخۆشی، وتی ماڵم لێرەیە، نابێ تۆ کوڕی ئامۆزامی لە ئوتێل بیت، دەبێ ئێستا لەگەڵم بێیتەوە بۆ ماڵەوە، من داوای لێبوردنم لێ کرد کە ناتوانم، چونکە کار دەکەم لای پارێزەرێک، وتم ڕۆژی هەینی بەیانییەکەی وەرە بەدوامدا بەسەر چاو، منیش حەز دەکەم خێزانەکەت بناسم. ڕۆژی هەینی بەیانی زوو بوو، هێشتا من نانم نەخواردبوو، کاک نامیق پەیدا بوو، لەگەڵیدا ڕۆیشتم بۆ ماڵەوە، ئەو ڕۆژە تا عەسر قسەوباس و ڕاز و گلەیی و هۆکاری دووریی ئەو دووبەرەبابە، واتە مەجید هاوار ئاغا و مستەفا هاوار ئاغا لە یەکتری کە وای کردووە یەکتر نەناسین؛ کاتمان بەڕێ کرد.

ماڵی کاک نامیق، ماڵێکی زۆر خێزان بوون، کاک نامیق دوو ژنی هەبوو، یەکیان خزمی خۆی بوو پێیان دەوت «عم قزی» واتە ئامۆزا، لەو ژنە ئەوانەی کە شوویان نەکردبوو و ژنیان نەهێنابوو و لەسەر ماڵ بوون؛ سێ کچ و چوار کوڕ بوون. لە ژنە بچوکەکەشی کە کورد بوو، خەڵکی کفری بوو، چوار کوڕ و پێنج کچی لەسەر ماڵ بوون، ناوی شیرین بوو. لە عەسرەکەیدا کاک نامیق و شیرین خان هەندێ شتیان پێچایەوە و وتیان ئێمە دەچین بۆ نەخۆشخانە کچێکمان لەوێیە سەردانی دەکەین و زوو دەگەڕێینەوە، وتم منیش دێم لەگەڵتان. کە چووینە نەخۆشخانە، لەسەر جێگای نەخۆش، کچێکی تەمەن نزیک بە ٢٥ ساڵم بینی، بە قەبارە زانیم مرۆڤە، بەڵام بە شێوە لە مرۆڤ نەدەچوو، ژنێکی سووتاو، دەتوانم بڵێم شێوەی دەموچاوی و ملی و قۆڵەکانی کە لەناو لەفاف دابوون؛ بەتەواوی شێوابوون. بە یەکتریان ناساندین، پرسیم بۆ وا بەو جۆرە سەختە سووتاوە، وتیان پێنج مانگ بوو شووی کردبوو، مانگێک لەمەوپێش مێردەکەی و نافعی برای لە ماڵی ئەمان شەڕیان بووە و دەمانچەیان

لە یەکتری ڕاکێشاوە، ئەمیش بۆ ئەوەی ئەوان یەکتری نەکوژن، نەوتی کردووە بە خۆیدا و خۆی سووتاندووە، ئێستا مێردەکەی لێی جیا بۆتەوە و براکەشی هەر لێشی ناپرسێ. ڕۆژی دوایی سودادی نەخۆش هاتەوە ماڵەوە لەسەر بەرپرسیارێتیی خۆی نەخۆشخانەی جێ هێشتبوو، من لێم پرسی بۆ وات کردووە تۆ دەبێ چارەسەر بکرێی، وتی لەبەر تۆ! ئیتر بۆ ئەوەی تووشی کێشەیەک نەبم، دوای چەند ڕۆژێک ماڵەکەم جێ هێشت و گەڕامەوە قەلەندەرخانەکەی مام یوسف هەتا گەڕانەوەم بۆ سلێمانی بەیەکجاری. تەنانەت لە ساڵی ١٩٧٠ دوای ١١ ئازار کە نەفی کرام بۆ پارێزگای بەسرا، لەسەر داوای پارتی؛ باسکی مەلایی و هاوسەرگیریم دوو مانگ بوو کردبوو، سداد و باوکی هاتن بۆ بەسرا بەهیوای بینینی من و شووکردنی سداد بە من، بەڵام کە هاتنە ماڵەوە شوکری هاوسەرمیان بینی؛ ئیتر بێهیوا بوون.

## فەرمانبەری و گێرمە و کێشەکانی

باوکم وەڵامی بۆ ناردم کە لە شارەوانیی ماوەت بە نووسەری شارەوانی ناوم هاتۆتەوە، هەر ئەو ڕۆژە چووم بۆ لای "علاء الدین الوسواسی" و ماڵئاواییم لێ کرد، زۆر هەوڵی دا بمێنمەوە، هەلێکی باش بوو بۆ من لە بەغدا هەم لای ئەو ئیش بکەم و هەم لە دانیشگای مستنسریەش کۆلێژی یاساکەم تەواو کەم، بڕیاری دا هەلی باشتری کاریشم بۆ بڕەخسێنێ تا ئاستی مووچەکەشم باشتر بێ، بەڵام من هەوەس و ئارەزووی هەوای کوردستان و بەتایبەتی جوانیی شاری سلێمانی و بیرکردنی کەسوکارم بەسەرمدا زاڵ بوو و ئەو هەلە باشەم لەکیس خۆم دا کە لەپاش چەند ساڵێک پەنجەی پەشیمانیی خۆم دەگەزی. مانگی ٨ی ساڵی ١٩٦٨ لە ١٢ی مانگدا فەرمانەکەم لە کاک "حەمە بچکۆل" بەشی خۆیی بەڕێوەبەرایەتییەکانی سلێمانی وەرگرت و ڕووەو چوارتا کەوتمە ڕێ. ئەو کاتە ماوەت هیچ بەڕێوەبەرایەتییەکی میریی تیا نەبوو، ماوەت بەدەست شۆڕشەوە بوو، هەموو بەڕێوەبەرایەتییەکانی ماوەت لە چوارتا کاریان دەکرد. کەمال تەها (کەمال کەتانە) قائمقامی چوارتا بوو، "محەممەد حەسەن بالەتە" بەڕێوەبەری ناحیەی ماوەت بوو، هەموو بەڕێوەبەرایەتییەکانی شارەوانی، ناحیە، دارایی، پۆلیس، ڕەگەزنامە، باری شارستانی، هەموویان کە

هەر بەڕێوەبەرایەتییەک لە یەک فەرمانبەر و یەک کارگوزار پێک هاتبوون جگە لە کارگوزارەکانی شارەوانیی ماوەت کە چوار کارگوزار بوون، لە سێ ژووری خانووی سەرای چوارتادا کاریان دەکرد. چووم بۆ لای بەڕێوەبەری ناحیە و فەرمانەکەم دایە، ئەویش بەخێرهاتنی گەرمی کردم و بە نووسەرەکەی وت کە دەستبەکار بم، "مباشرە"م بۆ بنووسێ و بیداتە بەڕێوەبەرایەتیی قائمقامیەی چوارتا و بنێردرێتەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتیی شارەوانییەکانی سلێمانی. ئەگەرچی من بە بڕوانامەی دەرچووی ئامادەیی داوای دامەزراندنم کردبوو، بەڵام بە بڕوانامەی دەرچووی ناوەندی و بەو مووچە کەمەش فەرمانی دامەرزاندنەکەم دەرچووبوو کە بریتی بوو لە ١٥ دینار مووچەی تەواو، وە ١٢ دیناریش دەرماڵە. ئەگەرچی هەستم بە غەدرێکی گەورە دەکرد لە دامەزراندنەکەمدا، بەڵام تا ئەو کاتە؛ ڕۆژی بوونم بە فەرمانبەر یەکێک بوو لە خۆشترین ڕۆژەکانی ژیانم. لەبەر ئەوەی تەمەنم گەیشتبووە ٢٥ ساڵ و هیچ ئارامییەکم لە ژیانی خۆمدا نەدیبوو، جگە لەوەش بووین بە یەک خەرجکار لەگەڵ ماڵی باوکم، کە پێشتر من لە بەغدا مەسرەفی خۆم و ئەوانیش لە سلێمانی مەسرەفی خۆیان هەبوو، ئەو پارەیەش بۆ ئەو کاتە بەشی خەرجیی هەموومانی دەکرد.

لە چوارتا هەندێ خانووی میری کرابوو بۆ فەرمانبەرەکان، بەڵام جگە لە قائمقام و بەڕێوەبەری ناحیە و بەڕێوەبەری دارایی و نووسەری قائمقام و بەڕێوەبەری باری شارستانی، کە خەڵکی چوارتا نەبوون و هەریەکەیان چووبووە خانوویەکەوە، منیش یەکێک لەو خانووانەیان دامێ کە تەنها بۆ سێ مانگ ماڵی باوکمم بردە ناوی، بۆ من زۆر باش بوو کە کرێی خانوومان نەدەدا. بە هۆی قوتابییەتیی برا و خوشکەکانم بۆ خوێندن، دەبووایە بچنەوە سلێمانی، لە چوارتا ناوەندی و ئامادەیی نەبوو.

## هەڕەشەی مەلایی و گەڕانەوەم بۆ سلێمانی

ساڵێک فەرمانبەریم لە چوارتا بەسەر برد، تا ڕۆژێک قائمقام ناردی بەدوامدا و پێی وتم کە هەواڵی وەرگرتووە لەم شەوانەدا چەکدارەکانی ئەحمەد عەزیز کاکی کە سەرلقی مەلاییەکان بوو؛ دێن بۆ گرتن و بردنت، چونکە بە دەستنێژی باڵی جەلالیت دەزانن لێرە، بۆیە من نووسراوت بۆ دەکەم کە بەڕێوەبەرایەتیی شارەوانییەکان بە

شێوەی کاتی (تنسیب) لە سلێمانی کارت پێ بکەن. لە ماوەی ئەو ساڵەدا زۆر سوودم بینی لە ناسینی کەسایەتیی بەنرخی وەک قائمقام و بەڕێوەبەری ناحیە و بەڕێز کاک ئەحمەد عەلی مەحموود کاکە خان و کەسایەتیی تری بەنرخ، پاشان شارەزابوون و ئەزموون پەیداکردن لە کاری فەرمانبەری و لایەنە چاکەکانی کە خزمەتکردنی خەڵک و شار بوو لەگەڵ لایەنە خراپەکانی کە کاری نەشیاوی وەک گەندەڵی و پارەپیسیی چەند مووچەخۆرێک، کە بەڕاستی تا نەکەوتبوومە مەیدانی کارکردنی ناو دامودەزگاکانی میرییەوە؛ هیچ جۆرە زانیارییەکم نەبوو لەو دونیای پڕ چەوتی و گەندەڵی و گیرفانپیسییە. خاڵێکی تری ئەرێنی و سوودبەخشی ئەو ساڵەم، لە چوارتا کاتێکی زۆرم هەبوو بۆ خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی کە بە سەرچاوە ماتریالیزمییەکان دادەنران، زۆر لەگەڵ هەست و خواستی ئەوکاتی بیروبۆچوونم دەگونجان.

## لیژنەی خەمڵی تووتن و دۆنم

لە بەڕێوەبەرایەتی (انحصار)ی سلێمانی و بەڕێوەبەرایەتیی شارەوانییەکانی سلێمانی، فەرمان دەرچوو بە دانانی کاک فەریق فەرمانبەری "انحصار" و بەندە سندووق ئەمینی ماوەت کە وەک لیژنەی خەمڵی تووتن بۆ ناحیەی ماوەت و دێهاتەکانی سەر بەو ناحیەیە بچین بۆ خەمڵکردنی تووتنی تووتنەوانەکانی ئەو دەڤەرە. چەند ساڵێک بوو ئەو خەمڵە لەو دەڤەرە نەکرابوو، تووتنەکانی ئەو دەڤەرە هەر بە دۆنمە کۆنەکان دەپشکنران (فحص). کاتی خۆی زۆربەی هەرە زۆری تووتنەوانەکان لە پێدانی دۆنم بێبەش کرابوون، دۆنمەکانیان دابوو بە بەگ و ئاغا و دەسەڵاتدارەکانی دەڤەرەکە، بۆ پشکنینی تووتنەکانیان دەبووایە تووتنەوانەکان بۆ هەر (٥) فەردەی ٦٠-٨٠ کیلۆیی؛ دۆنمێکیان هەبووایە کە پێی بپشکنن، بۆیە تووتنەوانەکان ناچار بوون کە دۆنمە پێویستەکان لە دۆنمدارەکان بکڕنەوە، هەر دۆنمێک بە ١٨-٢٠ دیناری ئەوسا کە نزیکەی ١٠٠ دۆلاری ئەوسای دەکرد. ئێمە کە ڕۆیشتین بۆ ئەو خەمڵە، هەردووکمان بڕیارمان دا کە:

١. دۆنم بدەی بە تووتن نەک کەسایەتی، واتە هەر کەس ٥ فەردە تووتنی هەبوو: دۆنمێکی بدەینێ. بەو پێیە چەند فەردە تووتنی بوو، بەگوێرەی تووتنەکانی دۆنمی بدەینێ.

٢. پارە و بەرتیل لە هیچ کەس وەرنەگرین، چونکە دۆنم نرخەکەی زۆر بوو، مشەخۆرەکان ئامادە بوون بۆ هەر دۆنمێک ١٠-١٥ دینارمان بدەنێ بە ناویانەوە تۆماری بکەین. خەملی سالی ١٩٦٨ بوو بە خێروخۆشی بەسەر توتنەوانەکانی ئەو دەڤەرەدا رژا، دلی زۆر ئاغا و کوێخا و بەگمان لە خۆمان رەنجاند، هەبوو پێشتر لە ١٠٠ دۆنم تا ٤٠٠ دۆنمی بە ناوەوە بوو بێ ئەوەی بایی ١٠ دۆنم توتنی هەبێت، ئێمە هەموویمان بری. توتنەوانیش هەبوو ٥٠ فەردە توتنی هەبوو، بەلام خاوەنی یەک دۆنم نەبوو، ئێمە ١٠ دۆنممان بە ناویەوە بۆ تۆمار دەکرد. دەتوانم بلێم شۆرشێکی توتنمان بەرپا کرد. دوای تەواوبوونی خەمل، بەگ و ئاغا و کوێخا دەستڕۆشتووەکان چوونە متصرفیەت و شکاتیان لێ کردین، بەلام هیچیان بۆ نەکرا، چونکە توتنەوانەکان پشتیوانمان بوون.

ئەوکات جوولەیەکی باشی رۆشنگەری لەناو گەنجانی سلێمانیدا سەری هەلدابوو، گەنجان بێزار بووبوون و بێهیوا لە هەردوو باسکەکەی جەلالی و مەلایی و لە حزبی شیوعیی عێراقییش، ئەو رەوتە نوێیە بەتایبەتی لەناو گەنجانی ناو باسکی جەلالیدا سەری هەلدابوو؛ کەوتبوونە خوێندنەوە و گەران بەدوای سەرچاوە چەپی و کوردستانییەکاندا، بەتایبەتی سەرچاوە چینییەکان و تێزی سێ جیهان و سەرچاوەکانی مارکسی و لینینی. لە راستیدا ئەوسا منی لە دنیایەکی دوگمایی و بێئاگایی لە جیهانەوە بردە ژیانێکی تر و دونیایەکی تری رۆشنبیری. لە شارەوانیی سلێمانی، بۆ دوو مانگ بە شێوەی کاتی "تنسیب" کارم کرد و پاشان راژەکەیان گوێزامەوە بۆ بازیان لە تەینال، رۆژێک نووسراوێک هات بۆ شارەوانیی بازیان، نووسرابوو:

١. بەرێز نووسەری ناحیە (کاتب ناحیە)، ئەرکی نووسەری شارەوانی ئیبراهیم جەلال مەجید بە شێوەی "وەکیل" بەرێوە دەبات تا ئاگادارکرنەوەی لە کاتێکی دیارینەکراودا.

٢. نووسەری شارەوانیی بازیان (ئیبراهیم جەلال مەجید) بەپەلە پەیوەندی دەکات بە بەشی خۆیی (زاتیە) بەرێوەبەرایەتیی شارەوانییەکانەوە، تا لە ١٩٦٩/٦/١ پەیوەندی بکات بە وەزارەتی شارەوانی، بەشی خۆییەتی لە بەغداد، بۆ بەشداریکردن لە خولی ژمێریاریی حەوتەمی وەزارەت بۆ ماوەی شەش مانگ.

لەو خولەدا بە پلەی نایاب لە دە یەکەمەکان (عشرە الاوائل)؛ پلەی سێهەمم هەبوو، دەرچووم. ئەو خولە زۆر سوودی بە من گەیاند لە ڕووی ئەزموون و شارەزایی پتر لە یاسا و ڕێساکانی ژمێریاری و پاشان پلەکەشم لە نووسەرەوە بەرز کرایەوە بۆ "امین صندوق" و مووچەکەشم لە ١٦ دینارەوە بوو بە ١٩ دینار بە هۆی بەرزکردنەوەی ڕاژەکەم لە دەرچووی ناوەندییەوە بۆ دەرچووی ئامادەیی. لەم خولەدا هەلی باشم بۆ هەڵکەوت دیسان، بەڵام لەدەستی خۆمم دا، چونکە لە دە یەکەمەکانیان داوا کرد کە کێ دەیەوێت کارەکەی بگوێزێتەوە بۆ بەغدای پایتەخت" کارئاسانیی بۆ دەکرێ، من دەمتوانی بچمە بەغدا و دیسان ئەو هەلە بقۆزمەوە بۆ خوێندن، بەلام تەنیا داواکارییەکەم ئەوە بوو کە بەفەرمی ڕاژەکەم بگوێزرێتەوە بۆ شارەوانیی سلێمانی بە پلەی "امین صندوق". بۆشیان کردم.

## بەیانی ١١ی ئازار و "نەفی"کردنم بۆ بەسرە

لە سەرەتای مانگی ١ی ١٩٧٠ لە شارەوانیی سلێمانی بە پیشەی "امین صندوق" دەستبەکار بووم، بەلام زۆری نەخایاند تا لە ١٩٧٠/٣/١٨، واتە ٧ ڕۆژ دوای خوێندنەوەی بەیانی ڕێککەوتنی نێوان مەلا مستەفا و ئەحمەد حەسەن بەکر و سەدام حسێن لە ٣/١١دا لە پارێزگاوە نێردرا بەدوامدا، من لە پێشدا چووم بۆ لای بەڕێز "حەمە پاشا"؛ بەڕێوەبەری شارەوانییەکان و ئاگاداری کردم کە پارێزگار دەیەوێت بتبینێ، تەلەفۆنی کرد بۆ پارێزگار کە بچم بۆ لای. پارێزگار؛ "شوکری صەبری حەدیسی" بوو، یەکێک لە دەستەی دامەزرێنەرانی حزبی بەعس لە عێراق، بەلام لەبەر خۆڕانەگری لە زیندان، پلەکەی کرابوو بە پارێزگار و دووریش خرابۆوە بۆ سلێمانی. پارێزگار پێی وتم لەسەر داوای پارتی، چەند مامۆستا و فەرمانبەرێک دەبێ دوور بخرێنەوە بۆ دەرەوەی سنووری "حکم الذاتی"، تۆش یەکێکی لەوانە و دەبێ لە یەک هەفتەدا لە سلێمانی دەست لە کار بکێشیتەوە و بڕۆی لە بەسرە دەستبەکار بیت، بەلام گەر بە ئامۆژگاریی من بکەیت، ناهێڵم لە سلێمانی بڕۆیت. من یەکسەر لە نیازەکەی گەیشتم، وتم داوای لێبوردن دەکەم، ناتوانم ئامۆژگاریی بەڕێزت پەسەند بکەم، دەڕۆم بۆ بەسرە، دەمزانی داوای بەبەعسیبوونم لێ دەکات، بەتووڕەییەوە

وتی بچۆرە دەرەوە و لەم هەفتەیەدا سلێمانی بەجێ بێڵە. هاتمە دەرەوە و بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتم، بەو خەم و خەفەتەوە لە ژوورەکەدا ڕاکشام، وەک فلیمی سینەما ئەو خەونەی هەم بوو کە ئیتر بتوانم بەئارامی لەگەڵ ماڵی باوکم و خوشک و براکانم بژیم لە لایەک و لە لایەکی ترەوە ئەو هەموو هیوایەی کە لە مێشکمدا هەڵمچنیبوو کە ئیتر بتوانم کۆشکی پڕ بەختیاریی هاوسەرگیریم بنیات بنێم کە دوو ساڵ بوو لەگەڵ دەزگیرانەکەمدا چاوەڕێمان دەکرد، هەموو بە بڕیارێکی زۆردارانەی پارتیی بارزانی و گوێڕایەڵیی حکومەتی بەعس؛ هەمووی ڕووخا.

بیرم لەو ڕابردووە تاڵە دەکردەوە کە هەر پاش دەرچوونم لە ئامادەیی، ئیتر کەوتمە ناو دنیای سیاسەت و پێشمەرگایەتی و دەربەدەری بە هۆی هەستی کوردبوون و کوردستانیبوونمەوە. بیرم لەو هەموو نەهامەتییانە دەکردەوە کە بە هۆی منەوە بەسەر ماڵی باوکم و خوشک و براکانمدا هات، بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن لە ساڵی ١٩٦٢ ماڵی باوکم ڕووخێنرا و لەگەڵ دووکانەکەی بە هۆی منەوە تالان کرا و دەربەدەری دۆڵی شەهیدان و دۆڵی مەرگە و پاشان سەنگەسەر بوون. لە سەنگەسەریش لە ١٩٦٤ لەدەست زۆرداریی هێرشی حکومەتی عێراقی ڕزگاریان نەبوو. بیرم لەوە دەکردەوە کە هەر بە هۆی منەوە لەدەست زۆر و ستەم و غەدری زۆرداری مەلا مستەفا لە سەنگەسەریش وازیان لێ نەهێنان، بە بیانووی جەلالیبوونی منەوە دەربەدەریان کردن. بیرم لەوە دەکردەوە کە پاش دەرچوونی شەهید خەلیلی برام لە دواناوەندی و دامەزراندنی بە سەرۆکی شارەوانیی سەنگەسەر، ئەوسا بیرم لە ژنهێنان و هاوسەرگیری کردەوە، بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن لە هاوسەرگیریشمدا دەمویست لەگەڵ کەسێک هاوسەرگیری بکەم بتوانم کەمێک لە ئازارەکانی کەم کەمەوە، بەڵام ئازاری زۆرترم پێ بەخشی، بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن قەدەر من و مامۆستا شوکریەی بە یەکتر ناساند، شوکریەک کە لە من بەشمەینەتتر ژیاوە کە هێشتا لە بێشکەدا بووە؛ دایکی کۆچی کردووە و کەوتۆتە بەر دەستی باوەژن، هێشتا لە ٥ی سەرەتایی بووە کە باوکیشی کۆچی کردووە و کەوتوەتە بەر دەستی مام و ئامۆژن و برا و براژن و ژیانی کولەمەرگی، زۆر هیوادار بووم کە بتوانم لە داهاتوودا هەم پاداشتی ماڵی باوکم و "تعویضی" ڕابردوویان بۆ بکەمەوە و هەم ژیانێکی بێ گێرم و

کێشەش بۆ مامۆستا شوکری برەخسێنم، بەڵام "تجری الرياح بما لا تشتهيه السخن".

## ئاهەنگی هاوسەرگیری و دەربەدەریم بۆ بەسرە

من گوێم بەو هەڕەشەوگوڕەشەیەی پارێزگار نەدا، ویستم کات بەسەر بەرم، بەشکم بتوانم تا مانگی ٦ لە سلێمانی بمێنمەوە، ئەوسا مامۆستا شوکری دوا پۆلی خانەی مامۆستایان دەبڕێ و ئاهەنگی هاوسەرگیریمان دەکەین و جا دەڕۆین، بەڵام ئەمەشم بۆ نەچووە سەر، چونکە لە ٣/٢٥ کاک حەمە بچکۆلی خۆیەتیی شارەوانی ئاگاداری کردم کە پارێزگار داوای پسووڵەی دەستلەکارکێشانەوەکەی منی کردووە، گەر دەست لە کار نەکێشیتەوە، بڕیاری گرتنت دەردەکات. لەو کاتەدا لای کاکە حەمە بڕیاری دەستلەکارکێشانەوەی یەکجاریم لە مووچەخۆریی دەوڵەت (استقاله) نووسی، بەڵام کاکە حەمە لێی وەرنەگرتم و کەوتە ئامۆژگاریم کە من ئێستا لەسەر خۆم نیم، هەر نەبێ لەبەر پێویستیی ماڵی باوکم بە من، لەبەر پێویستیی بارودۆخی ئێستام کە لەسەر هاوسەرگیریم؛ ئەو کارە نەکەم. ڕۆژی ٣/٢٥ دەستم لە کاری "امین صندوقی" شارەوانیی سلێمانی کێشایەوە و ڕۆژی ٣/٢٧ لە شارەوانیی بەسرە دەستم بە کار کرد، بەڵام نەک بە پلەکەی خۆم، بەڵکوو بە دوو پلە کەمتر لە پلەکەی خۆم وەک سزایەک (هەم نەفی و هم تنزيل پله) بە پلەی چاودێریی شارەوانی لە صفوان لەسەر سنووری عێراق-کوێت دەستبەکار بووم.

## بۆ یەکەم جار بوو گرێی بەختم بکرێتەوە

سەری مانگ بوو لە بەشی ژمێریارییەوە بانگ کرام بۆ وەرگرتنی مووچەکەم و ئاگاداریشیان کردم کە لە سەرۆکایەتیی شارەوانی بەسرەوە بانگ کراوم. سەرەتا ترسێکم لێ نیشت کە داوام لێ بکەن ببمە بەعسی، بەڵام کە چووم بۆ شارەوانی. وتیان لەلایەن جێگری بەڕێوەبەرەوە داوا کراوی. چوومە ژوورەوە، بەڕاستی واقم وڕما، عەبدولئەمیر کە لە خولی ژمێریاریی شارەوانییەکان لە بەغدا کورسییەکانمان بەتەنیشت یەکەوە بوو، بە پلەی "محاسب"ی شارەوانیی بەسرە ناوی دەخوێنرایەوە. ئێستا جێگری بەڕێوەبەرە، زۆر بەگەرمی هەڵسا لەبەرم و مێزەکەی خۆی جێ

هێشت و منی لەتەنیشت خۆیەوە لەسەر قەنەفەکە دانا، کەوتە دوان لەگەڵمدا: "ها ابو خليل؟ اش عجب؟ ایش جابك للبصرة؟"، دوایی کەوتە پرسیار و وەڵام، لە یاداشتی یەکەمییەکەم، هەم نەفی و هەم دوو پلەش دابەزاندن، بۆم باس کرد کە هۆکارەکەی چییە. عەبدولئەمیر تومەز بەعسییەکی گەورە و ئەندامی شوعبەی بەسرەیە و بەرپرسی ئاسایشی هەموو شارەوانییەکانیشە و جێگری بەڕێوەبەری گشتیی شارەوانییەکانیشە، وتی ئێمە زۆرمان پێویست بە تۆیە بۆ بەشی ژمێریاری، تۆ بڕۆرەوە بۆ صەفوان تا فەرمانەکەت بۆ دێ. دوای یەک هەفتە فەرمانی بەرزبوونەوەی پلەکەم بۆ "معاون محاسب" و گواستنەوەشم بۆ سەرۆکایەتیی شارەوانی بەسرە بەدەستم گەیشت. لە بەسرە لە گەڕەکی (عەشار - شەقامی ابو الاسود) لە قاتی سەرەوەی خانوویەک کە دوو ماڵی تریشی تێدا بوو، ژوورێک و باڵکۆنێکم بەکرێ گرت و هەندێ قاپ و قاچاغ و تەباخێکی دوو چاوی کارەبا و دەستێک نوێنی دوو نەفەری و چوار پایەیەکی لە ئاسن دروستکراوم تیا دانا. ڕۆژی ٥/٢٧ داوای پشووم کرد بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ، لە داواکەم نووسیبووم بۆ هاوسەرگیری ئەو پشووەم دەوێ، قایل بوون تا ڕۆژی ١٩٧٠/٦/٨ پشووم بدەنێ.

### ئاهەنگی هاوسەرگیریمان

لەگەڵ مامۆستا شوکریە ساڵێک پتر بوو پێویستیی هاوسەرگیریمان ئامادە کردبوو لە ژووری نووستن و میوان، مابوو ئەو قوتابخانە تەواو کات، ئەوسا ئاهەنگێکی خنجیلانە بگێڕین. کە گەیشتمەوە سلێمانی، ئاگادارم کرد کە پێکەوە ڕۆژی ئاهەنگەکەمان لەو ١٠ ڕۆژەدا دیاری بکەین، بڕیارمان دا کە ڕۆژی ٦/٦ ئاهەنگ بگێڕین بە یادی ڕۆژی نیشانکردن و مارەبڕینەکەمان کە لە هەمان ڕۆژ بوو لە ١٩٦٩/٦/٦دا بوو. بەڵام دیسان چارەنووس بە پێچەوانەی خواستی ئێمەوە سووڕا، ڕۆژی ٦/٢ حەمە سووری پوورزام (حەمەی پوورە بەهێ[١٤]) هات بۆ ماڵەوە بۆ لام و پێی وتم کە سدیق ئەمین زانیویەتی تۆ لە سلێمانییت، دەیانەوێت لە هەلێکدا بتگرن، تا دەگەڕێیتەوە لە ماڵی خۆتان مەبە، هەر ئێستاش بڕۆ بۆ ماڵی ئێمە. ناچار مامۆستام ئاگادار کرد

[١٤] کاکە حەمە هەم پوورزام بوو هەم سەر بە مەلاییەکان بوو لەگەڵ شێخ مەحموودی کاریزەدا.

کە لە دوو ڕۆژدا پێویستییەکانی جێبەجێ بکات و بارودۆخەکەمان وایە، شەوی ٤-١٩٧٠/٦/٥ بەنهێنی لەگەڵ خاڵم (محەممەد مەجید هاوار) و شوکری بە ئۆتۆمبێلی قەمەرە لە سەعات ١٢ی نیوەشەودا ڕۆیشتین بۆ بەغدا و خاڵم گەڕایەوە و ئێمەش چووین بۆ بەسرە، بەبێ ئەوەی سادەترین و بچووکترین ئاهەنگ بگێڕین.

## ڕۆژە خۆشەکانی مرۆڤ

١. تەواوکردنی خوێندن و دەستکردن بە ژیانی دانیشگا، من بۆ شاخ و پێشمەرگایەتی.

٢. دوای تەواوکردنی خوێندن، دامەزراندن و ئاینده دروستکردن، من خۆشاردنەوە و دەربەدەریی وڵاتان و کرێکاریکردن و پاشان نەفیکردن.

٣. ڕۆژی هاوسەرگیری و ئاهەنگ و مانگی هەنگوینی، بۆ من وڵات بەدەرکردن و ڕاکردن و خۆشاردنەوە و ئاوارەیی چەشتن.

ئای قەدەر، دەبێ چیی تری لە هەناوی خۆیدا بۆ هەڵگرتبم!

گەڕاینەوە بەسرە، بەڵام چیم دی؟ مار لە سیر بێزار بووە و سیریش دەچوو لەبەردەمی کونەکەی سەوز دەبوو، من دەربەدەری دەستی پارتیی مەلایی بووم، کەچی گرگر بارەگای لیژنەی ناوچەکەیان هێنابووە کۆڵانەکە و بەرامبەر ماڵی ئێمە. هەموو ڕۆژی بەیانیان کە دەچووم بۆ کار و نیوەڕوان کە لە کار دەهاتمەوە، دەبووایە چاوم بەو لەوحە قیزەونەی لەسەری نووسرابوو "الحزب الديموقراطي الكردستاني - لجنه محليه البصره" بکەوێ. خواستم بوو کە بۆ خوێندن ساڵی ١٩٧١ داواکاری بدەمە دانیشگای بەسرە، بەو هیوایەی کە بتوانم لەم مەنفایە کۆلێژی یاسا تەواو بکەم، گەر تەمەن و نەهامەتییەکان ڕێگە بدەن. نەخێر، ئەم جارەش شانسم نەیکرد، لەدوای تەواوکردنی زمستەری یەکەم و لە مانگی ١٩٧١/٨ دوای بەستنی کۆنگرەی جەلالی و وەرگرتنەوەیان لەناو ڕیزەکانی پارتیی باسکی مەلایی، منیش بەر ئەو تێکەڵکردنەوەیە کەوتم، بڕیاری گەڕانەوە و گوێزرانەوەی ڕاژەکەم لە شارەوانیی بەسرەوە بۆ شارەوانیی سلێمانی دەرچوو، بەڵام بە ناوی "امین صندوق[١٥]".

[١٥] بەدرێژی ئەم بابەتە لە کتێبی «چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە»دا باس کراوە.

## دوجەیلە یان دوجەیل

لەو ماوەیەی لە بەسرە بووم، زۆرتر لەدوای کار خۆم بە خوێندنەوە و سەعیکردن خەریک دەکرد، یان جار جار بۆ کاتبەسەربردن دەچوومە دووکانەکەی (عبد) عابیدی بەرگدروو. عابید پیاوێکی باڵا مامناوەندی ڕووخۆش و دەمبەپێکەنین و خاوەن کەسایەتیی تایبەت و خۆشەویست لای هەموو کوردەکانی بەسرە، لەگەڵ مندا زۆر تێکەڵاوی خێزانییش بووین، گەرچی ئەو هاوسەرەکەی عەرەب و تەنانەت منداڵەکانیشی کوردییان نەدەزانی. ڕۆژێک چووم بۆ دووکان بۆ لای، دیم پیاوێکی سەرکەچەڵ لەلای بوو، لە منی پرسی: "دیارە تازە هاتووی بۆ ئێرە، ئێستە ڕێککەوتن هەیە و سەرۆک بارزانی حەقی کوردی وەرگرتووە، خەڵک لە جنوب و وەسەتەوە دەگەڕێنەوە بۆ شمال، کەچی تۆ ئێستا هاتووی بۆ بەسرە. دیارە لە شەست و شەشەکانی!" زۆر بەکورتی وەڵامم دایەوە، جەرگبڕ. لە مانگی ١٩٧٠/٦ کۆنگرەی پارتی دیموکراتی کوردستان باڵی "م. س" گیرا و منیش ئەندامی کۆنگرە بووم، هەر لە کۆنفرانسی لیژنەی ناوچەکانەوە لە ساڵی ١٩٦٨ هەڵبژێردرا بووم بۆ کۆنگرە. لەو کۆنگرەیە کە ٣ ڕۆژی خایاند، سێ بڕیاری تیا درا:

١. گۆڕینی ناوەکە لە پارتی دیموکراتی کوردستان باڵی "م. س"، بۆ پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان.

٢. هەڵوەشاندنەوەی ئەم حزبە نوێیە.

٣. تێکەڵبوونەوە بە پارتی دیموکراتی کوردستان، لەژێر سەرکردایەتیی مەلا مستەفا بارزانیدا.

لایەنگرانی هەڵوەشاندنەوەکە (حەلبوونەکە)، زۆربەی بەشداربووانی کۆنگرە بوو. دوای تەواوبوونی کۆنگرە، فەرەیدوون عەبدولقادرم بینی، مژدەی پێکهێنانی کۆمەڵەی "مارکسی لینینی کوردستان - بیری ماوتسی تۆنگ"ی دامێ و بەندەش لەو کاتەوە بوومە ئەندامێکی ئەو ڕێکخراوە نوێیە"[١٦].

لەسەر بڕیاری سێهەمی کۆنگرە، بڕیار درا کە هەموو ئەندامانی نەفیکراو و

---

[١٦] سەیری "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" بکە.

گوێزراوە و ماڵ دەستبەسەردا گیراو و ئەوانەی بڕیاری گرتنیشیان هەبوو لای مەلاییەوە؛ ببەخشرێن و بگەڕێنرێنەوە شوێنی خۆیان، منیش یەکێک بووم لەوانەی کە لە تێکەڵبوونەوەکەدا بڕیاری گەڕانەوەم بۆ سلێمانی لە وەزارەتی شارەوانییەکانەوە کە "ئیحسان شێرزاد" وەزیر بوو؛ بۆ دەرچوو، لە هەمان کاتیشدا وەک ئەندامی لقی سلێمانیی پارتی دانرام، بەڵام بە گەڕانەوەم بۆ سلێمانی، پێش دەستبەکاربوونم لە شارەوانی بانگ کرام بۆ کۆبوونەوەی لق، لەو یەکەم کۆبوونەوەیە من نامەی دەست لە کاری سیاسی کێشانەوەی خۆم دا بە لێپرسراوی لق (عەلی عەبدوڵلا) کە ئەندامی لیژنەی ناوەندی و لێپرسراوی لقی سلێمانی و پارێزگاری سلێمانییش بوو، لە نامەکەمدا نووسیبووم کە بڕیارم داوە لەمەودوا سیاسەت نەکەم و خەریکی ژیانی خۆم و ماڵ و منداڵی خۆم بم. لەسەر ئەو دەستلەکارکێشانەوەیەم، سەرۆکی شارەوانی (عەبدولی سۆران) بڕیاری دا کە گوێزانەوەکەم لێ وەرنەگرێ و لە شارەوانیی سلێمانییش دەستبەکاریم "مباشرە" نەنووسێ. بێ ئەوەی ڕۆژێک لە سلێمانی دەستبەکار بم، ناردیانم بۆ ناحیەی دوجەیلە (سیروان).

بیستبووم لەو دنیا بەهەشت و دۆزەخ هەیە و دۆزەخیش چەند بەشێکی هەیە، وەیل و دوجەیل و بأس المصیر، دانیشتووانەکانی بەپێی کەمی و زۆری و خراپی و خراپتر و خراپترینی بەسەر ئەو سێ بەشەدا دابەش دەبن، بەڵام نەمدەزانی لەم جیهانەی خۆشمدا دوجەیلێک هەیە. پاش گەڕانەوەم لە بەسرە و مانەوەی دەستبەکاربوونەکەم و درێژەکێشانی، داوای بینینی پارێزگارم کرد. پارێزگار لەباتیی ئەوەی فەرمان بەسەر عەبدولی سۆراندا بکات کە "مباشرە"کەم بنووسن، فەرمانی کرد کە ڕاژەکەم بگوێزنەوە بۆ ناحیەی دوجەیلە. زۆر بێزار بووم لەو هەموو دژایەتییەی کە لەلایەن پارتییەوە دەکرام. دکتۆر کەمال خۆشناوم بینی کە هەم ئەندامی لق بوو لە تێکەڵکردنەوەکەدا و هەم سەرۆکی دانیشگای سلێمانییش بوو، ڕاوێژم لەگەڵدا کرد کە دەمەوێ دەست لە کاری فەرمانبەری بکێشمەوە، بەڵام ئەو پێی خراپ بوو و ئامۆژگاریی کردم کە ئەوە نەکەم، چونکە ڕقی پارتی بەرامبەر بە خۆم پتر دەکەم، وتی دەچمە لای کاک عەلی، بزانم دەڵێ چی، دوای دوو ڕۆژ وەڵامەکەی دامەوە کە با بچێتە دوجەیلە (سیروان)، دوای سێ چوار مانگی تر دەیهێنمەوە سلێمانی. دوجەیلە (سیروان) ناحیەیەکی زۆر بچووک

کە دەکەوێتە سەر ڕێگای سەیدسادق-هەڵەبجە کە چەند کیلۆمەترێکی زۆر کەم لە هەڵەبجەوە دوور بوو، گەرماکەی زۆر پڕووکێنەر بوو، بە هۆی ئەوەی لە پانتاییەکی کشتوکاڵی شێداردا دروست کرابوو، جرۆجانەوەری وردی وەک سیرسرک و قالۆنچە و مێرووله و دووپشکی زۆر بوو، لە هەموویان خراپتر و زۆرتر مێشوولەی مەلاریا بە نێر و مێیەوە. شوێنێکی زۆر چۆڵەوانی جگە لە چەند دوکانێکی بچکۆلە، بازاڕی نەبوو، چونکە بە ڕۆژدا خەڵکەکەی هەموو دەچوونە سەر شینایییەکانیان و خەریکی کشتوکاڵی خۆیان بوون و بە شەویش بەهیلاکی لەماڵەوە، خەڵکی تری کاسبکار و خوێندەواریش بە هۆی نزیکیی هەڵەبجەوە؛ زۆربەیان لە دوجەیلە نەدەژیان. من ماوەی چەند مانگێک لە دوجەیلە مامەوە، بە خۆشیی نووری بەگی سەرۆک شارەوانی و بە هۆی هەندێ هاوڕێم لە هەڵەبجە، لەوانە: مەلا ڕەئووف، شێخ عەلی (مەحموود کەشکوڵ) کە کاک شێخ عەلیم لەو ماوە کەمەدا لە سەردانێکی ئاوات عەبدولغەفوور و بەندە چووین بۆ لای، باسی کۆمەڵەم لەلا کرد و بوو بە ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵە. چوار مانگێک دانم بە خۆمدا گرت، دیار بوو کاک عەلی عەبدوڵلا هیچی بۆ نەکردم. لەو ماوەیە ماڵمان کرا بوو بە سەربەشی ماڵان، هەر چەندە ماڵەکەم لە ساردکەر و بەفرگرێک و چەند وردە پێویستییەکی ژیان، هیچ شتێکی قەبەمان نەبوو، ئەو شتانەمان لە ماڵی کاک حەسەن ئیبراهیم (حەسەنی بلە بەهار)ی ئاوەڵزاوام دانابوو، شوکرییش بەسەر ماڵە خزمانەوە دەگەڕا و منیش هەفتەی ٢ ڕۆژ دەگەڕامەوە سلێمانی یا لە ماڵی باوکم یا لە ماڵی خزمان دەمانبردەسەر و بەو هیوایەی دەگەڕێمەوە سلێمانی بەیەکجاری، ئەوسا لەسەرپشت خانوو دەگرم و ماڵێکمان دەبێ. لەو ماوەیەی لە دوجەیلە بووم، لەگەڵ سەرۆکی شارەوانی (نووری بەگ) لە بەگەکانی جافەکان بوو، بووبووین بە دۆستێکی زۆر نزیک. نووری بەگ پیاوێکی زۆر بەڕێز و ڕووخۆش، بەڵام هیچی لە کاری شارەوانی نەدەزانی، بۆیە بۆ هەموو کارەکان پرسی پێ دەکردم و ڕێزیشی لە ڕایەکانم دەگرت، بەڕێوەبەرێکی ناحیەمان هەبوو ناوی "عومەر پێداوی" بوو، بەڕاستی پیاوێکی نەزان و لەخۆبایی بوو، گەنج، تازە لەلایەن پارتییەوە دامەزرابوو، پیاوێکی کەم ئەزموون و گیرفانپیس، بڕیار لە بەڕێوەبەرایەتیی شارەوانییەکانی سلێمانییەوە دەرچوو کە گەرماوێک و شەش دووکان بۆ ناحیەکە دروست بکرێ و بدرێتە مناقەسە،

واتە کەمترین نرخ، لە ڕێگەی لیژنەوە بدرێ بە بەڵێندەر. لیژنەکە لە بەڕێوەبەری ناحیە، سەرۆک و ئەندامێتیی سەرۆکی شارەوانی و "امین صندوقی" شارەوانی پێک هاتبوو. لەپڕ ڕۆژێک دوو پیاوی قەڵەوی تەنگە ئەستوور هاتنە شارەوانی، وتیان دەمانەوێ دەست بە دروستکردنی حەمام و دووکانەکان بکەین، چونکە بەڕێوەبەری ناحیە؛ "مناقەسە"کەی داوە بە ئێمە.

نووری بەگ و من زۆرمان لا سەیر بوو بێ مناقەسە و بێ ئاگاداریی ئێمە؛ ئەمە چۆن کراوە، دوایی دەرکەوت کە بەڕێوەبەر سەهۆڵگرێک و جووتێ فەرشی ئورتەی ئێرانی بە بەرتیل لێ وەرگرتوون، بە هەردووکمان بەڵێنەکەمان هەڵوەشاندەوە، خستمانە مناقەسەوە بە ڕێژەی ١/٣ کەمتر درا بە بەڵێندەر و کێشەش کەوتە نێوان بەڕێوەبەری ناحیە و منەوە، چونکە نەیدەوێرا کێشە لەگەڵ نووری بەگدا بکات. سەرئەنجام بەڕێوەبەریان گواستەوە بۆ ناحیەی چوارقوڕنە، دڵخۆش بووم کە منیش لایەنێکی کێشەکەم، دەمگوازنەوە بۆ شوێنێک، بەڵام نەیانکرد و منیان بە خاوەن ماف دانا. لەو ماوەیەی کە لە دجیلە (سیروان) بووم، هەر لە هەوڵی ئەوەدا بووم هەلێکم دەست کەوێ و بگەڕێمەوە سلێمانی. ڕۆژێک لە سلێمانی بووم لای "حەمە بچکۆل"ی خۆیی شارەوانی دانیشتبووم، پێی وتم کە چاودێری خانەنیشینی سلێمانی، شوێنی "امین صندوق"ێکیان چۆڵە و ئەو چاودێرییەش سەر بە گەنجینەی سلێمانییە و گەنجینەکەش سەر بە وەزارەتی دارایی حکومەتی ناوەندە، بڕۆ داوایەک بنووسە بۆ گوێزانەوەی ڕاژەکەت لە "امین صندوق"ی شارەوانیی سیروانەوە بۆ بەشی چاودێریی خانەنشینی سلێمانی (ملاحظية تقاعد السليمانيه). وتی منیش لای کاک "عەلی لاوە"ی چاودێر هەوڵت بۆ دەدەم. ئەم هەوڵە سەری گرت، بەڵام ئەم جارەش بە هۆی ڕەقیی خۆمەوە؛ خۆشییەکەم تا سەر بڕی نەکرد. لەبەر ئەوەی لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"دا بەدرێژی لەسەر ئەم بەشە وەستاوم، نامەوێ لێرەدا دووبارە بینەوە.

گەڕانەوەم بۆ سلێمانی و بەکرێگرتنی دوو ژوور و هەیوانێکی نیمچەسەربەخۆ و بوونم بە خاوەنی ماڵی خۆم؛ زۆر دڵخۆشی کردم، بەتایبەتی لەگەڵ هاوسەرمدا بەهیوای پشکوتنی یەکەم نۆبەرەی باخی ژیانمان بووین کە هاوسەرم لە بەسرەوە لە هەناوی خۆیدا هەڵیگرتبوو تا لە کوردستانەکەمان لە شارە جوانەکەی سلێمانیدا

بپشکوێ. ١٩٧١/٩/١٢ بۆ من ساتێکی مێژوویی و وەرچەرخانێک بوو لە ژیانی مندا کە بووم بە باوک، لە خۆشیدا نەمدەزانی چ ناوێکی جوانی جیهانگیریی لێ بنێم، دواجار بڕیارم دا ناوێکی لێ بنێم کە هەرگیز کۆن نەبێ و نەمر بێ و لەگەڵ بووندا؛ ئەویش بوونی هەبێ، ئەو ناوەی کە هەموو جوانییەکانی بوون لە خۆیدا کۆ بکاتەوە، بۆیە ناوم نا "سروشت". زۆر دڵخۆش و بەختەوەر بووم کە هەم لە تاراوگە و هەم لە دوجەیلە ڕزگارم بوو، بووشم بە باوک و خاوەن دوو ژووری کرێ کە لەگەڵ هاوسەرەکەمدا لە حەوشیماڵی پیاوێکی وەک مەلا حەسەن و ژن و کوڕ و کچە بەڕێزەکانیدا ژیانی ڕۆژانەمان بەسەر بەرین. دوای چەندین ساڵ پێشمەرگایەتی و ڕاکەڕاکە و پاشان دەربەدەری و دواتر دووری لە کەسوکار و خێزان، بە کەسوکار و خێزان و شار و وڵات شاد بم.

## چاودێرێتیی خانەنشینانی سلێمانی (ملاحظیە تقاعد السلیمانیە)

لەم فەرمانگەیەدا کە لەجیاتیی بانک؛ مووچەی خانەنشینانی تێدا دەدرا، دوو جۆر مووچە هەبوو، بەشی زۆریان ٣ مانگ جارێک، مووچەی سێ مانگیان بەسەر یەکەوە وەردەگرت، ئەوانە بوون کە مووچەی مانگانەیان لە پانزە دینار و کەمتر بوو وەک کارگوزار و پۆلیس و خانەنشینانی شەهیدانی ڕووداوەکانی ژووروو (شهداء حوادث الشمال)، بەشێکی کەمیشیان ئەوانە بوون کە مووچەکانیان مانگانە بوو لە ١٥ دینار بەرەو ژوورتر بوو. هەر لە یەکەم وەرزی ٣ مانگی مووچەداندا تووشی کێشە و ئاستەنگی بووم، من کە خولی ژمێریاریی وەزارەتی شارەوانیم تەواو کردبوو، تەواو شارەزای هەموو یاسا و ڕێساکانی ژمێریاری و "امین صندوق"ی بووبووم، جگە لە ئەزموونی چەند ساڵەشم لەو بوارەدا لە شارەوانییەکان، بێئاگا نەبووم لە ساختەکارییەکانی دزی و گەندەڵی، لە کاتی مووچە دابەشکردندا دەبووایە خانەنیشین یان خۆی یان بریکارەکەی بە شووناسنامەکەیەوە ئامادە بێ تا پاش دڵنیابوون لە کەسایەتیی خانەنشینەکە؛ مووچەکەی بدرێتی، وە هەر لیستێکی مووچەی خانەنشینەکە دەبووایە پوولێکی ٥٠ فلسیی پێوە بێ و مۆر بکرێ و پارەکەشی لە خانەنشینەکە بگێڕدرێتەوە. لە دووهەم ڕۆژی مووچە دابەشکردندا، کارگوزارێکی بەشی بەڕێوەبەرایەتیی گەنجینەی سلێمانی

کە ناوی "عومەر ڕەزا"ی هونەرمەند و دەنگخۆش بوو، هاتە بەر پەنجەرەی ژوورەکە و لیستێکی ناوی خانەنشینی پێ بوو داوای قائمەکانی کرد کە بەڕێوەبەری گەنجینە (شێخ جەمال ڕەشید) داوای قائمەی ئەو ناوانەی کردووە، گوایە پەککەوتەن و توانای هاتنی فەرمانگەیان نییە، بۆیان دەبرێتە ماڵەوە مۆر و پەنجە و واژۆیان پێ دەکرێ و پاشان لە ڕێگەی شێخەوە مووچەکانیان بۆ دەبرێتە ماڵەوە، من ئەو هەموو ناو و قائمانەم خستە ناو قاسەکە و ژێر کۆنترۆڵەوە، بە چاودێر و بەڕێوەبەرم وت کە پاش مووچە؛ عەسر خۆم دەچمە ماڵەکانیان و پەنجەمۆریان پێ دەکەم، چونکە ئەوە ئەرکی منە، بەڵام چاودێری فەرمانگە (عەلی حاجی محەممەد لاوە) فەرمانی پێ کردم کە قائمە داواکراوەکان بدەم بە عومەر ڕەزا بیبات و بەمۆرکراوی بیانهێنێتەوە. لەسەر بەرپرسیارێتیی ئەو، قائمەکانم دایە کە پتر لە ١٠٠ قائمە بوو، ئەویش دوای دوو ڕۆژ بەپەنجەمۆرکراوی بۆی هێنامەوە کە مووچەکانی بدەمێ و بیبات بۆ شێخ جەمال، بەڵام من سوور بووم لەسەر لێکۆڵینەوە لە عومەر ڕەزا سەبارەت بە پەنجەمۆرەکان، عومەر ڕەزا دانی پێدا نا کە هەر دە پەنجەکەی دەستی و قاچی خۆی بەکار هێناوە، قائمە مۆرکراوەکانم خستە ناو "قاسەکەوە" و پارەم نەدانێ. ڕۆژی دواتر وەک پیلان و نەخشەبۆکێشراو، "جەمال ئەحمەد فەهمی" کە ئەفسەری خانەنشین بوو، هات و بەتوندی لە دەرگای ژوورەکەی دا و داوای مووچەکەی کرد و منیش پێم وت کە هەویەکە بدات و چاوەڕێ بکات تا نۆرەی دێ، دیار بوو فێر کرابوو کە کێشەیەکم بۆ بنێتەوە، کردی بە هەرا و شاتەشات و وشەی ناشیرین وتن، منیش مافی خۆیم دایە و کردمە دەرەوە. جەمال ئەحمەد فەهمی برای سەلاح ئەحمەد فەهمی؛ بەڕێوەبەری پۆلی ئەوسای سلێمانی و مەلایی بوو، برای جەلال ئەحمەد فەهمی ئەفسەری ئازادیخواز و یەکێک لە ئەفسەرە بەشداربووەکانی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ بوو کە شیوعی بوو، من لەسەر هاوسەر و منداڵەکانی شەهید جەلال لەگەڵ ئەو بنەماڵەیە کێشەمان هەبوو کە ئەوان دەیانویست منداڵەکانی شەهید لە دایکیان بسەنن و منیش ڕێگر و بەرگریکاریان بووم، بۆ ئەوان ئەو شەڕە هەلێکی باش بوو بۆ تۆڵەکردنەوە لێم. بە کوردی و بە کورتی بە دز و گەندەڵ و مەلایی و دەستە دزەکان کەوتنە هەوڵدان دیسانەوە بۆ

دوورخستنەوەم لە سلێمانی[١٧].

سەردەمی ساڵی هەنگوینیی گفتوگۆی ئازاری نێوان مەلایی و ڕژێمی ئەحمەد حەسەن بەکر و لەو سنوورانەی کە سەر بە گوایە "حوکمی ذاتی" بوون، مەلاییەکان هەموو شتێکیان بۆ دەچووە سەر. لەسەر داوای دژەکان، شێخ جەماڵ و سەلاح و هاوسۆزەکانیان عەلی عەبدوڵڵا داوای گواستنەوەی ڕاژەکەیان کردم بۆ دەرەوەی سنوور گوایە "حوکمی ذاتی"ی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی خانەنشینان لە بەغدا لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەو کێشەیە کردبوو، دەیانزانی کە ماف (حق) لای منە، بەڵام نەیاندەتوانی دڵی پارتیی مەلایی بشکێنن، بۆیە منیان سەرپشک کرد لە دەرەوەی سنووری حوکمی زاتی کوێم بوێت؛ بۆ ئەوێم بنێرن. منیش پرسم بە کۆمەڵە کرد، وتیان باشترین هەلە، کەرکووک داوا کە، داوای کەرکووکم کرد بۆ خۆم و بۆ دایکی سروشت کە ئەویش ماوەیەک بووبوو بە مامۆستای سەرەتایی. هەردووکمان دیسان بارگەوبنەمان پێچایەوە و بەرەو شاری کەرکووک، من بۆ چاودێریی خانەنشینانی کەرکووک (ملاحظیە تقاعد کرکوک) و دایکی سروشتیش بۆ قوتابخانەی (امام قاسم) ی سەرەتایی بۆ وتنەوەی وانەی کوردی.

## کەرکووک و یادگارییەکانم

شاری کەرکووک لای هەندێ کەس بە شارێکی قەبز و ناخۆش ناسراو بوو، بە بۆچوونی من هۆکەی دوو شت بووە: یەکیان لەبەر ئەوەی هەرسێ نەتەوەی تێدا دەژیا: کورد، تورکمان، عەرەب. هۆی دووهەم، کەرکووک وەک سلێمانی و هەندێ شاری تر نەبوو گرد و دۆڵ و بەرزی و نزمیی هەبێ و شێوە و قەبارەی دیار بێ، بەڵکە شوێنەکەی تەخت بوو، مەگەر بچوویتایەتە سەر قەڵای کەرکووک، ئەوسا بتزانیایە قەبارەی کەرکووک چەندە. لەلای من کەرکووک یەکێک بوو لە شارە زۆر خۆشەویست و خۆشەکانی کوردستان، لەو شارەدا ئەوکات کورد و تورکمان و تەنانەت عەرەبە ڕەسەنەکانیش کە بەعسی نەبوون؛ هاوخەم و هاودەردی

---

[١٧] زۆر بەدرێژی لەسەر ئەم بابەتە لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" دواوم کە دووبارەکردنەوەی لێرەدا بە پێویست نازانم.

چەوساوەیی دەستی عەرەبە شۆڤێنی و هـاوردە بەعسییەکان بوون. دانیشتووانی کەرکووک خەڵکانێکی زۆر سادە و دوور لە لەخۆباییبوون بوون، ژیانیان بەسادەیی وەرگرتبوو، شارەکە لە ڕووی دابەشبوونی دانیشتووانەکەیەوە تا ڕادەیـەک لە گەڕەکەکاندا لێک جیا کرابوونەوە، عەرەبەکان کەوتبوونە سەر ڕێگای کەرکووک-بەغدا لە ڕۆژئاوای کەرکووک، کوردەکانیش کەوتبوونە ناوەند و ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکووک و تورکمانیش کەوتبوونە ناوەند و باکووری ڕۆژهەڵاتی کەرکووک. لەبەر تەختیی شارەکە، زۆربەری دانیشتووانەکەی بە پایسکل هاتوچۆیان دەکرد، کەمترین ژمارەی تەکسی و ئۆتۆمبێلی سواری تێدا بوو. دەتوانم بڵێم کەرکووک هەژارترین و بەشمەینەتترین و چەوساوەترین خەڵکی تێدا دەژیا، لەگەڵ ئەوەی ئەو شارە لەسەر دەریایەک ئاڵتوونی ڕەش دروست کرابوو، ئینجا جگە لە دووکەڵە غازاوییەکەی، هیچ خێرێکی بۆ شارەکە نەبوو. لەبەر ئەوەی لە کەرکووکدا شەریکەیەکی گەورەی تێدا بوو پێیان دەوت شەریکەی نەوت، چینی کرێکاری بەزەقی تیا دەردەکەوت کە کەمترین ژمارەی کورد بوو. کەرکووک لە باشووری کوردستاندا چەقی ململانێ نەتەوەیی و چینایەتییەکان بوو، بۆیە لە کەرکووکدا میانڕەو و بێباری تا ڕادەی نەبووان کەم تێدا بوو. یان دڵسۆز و نەتەوەپەرست بوون، یان بەئاشکرا دژەکورد و تورکمان و تەنانەت عەرەبە ڕەسەنەکانیش بوون. سەرەتا لە ماڵی ئامۆزایەکی باوکم (سەعدون مستەفا هاوار ئاغا) ژوورێکیان داینێ لە گەڕەکی "منارە نەخشیە" (جامع نەقشلی منارەسی) تا خانوومان دەست دەکەوێ. ئامۆزاکەی باوکم لە کەرکووکدا ناسرابوو بە سەعدون دیشچی، واتە "دانساز"، پیاوێکی هێمن و دەمبەپێکەنین لەگەڵ خەڵکی گەڕەک و مشتەرییەکانی، بەڵام زۆر تووڕە لەگەڵ منداڵەکانیدا. دوای دوو سێ مانگ خانوویەکمان لە گەڕەکی یادگار دەست کەوت، لەنزیک ماڵی مامۆستا مەحموود شاکر: باوکی کاک کاوە و نزیک ماڵی فەرەیدوون عەبدولقادر و فەیسەڵ تاڵەبانی (سیروان تاڵەبانی). گەرچی بەناو ئاوارە بووم، بەڵام زۆر دڵخۆش بووم لە کەرکووک بەگشتی و لەو گەڕەکە بەتایبەتی، دانیشتووانەکەی کەسانی دڵپاک و ڕاستگۆ و بەڕێز لەگەڵماندا. بەتایبەتی ئەو مامۆستا ژن و پیاوانەی کە لەگەڵ مامۆستا شوکریەدا لە قوتابخانەی ئیمام قاسم پێکەوە بوون و ماڵی زۆربەشیان هەر لەو گەڕەکە بوو. زۆر بەخێرایی

ئاشنایەتیمان لەگەڵ هەندێکیان بە ڕادەیەک پەیدا کرد، وات دەزانی چەندین ساڵە خزم و هاوسێ و هاوڕێ بووین، بەتایبەتی لەگەڵ ماڵی مامۆستا مەحموود شاکر و خێزانەکەی و ژن خوشکەکەی مامۆستای طەبیبە و ماڵی مامۆستا مەلا عەبدولڕەحمان و کاک حەمیدی پۆلیس و کاک ئەحمەد کرێکار و ماڵی کاک فەیسەڵ تاڵەبانی و ماڵی مام ڕەشیدی هاوسێمان. کاک فەرەیدوون عەبدولقادر و کاک فەیسەڵ و بەندەش ئۆتۆمبێلێکمان گرتبوو، بەیانیان کاک فەرەیدوونی لە پارێزگا دادەبەزاند و فەیسەڵ و منیشی دەبردە چاودێریی خانەنشینی کە هەردووکمان لەوێ کارمەند بووین. بە هۆی کاری کۆمەڵەشەوە لەگەڵ ئیحسان نەجم (ابو شهاب) و عەلی بچکۆل و ئازاد هەورامی بووینە هاوڕێی دڵسۆز و خۆشەویستی یەک. کە لە سەرەتاوە چوومە کەرکووک، لە فەرمانگە کێشەیەکم بۆ پەیدا بوو، ئەویش کێشەی نەزانینی تورکمانی بوو، دانیشتووانی کەرکووک کورد و تورکمانەکە و هەندێ لە عەرەبە ڕەسەنەکانیش، بە هەرسێ زمانی کوردی و عەرەبی و تورکمانیی باش و شکستە لەگەڵ یەکدا ئاخاوتنیان دەکرد، لەو فەرمانگەیەی ئێمەش هەرسێ نەتەوەکە ڕوویان تێ دەکرد، فەرمانبەریش دەبووایە هەرسێ زمانەکانی بزانیایە، بەڵام پاش تێپەڕبوونی ساڵێک بە تێکەڵاوبوونم لەگەڵیان و هەوڵی خۆشم تا ڕادەیەک فێری ئاخاوتن بە تورکمانی بووم، خۆشم عەرەبییەکی زۆر باشم دەزانی، جاروبار لە تورکمانیدا هەڵەی وام دەکرد، لە سلێمانیدا بووایە پیاویان لەسەر دەکوشت. تازە گرۆگاڵم بە زمانی تورکمانی دەکرد، ڕۆژێک پیرەژنێکی تورکمان هاتە ژوورەکەمان پرسیاری "بەهائەددین"ی کرد بە تورکمانی، منیش هەر بە تورکمانی وەڵامم دایەوە، بە بۆچوونی خۆم وتبووم چووە بۆ سەر ئاو (سچماغە)، بەڵام من وتبووم چووە بۆ "سکماغە"، وشەیەکی زۆر ناشرین، پیرەژن دای بە سەری خۆیدا و بەهادین پەیدا بوو، بە بەهادینی وت بابە گیان ئەم پیاوە وتی چووە بۆ "سکماغە"، بەهادین پێکەنی و بە تورکمانی وتی ڕاست دەکا نەنە. وشەی سچماغە واتە دەستبەئاوگەیاندن. وشەی سکماغە واتە کاری سێکسی. لەو چەند ساڵەی کە لە کەرکووک بووم، لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا کاری زۆر سەخت و پڕ بەرهەم و ماندووبوونمان کرد، ئەو تیمەی ئێمە (فەرەیدوون، ئەحمەد کرێکار، عەلی بچکۆل، ئیحسان نەجم، بەندە، فەیسەڵ تاڵەبانی، بێستوون، ئەحمەد نانەوا، ئازاد هەورامی و لە

دوا ساڵدا واته له ١٩٧٣-١٩٧٤ به سەرپەرشتیی کاک شەهابی شێخ نووری) وەک یەک تیم، بناغەی بەهێزترین ڕێکخستنی کۆمەڵەمان له کەرکووک دارشت. لەو ماوەیەی که کاک شەهاب له کەرکووک بوو، کەرکووک کرایه چەقی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵه له باشووری کوردستاندا، واته بووه ناوەندێک بۆ سەرجەم ڕێکخستنەکانی سلێمانی و هەولێر و بەغدا و بادینان[18].

ڕۆژێک وەک زۆربەی ڕۆژەکانی تر، ئێواره له ژوورەکەی خاڵه شەهاب بووم و باسی بارودۆخی شۆرش و پارتی و حکومەتی عێراقی و وردەکارییەکانمان دەرکرد، خاڵه لەپڕ وتی: "دەزانی تۆ ناتوانی ببیته پیاوێکی بڕوابوو به عەدالەت و دیموکراتیەت که ئەوانه له هەره نموونه بەرزەکانی خووڕەوشتی کۆمەڵەن!" بەڕاستی سەرم سوڕما بۆ دەبێ چیم کردبێ، لەپڕ وتی: "تۆ بۆ هاوکاریی مامۆستا شوکری ناکەی له ئیشوکاری ناوماڵ، ئاخر چۆن فریای قوتابخانه و خزمەتی منداڵ و ماڵیش دەکەوێ!" منیش وتم باشه تۆ بانگی که و پێی بڵێ با ئەو ڕۆژی ٢ سەعات بخوێنێتەوه لەگەڵمدا، منیش ٣ سەعات کارەکانی ناوماڵی لەگەڵ دەکەم. خاڵه بانگی کرد و پێی وت، شوکری وتی خاڵه عوسمان من ڕقم له سیاسەت و خوێندنەوەی کتێبه، لەبەر برایم هەموو کارێکی کۆمەڵه دەکەم و هاوکاریی ئەویشم ناوێ. کاک شەهاب لەو ماوەیەی که له کەرکووک بوو، جگه له فەرەیدوون و من و ئیحسان نەجم و عەلی بچکۆل، کەسی تر نەیدەزانی ناوی شەهاب شێخ نوورییه، کاک شەهاب پاش گەڕانەوەی لەلای شۆڕشگێڕانی زەفار و فەڵەستینییەکان و هاتنی بۆ کەرکووک بەنهێنی و له ماڵی ئێمه شاردمانەوه، وامان بڵاو کردەوه که خاڵی مامۆستا شوکریه و خێزانەکەی کۆچی دوایی کردووه و هاتووه بۆ لای خوشکەزاکەی و ناویشی خاڵه عوسمانه، ئیتر لای هەمووومان هەر خاڵه عوسمان بوو، تەنانەت شوکرییش وای دەزانی بەڕاستی ناوی خاڵه عوسمانه.

ڕۆژێک بۆ کاری کۆمەڵه چوومه سلێمانی و پەیوەندیم به کاک عوسمانی نانەوا کرد، ئەویش کۆمەڵێک بەیانی دامێ بیبەمەوه کەرکووک، بارودۆخەکەی ساڵی هەنگوینیی نێوان بارزانی و حکومەتی عێراقی هەندێ ئاڵۆزی و تەمومژی تێ کەوتبوو.

---

[18] به پێویستم نەزانی باسی چۆنیەتیی کارکردنی ناو کۆمەڵه و وردەکارییەکانی ناو کەرکووک بکەم، چونکه بەدرێژی له کتێبی "چەپکێک له مێژووی کۆمەڵه"دا باس کراوه.

ڕێگاوبان وەک پێشوو وا نەبوو، بیرم کردەوە بۆ ڕزگارکردنی بەیانەکان، باشترین شت ئەوەیە ژنێکم لەگەڵدا بێ، هەموو بەیانەکانم کرد بە دۆشەکەڵە و نەسرین صابیری؛ پوورزای باوکم بە بیانووی نەخۆشیی شوکرییەوە لەگەڵ خۆما برد بۆ کەرکووک و دۆشەکەڵەکەشم بەدزی سایەقەکەوە خستە ژێر پێی نەسرین و هەردووکمان لە دواوەی تەکسییەکە سوار بووین، فەرشی بەرقاچی ناو سەیارەکەشمان دا بەسەر دۆشەکەڵەکەدا. لە کەرکووک کە دابەزین و نەسرین دۆشکەڵە بەیانەکەی بینی؛ زەرد هەڵگەڕا، پێم وت باش بوو پێم نەوتی چیی تیایە، ئەگینا هەر بە ڕەنگی زەردتدا شکیان لێ دەکردین. جارێکی تر فەرەیدوون قادر ئۆتۆمبێلێکی فۆلکس ڤاکینی (بۆقی) فاورقی ئامۆزای ئیحسان نەجمی وەرگرت و بەیەکەوە ڕۆیشتین بۆ سلێمانی بۆ کاری کۆمەڵە. لە تاسلوجە پیمی ئیستۆپەکەی دەرچوو، فەرەیدوون عاقڵیی کرد، گێڕی ئۆتۆمبێلەکەی دا بە یەک و هێواش هێواش لەو سەرەوخوارکەی تاسلوجەیە هاتینە خوارەوە. کە گەیشتینە تەختایی، تراکاتۆرێکمان بەکرێ گرت ئۆتۆمبێلەکەی ڕاکێشا هەتا لای مزگەوتی کانی ئیسکان، لەوێ فیتەرێکی لێ بوو ئیستۆپەکەی چاک کردەوە بە بیست دینار، بەڵام چەقۆیەکی لە ئۆتۆمبێلەکە لێ بەجێ ما، ئێمەش بەگاڵتەوە دەمانوت ئەم چەقۆیەمان بە بیست دینار کڕیوە.

کەڕەتێکی تر لەگەڵ ئەبو شەهاب (ئیحسان نەجم) دیسان بۆ کاری کۆمەڵە بە ماتۆڕ لە کەرکووکەوە هاتینە سلێمانی، بۆ ڕۆژی دوایی گەڕاینەوە، گەیشتینە تەیناڵ، ماتۆڕ کوژایەوە و نەڕۆیشت، لە هەورازەکاندا پاڵمان پێوە دەنا و لە سەرەوخوارەکان سواری دەبووین، بەو جۆرە تا نیوەڕۆ گەیشتینە تەکیەی دەربەند. بە ئیحسانم وت با ماتۆڕەکە بخەینە ناو پیکابێک یا لۆرییەک و خۆیشمان لەگەڵیا بڕۆین، ئەو دەیوت نا، دەیخەمە ئیش. بەکورتی لە سەرەوژوورەکە ماتۆڕمان پاڵ دەنا و لە سەرەوخوارکەش سواری ماتۆڕ دەبووین و خل دەبووینەوە، تا سەعات ١٢ی نیوە شەو گەیشتینە قات قاتەکانی کەرکووک. ئیحسان وتی ئیبراهیم وا نزیک بووینەوە لە بازگەکە، من گۆرانی دەڵێم تا تەقەمان لێ نەکەن. تا گەیشتینە بەردەم بازگەکە، ئیحسان بە سێ زمان بەو دەنگە ناخۆشەی گۆرانیی وت. لە بازگە دەرباز بووین تا ناو کەرکووک بەرەو خوارکە بوو بە سواری ماتۆڕ ڕۆیشتین، سەعات دووی بەرەبەیان گەیشتینە ماڵی

ئێمە لە ئیسکان. نیوەڕۆکە ماتۆڕەکەی بردبۆوە بۆ خاوەنەکەی، پێی وتبوو ماتۆڕ دەبێ بەنزین و ڕۆنی تێکەڵی تێکەی، ئەوسا ئیحسان ڕاستییەکەی وت کە لە سلێمانی بەس بەنزینی تێ کردووە.

## دەستپێکردنەوەی شەڕ و کۆمەڵە و زیندانی ئاسایشی کەرکووک

لەدوای گفتوگۆی ئازار و پاش چوار ساڵ وتوویژ و شاند و شاندکاری و پیلانگێرانی لە یەکتری، لەنێوان مەلا مستەفا و سەدام حسێندا شەڕ دەستی پێ کردەوە. کۆمەڵە لە هەموو شارەکان و لە هەموو ئەڵقە و کۆمیتەکان کۆبوونەوەی خۆیان کرد و مشتومڕی زۆر لە چۆنیەتیی هەڵوێستی کۆمەڵە لەسەر دەستپێکردنەوەی شەڕ کرا و تاووتوێیەکی زۆر و تەتەڵەیەکی زۆری بیروڕاکان کرا و ئەنجام بڕیاری زۆر لەسەر بەشداریکردنی کۆمەڵە لە شەڕدا لە بەرەی شۆڕش دژی ڕژێمی عێراق درا. بڕیار درا لە هەموو شار و شارۆچکەکان ئەو هەڤاڵانەی مەترسیی گرتن یا ڕاونانیان لەسەر بێ؛ بڕۆنە ناو شۆڕش لە کەرکووک: فەرەیدوون عەبدولقادر، عەلی بچکۆل، ئیحسان نەجم، حەمید پۆلیس، ئازاد عەبدولمەجید ڕۆیشتن، خاڵە شەهاب و بەندەش لەگەڵ ئەحمەد کرێکار وەک کۆمیتەی سەرپەرشتیی ڕێکخستن ماینەوە، دوای دوو ڕۆژ فەیسەڵ تاڵەبانییش ڕۆیشت. لە مانگی ٦ی ساڵی ١٩٧٤ لە فەرمانگە هەستم بە چاودێرییەکی ئاشکرای خۆم دەکرد لەلایەن دوو فەرمانبەری فەرمانگەکەی خۆمانەوە کە یەکیان زۆڵەکوردێکی دووزی بوو، ئەوی تریش تورکمانێکی کوردیزانێکی قینلەدل بوو، دووزییەکە ناوی سەلاح بوو، تورکمانەکە ناوی عەباس بوو، بە خاڵەم وت کە من هەستێکی وام هەیە چاودێری دەکرێم، پێشنیازم کرد کە ئێمەش هەردووکمان بڕۆینە دەرەوە لە کەرکووک. خاڵە وەڵامی دامەوە کە ناکرێ کەرکووک چۆڵ بکەین، لە سلێمانییش هەر ئاسۆی شێخ نووری و عوسمان ماونەتەوە، لە هەولێریش جەعفەر و عەبدولڕەزاق ماونەتەوە، ئەگەر گیرایت؛ پێیان بڵێ حکومەتەکەتان و مەلا مستەفاش وەک دوو ڕووی دراوێک وان، وەک یەک دکتاتۆر و دژە ئازادی دژە دیموکراتین. وتم خاڵە خۆ حکومەت من لە هۆڵێکی گەورەدا دادگایی ناکات و ڕێگەی بەرگریکردن لە خۆم بدات، خاڵە وتی: "گەر کۆمەڵە بی، دەبێ خۆڕاگر و نەترس و داکۆکیکار بی."

فەرمانگەکەمان خانووی مالآن بوو، بەکرێ گیرابوو، بریتی بوو لە هۆڵێکی گەورەی بازنەیی شێوە، حەوت ژووری لەسەر بوو، بە جۆرێک کە هەموو ژوورەکان هەر ڕوویان کردبووە سەر هۆڵەکە، دەرگایەکی سەرەکیی چوونەژوورەوە و دەرگایەکی تری بچووکی تیا بوو بۆ سەر دەستشۆر و بە پلیکانەش دەچووە سەربان، من کلیلی ئەو دەرگا بچووکە و دەرگای هەورەبانەکەشم کۆپی کردبوو، بۆ کاتی پێویست کە لەو دەرگایەوە بتوانم ڕاکەم.

لە فەرمانگەکەمان یەک تایپیست هەبوو کە فەیسەڵ تاڵەبانی بوو، دوو ئەمینسندووق، یەکێکیان مەسیحی بوو، ئەوی تریش تورکمانێکی سیخوڕی ئاسایش بوو، بەندە و عەدنان لە ژوورێک بووین، هەردووکمان (مدقق) پشکنەر بووین، هیی بەشی "مدنی"، ژوورێکی تر فەرمانبەرێکی زۆر بەڕێز عەلی ناو بوو، ئەویش پشکنەری گشتی بوو، ژوورێکی تر ناسح و نەجم تاڵەبانی کە ئەوانیش بەشی عەسکەری بوون، ژوورێکیش چاودێری گشتی بوو، کوردێکی تورکمان، ناوی غالب عەبدولمەجید بوو، ژووری ئەوراق و بەشی خۆی زۆڵەکوردێک سەلاح و دوو عەرەبی تیا بوو. لەو فەرمانگەیە دوو کارگوزاری تێدا بوو: "بەهادین" کوردی عانە بوو، لەگەڵ عەرەبێک لە فەرمانگەکەی ئێمە توانیبووم کە فەیسەڵ تاڵەبانی، عەدنان، بەهادین بکەمە شانەیەک لە ڕێکخستنی کۆمەڵە.

من و فەرەیدوون و فەیسەڵ بۆ ماوەی دوو ساڵ پێکەوە تەکسییەکمان گرتبوو، بەیانیان دەیبردین بۆ سەر کار و نیوەڕوان دەیبردینەوە بۆ ماڵەوە، چونکە هەرسێکمان ماڵەکانمان زۆر نزیک لە یەک بووین، شۆفێرەکە ناوی کاک سابیر بوو، ئەویشمان بۆ کۆمەڵە ڕێک خستبوو. ڕۆژی ١٩٧٤/٦/٧ بەیانی ڕۆیشتم بۆ کار، وەک ڕۆژانی پێشوو چواردەوری فەرمانگەکەم تەماشا کرد، هیچ ئۆتۆمبێلێکی نەناسراوی لێ نەبوو، چوومە هۆڵەکە بە تیلەی چاو سەیرێکی ژوورەکانم کرد کە هەموو دەرگاکان کرابوونەوە، کەسێکی نەناسم بەدی نەکرد، دوای کاتژمێرێک گوێم لە زەنگی تەلەفۆنی ژووری غالب بوو، لە هەمان کاتدا کارگوزارە عەرەبەکە هات بۆ ژووری ئێمە، وتی تەلەفۆن داوات دەکات، کە چووم؛ لە هۆڵەکەوە ناو ژوورەکە دیار بوو، گوشیی تەلەفۆنەکە لەسەر مێزەکە دانرابوو و کەسیش لە ژوورەکە جگە لە چاودێر دیار نەبوو، چوومە

ژوورەوە دەستم برد بۆ گوشییەکە، لە پشتەوە دوو کەس هەردوو دەستیان گرتم، پێیان وتم لە ئاسایشەوە هاتووین، وەرە لەگەڵمان هەندێ پرسیارت لێ دەکەین، پاش دوو سەعاتی تر دەگەڕێیتەوە. بۆ ئەوەی لە هاورێکانم بگەیەنم کە گیراوم، بە ئاسایشەکانم وت کلیلی دۆلابەکەم لایە و لیستی مووچەی خەڵکی تێدایە، با کلیلەکە بدەم بەو فەرمانبەرەی تر، ڕێگەیان دام چوومە ژوورەکە و بە عەدنانم وت کلیلەکانت لا بێ من هەتا بەڕێوەبەرایەتیی ئاسایش دەبەن. دوای گرتنی من، بەهادین بە بیانووی دابەشکردنی پۆستی فەرمانگە، بە ماتۆڕەکەی خۆی گەیاندبووە ماڵەوە و هەواڵی گرتنەکەمی گەیاندبوو، بە ماتۆڕەکەشی خاڵە شەهابی گەیاندبووە ماڵی "ئەحمەد کرێکار" کە هەر نزیکەی کیلۆمەترێک لە ئێمەوە دوور بوون، ئەحمەد کرێکاریش هەر ئەو شەوە خاڵەی بردبووە دەرەوەی کەرکووک و ڕەوانەی لای عەسکەری کردبوو. مامۆستا شوکرییش ڕۆنیۆ تیرۆکییەکە و ئەو کاغەز و بەیان و شتە گومانلێکراوانەی خۆمان و هیی ژوورەکەی خاڵەی لەگەڵ "زەینەب خانی" دراوسێمان کە ژنە شەهیدێک بوو، هاوسەرەکەی لە شۆڕشی ئەیلوولدا شەهید ببوو، لەگەڵ دایکی "مدحەت کاکەیی"، ئەوانیش دراوسێمان بوون؛ لە ماڵەوە دەرباز دەکەن و لای خۆیان حەشاری دەدەن، یەک دوو ڕۆژ و دواتر هەڤاڵان خۆیان بەئەنجامیان دەگەیەنن. دوای دوو مانگ لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدان لەسەر ئەو تۆمەتانەی بۆیان دروست کردبووم کە گوایە لەگەڵ ڕێکخراوێکی نهێنی؛ دژی ڕژێم کار دەکەم، هاوکاریی پارتی و تێکدەران دەکەم. مووچەی ئەو خانەنشینانە بە دزی فەرمانگەوە دەنێرم کە بوون بە پێشمەرگە. دوای هیلاکبوونێکی زۆر لەگەڵم، کە زانییان هیچیان دەست ناکەوێت؛ دەستیان لە لێکۆڵینەوە و سزادان و ئازاردان و ئەشکەنجەدانم هەڵگرت و هەر لە بەندینخانەی ئاسایشی کەرکووک چوار مانگ مامەوە و پاشان ڕۆژێک لە ژوورەکە بردمیانە دەرەوە بۆ ژووری بەڕێوەبەر، پێی وتم شوێنی کەسێکمان بدەرێ دەنێرین بەدوایدا ببێ بە "کەفیلت" بەرت دەدەین، منیش ناو و جێگەی "نەجمەددین عانەبەگی"م دانێ کە ماڵ و دووکانەکەی هەر لە ئیسکان بوو. لە کاتی بەردانم، پێیان وتم کە لە دەرەوە بڵێم زۆر ڕێزیان لێ گرتووم. نامەوێ لێرەدا باسی زیندانی ئاسایشی کەرکووک و جۆری ئەشکەنجەکانیان و بێڕێزییەکانیان بە مرۆڤ و مرۆڤایەتی بکەم، کەم زیندانی سیاسی

هەیە کە لەدوای بەربوونی کەم تا زۆر باسی دڕندەیی و نامرۆڤیی زیندانەکانی بەعسی نەکردبێ، جگە لەوەش خۆیشم زۆر بەکورتی باسێکم کردووە لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"، لێرەدا پێویست بە دووبارەبوونەوەی ناکات.

## ئاسۆی شێخ نووری و کاک سابیری شۆفێری تەکسی

ئاسۆی شێخ نووری لە کاتی گرتنەکەمدا هەر ئەو ڕۆژە لە سلێمانییەوە دێتە کەرکووک بۆ لای من کە نەیزانیوە من گیراوم، ئاسۆ ماڵی ئێمە نازانێ، چونکە ماوەیەکی کەم بوو ماڵمان گوێزابۆوە، لە بازاڕی حەسیرەکە دادەبەزێ و دەست لە تەکسییەک ڕادەگرێ کە بیبات بۆ فەرمانگەی خانەنشینی، لە ڕێگا شۆفێرەکە لە ئاسۆ دەپرسێ بۆ لای کێ دەچی؟ ئاسۆ دەڵێ کارێکی خانەنشینیی باوکم هەیە لەوێ، شۆفێرەکە پێی دەڵێ تۆ خەڵکی کەرکووک نیت، ئەگەر بۆ لای "برایم ئەفەندی" دەچی؛ مەچۆ، چونکە ئەم بەیانییە زوو گیرا لەلایەن ئاسایشەوە. ئاسۆ سەرسام دەبێ و دەڵێ تۆ چۆن دەزانی، سابیریش دەڵێ من هەموو ڕۆژێ خۆی و هاوسەرەکەی هاتوچۆی فەرمانگە و قوتابخانە پێ دەکەم، دەتەوێ بتبەمە لای ماڵیان، ئاسۆش دەڵێ بەڵێ بگەڕێرەوە بۆ ماڵەوە، ئاسۆ هیچ خۆی تێک نادا و وا پیشان نادا کە ماڵەکە نازانێ، لەبەردەم ماڵی ئێمە دادەبەزێ، سروشتی کچم خۆی فڕێ دەداتە باوەشیەوە، سابیر دەڕوا و ئاسۆش کە دەزانێ من گیراوم و خاڵەش لەوێ نییە، بەرودوا بە ئۆتۆمبێلی سلێمانی دەگەڕێتەوە. من کە بەر بووم، ئاسۆ ئەم بەزمەی بەسەری هاتبوو؛ بۆی گێڕامەوە.

ئاسۆ وتی کە گەڕامەوە سلێمانی، هاوڕێیانم ئاگادار کردەوە کە تا ماوەیەک بەوریایی هەڵسوکەوت بکەن نەک برایم خۆی ڕانەگرێ، وتی بەڵام پاش هەفتەیەک کە هیچ ڕووی نەدا؛ زانیمان کە سوودیان لێت نەبینیوە. پێش گرتنم و دوای گرتنم، وشەکانی خاڵە شەهاب لە گوێمدا دەزرنگایەوە: "کۆمەڵە دەبێ نەترس و قسەلەڕوو و ڕاستگۆ بێ." لەو ماوە کەمەدا کە زیندانی بووم، ئەوەندەیان ئەشکەنجەی جۆراوجۆر دام کە تا نووسینی ئەم یادگارنامەیەش شوێنەواری بە لەشمەوە ماوە، وەک شوێن ئوتوو و شکانی بڕبڕەی پشتم کە لەم دواییانەدا لە ئەڵمانیا نەشتەرگەرییان بۆ کردم، ئێستا شانازی بەوەوە دەکەم کە تاکە یەک وشەی زیانبەخشیان لە من وەرنەگرت

کە سوودی بۆ ئاسایش هەبێت و زیان بە هاوڕێکانمان بگات، لە کاتێکدا کە ئێمە لە کەرکووک ئەڵقەی ناوەندی ڕێکخستنەکانی شارەکانی سلێمانی و هەولێر و بەغداد بووین بە هۆی بوونی خاڵە شەهابەوە لە کەرکووک. خاڵە شەهاب و هاوڕێکانی، هەمان ڕێبازی خاڵەیان پەیڕەو کرد کە لە زینداندا بوون، درووشمی "کەم بژی و کەڵ بژی"یان داهێنا لە زیندانەکانی فاشستی بەعسییەکاندا. دوای بەربوونم، بە باشم زانی بۆ ماوەیەک کەنار بگرم و نزیک نەبمەوە لە هاوڕێکانم تا بە هۆی هەڵسوکەوت و چالاکیی منەوە گومان نەخەنە سەر هاوڕێیانی تری کۆمەڵە کە لەناو شاری کەرکووکدا بوون، وەڵامم بۆ ئەحمەد کرێکار نارد، شەو هاتە لام و ناوی ئەو هاوڕێیانەم دایە کە سەرەکشانە بوون لای من کە پەیوەندییان پێوە بکات و نامەشم بۆ هەموویان نووسی کە باوەڕ بە کاک ئەحمەد بکەن، ئەو هەوڵەم زۆر سەرکەوتوو بوو کە هیچ هاوڕێیەکی ترمان لە کەرکووک تووشی گرتن و ڕاوەدوونان نەبوون، پەیوەندییەکانم لەگەڵ هەولێر و سلێمانی زۆر کەم کردەوە و بەپارێزەوە ئەرکەکانم جێبەجێ دەکرد و بەردەوامیش بووم لە پەیوەندیم بە هاوڕێیانی دەرەوە (ناو شۆڕش[19]).

## ١٩٧٥/٣/٦، ڕۆژە ڕەش و شوومەکەی کە ناو نرا ئاشبەتاڵ

لەو ڕۆژەدا لەجیاتیی بانگی سەرکەوتن و سەرفرازی لە باشووری کوردستان بە گوێیی خەڵکیدا بدرێت، بانگی ڕێککەوتنی نێوان محەممەد ڕەزا شای ئێران و سەدام حسێن لە جەزائیر بە ناوەندگیریی "هاواری بۆمیدیەن" لە هەموو ئێزگەکانی لەندەن، ئێران و ئیسرائیل و عێراق و دەنگی ئەمەریکا بە گوێی دانیشتووانی کوردستان بەگشتی و هێزی پێشمەرگە بەتایبەتیدا درا. شوومترین ڕۆژێک لە مێژووی گەلی کورددا کەوتە سەر لاپەڕەکانی مێژووی خەباتی گەلی کوردەوە، ڕەشترین پەڵەی سەرشۆڕی و شەرمەزاری و خیانەتیش چووە ناو مێژووی سەرانی خۆفرۆش و گەل فرۆش و وڵات فرۆشی بارزانی و سەرکردایەتیی حزبەکەیەوە، وشەیەک بە پیتی تاوان و ڕووڕەشی و شەرمەزارییەوە لە مێژووی شۆڕشی ئەیلوولدا بوو بە

---

[19] باسی کاری کۆمەڵە لە کەرکووک و درێژەی ئەم بەشەم لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"دا باس کردووە.

دوا وشەی داستانەکانی شۆڕشی ئەیلوول و دوا لاپەڕەی مێژووی ئەو شۆڕشەی پێ نەخشێنرا کە وشەی ئاشبەتاڵ بوو. ئەو کارەساتە تراجیدیایە مەگەر هەر لە زاری ئەو پێشمەرگە گیانبەخشانەوە بگێڕدرێتەوە کە بە هۆی بوودەڵەیی سەرکردەکانیانەوە، خۆشەویستترین دڵداریان کە چەکەکانی شانیان بوو؛ بەسەرەوخوار هەڵواسراوی و بەناچاری دەیاندا بە دەست سەربازە ترسنۆکەکانی ڕژێمی بەعسییانەوە، یان لە زاری دەیان هەزار ژن و منداڵی ئاوارەبوو و دەربەدەری وڵات بگێڕدرێتەوە کە چۆن بووبوون بە ئاردی ناو دڕک و بە پەینکەی خۆیشیان نەدەشیان، بە جۆرێک لەنێوان ئێران و عێراقدا سەریان لێ شێوابوو کە ڕاست و چەپیان بۆ لێک جیا نەدەکرایەوە. لەو ڕۆژە شوومەدا کە هەموو کەس تەمی بێهیوایی و ترسی مەرگ؛ بەرۆکی گرتبوون، کۆمەڵە لە دەرەوە داوای ڕاوبۆچوونی ڕێکخستنەکانی ناو شارەکانی دەکرد لەسەر خۆبەدەستەوەنەدان و درێژەدان بە بەرگری و بەردەوامیی شۆڕش[20]، بەڵام بەداخەوە لافاوی خۆبەدەستەوەدان و شاڵاوی ئاشبەتاڵەکە هێندە بەتەوژم بوو؛ بوار و دەرفەتی بیرکردنەوەی ڕاست و بابەتی بە هیچ لایەنێک نەدا، سەرجەم هاوڕێیانی ئێمەش لەگەڵ هەموو ئەوانەی ڕوویان لە گەڕانەوە بۆ ناو شارەکان کرد؛ هاتنەوە ناو شارەکان و ئەوانەی نەیانتوانی بەئاشکرا کار بکەن؛ کەوتنە کاری نهێنی.

ڕژێمی بەعس لە کەرکووکدا کەوتە پاکتاوکردنی شارەکە لە کوردەکانی دانیشتووی کەرکووک و گوێزانەوەی فەرمانبەرە کوردەکانیش بۆ دهۆک و هەولێر و سلێمانی. لە چاودێریی خانەنشینی کەرکووک، من و فەیسەڵ تاڵەبانی و عەدنان گوێزرانەوە بۆ سلێمانی، لە قوتابخانەکانیش بەشی کوردی داخرا و مامۆستا شوکرییش نێردرایەوە بۆ سلێمانی[21]. کاک فەیسەڵ تایپیستێکی زۆر بەتوانا و خێرا و بێ هەڵە بوو، هەر کارێکی چاپی کۆمەڵەمان هەبووایە؛ دەماندا بەو، تێکەڵ بە وەرەقەکانی تر دەکرا و چاپی دەکردن و بە شوێنەکانی خۆیانمان دەگەیاند. لەدوای گەڕانەوەی هاوڕێیان، وا بە باش زانرا کە کۆمیتەیەک بە ناوی کۆمیتەی شارەکانەوە دابنرێت بۆ بەڕێوەبردنی ئەرک و کارەکانی کۆمەڵە، دوور لە تێکەڵبوونی هاوڕێیانی سەرکردایەتی کە لە

---

[20] سەیری کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" بکە.
[21] هەمان سەرچاوە.

ئاشبەتاڵ گەڕابوونەوە بۆ پاراستنی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە گرتن و ڕاونان و شک و گومانی ڕژێمی بەعس[٢٢]. ڕۆژێک فەیسەڵ هەندێک بەیانی کۆمەڵەی چاپ کردبوو، لەگەڵ نووسراوەکانی فەرمانگە بەتێکەڵی بۆی هێنام و منیش لەناو سەبەتەی کاغەزەکاندا دامنا کە سەرقاڵی کاری فەرمانگە بووم، مامۆستا ڕەسوول محەممەد ئەمین تێلچی خەڵکی ڕانیە بوو لە سلێمانی مامۆستا بوو، ناسیاوی مناڵیی یەکتر بووین، هاتە سەردانم و لەلامەوە لەسەر کورسییەک دانیشت، کەوتە وتووێژ کە ئەو لە حزبەکەی ستار تایەر شەریفە (پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان - حزب الثوری الكردستانی) کە هاوپەیمانی حزبی بەعس بوون و پاشماوەی "پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان"ی هەڵوەشاوەی ساڵی ١٩٧٠ بوون، دەستی پێ کرد و بە خەیاڵی خۆی هەوڵی دەدا قایلم بکات بەوەی بچمە حزبەکەیانەوە وەک ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حزبەکەیان، هەر لە کاتی وتووێژەکەماندا ئەو لەپڕ ڕەوتی وتەکانی گۆڕا و داوای لێبوردنی لێ کردم و بە بیانووی ئەوەی کە کاری هەیە و دەبێ بڕوات. دوای ڕۆیشتنی ئەو، سەرنجی وەرەقەکانی ناو سەبەتەکەم دا، ئەو بەیانەی کە هیی کۆمەڵە بوو؛ چمکێکی دیار بوو کە ناوی کۆمەڵەی لەسەر بوو، من کەوتمە گومان و دڵەڕاوکێوە، دوای نیوەڕۆ من چووم بۆ لای ئەو، پێم وت بۆ پێش نیوەڕۆ گفتوگۆکەت بڕی، وەڵامی دامەوە کە بیبورم نەیزانیبوو کە لە ڕێکخراوێکی تردا کار دەکەم و بەڵێنی دا کە ئەو هیچی نەدیوە و نەزانیوە، منیش سوپاسم کرد و پێم وت ئەوەی دیویشتە؛ هیی لایەنێکی دەستەوستان نییە، پێم خۆشە بزانی. مامۆستا ڕەسوول لە حزبەکەی شێخ ستارەوە سەنگەری گوێزایەوە بۆ ناو بەعس و لە ڕێگەی تەها جەزراوییەوە هاوکاری دەکرا، بۆیە لەگەڵ هەڵگیرسانی کڵپەی شۆڕشی نوێ؛ ئەویش بە سزای خۆی گەیەنرا هەر لەلایەن حزبەکەی پێشوویەوە.

---

٢٢ هەمان سەرچاوە.

## بەشی شەشەم
## کۆمیتەی هەرێمەکان و کۆمیتەی شارەکان و مشتومڕی یەک ساڵە

دوای گەڕانەوەی هاوڕێیان لە دەرەوە بۆ ناو شارەکان و بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە ڕێکخستنی شارەکان هەر بەنهێنی بمێنێتەوە و تێکەڵ بە ڕێکخستنەکانی دەرەوە نەکرێ لەبەر سەلامەتیی پاراستنیان و نهێنیی کارکردنیان، بڕیار درا کە کۆمیتەی شارەکان پێک بهێنرێ و ئەرکی سەرکردایەتی و بەڕێوەبەردنی کاری ڕێکخراوەیی ڕێکخستنەکانی شارەکان بگرێتە ئەستۆ، ئەم کۆمیتەیە بەردەوام بوو لە کارەکەی تا ڕۆیشتنی هاوڕێیانی سەرکردایەتی بۆ ئێران بەنیازی چوونیان بۆ سوریا و بینینی مام جەلال و گرتنیان لە ئێران و ڕادەستکردنەوەیان بە ڕژێمی عێراقی و زیندانیکردنیان. لەو ماوەیەدا چەند هاوڕێیەکی تری کۆمەڵەی بێئاگا لە کۆمیتەی شارەکان، کۆمیتەیەکیان پێک هێنا بە ناوی کۆمیتەی هەرێمەکان، بەڵام بە زیندووکردنەوەی تێزی عێراقی و کارکردن بە گۆڕینی ڕەوتی کوردستانیی کۆمەڵە بەرەو عێراقیبوونی کۆمەڵە.

ئەم دوو بۆچوونە لە مشتومڕی بەردەوامدا بوون تا دەرچوونی بڕیاری ڕژێمی عێراقی بە بەسەرداداني سزای هەڵواسین بەسەر شەهیدان: شەهاب شێخ نووری، جەعفەر عەبدولواحید؛ سکرتێر و سەرکردایەتیی کۆمەڵە و ئەنوەر زۆراب؛ کادری پێشکەوتووی کۆمەڵە، وە سزای زیندانیکردنی سەرکردە و هاوڕێکانی تر بە ٦ ساڵ زیندانی و هەندێکیان کەمتر. کۆمیتەی هەرێمەکان هەر ڕێک پاش ڕادەستکردنەوەی ئەو هاوڕێیانە لەلایەن ئێرانەوە بە عێراق و بردنیان بۆ بەندینخانەی "ابو غریب" و دڵنیابیان لە گرتنی سەرکردایەتی، بەیانێکیان کە لە مێژووی کۆمەڵەدا ناسراوە بە بەیانی شوبات لە مانگی شوباتی ١٩٧٦دا لەسەر ئەو هەڤاڵانەی زیندان دەرکرد و ناوزەدیان کردن بە (معترف، منحرف، انتهازی، انهزامی) و وەرگرتنی وێنەیەکی ئەو

بەیانە بە شەهید "ئەنوەری برای خولە کەشکۆڵ" بوو بە گەورەترین بەڵگە لەسەر گیراوەکان بەدەست ڕژێمی بەعس و دادگا گاڵتەجاڕییەکەیەوە. کێشەی نێوان کۆمیتەی شارەکان و کۆمیتەی هەرێمەکان بەردەوام بوو تا دەرچوونی سزای دادگا بەسەر گیراوەکان و چوونی بەندە بۆ لای خاڵە شەهاب و فەرەیدوون و ئاوات غەفوور و عومەری سەیید عەلی و لەسەر داوای خاڵە شەهاب و بۆ پاراستنی کۆمەڵە لە گورزی کوشندەی تری ڕژێم و کارکردن بە ڕەوتی یەکڕیزیی کۆمەڵە، ئەو دوو کۆمیتەیە پاش لەدایکبوونی یەکێتی؛ یەکیان گرتەوە و وەک یەک تیم کاریان کرد[٢٣].

## مەفرەزە سەرەتاییەکان

لەپاش دروستبوونی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و دروستبوونی پەیوەندیی نێوان ناو وڵات و دەرەوەی وڵات، لە دەرەوە دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی بەتایبەت مام جەلال داوایان لە کۆمەڵە کرد لەناو وڵات کار بکەن بۆ بەئەنجامگەیاندنی دوو ئەرک:

یەکەم: هەوڵدان بۆ دروستکردنی ڕێکخستنی یەکێتی لە شارەکانی کوردستان لە کەسانی نیشتمانپەروەر و پێشمەرگەی دێرین و کۆنە جەلالییەکان و ئەو سیاسییانەی کە بێلایەن دانیشتوون لەدوای ئاشبەتاڵ.

دووەم: دروستکردنی مەفارزی سەرەتایی بە ژمارە کەم و بە چۆنایەتی لە هەرە دڵسۆزەکانی کۆمەڵە و کەسانی تری توێژەکانی جووتیاران و کرێکاران.

هاوڕێیانی کۆمەڵە لە هەموو لایەکەوە کەوتنە خۆ بۆ پێکهێنانی ڕێکخراو و لیژنەی ناوچەی یەکێتی و مەفرەزەی سەرەتایی لە هەڵەبجە و هەورامان و باڵەکایەتی و دەشتی کۆیە و قەڵاتووکان و دەشتی هەولێر و لە بادینان و شارباژێر و دۆڵی جافەتی. هەندێ لە هاوڕێیانی کۆمەڵە چوونە شارباژێڕ و پاشان چوونە بەری قەرەداغ، بەتایبەتی هاوڕێیانی کۆمتیەی هەرێمەکان، بە ئامانجی پێکهێنانی بنکەی سوور و ڕابەریکردنی شۆڕشی نوێ. هەر لەو ساڵەدا واتە ساڵی ١٩٧٥، پاش ئاشبەتاڵ، (حرکة اشتراکیة

---

[٢٣] وردی و درێژیی کێشەی کۆمیتەی شارەکان و کۆمیتەی هەرێمەکان، لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"دا بخوێنەرەوە.

الدیمقراطیة الکردستانیة) بزووتنەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستانیش لەلایەن هەڤالان عەلی عەسکەری و ڕەسوول مامەند و سەیدا سالح یوسفی و چەند هەڤالێکی تری و پەیوەندییان بە مام جەلالەوە کردبوو بۆ چوونە شاخ و بەرپاکردنی شۆڕشی نوێ، ئەوانیش لای خۆیانەوە کەوتنە پێکهێنانی دەستەی چەکداری و چوونە بەری قەلادزێ و شارباژێڕ و دۆڵی جافەتی. هەر لەو کاتەدا هەندێ لە هاوڕێیانی کۆمەڵە کە لە ئاشبەتاڵ گەڕابوونەوە و نێردرابوون بۆ خواروو و ناوەڕاستی عێراق، فرسەتیان هێنابوو و گەڕابوونەوە سلێمانی، بەڵام بەنهێنی پێمان باش بوو پەیوەندییان پێوە بکەین گەر بیانەوێ هاوکارییان بکەین بۆ چوونەدەرەوە و پەیوەندیکردن بە مەفرەزە سەرەتاییەکانەوە، لەوانە (تەها باراوی و فوئاد مەجید میسری) کە کاک تەها ڕۆیشتە شارباژێڕ و ماوەیەک و پاشان گەڕایەوە ناو شار و خۆی ڕادەستی میری کرد، بەڵام فوئاد نەک هەر ئامادە نەبوو، بەڵکە لە ڕێگەی زیادی برایەوە پەیوەندیی بە شێخ ستارەوە کرد و لە ڕێگەی شێخ ستاریشەوە پەیوەندیی بە تەها یاسین ڕەمەزانەوە کرد و پەرێزی خۆی بەو جۆرە پاک کردەوە"[٢٤].

## شەهید خەلیل و مەفرەزەی سەرەتایی

لە مانگی ١٩٧٦/٦ بە شەهید خەلیلی برامدا نامەیەکی شەهید ئارام و بەندەمان نارد بۆ فەقێ حەسەنی حەمەد ئاغای کاسکان، کە ئەو چەکانەی لە ئاشبەتاڵدا شاردبوویەوە یان خۆی مەفرەزەیەکی پێ چەکدار بکات و لەگەڵ قادر خەبات کە پاش ئاشبەتاڵیش خۆی نەدابوو بەدەستەوە و لەگەڵ خەلیل جەلالدا پێکەوە بانگی هەڵگیرسانی شۆڕشی نوێ هەڵبدەن، شۆڕشی نوێ بەگوێی دانیشتووانی ناوچەکەدا بدەن، یان چەکەکان بدات بە شەهید خەلیل بۆ چەکدارکردنی مەفرەزەیەک بۆ شۆڕشی نوێ. شەهید خەلیل نامەکە دەبات و لەسەر پردی ژاراوا کە بازگەی حکومەتی لێ دەبێ، لەسەر زمانلێدانی فەیسەڵ حەقی ئاغای ئیندزە دەیگرن و شەهید خەلیل نامە پێچراوەکە قووت دەدا، بەگیراوی دەبرێ بۆ قەلادزە و لە سەرای قەلادزە بەندی دەکەن، دوای ٤

---

٢٤ سەبارەت بە مەفرەزە سەرەتاییەکان و بارودۆخەکە و هەڵسەنگاندنیان، دیسان بەدرێژی لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"دا باسم کردووە.

ڕۆژ لە بەندیخانەی پۆلیسی قەڵادزەوە دەیگوێزنەوە بۆ بارەگای هەواڵگری بەنیازی ڕەوانەکردنی بۆ کەرکووک، شەهید خەلیل لە ڕێگا هەل دەقۆزێتەوە و لە کۆلانێکی تەسکدا ڕادەکات لەدەستیان و پاشان بەناو زێرابی کۆلانەکەدا خۆی دەگەیەنێتە ناو باخچە و دارەکانی پشتی قەڵادزە و دواجار بە شەو ڕووەو بەستەسێن و ڕۆژی دوایی دەچێتە خەزێنە بۆ لای قادر خەبات و ناوەڕۆکی نامەکە بە دەمی بە فەقێ حەسەن و قادر خەبات دەگەیەنێ و ناگەڕێتەوە بۆ ڕانیە، هەر لە باڵەکایەتی و شاخی گەڵاڵی قەڵاتوکان و ئەبو بەکرە و مەفرەزەیەک لەگەڵ مام عەبدوڵڵا ئەبو بەکرە و حەسەن برایم شوان پێک دێنن و دەبنە یەکەم مەفرەزەی سەرەتایی لەگەڵ قادر خەباتدا لە ناوچەی سەنگەسەر و قەڵادزێ و پشدەرەوە.

لە مانگی ١٩٧٦/٨ لەسەر شەهید خەلیلی برام، باوکم (جەلال مەجید هاوار) لەناو دووکانەکەی خۆیدا دەگرن، دراوسێ دووکانەکان وەڵام دەنێرن بۆ ماڵی باوکم کە باوکم گیراوە، ئەوانیش خۆیان دەرباز دەکەن. دایکم و شەهید هاوار و ڕزگاری برام و پەروین و نەکەرۆزی خوشکم بە سەربانەکاندا دەچەنە ماڵ و تەکیەی شێخ مستەفای شێخ بایزی باقلان، لە ڕێگەی شێخ مستەفاوە کە زۆر تێکەڵیان لەگەڵ باوکم هەبوو؛ دەنێردرێنە سلێمانی، بە هاوکاریی مامۆستا سادق مەعرووف، شەهید هاوار و ڕزگار بە کارکردنەوە سەرقاڵ بوون هەتا کردنەوەی قوتابخانە. دوای کردنەوەی قوتابخانە، شەهید هاوار لە قوتابخانەی "شانۆی سلێمانی" لە پۆلی ٦، بەشی زانستی، دەستی بە خوێندن کرد و ڕزگاریش چوو بۆ قوتابخانەی پیشەسازیی سلێمانی، بەڵام دوای ٤ مانگ خوێندن، ئەوانیش ڕژێم ویستبووی لە قوتابخانە بیانگرێ، بەرەودوا ڕادەکەن و شەهید هاوار لە ڕێگەی دۆڵەڕووتەوە دەڕوات بەرەو سەرگەڵوو، لە مانگی ١٩٧٧/٢ پەیوەندی بە مەفرەزەکانی کۆمەڵە دەکات و دایکم و خوشکەکانم و ڕزگاری برام لە ساڵی ١٩٧٧ و تا کۆتایی ساڵی ١٩٧٩ لە ژوورێکی سەردالانەکەی ماڵی هاوڕێ و برای زۆر دڵسۆز بۆ کۆمەڵە و بەندەش ئیبراهیم مەجید ناسراو بە برایم گوڵبەهار بەشاردراوەیی دەمێننەوە، تا بڕیاری لێخۆشبوونەکەی سەدام حسێن لە مانگی١٩٧٩/١١ کە بەو بڕیارە باوکم لە زیندانی "خناق" لە سەماوە بەر دەبێ و بڕیاری گرتنیش لەسەر ڕزگار لا دەبرێ.

## سەرکردایەتیی ڕێکخستنی ناوخۆ

لەدوای گەڕانەوەی مام جەلال و کاک نەوشیروان، بڕیاریان دا کە سەرکردایەتییەکی ڕێکخستنی ناوخۆ دروست بکرێ لە هەولێر و سلێمانی و کەرکووک و بەغدا. لە سلێمانی بەندە بوومە ئەندامی ئەو سەرکردایەتییە لەگەڵ هەڤاڵان: جەمال تایەر، شازاد صائب، حەمە چاوشین. ئێمە سەرپەرشتیکاری ڕێکخراوەیی کۆمەڵە و یەکێتییشمان دەکرد لە سلێمانی و ئەو شار و شارۆچکانەی سەر بە پارێزگای سلێمانی بوون. ئەو سەرکردایەتییە تا مانگی ١٩٧٨/٨ بڕی کرد کە جگە لەوەی ئەرکی ڕێکخستن و ڕێکخراوەیی لەئەستۆ بوو، ئەڵقەیەکی پەیوەندییش بوو لەنێوان شارەکان و سەرکردایەتیی ناو شۆڕش و سەرچاوەیەکی دارایی شۆڕشیش بوو. لەدوای کارەساتی هەکاری و خیانەتی پڕ شوورەیی و شکاندنی پەیمانی نێوان یەکێتی و پارتی لەلایەن پارتییەوە؛ گورزێکی کەمەرشکێن بەر یەکێتی کەوت، گەر سەرکردایەتیی بەهێز و بەورەی یەکێتی نەبووایە، هەرچ حزبێکی تر بووایە دووهەم ئاشبەتاڵ ڕووی دەدایەوە کە مەبەستی هەرە سەرەکیی پارتی؛ ئاشبەتاڵپێکردنی یەکێتی و سەرخستنی "فەلسەفەکەی ئیدریس بارزانی" بوو کە "ئەگەر شۆڕشمان پێ نەکرێ، پێمان تێک دەدرێ". لە کارەساتی هەکاری پتر لە هەزار پێشمەرگەی یەکێتی شەهید و زیندانی و ڕادەستی هێزەکانی عێراقی بوون، چەندین سەرکردە و کادری سەرەکی و سەرکردەی پێشمەرگانەی یەکێتی بە دەستی بنەماڵەی ناسراو بە "قیادة مؤقتة" شەهید کران، وەک شەهیدان: عەلی عەسکەری، دکتۆر خالید، شێخ حسێن بابە شێخ، ڕەئووف بەگ و چەندین ئەندامی سەرکردایەتیی تری کۆمەڵە و یەکێتی زیندانی کران، وەک: ملازم عومەر، ئازاد هەورامی. ئەو کارەساتە بووە هۆی لاوازبوونی سەکردایەتیی یەکێتی لە ڕووی ژمارەوە، بەڵام ورەی بەرز و بەهێزیی ئەندامانی سەرکردایەتی توانییان ئەو قەیرانە تێپەڕێنن، داوایان لە سەرکردایەتیی ڕێکخستنی ناوخۆ کرد کە چەند دەتوانن لە هەڤاڵانی سەرکردایەتیی ناوخۆ و ئەندامانی پێشکەوتووی کۆمەڵە و بزووتنەوەش ڕەوانەی ناو شۆڕش بکەن. ئێمە لە سەرکردایەتیی ناخۆ باش تاووتوێی ئەو بڕیارەی سەرکردایەتیی دەرەوەمان کرد، سەرەتا پێمان باش بوو کێ خۆبەخش لە ئەندامان ئامادەی چوونەدەرەوە بێ؛ بیاننێرین، بەڵام دوایی بڕیار درا کە منیش و شازاد

صائبیش بڕۆین، بەڵام گرتنی کەمالی سەیید قادر بەبریینداری لەلایەن ڕژێمەوە کە پەیوەندیی ڕاستەخۆی بە کاک شازادەوە بوو، ڕۆیشتنەکەی شازادی پێش خست، شازاد پاسپۆرتی عێراقیی هەبوو، بەپەلە لە بەغداوە ڕۆیشت بۆ هۆڵەندە و پاشان لە ڕێگەی سووریا و ئێرانەوە گەیشتە سەرکردایەتی.

## لە شارەوە بۆ شاخ

من لە لایەکەوە شەهید جەمال تایەر لە ڕێگەی شەهید مەغدید کوێخا عەبدوڵلاوە کە ئەندامی یەکێتی بوو بە پلان لەناو ئاسایشی دانیشگاش لەگەڵ ڕژێم کاری دەکرد، ئاگادار کرابوو کە من ئاگادار کات خۆم بشارمەوە، چونکە دەیانەوێ بمگرن. لە لایەکی ترەوە نامەی هەڤاڵ مام جەلال و هاوڕێ نەوشیروانم بۆ هاتبوو کە پاکتاوی کارە ڕێکخراوەیی و خێزانیی خۆم بکەم و خۆم ئامادە بکەم بۆ چوونە ناو شۆڕش و پەیوەندیکردن بە سەرکردایەتییەوە خۆیشم دوچاری چەندین کۆسپ و تەگەرەی سەر ڕێگەی چوونەدەرەوەم هاتبووم، دایکم و خوشکەکانم بێ سەرپەرشت مابوونەوە، باوکم لە زیندان بوو، براکانم شەهیدان خەلیل و هاوار پێشمەرگە بوون لە شاخ، ڕزگاری برام حەشار درابوو، چونکە ئەویش بڕیاری گرتنی دەرچووبوو. لە سەرەتاوە واتە لە ١٩٧٨/٨/١ەوە لە بیری چۆنیەتیی چارەسەری ئەو کێشانە و چوونە شاخدا بووم، هەموو شەوێک بیرم دەکردەوە چۆن بتوانم بە هاوسەرەکەم بڵێم بەجێت دەهێڵم و دەچمە ناو سەنگەری بەرەنگاری و مەرگەوە، ئەی چۆن بە دایک و خوشکەکانم بڵێم بەجێتان دەهێڵم بێ سەرپەرشتتان دەکەم، یان چۆن بتوانم و دڵم بێ هەرسێ کچە نازدارەکانم بێ باوک کەم؛ سروشتی تەمەن حەوت ساڵ، ژینی تەمەن چوار ساڵ و دەروونی تەمەن ٧ حەوت مانگ. چۆن بتوانم ئەو دوو خۆشەویستییە لە تای تەرازوودا هەڵسەنگێنم، خۆشەویستیی دایک و خوشک و برا و هاوسەر و منداڵەکانم، خۆشەویستیی گەل و نیشتمانە خاپوورکراوەکەم، چۆن بتوانم کامیان بەسەر کامیاندا زاڵ کەم، ڕۆژانە بیرم لەو دوو تای تەرازووە دەکردەوە. ئاخر زۆر ستەمە دایکێک و سێ کچ، دایکێک و دوو خوشک، باوکێک لە زیندانی بەعسییاندا کە هەموویان تاکە سەرپەرشت و تاکە پشتوپەنایان من بووم، من بووم تاکە کەس کە هەموو مانگێک

جارێک دەچوومە سەردانی باوکم لە زیندانی خەناق لە سەماوە بۆ دڵدانەوەی و کەمکردنەوەی کەمێک لە ئازاری زیندان و دووریی لە ماڵ و منداڵ و خەم و پەژارەی کوڕە پێشمەرگەکانی.

دواجار بڕیارم دا لە پێشدا سەردانی باوکم بکەم و لە ڕۆیشتنم بۆ پێشمەرگایەتی ئاگاداری کەم و ئامۆژگاری و سەرنج و ڕای ئەویش لەسەر بڕیارەکەم وەربگرم. لە ١٩٧٨/٨/٣ سەردانی باوکمم کرد و لە بڕیارەکەی خۆم ئاگادارم کرد، باوکم پێی وتم: "دەمزانی کوڕی سێیەمیشم سەر لەبەردەم ئەم ڕژێمە کوردکوژە دانانەوێنێ و دەبێتە پشتیوانی دوو براکەی تری لە شاخ و سەنگەری شەرەفمەندانیدا، بەڵام داوایەکم لێتان هەیە، لەبەر من و بۆ بەربوونی من هەرگیز کەستان تەسلیم بە ڕژێم نەبنەوە و سەری بەرزم شۆڕ نەکەن، بڕۆ خوات لەگەڵ. بە شوکری بڵێ ئاگای لە دایکت و خوشکەکانت بێ".

دوای گەڕانەوەم لە سەماوە، دایکم و خوشکەکانم و ڕزگاری براشم لە ڕۆیشتنم ئاگادار کرد و ئەوانم سپارد بە هاوڕێ و برا و کەسی ڕۆژی تەنگانەم هاوڕێ ئیبراهیم مەجید ناسراو بە وەستا برایمی گوڵبەهار. بیرم لەوە دەکردەوە چۆن مامۆستا شوکریی هاوسەرم و منداڵەکان لەو بڕیارە ئاگادارکەم. من پاسپۆرتم دەرهێنابوو، لە فەرمانگەش مانگێک پشووم داوا کردبوو، پێم لە جەرگی خۆم نا و شوکریم ئاگادار کرد کە دەڕۆم بۆ دەرەوەی وڵات بۆ یەک مانگ، سروشت و ژینم تێگەیاند کە بابە دەچێ بۆ ئەورووپا، جلی جوان و بووکی جوانتان بۆ دێنێ، تەنانەت دوو کاسێتی تەسجیلیشم بە پرسیار و وەڵام پێ پڕکردنەوە تا نووسینی ئەو یادەوەرییانەش؛ کاسێتەکان لای هەردووکیان ماوە.

ڕۆژی ١٩٧٨/٨/٨ جانتای جلەکانم ئامادە کرد، گوایە دەڕۆم بۆ بەغدا و لەوێوە بە فڕۆکە بۆ بەرلینی ڕۆژئاوا. هەڵەیەکم کرد لە دانانی جلەکانمدا؛ دەستێ جلی کوردیشم دانا، شوکری کەوتە شکەوە کە بۆ ئەورووپا بۆ جلی کوردی دەبەم، قایلم کرد کە بۆ نمایشکردن و کوردناساندن دەیبەم. هێشتا کاک شازاد لە سلێمانییەوە سەفەری نەکردبوو، چەند نامەیەکم بۆ شوکری نووسی و خستمنە ناو زەرفەوە و بە کاک شازادم وت هەر نامەیەی لە وڵاتێکەوە بە پۆستدا بنێرێتەوە بۆ شوکری، ئەوەش بۆ

شوێن ونیی خۆم و پاراستنی شوکری لە گرتن. ڕۆژی ١٩٧٨/٨/٩ جانتاکەم هەڵگرت، کچەکانم ماچ کرد و شوکریی هاوسەرم لەباوەش گرت و بە گریان ئەوانم جێ هێشت و خۆشم لەودیو دەرگای حەوشەوە بە چاوی بە فرمێسکەوە ئاوڕێکم لە خانوو و ماڵەکە دایەوە و ماڵئاواییم لێ کردن. لە ڕۆژی ١٩٧٨/٨/١٠ بە یاوەریی شەهید هاواری برام کە بەنهێنی هاتبوو بۆ بەستەستێن لەگەڵ دانای ئەحمەد مەجید و کوکژ عوسمان عەسکەری و پشکۆ سەعید ناکام، مامۆستا شەهید نووری کەرکووکی، کە مامۆستا جەمال تایەر داوای لێ کردم لەگەڵ خۆمدا بیانبەم بۆ سەرکردایەتی، گەیشتینە قەندیل لای هاوڕێیان مام جەلال و کاک نەوشیروان.

## قەندیل و سەرەتای ژیانی شاخ لە شۆڕشی نوێدا

پەیوەندیی نێوان سەرکردایەتیی شۆڕش و سەرکردایەتیی ناوخۆ لە هێڵی سلێمانییەوە بەندە ڕێکم خستبوو بە هاوکاریی خاڵم (حەمەی مەجید هاوار) و هاوڕێ "ئەحمەد سەیید زادە" کە دەستنێژی خۆمان بوو لەناو هەواڵگریی ڕژێم لە ڕانیەدا، هێڵەکە بەم شێوەیە بوو تا پێش چوونەدەرەوەم بۆ شاخ بەندە لە سلێمانی، ئەحمەد سەیید زادە لە ڕانیە، خاڵم بۆ بەستەسێن، شەهید هاوار بۆ سەرکردایەتی.

دوای چوونەدەرەوەم، پەیوەندیی شاخ و شار هەر بەو هێڵە بە مامۆستا جەمال تایەرەوە بەسترا. لەگەڵ شەهید هاواردا سەرەتا لە ئەبو بەکرە پشوویەکمان دا و شەوێک ماینەوە، پاشان بۆ بەیانی ڕووەو بارەگای سەرکردایەتی لە قەندیل ڕۆیشتین، من وام دەزانی بارەگای سەرکردایەتی وەک سەرکردایەتییەکەی مەلا مستەفا کۆمەڵێک خانوو و ئۆفیس و بارەگای جۆراوجۆر و دوکان و بازاڕی لێیە. کە گەیشتمە سەرکردایەتی، کاک نەوشیروانم بینی لەپەنا گابەردێکی گەورەدا بوو بەگەرمی پێشوازیی لێ کردم، پاش تۆزێک وتووێژکردن لەسەر شار و بارودۆخی یەکێتی لە شارەکان و ڕێکخستنەکان، ڕۆیشتین بۆ لای مام جەلال، ئەویش بە هەمان شێوە لەپەنا بەردێکی گەورەدا پاڵی دابۆوە و خەریکی نووسین بوو لە دەفتەرێکی ڕۆژانەیدا.

دوو پێشمەرگەی زۆر ناسیاوم کە هەردووکیان ئەوان مناڵ بوون من ناسیومن، یەکیان هاوڕێ جەبار خوشکەزای کاکە حەمەی جابی، کە لە کاتی کاری نهێنیم لە ژێرخانەکەی ماڵی باپیری لەگەڵ شێخ ڕەئووف شێخ عارف لە لیژنەی ناوچەی قەزای سلێمانی ئەو منال بوو بەیانمان پیا دەنارد بەملاولادا، ئەوی تریشیان حسێن شێخ کەریم ناسراو بە هاوڕێ حەمە سەعید کە لە ساڵی ١٩٦٥ لە ماڵی ئەوان حەشار درابووم بەبریندار‌ی. ئەو دووانە بۆ من وەک براکانم وا بوون، دەوروبەری قەندیلیان پێ ناساندم، وەک دەراوی گورگان و بازاڕی ورچان. لە مانگی ٨ کە هێشتا دووهەم مانگی هاوین بوو، لە قەندیل شەو لەبەر سەرما دەبووایە گەرم خۆت داپۆشیایە و بە ڕۆژیش لەبەر هەتاو گەرما بوو و لەبەر سێبەردا سەرما بوو. من کە چوومە قەندیل، سەرکردایەتی لەسەر ڕۆیشتن و گوێزانەوەی جێگەکانیان بوون، لەو کاتەدا برایانی بزووتنەوە دردۆنگ بووبوون و خۆیان لە سەرکردایەتیی کۆمەڵە و مام جەلال دوور دەگرت. سەرکردایەتی بەگشتی بە هەردوو باڵی کۆمەڵەش و بزووتنەوەشەوە بە هۆی کارەساتی هەکارییەوە تووشی قەیران بووبوون، ژمارەیەکی زۆریان لێ شەهید و گیرابوو و هەشبوو کە لە ناچاریدا خۆی ڕادەستی عێراق کردبوو وەک تالیب ڕۆستەم. یەکەم گوێزانەوەمان ڕۆیشتین بۆ "وارمێوان"، وار: واتە شوێن، جێگا، هەوار، میوان: واتە میوان، زیارەتکەر، نیشتەجێی کاتی، وارمێوان واتە هـاواری کاتی. وارمێوان قوتەیەکی بەرز بە شانی بەری ڕۆژهەڵاتی قەندیلەوە لە چەندین دۆڵ و شیو و ڕەوەز پێک هاتبوو. بارەگای سەرکردایەتیی کۆمەڵە و مام جەلال و د. مەحموود سۆرانی لە قوتەی وارمێوان بوون کە بە هەموو پێشمەرگە و کادر و سەرکردایەتییەوە لە چوار خێمە پێک هاتبوو. خەیمەیەک مام جەلال و د. مەحموود پێکەوە بوون، خەیمەیەکی تری بچووک کاک نەوشیروان و حەمە سەعید و هـاوڕێ جەبار و تایپە شرەکە پێکەوە بوون، خەیمەیەک کادرەکانی وەک: دانا، کوکژ، پشکۆ، نووری، جەلال، سەلاح چاوشین، ئەبو شەهاب، فازیل و بەندە و خەیمەیەکیش پێشمەرگەکانی پاسەوانی مام جەلال و سەرکردایەتیی تێدا بوو، بە هەمووومان ژمارەمان لە ٥٠ کەس تێنەدەپەڕی. لە سەرکردایەتیی کۆمەڵە، تەنیا فازیل کەریم (جەعفەر) و کاک نەوشیروان و بەندە لەوێ بووین، ملازم عومەر، ئازاد هەورامی لە زیندانی قیادە موقتەدا بوون، تالیب

ڕۆستەم خۆی ڕادەستی هێزەکانی سەر سنووری عێراق تورکیای عێراق کردبۆوە، ئارام شەهید بووبوو، سالار عەزیز ڕۆیشتبوو بۆ سووریا، مەلا بەختیار لە شارباژێڕ بوو، ناوە ناوە دەهاتە سەرکردایەتی. سەرکردایەتیی بزووتنەوەش ئەو کاتە: ڕەسوول مەمەند، مەلا ناصح، حاجی حاجی برایم لە وارمێوان بوون، (عەلی عەسکەری، دکتۆر خالید) و لە زیندانی قیادە مەوقەتە بوون، شەهید کرابوون، تایەر عەلی والی لە زیندانی قیادە موقەتە بوو، سالّح یوسفی و عەلی هەژار لە بەغداد و هەولێر بوون، سەعدی گچکە شەهید بووبوو، بارەگای ئەوانیش لە دۆڵەکەی خوار قوتەی وارمێوان بوون. لەوێش واتە لە وارمێوانیش زۆر نەماینەوە و بارمان کرد بەرەو گوێزێ، لە دۆڵە نێ، بەیانی زوو بوو وچانێکمان دا. مام جەلال بڕیاری دا دوو سێ ڕۆژ لەوێ بمێنینەوە، گەر ئێران لێمان بگەڕێت.

## ناوساجی و گەندەڵیی کادران

بەیانی پێش هەتاوکەوتن گەیشتینە "دۆڵە نێ". دانیشتووانی هەر خەیمەیەک کەوتنە چاکردن و تەختکردنی شوێن خەیمەکەیان، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا هەرچوار خەیمەکان هەڵدران، ئەو بەیانییە دانا ئەحمەد مەجید نووره خەفارەتی بوو، لەبەر ئەوەی دانیشتووانی خەیمەکەی ئێمە ناوزەد کرابوو بە خەیمەی کادران و منیش سەرپەرشتیاریان بووم، دانا پێشنیاری کرد با ئەو بەیانییە ناوساجی بکەین بۆ خواردنی بەیانی، منیش قایل بووم، دەست کرا بە ناوساجیکردن، بۆنوبەرامەی بە خەیمەکانی تردا بڵاو بۆوە، لەپڕ مام جەلال بە تووڕەیی و دەنگی بەرزەوە هاواری کرد: "ئەگەر کادران گەندەڵی و زێدەڕۆیی بکەن، دەبێ خەڵکی تر چی بکەن! لەم بێ ئازووقەییەماندا ناوساجی دەکەن، بەڕاستی شەرمە!" مام جەلال پێشمەرگەیەکی لەلا بوو ناوی کامەران بوو، خەڵکی پێنجوێن بوو، لاوێکی تەمەن کەم و منداڵکار، پێمان دەوت "خەپە". بانگی خەپەم کرد و وتم "چەند مشت چای ئێمە قەرزارن؟ چەند ئاردی ئێمە قەرزارن؟ چەند جام ڕۆنی ئێمە قەرزارن؟" بە مام جەلالم وت ئێمە دەزانین پاشەکەوت بکەین و لە پاشەکەوتی ئێمە، ئێوەش دێن بە قەرز لێمان وەردەگرن. پاشان بە دانام وت چەند ناوساجییەک بدە بە کامەران بیبات بۆ خەیمەکەی مام جەلال و

دکتۆر مەحموود، ئیتر دوای ئەوە ئاو کرا بە ئاگردا و چاوپۆشی لەو گەندەڵییەی کادران کرا.

**هەواری گوێزێ و کێشەی کوێخا زادان و حاجی نێرگز**

**لە دۆڵە نێوە بارگەوبنەمان تێک نا بەرەو هەواری گوێزێ**

گوێزێ گوندێکی زۆر بچکۆلەی چۆڵکراو و بەسەریەکدا ڕووخاو، بەڵام گوندێکی زۆر بە ئاو و باخ و درەختی بەردار، بەتایبەتی داری گوێز کە ناوەکەی خۆی پڕ بە ناوەڕۆکی بوو. گوێزێ یەکێک بوو لە گوندەکانی مەنگوڕایەتی و سەر بە عەشیرەتی مەنگوڕان بوون، هەوارمان لەوێ هەڵدا، بەڵام شوێن خەیمەکانمان گۆڕانی تێدا کرا، هاوڕێ جەبار و حەمە سەعید بە خۆیان و تایپەکەیانەوە چوونە خەیمەی کادران و منیش گوێزرامەوە بۆ ناو خەیمەکەی کاک نەوشیروان. ڕۆژێک مام جەلال ناردی بەدوامدا، کە چووم؛ پێی وتم ماوەیەکی زۆرە هیچ هەواڵی ناوخۆمان بۆ نەهاتووە، بەشکم بڕۆیتە خوارەوە (مەبەستی بەستەسێن و سەنگەسەر بوو)، وەڵام بۆ هاواریش بنێرە با بێتە ئێرە پێکەوە بڕۆن ئەو شارەزاترە، گەر بشکرێ وەڵام بۆ وەستای خاڵت کاکە حەمە بنێری بەشکم سەردانی سلێمانی بکا و هەندێ پارەمان لە شارەوە بۆ بێنی و خۆیشی چەند دەتوانێ؛ هاوکاریمان بکات[25]. وەڵامم بۆ کاک هاوار نارد لە قەڵاتوکانەوە هاتە لام، بەیەکەوە چووینە گوندی سڵتانە دێ و ماڵی کاک خدر و بەودا وەڵاممان بۆ خاڵم و کاک ئەحمەد سەیید زادە نارد کە بچنە سلێمانی هەواڵ و نامە و پارەی شارمان بۆ بهێنن. خاڵم و ئەحمەدی زێڕنگەر و کەمالی زێڕنگەر هاتنە لامان نامەکان و چەردەیەکیش پارەیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو. لە گەڕانەوەدا لەگەڵ هاواری برام لە دۆڵی سیوەیس تووشی کوڕەکانی کوێخا قادر و کوێخا خدر بووین، دیار بوو بەنیازی خراپ هاتبوونە سەر ڕێمان، دوای هەندێ قسە و قرەقڕ لەسەر کۆمەڵە و بزووتنەوە لەگەڵ هاوار کە زانییان من برای ئەوم لە سەرکردایەتیم؛ پاشگەز بوونەوە و بە ڕێگایەکی تردا ڕۆیشتن. کە گەیشتینەوە گوێزێ، من لای مام جەلال سکاڵام لێ

---

[25] خاڵم (حەمەی مەجید هاوار) بەڵێندەر بوو، باری دارایی زۆر باش بوو، کەسایەتییەکی زۆر دڵسۆزی شۆڕشی نوێ بوو، بەتایبەتی سێ خوشکەزاشی لە شۆڕش بوون، ناسیاوی مام جەلال بوو، لە شۆڕشی ئەیلوولیش ساڵی ١٩٦٣ لە خولی کادیران یەکەم دەرچووبوو.

کردن، مام جەلال هەرسێکیانی گرت و چەکی کردن و زیندانی کردن لە خەیمەکەی حاجی ئەحمەد (حاجی نێرگز) کە فەرماندەی هێزی ڕزگاری بوو (واتە فەرماندەی هەمووەمان بە بەرپرس و پێشمەرگە و کادرەوە)، دوای دوو ڕۆژ کوێخاکان داوایان لە حاجی ئەحمەد کردبوو کە کوڕەکانیان بەر بدا، ئەویش بێ ئاگاداریی مام جەلال بەری دابوون، مام جەلال بە منی وت بچم حاجی چەک کەم، حاجی هیچ چەکی پێ نەبوو جگە لە خەنجەرەکەی بەر پشتێنەکەی، پێم وت: "حاجی خەنجەر بە!" بە فەرمانی مام جەلال، حاجی بێ نقە و سێ و دوو خەنجەرەکەی دایە دەستم.

ئێمە هێشتا لە گوێزێ بووین، هەواڵێک هات بۆ مام جەلال، گوایە هەمزە ئاغای میرئاودەلی لەلایەن میرییەوە نێردراوە بۆ لای ڕەسوول مامەند و برایانی بزووتنەوە کە میری ئامادەی گفتوگۆیە و هەمزە ئاغا لە بارەگای ئەوانە، وە ئەوان لەو بارودۆخەدا بە باشی دەزانن گفتوگۆ بکرێ. مام جەلال لەگەڵ ئێمە کۆ بۆوە و ڕای خۆی بەو جۆرە گوت: "ڕژێم ئێمە لە بارودۆخێکی خراپ و لاوازدا دەبینێ دوای کارەساتی هەکاری، بۆیە هەر گفتوگۆیەک بکەین؛ دەبێ بە خۆبەدەستەوەدان، من دژی هەر گفتوگۆیەکم لەم بارودۆخەماندا، وە ئەگەر هەمزە ئاغاش بۆ لای ئێمە هاتووە، با خۆی بێت بۆ لامان، نەک وەڵاممان بۆ بنێرێ". پاشان ڕووی کردە ئێمە کە ڕای خۆمان بڵێین، کاک نەوشیروان هاتە دەنگ وتی: "مام جەلال، هەرگیز گەلی کورد و هێزی پێشمەرگە چۆکی لەبەردەم دوژمن دانەداوە، هەمیشە سەرکردەکان بوون یا ڕایانکردووە و ئاشبەتاڵیان کردووە یا خۆیان بەدەست دوژمنەوە داوە، با ئەم جارە ئێمە ئەو نەریتە بۆگەنە بشکێنین و هەریەکەمان لەپەنا بەردێک و لەناو سەنگەردا بکوژرێین، لە دوارۆژ بڵێن ئەوە گۆڕی فڵانە و ئەمە گۆڕی فڵانە." ئەو هاوڕێیانەی لەو کۆبوونەوەیەدا بوون جگە لەو دووانە، ملازم عومەر کە تازە لای قیادە موقەتە بە نامەیەکەوە بەریان دابوو. فازیل کەریم، بەندە و د. مەحموودیش هەموو جارێک بەشداریی کۆبوونەوەکانی دەکرد، بە ڕای گشتی داواکەی برایانی بزووتنەوە و هەمزە ئاغا ڕەت کرایەوە.

## ناوزەنگ و کۆبوونەوەی فراوانی کۆمەڵە و جەنەراڵ بەفر

ورده ورده بەرەو سەرما و زستان دەڕۆیشتین، گوێزێش ڕێک لەسەر سنووره دەستکردەکە بوو، چۆڵ و دوورەدەست بوو، ڕێگەی هیچ لایەکی بەسەرەوە نەبوو، بڕیار درا کە دووباره و دە باره بارەگا بگوێزینەوە بۆ شێنێ. شێنێ گوندێکی ئاوەدان بوو، تاکە گوند بوو لەو سنوورانە کە ڕژێم دەستی سووتاندن و کاولکاریی پێ نەگەیشتبوو، گوندێکی گەورە و خاوەن باخ و ئاوی زۆر و ماڵداری بوون. دانیشتووانی ئەو گوندە بە ڕەچەڵەک سەر بە عەشیرەتی مەنگوڕ بوون، لەبەر ئەوەی نزیک سنوور بوون، هاتوچۆیان لەگەڵ قەڵادزێ و سەردەشتیش هەبوو. شێنێ بەتەواوی خانووەکانی بەپێوە مابوو، واتە لەوێ نوایەک دەست دەکەوت لە سەرمای زستان بمانپارێزێ، بە هۆی نزیکی لە قەڵادزێ و سەنگەسەریشەوە لەو کاتە باشترین شوێن بوو بۆ پەیوەندی بە شارەکانەوە لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانەوە، جگە لەمانەش لەسەر ڕێگەی قاچاخچیانی نێوان سەردەشت و قەڵادزە بوو، واتە نێوان ئێران و عێراق کە زۆر بەئاسانی هەموو کەلوپەلێکی پێویستمان دەست دەکەوت. لەسەر بڕیاری کۆبوونەوەکەی گوێزێ، لە ۱۹۷۸/۱۰/۲۵ کەوتینە ڕێ بەرەو شێنێ و زەڵێ و ناوزەنگ.

پاش نیشتەجێبوونمان لە شێنێ و زەڵێ، هەندێکمان چووینە خانووە چۆڵەکانی شێنێ و هەندێک خەیمە هەڵدران، بەڵام بەو پاییزە سارده سەرکردایەتی کەوتنە ژوور و نوا دروستکردن بۆ مام جەلال، نەوشیروان و پێشمەرگەکان. مەلا بەختیار و بەنده و ڕەسوول مامەند و حاجی حاجی برایم لە سەرەتاوە لە شێنێ بارەگامان دانا، پاشان مەلا بەختیار و ڕەسوول مامەند و حاجی حاجی برایم لەگەڵ د. مەحموود چوونە ناوزەنگ و ئەوانیش کەوتنە خانوو دروستکردن. پاش گەیشتنی سەرکردایەتی بە شێنێ و زەڵێ و ناوزەنگ کە تا ڕادەیەک کەوتبووە ناوەڕاستی سلێمانی و هەولێر، ژمارەیەکی باش لە کادران و پێشمەرگەی ناوچەکانی ڕانیە و کۆیە و دەشتی هەولێر و ناوچەکانی شارباژێڕ و شارەزوور و گەرمیان هاتبوونە سەرکردایەتی. نەوشیروان پێشنیاری کرد کە هەلێکی باشە بە بوونی ئەو کادره پێشکەوتووانە کۆبوونەوەیەکی فراوان بکرێ بۆ هەڵبژاردنی سەرکردایەتییەکی شەرعیی کۆمەڵە، چونکە لەدوای ڕۆیشتنی سەرکردایەتیی کۆمەڵە بۆ ئێران، هیچ سەکردایەتییەکی

شەرعیی هەڵبژێردراوی کۆنفرانس یان کۆنگرێس یا کۆبوونەوەیەکی فراوان نەکراوە. لە ١٩٧٨/١١/٥ کۆبوونەوە فراوانەکە لە شێنێ بەسترا، نزیکەی بیست کادر و ئەندامی کۆمەڵەی تیا بەشدار بوون[٢٦].

ئێمە هێشتا لە گەرمەی کۆبوونەوە فراوانەکەدا بووین کە هەواڵ لە ڕێکخستنەکانی ناو ڕانیە و قەڵادزە دەهات کە ڕژێمی بەعس هێزێکی زۆری ئامادە کردووە بۆ هێرشکردنە سەر سەرکردایەتی. سەرکردایەتی بەسەر شێنێ و زەڵێ و ناوزەنگدا دابەش کرابوو، واتە ئەو دۆڵەی لەسەری مامەندەوە دەست پێ دەکات تا چەمی بێدەلان. بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزی بەعسییان، دەبووایە لە دەروازەی شێنێوە کە گوندی سیوەسەن و کۆتایی ڕێگەی قەڵادزە-شێنێ کە لەبەردەم بینای پۆلیسخانەی شێنێ تەواو دەبوو، لەگەڵ سەری شاخی مامەندە و بەرامبەر شاخی جاسووسانیش کە لەسەر سنوور لەودیوی ئێران بوو؛ بگیرایە، چونکە ڕژێمی بەعس ڕەزامەندیی لە ڕژێمی شای ئێران وەرگرتبوو بۆ ئابڵوقەدانی سەرکردایەتیی یەکێتیی ئێران ڕێگە بدات کە عێراق بە کۆپتەر سوپاکەی لە شاخی جاسووسان دابەزێنێ.

شەوی ٩ لەسەر ١٩٧٨/١١/١٠ هێرشی بەعس لە مامەندە و لە دەروازەی شێنێوە دەستی پێ کرد. ئەو شەڕە بە هیممەت و ئازایەتیی پێشمەرگە و بەرپرسەکان و هێزی جەنەراڵ بەفر کە شەوی ١٧ لەسەر ١١/١٨ بەفرێکی وا زۆر باری و سەرمایەکی زۆر بەتین هەڵیکرد و ژمارەیەکی زۆر سەربازی دوژمن لەناو بەفردا ڕەق بوونەوە و مردن و ئەو فەیلەقە سوپایە بەشکاوی کشانەوە بۆ قەڵادزە و پاشان ڕانیە[٢٧].

سەبارەت بە گرنگیی ستراتیجیی ئەو شەڕە، هەر لە هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێوە تا ئەو ساتەوەختە کە یەکەم شەڕی بەرەیی (جەبهەیی) و ڕووبەڕووبوونەوەی بەرامبەر یەکتری بوو کە کاریگەرییەکی زۆر گەورەی کردە سەر ورە و بڕوابەخۆبوونی شۆڕشی نوێ.

---

[٢٦] بۆ زانینی درێژەی کۆبوونەوەکە و بەرنامەی کارەکان و ماوەی کۆبوونەوەکە و ئەنجامەکانی، سەیری "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" بکە.

[٢٧] بۆ شارەزایی زیاتر لەو شەڕە و ئەو کۆبوونەوەیە و گرنگیی ئەو شەڕە، تکایە سەیری "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" بکە.

## پێنج مانگ و نۆ ڕووداوی گرنگ

لە مانگی ١٩٧٨/١٠ و تا مانگی ١٩٧٩/٣، نۆ ڕووداوی گرنگ لە ژیانی یەکێتی و کۆمەڵە و شۆڕشی نوێ و ناوچەکە ڕووی دا کە لە ڕاستیدا هەریەک لەو ڕووداوانە وەرچەرخانێکی گرنگ و چارەنووسساز و مێژوویی بوون، لەبەر ئەوەی هەریەک لەو ڕووداوانەم بەدرێژی لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"دا باس کردووە، لێرەدا زۆر بەکورتی باسیان لێوە دەکەم:

١. پێکهێنانی دامودەزگاکانی یەکێتی. تاکوو مانگی ١٩٧٨/١١، یەکێتی جگە لە سەرکردایەتییەکی پەرەوازە و تەرخانکراو تایبەت بۆ کاری شەڕی چەکداری، هیچ جۆرە دامودەزگایەکی بەڕێوەبەردنی شۆڕشێکی نوێی نەبوو، بەڵام دوای نیشتەجێبوونمان لە شێنێ و زەڵێ و ناوزەنگ، چەند دەزگایەک پێک هێنرا، وەک: مەکتەبی عەسکەری، مەکتەبی دارایی، مەکتەبی ئیداری، مەکتەبی ڕێکخستنی یەکێتی، ناوەندی کۆمەڵە.

٢. قووڵبوونی کێشەی نێوان یەکێتی و بزووتنەوە بە هۆی هەڵسوکەوتی کاڵفامیی مەلا بەختیار بەرامبەر شەهید شێرکۆ شێخ عەلییەوە لەسەر تەقەیەک لە کۆترێک کە شێرزادی برای شێرکۆ لای بارەگاکەی خۆیان لە شێنێ لە کۆترێکی کردبوو، وە هەڵنەسانی مام جەلال بە لێکۆڵینەوە لەو ئەتوارە ناشرینەی مەلا بەختیار بەرامبەر شێرکۆ و شێرزاد نواندی.

٣. دەرچوونی یەکەم ژمارەی "کۆمەڵە". کۆمەڵە پێشتر لەپاش لەدایکبوونی و لە ساڵی ١٩٧١دا بڵاوکراوەیەکی وەرزیی دەرکرد بە ناوی "ئاڵای سوور" کە تەنیا سێ ژمارەی لێ دەرچوو، پاشان لە ساڵی ١٩٧٧ و گۆڤارێکی تر لەلایەن کۆمیتەی هەرێمەکانەوە، ڕوونتر بڵێم لەلایەن شەهید ئارامەوە دەرچوو بە ناوی ئاڵای شۆڕش (ئاش) کە ئەویش هەر دوو سێ ژمارەی لێ دەرچوو. بۆ سێیەم جار ئۆرگانێکی ناوەندی کۆمەڵە بە ناوی "کۆمەڵە" کە گۆڤارێکی وەرزی بوو، یەکەم ژمارەی لە کۆتایی پاییزی ١٩٧٨دا دەرچوو بە قەبارەی ٣٠ لاپەڕەی فولسکابی دینا ٤، بە درووشمی: "کرێکاران و گەلانی زۆرلێکراوی جیهان یەک گرن".

٤. یەکەم کۆبوونەوەی بەکۆمەڵی سەرکردایەتیی یەکێتی کە پێک هاتبوون لە دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی و سەرکردایەتیی کۆمەڵە و سەرکردایەتیی بزووتنەوە،

بەم جۆرە یەکەم کۆبوونەوەی سەرکردایەتیی بەکۆمەڵی یەکێتی لە ١٩٧٩/٢/١٥ دەستی پێ کرد و سێ رۆژی خایاند، لە ئێوارەی ٢/١٨ کۆتایی هات.

٥. نۆکان و ئێزگەکەی یەکێتی

دوای سێ ساڵ دەستپێکردنی شۆڕشی نوێ و پاش چەندین هەوڵ و کۆشش، توانرا یەکێتی ببێتە خاوەنی ئێزگەیەکی خۆی. داستانی ئەم ئێزگەیە دەکرێ چەندین لاپەڕەی لەسەر بنووسرێ، لە پەیداکردنیەوە تا گەیاندنی بە خڕی ناوەزەنگ و پاشان گوندی نۆکان، ئەو ئێزگەیە بە هەوڵ و هیمەتی "تەلعەت گلی" کە ناسراو بوو بە هاوڕێ ئاشتی و بەشداریی د. خدر مەعسوم، ئەبو شەهاب ئیحسان و بەندەش لە ڕۆژی ١٩٧٩/٣/١٩ خرایە ئیش.

دکتۆر خدر بۆ تاقیکردنەوە و سوعبەت هاواری کرد: "ئێرە ئێزگەی دەنگی برایم جەلالە"، بێئاگا لەوەی کە مام جەلال چاودێریی دەنگی ئێزگە دەکا و بەتەمای یەکەم بڵاوکردنەوەی بەیانێک بوو کە خۆی نووسیبووی، تووڕە بوو بە درووشمی: "ئێرە ئێزگەی دەنگی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە"، بە لێدانی سروودێکی نیشتمانی بۆ ماوەی ٢٠ بیست خولەک؛ کاری کرد.

لە ڕۆژی ١٩٧٩/٣/٢٠، ئێزگە لە کاتژمێر شەشی ئێوارە یەکەم پەخشی خۆی بە وتارێکی مام جەلال دەست پێ کرد، کە پاش پیرۆزبایی و گەیاندنی مژدەی پەیدابوونی ڕادیۆی دەنگی شۆڕشی نوێ، سەرزەنشتی جیابوونەوەی بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانی کرد لە یەکێتی.

٦. ڕۆیشتنی وەفدێکی یەکێتی بۆ لای خومەینی و کردنەوەی دەرگای ئێران.

هەرکە ڕاپەڕینی شارەکانی ئێران بە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیشەوە دژی ڕژێمی شا محەممەد ڕەزا شا و پاشان شاپور بەختیار دەستی پێ کرد، یەکێتی هەوڵی پێکهێنانی وەفدێکی دا بۆ لای ئیمام خومەینی کە لەنزیک پاریس دەژیا، یەکێتی لە قەندیلەوە نامەیەکی نارد بۆ ئیمام لە ڕێگەی کاک شازاد صائیبەوە کە لەگەڵ عادل موراد و د. فوئاد مەعسوم و ئەحمەد بامەڕنی کە ئەوسا نوێنەری یەکێتی بوو لە فەرەنسا، نامەکەیان لە مانگی ١٩٧٨/١٠دا برد بۆ ئیمام خومەینی، یەکێتی لە نامەکەیدا ئامادەیی دەربڕیبوو بۆ پێشوازی لە ئیمام تا لە قەندیلەوە سەرپەرشتی و ڕابەری و پێشڕەوایەتیی ڕاپەڕینی ئێران بکات.

ئیمام ئەو پێشنیارەی پەسەند نەکرد و خۆی لە ١٩٧٩/٢/١ لە پاریسەوە گەڕایەوە تاران و سەرکەوتنی قیامی گەلانی ئێرانی ڕاگەیاند. یەکێتی لە ١٩٧٩/٢/٢٥ شاندێکی لە (کاک عومەر دەبابە و د. فوئاد مەعسوم و فازیل کەریم) پێک هێنا و ناردنی بۆ تاران. گەرچی شاندەکە لە ئەرکەکەیاندا سەرکەوتوو نەبوون، بەڵام بوو بە سەرەتایەک بۆ دروستکردنی پردی پەیوەندیی نێوان شۆڕشی نوێ و حکومەتی کۆماری ئیسلامیی ئێران.

٧. جیابوونەوەی بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان.

سەبارەت بەو ناکۆکی و ململانێیانەی کەڵەکە بووبوون لەنێوان کۆمەڵە و بزووتنەوە لەنێوان مام جەلال و بزووتنەوە، بەتایبەتی پاش کارەساتی هەکاری و شەهیدبوونی دوو سەرکردەی کاریگەری بزووتنەوە؛ کاک عەلی عەسکەری و کاک د. خالید، ئەم ڕووداوە گرنگەش لە مێژووی کۆمەڵە و یەکێتیدا ڕووی دا کە لە ١٩٧٩/٣/٢١دا هەڤاڵانی سەرکردایەتی و پێشمەرگەکانیان بە دنە و فیتی د. مەحموود عوسمان بنەوبارەگای خۆیان لە ناوزەنگ و شێنێ و زەڵێ گواستەوە بۆ "بێدەلان" و بانگی جیابوونەوەی خۆیان لە نیمچەبەرەیی یەکێتیدا ڕاگەیاند. لە ڕاستیدا ئەو ڕووداوە کاریگەرییەکەی لەسەر شۆڕشی نوێ و یەکێتی، زۆر لە کاریگەریی کارەساتی هەکاری گەورەتر بوو و کەمتر نەبوو. کاریگەریی جیابوونەوەی بزووتنەوە؛ کارەساتێکی کاتی و بێ زیان نەبوو، بەڵکە کاریگەرییەکەی لەسەر یەکێتی و شۆڕشی نوێ و باشووری کوردستانیش تا ساڵانێکی زۆری بە سەلبی خایاند. سەبارەت بە هۆکارەکان و بارگاوی ململانێکە و ئەنجامەکان و زیانەکانی ئەو ڕووداوە، بەدرێژی لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"دا باسم کردووە کە پێویست بە دووبارەکردنەوەی ناکات.

٨. ڕاپەڕینی ئێران و سەرکەوتنی (قیام).

شۆڕشی نوێ و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە هەموو لایەکەوە ئابڵوقە درابوو، هیچ دەرچە و ڕێگایەک نەبوو بۆ گەیاندنی دەنگی گەلی کورد و شۆڕشەکەی بە جیهانی دەرەوەی باشووری کوردستان، شۆڕش لەبەر سمێڵێک پانتایی زەوی سەر سنوورەکانی نێوان ئێران و عێراق زیاتری بەدەستەوە نەبوو، ئەویش پانتاییەکی چۆڵکراو و سووتماککراو و ڕاگوازراوی خەڵکەکەی، واتە کۆمەڵێ دێهاتی چۆڵ و وێرانە نەبێ، هیچی تر بەدەست شۆڕشەوە نەبوو، عێراق و ئێران و تورکیا و قیادەی مەوقوتە، گەمارۆی شۆڕشی نوێ

و یەکێتییان دابوو.

شۆڕشی گەلانی ئێران لەو کاتەدا و سەرکەوتنی شۆڕشەکە و ڕووخانی حوکمڕانی، شایەتیی دەرگایەکی گەورەی ئێران بوو بە ڕووی شۆڕشدا کرایەوە. لە هەموو ڕووەکانی ڕاگەیاندن، سیاسی، لۆجستی عەسکەری و باری ئابووری، پەیوەندی بە دونیای دەرەوە، فراوانبوونی مەیدانی جووڵە و چالاکیی پێشمەرگانە و دەستکەوتنی زۆری ژمارە و جۆری چەک و چەکدارکردنی چەندین مەفرەزە و تیپ، لە هەمووی گرنگتر پەیوەندیی بەهێزی سیاسیی نێوان کوردانی باشوور و کوردانی ڕۆژهەلات و نێوان یەکێتی و کۆمەڵە و حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی ئامۆزا.

٩. حزبی شیوعیی عێراقی و ڕاونانیان لە بەرەی بەعسییان.

هاتنەدەرەوەی حزبی شیوعیی عێراقی لەناو "بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخوازی بەعسییان" لە ١٩٧٨/١١/١٢ بە هۆی دەرکردنیان لەو بەرەیە لەلایەن بەعسییانەوە، یەکێکی ترە لە ڕووداوە گرنگەکانی ئەو پێنج مانگە. یەکێتی پێشوازییەکی گەرمی لێ کردن، هەم لە دەرپەڕاندنیان لەو بەرەیە و هەم هاتنیان بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی، لە ڕاستیدا یەکێتی وای دەزانی بە هاتنی حزبی شیوعی بۆ بەرەی شۆڕش و دژ بە حکومەتی عێراقی؛ دەرگایەکی نوێمان لێ دەکرێتەوە و دۆستێکی نوێشمان بۆ پەیدا دەبێ کە یەکێتیی سۆڤیەتە، بۆیە یەکێتی پێشوازییەکی گەرمی لە سەرانی ئەو حزبە کرد.

ا. هاوکارییەکی زۆریان کرا بە چەک و زەخیرە و مووچە و خەرجیی بارەگاکانیان.

ب. یەکێتی پێی وا بوو کە هاوپەیمانییەکی تر بۆ شۆڕشی نوێ پەیدا دەبێ و لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوەش دەنگ و سەدایەکی تر بۆ شۆڕشی نوێ پەیدا دەبێ، بەڵام بەداخەوە بوونە مارەکەی شێخ ئۆمەر و لە قاچ و ملی خۆمانەوە ئاڵان، لەجیاتیی ئەوەی ببنە ناوبژیوان، لە مەیدانەکەدا بوونە ئاگر خۆشکەری دوژمنکاریی نێوان یەکێتی و پارتی و پاشان بزووتنەوەش. لەباتیی ئەوەی لەگەڵ یەکێتی و کۆمەڵەدا نزیک بوونایە سەبارەت بە نزیکیی ئایدیۆلۆجییانەوە، کەچی کۆمەڵە و یەکێتییان بە ئەلتەرناتیڤی خۆیان دەزانی، کەوتبوونە بەرەی دژ و هاوپەیمانی دژەکانی یەکێتییەوە[٢٨].

[٢٨] ئەم بابەتەش بەدرێژی لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"دا باس کراوە.

## چوونم بۆ لقی کەرکووک

لەدوای لەسێدارەدانی شەهیدی تێکۆشەر مامۆستا عەزیز مەحموود لە ١٩٧٩/٣/٢٥، سەرکردایەتی بڕیاری دا من بنێرن بۆ ناوچەی قەرەداغ و گەرمیان و لقێکیش بە ناوی لقی کەرکووکی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بکەنەوە کە پێک بێت لە سێ ئەندام لێپرسراوی لق: بەندە (کۆمەڵە) و مامۆستا ئەنوەر (ڕەفیق ئەحمەد صەبری)؛ نوێنەری بزووتنەوە و مامۆستا جەلال شێخ تۆفیق وەک نوێنەری هێڵی گشتی[٢٩]. هەر لەو کۆبوونەوەیە بڕیار درا کە کەرتێکیش پێشمەرگە و دوو کادری کارامەش بنێرن بۆ لقی ٢ی کەرکووک. کەرتە پێشمەرگەکە، کەرتەکەی شەهید خەلیل جەلال دیاری کرا و کادرەکانیش شەهید هاوار جەلال و شەهید لەتیف عەبدوڵڵا دەستنیشان کران لەگەڵ برینپێچێک، ئەویش د. خدر کە لە دەورەیەکی برینپێچیی شەش مانگی دەرچووبوو، بەڵام هەندێک لە پێشمەرگەکانی کەرتەکە؛ خەڵکی دێهاتەکانی بەستەسێن و سەنگەسەر بوون و شەهید لەتیف عەبدوڵڵا و د. خدریش قایل نەبوون بە چوون بۆ لقی کەرکووک.

لە ١٩٧٩/٣/٢٦ لە ناوزەنگەوە بە شارەزایی و چاوساغیی شەهید سدیق ئیبراهیم ناسراو بە حاجی چاوشین بەرەو لقی ٢ کەوتینە ڕێ و دوای دوو ڕۆژ ڕێگابڕین، شەو گەیشتینە گوندی "کەلۆش" لەگەڵ هاوڕێی دێرینم فەیسەڵ تاڵەبانی ناسراو بە سیروان؛ یەکمان گرتەوە. شەهید حاجی چاوشین، پیاوێکی باڵابەرزی ڕەقەکاری چاوشینی دەمبەپێکەنین و هەمیشە ڕووخۆش و زۆر بەورە و خێرا و تیژڕۆ لە ڕێکردندا، زۆر شارەزای هەموو قاچاغە ڕێگەکانی ناوچەکانی قەرەداغ و بازیان و شارەزوور و شارباژێڕ و هەموو دێهاتە سنوورییەکانیش بوو، حاجی تاکە گەیەنەری پۆستەکانی سەرکردایەتی بوو بە شارباژێڕ و شارەزوور و گەرمیانیش و بەپێچەوانەشەوە. شەهید فەیسەڵ تاڵەبانی، شەهید سیروان: فەیسەڵ و من، هاوڕێی دێرینی ساڵی ١٩٧٢ بووین. کە چووم بۆ کەرکووک، لە چاودێریی خانەنشینی ئەوم ناسی و وەک فەرمانبەرێک پاشان وەک هاوڕێیەکی کۆمەڵە. شەهید سیروان بووبوو بە فەرماندەی هەرێمی کەرکووک کە لە سێ کەرت پێک هاتبوو:

---

[٢٩] لە ڕاستیدا مامۆستا جەلالیش کۆمەڵە بوو، بەڵام وەکوو نوێنەری هێڵی گشتی ناوزەد کرا.

١. کەرتی گەرمیان – سامان گەرمیانی فەرماندەی کەرت بوو، کەرتی بازیان – ڕۆستەم فەرماندەی بوو، کەرتی قەرەداغ و شارەزووریش - شەهید حسێن، شەهید گۆران فەرماندەی بوو، کەرتی هەرێم کە لەگەڵ شەهید سیروان خۆیدا بووە کەرتی لق کە شەهید خەلیل فەرماندەی بوو.

من هیوایەکی زۆرم لەسەر شەهید سیروان هەڵچنیبوو، پێم وا بوو پێکەوە دەتوانین بە هاوکاریی کادرەکان و کەرتەکانی پێشمەرگە گۆڕانێکی چۆنایەتی و چەندایەتی لە ڕووی ڕێکخراوەیی و چالاکیی پێشمەرگانەشەوە بکەین.

سەرەتای کار، شەهید سیروان ناردی بەدوای کەرتەکەی ڕۆستەم و کەرتەکەی سامان، هەر چوار کەرتەکە کۆبوونەوەیەکمان لەپشتی گوندی "دوکان" کرد، لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیارەکانی سەرکردایەتیم پێ ڕاگەیاندن لەگەڵ بۆچوونی خۆمان لەسەر لقی کەرکووک.

١. سەرکردایەتی داوای چوونی کاک فەیسەڵ تاڵەبانیی کردبوو، تا لە نزیکەوە لە بارودۆخی هەرێمەکە و پێویستییەکانی هەرێمەکە ئاگادار بێ، بەتایبەتی پێویستیی وەک چەک و تەقەمەنی و جیهازی هوکی تۆکی و ئەو کەرەستانەی کە لە سەرکردایەتی دەست بکەوێ، لەو کاتەدا لە ئێران پاشاگەردانییەکی بێ سەروبەرە بوو، لە هەموو شار و لەسەر هەموو شەقامێک بووبوو بە بازاڕی چەک فرۆشتن، لەو چەک و تەقەمەنییانەی کە خەڵکی لە پادگان و پایەگاکانی ئەرتەشی ئێرانیدا دەیگرت، هەلێکی باش بۆ یەکێتییش ڕەخسابوو بۆ پۆشتەکردنەوەی کەرت و هەرێم و مەفرەزەکان لە ڕووی چەک و تەقەمەنییەوە.

٢. مامۆستا "نەریمان" کە کادری کۆمەڵە بوو، لەگەڵ کاک فەیسەڵدا بڕوات بۆ سەرکردایەتی بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا سەبارەت بە گرتنی مامۆستا عەزیز، کە لە سلێمانی لە ماڵی عومەری برایدا گیرابوو[٣٠].

٣. دەستپێکردنی جەولەیەکی دوورودرێژ لە هەرێمەکانی بازیان و قەرەداغ و گەرمیاندا تا ئەو کاتە کە کاک فەیسەڵ لە سەرکردایەتی دەگەڕێتەوە و چەک و تەقەمەنییەکانی لەگەڵ خۆی دێنێ بۆ چەکدارکردنی بێ چەکەکان.

---

[٣٠] لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"دا بەدرێژی باسم کردووە.

ئێمە لە جەولەکردندا بووین، لە بانی خێڵان بووین، هەواڵێکی دڵتەزێنمان پێ گەیشت!

## شەهیدبوونی کاک فەیسەڵ (سیروان تاڵەبانی) و هاوڕێکانی

هەواڵمان بۆ هات کە ئەو شەوە، واتە شەوی ٢٩ لەسەر ١٩٧٩/٤/٣٠ لە شارەزوور شەهید سیروان و هاوڕێکانی کەوتوونەتە کەمینی جاشەکانی حەمەخانی حاجی دارای خۆفرۆش و جاشی بەعس و جاشی پارتی دیموکراتی کوردستان لە گوندی زێڕینجۆ، لە ئەنجامدا سیروان تاڵەبانی، سدیق ئیبراهیم (حاجی چاوشین)، حەسەن ئەحمەد (حەسەن خاوێیی)، عەلی چەلەبی، نەجات ڕەحیم، شۆفێری تراکتۆرەکەش شەهید دەبن[٣١].

## شەهید شەوکەوتی حاجی مشیر و نامەکانی

ئێمە هەر چوار کەرتەکە هێشتا لە گەرمیان لە جەولەدا بووین، کە هەواڵ هات وتیان کاک شەوکەت نامەی بۆ مام ڕۆستەم و شەهید گۆران ناردووە. کاک شەوکەت پاش یەکگرتنەوەی بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان (لیژنەی ئامادەکاری) کە هەموو حزبەکەیان بریتی بوون لە د. مەحموود عوسمان و قادر جەباری و عەدنان موفتی، ئەمیش لە یەکێتی دەڕوات و دەچێتە ناو ئەو حزبەی کە ناویان نا حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان و لە هەڵبژاردنی سەرکردایەتیی حزبە نوێیەکە؛ کاک شەوکەتیش دەبێتە سەرکردایەتی، دەینێرنە شارەزوور، بەو هیوایەی کە ئەو لە شارەزوور و هەڵەبجە دەتوانێ لایەنگر بۆ حزبە

---

[٣١] هەتا بەتەواوی هەواڵی چۆنیەتیی شەهیدبوونی ئەو شەهیدانەمان زانی، لە ماوەی دوو ڕۆژدا چەندین هەواڵی سەیرمان پێ دەگەیشت وەک

هەواڵێک وا بوو کە شەهید سیروان دەرچووە و بەرەو دوا گەڕاوەتەوە بەبرینداری بەرەو ئێران.

هەواڵێک وا بوو کە بەبرینداری دەرچووە و گەیەنراوەتە سلێمانی.

هەواڵێک وا بوو کە شەهید بووە و تەرمەکەشیان بردۆتە چەمچەماڵ. هەواڵی ڕاستیمان لە سلێمانییەوە بۆ هات کە بەڵێ ئەوانە هەر پێنجیان شەهید بوون، تەرمەکانیشیان کەوتووەتە دەست جاشی بەعس و پارتیی حەمەخان و بەدڵنیایی تەرمی شەهید سیروانیان بردۆتە چەمچەماڵ.

نوێکە پەیدا بکات. کاک شەوکەت بە ناوی هاورێیەتی و تێرادیتنەوە چەند نامەیەک بۆ فەرماندەی کەرت و مەفرەزەکانی هەرێمی کەرکووک دەنێرێ و داوایان لێ دەکات کە واز لە یەکێتی بهێنن و بچنە لای حزبی سۆسیالیستی یەکگرتوو، لەناو نامەکان؛ نامەیەکی بۆ ڕۆستەم و شەهید گۆران ناردبوو، ئەوانیش نامەکانیان هێنا بۆ من و وتیان با لقی (٢) خۆتان جوابیان بدەنەوە، ئێمەش پێمان وتن خۆتان وەڵامیان بدەنەوە و بنووسن: "کاک شەوکەت فەرموون بۆ قەرەداغ، لە کوێ پێتان باشە؛ لەوێ تاقتان بۆ لێ دەدەین و بەخێرهاتنی گەرمت دەکەین." کاک شەوکەت لە وەڵامەکە تێگەیشتبوو، نەهات و دوای چەند مانگێکی کەم بە کارتێکەری حامیدی حاجی غالی و حەمەی حاجی مەحموود چووبوو بۆ لای مام جەلال و گەڕابۆوە ناو یەکێتی. لەدوای شەهیدبوونی شەهید سیروان لە کۆبوونەوەیەکی لق و کەرتەکانی هەرێمی ٢، بڕیارمان دا کە سامان گەرمیانی بە شێوەی کاتی؛ ئەرکی فەرماندەی هەرێمی ٢ بگرێتە ئەستۆ، تا دوا بڕیاری سەرکردایەتی دەردەچێ. بۆیە من لە سەرەتای مانگی ١٩٧٩/٧ لەگەڵ کەرتەکەی شەهید خەلیل و کاک سۆرانی ڕابەر سیاسی هەرێم گەڕاینەوە بۆ سەرکردایەتی، لە سەرکردایەتییەوە بڕیار لەسەر مستەفا چاوڕەش درا ببێتە فەرماندەی هەرێمی (٢).

## سەدام حسێن و حاکمیەتی بێڕکابەر

لە ١٩٧٩/٧/١٦ بەیانێک لە سەرکردایەتیی حزبی بەعسەوە بڵاو کرایەوە کە بە هۆکاری نەخۆشیی ئەحمەد حەسەن بەکر لە سەرۆکی کۆماری و سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتیی شۆڕش و فەرماندەی گشتیی هێزی چەکدار بەخشرا و سەدام حسێن مەجید جێگری ئەحمەد حەسەن بەکر بوو بە سەرۆککۆمار، فەرماندەی گشتیی هێزی چەکدار و ئەمین سڕی سەرکردایەتیی قوطریی عێراق و حزبی بەعس و سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش. ئەو گۆڕانکارییە گەرچی بەدامەزراوەییکردنی دەسەڵاتی دیکتاتۆری بوو لە عێراق، سەرەتای کردنەوەی دەرگایەکی حوکمی قەرەقوشی و ڕەشەکوژی بوو بۆ شیعە و کورد، بەڵام بۆ یەکێتی و کۆمەڵە سوودبەخش بوو. سەدام کە چووە سەر کورسیی حوکمی دیکتاتۆری. بڕیاری لێبوردنی گشتیی بۆ زیندانیانی سیاسی دەرکرد کە بە هۆیەوە پۆلێکی باش لە

ئەندامانی سەرکردایەتی و کادران و ئەندامانی کۆمەڵە و بزووتنەوەشی تیا سەرفراز بوون و لە زیندان دەرچوون. لەو لیبوردنەی کە لە مانگی ١٩٧٩/٨ دەرچوو، مامۆستا شوکریی هاوسەرم و دەروونی کچە بچووکیشم و باوکیشم لە زیندان بەر بوون.

بەربوونی ئەندامانی سەرکردایەتی کە بە بڕیاری کۆبوونەوەی فراوانی کۆمەڵە لە شێنێ لە مانگی ١٩٧٨/١١ مافی ئەندامێتیی سەرکردایەتییان پارێزراو بوو لە زینداندا، لە مانگی ١٩٧٩/١٠ کە بەرودوا خۆیان و خێزانیان هاتنە دەرەوە و لە بارەگاکانی سەرکردایەتی جێگیر بوون. لەگەڵ ئەوەی کە هاتنەدەرەوەی سەرکردە و کادرانی کۆمەڵە و بزووتنەوە تەکانێکی باشی سیاسی و پێشمەرگانەی بە یەکێتی و کۆمەڵە دا، بەڵام سەرەتای ململانێی نێوان (کتلەی سجن و کۆمیتەی هەرێمەکان) دەستی پێ کرد و بەردەوام بوو تا ئاشکرابوونی "ئاش" و تەفروتووناکردنیان لە ساڵی ١٩٨٥دا[٣٢].

## ڕۆژهەڵاتی کوردستان و کۆمەڵەی ئامۆزا

هەر لەناوەڕاستی ساڵی (١٩٧٨)ەوە لەگەڵ هەندێ لە هەڤاڵانی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ئاشنایەتیمان پەیدا کرد، ئەوانیش بەڕێزان مامۆستا برایم (ساعید سنەیی)، دکتۆر عەزیز (دکتۆر جەعفەر شەفیعی) و کاک ئیبراهیم (ئیبراهیم عەلی زادە). ئەو بەڕێزانە وەک نوێنەری کومەڵەی ئامۆزا هاتبوون بۆ هاوکاریی شۆڕشی نوێ، کە لە ڕاستیدا زۆر کۆمەکیان کردین هەم بە پارە و هەم بە کەلوپەل و هەم بە دەرمان و چارەسەریش کە ئێمە تا چوونمان بۆ ناوزەنگ و تا ماوەیەکیش دکتۆرمان نەبوو، دکتۆر جەعفەری شەفیعی؛ تاکە دکتۆری ڕاستی سەرکردایەتی و شۆڕش بوو. بەندە پاش ئەوەی کە سوور بووم لەسەر پێکهێنانی لیژنەیەک بۆ لێکۆڵینەوە لە تۆمەتەکەی سالار عەزیز و بەدەنگەوەنەهاتنی مام جەلال و بەگوێنەکردنی مام جەلال بە گەڕانەوەم بۆ لقی ٢، مام جەلالیشم لێ چووبوو بەقینا و بە بڕیاری سێ قۆڵیی قەرەقووش (م. س) کە تەنیا مام جەلال و سالار عەزیز و فازل کەریم لەوێ بوو، نەوشیروان بە سەفەر ڕۆشتبوو بۆ ئەورووپا، بڕیار درا کە ئیتر من

---

[٣٢] سەبارەت بە ململانێی ناو کومەڵە، لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" بەدرێژی باس کراوە کە لێرەدا شوێنی باسکردنی نییە.

هیچ کارێکم پێ نەسپێردرێ.

لە کۆتایی مانگی ١٩٧٩/٨ چوومە شێنێ و لە خانوویەکی چۆڵدا بارەگام دانا، شەهید خەلیل و شەهید هاواری براشم لەگەڵ مندا بەر ئەو نەفرەتە کەوتن، ئەوان و پێشمەرگەکانیش لەگەڵ مندا مانەوە. ڕۆژێک "عومەر چاوشین" کە ناسرابوو بە هەڤاڵ کوێستانی، هاتە سەردانمان بۆ شێنێ. لە ڕاستیدا من وام زانی بۆ پیشاندانی دۆستایەتیی خۆی هاتووە، چونکە لەگەڵ هاواری برام لە چوارقوڕنە یەکتریان دەناسی. دوای چاک و خۆشیی یەکتر، هەڤاڵ ڕووی کردە من و پێی وتم: "ئێوە سێ برا پێشمەرگەن و باوکیشتان گیراوە لای ڕژێم و ماڵەکانیشتان خۆیان حەشار داوە و پێویستیان بە سەرپەرشتیارێک هەیە، هەقە یەک دووانێکتان بڕۆنەوە و خۆتان بەدەستەوە بدەن." من بەو ئامۆژگارییەی هەڤاڵ زۆر ناڕەحەت بووم، سەیرێکی خەلیل و هاواریشم کرد، ئەوانیش لە ڕوویاندا دیار بوو کە پێی ناڕەحەت بوون. بە هەڤاڵم وت، ئەو پەیامە ئامۆژگاریی خۆتە بۆ ئێمە یان پەیامی کەسێکی ترە بە تۆیان وتووە کە بە ئێمەی بگەیەنیت؟ دەرکەوت کە (نەجمەددین عەزیز) سالار عەزیز ڕایسپاردبوو. من بەهێمنی پێم وت، بڕۆ پێیان بڵێ کەس بەزۆر ئێمەی نەهێناوە بۆ پێشمەرگایەتی و ناو شۆڕش، تا سەرکەوتن یان شەهیدبوون؛ نە یەکتری بەجێ دەهێڵین و نە شۆڕش و یەکێتی و کۆمەڵەش، بەڵام گەر ئەو کەسەی کە ڕایسپاردووی خۆی لە ئێمە و لە شۆڕش و کۆمەڵە و یەکێتی بێتاقەت بووە، با بفەرمووێ خۆی ڕادەستی ڕژێم بکاتەوە. کە ویردی سەر زمانی بۆتە وشەی "مفە حەیاتەکە" و بەخێر هێنانی ناوی هەمزە ئاغا[٣٣]. دوای من، هاوار زۆر بەڕەقی وەڵامی هەڤاڵی دایەوە، کە هەڤاڵ بە وەڵامەکەی هاوار زۆر قەڵس بوو هەستا و ڕۆیشتەوە بۆ ناوزەنگ بۆ لای سالار.

لە ڕۆژی ١٩٧٩/٨/٢٥، دوای کۆبوونەوە پێنج قۆڵییەکەی نێوان یەکێتی، حسک و شیوعی و حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی ئامۆزا، بڕیاریان دابوو کە هێزێکی هاوبەشی ئەو پێنج لایەنە کە هێزێکی تا (١٥٠٠) پێشمەرگە پێک بێنن و ئامادەی کەن بۆ گرتنی

---

[٣٣] مفە حەیاتەکە: واتە مفاوەزە (وتوویژ)
هەمزە ئاغاش نوێنەرێکی ڕژێم بوو لەو کاتەدا جارێک هاتبوو بۆ سەرکردایەتی لە ڕێگەی ڕەفیق پشدەرییەوە کە دۆستی حکومەت بوو، ناردبوویان بۆ ڕێککەوتن و وتوویژکردن.

شاری مەریوان بەو شێوەیە کە یەکێتی: (٤٥٠) پێشمەرگە و حسک: (٣٠٠) پێشمەرگە و شیوعی: (٢٥٠) پێشمەرگە و حزبی دیموکرات: (٣٥٠) پێشمەرگەی و کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێرانیش: (١٥٠)، لە کاتی دیاریکراودا لە شاری "بانە" کە ئەوسا ئازاد بوو؛ ئامادە بن. من لەلایەن مام جەلالەوە بانگ کرام و ئاگاداری کردم کە وەک نوێنەری یەکێتی بچم بۆ لای برایانی کۆمەڵە و لەگەڵ ئەوان کار بکەم و کاک بەکر حاجی سەفەریش وەک لێپرسراوی هێزەکەی یەکێتی، سەرپەرشتیی ئەو هێزەی یەکێتی بکات.

لەسەر بڕیاری مام جەلال و داوای سەرانی کۆمەڵەی زەحمەتکێشان، من ڕۆژی ١٩٧٩/٨/١٨ گەیشتمە بانە و پەیوەندیم کرد بە شەهید فوئادی سوڵتانییەوە. ئێمە پێک هاتبووین لە کەرتەکەی شەهید خەلیل و خۆی و شەهید هاواری برام و بەندە، کاک فوئاد کە وەک کەسی یەکەمی ناو کۆمەڵە وا بوو، لە ڕێگەی دکتۆر جەعفەری شەفیعییەوە یەکترمان ناسی، دوو ڕۆژ لە بانە لەگەڵ هێزەکەی یەکێتی و هێزەکەی حسک کە بە سەرپەرشتیی شەهید ئەنوەری مەجید سوڵتان بوو لەگەڵ کاک بەکر، چاوەڕێی هێزەکانی حزبی شیوعی و حزبی دیموکراتمان کرد، بەڵام هیچ هەواڵێکی هاتنیان نەبوو کە بڕیار وا بوو هەموو هێزەکان لە ١٩٧٩/٨/٢٧ ئامادەی لێدانی مەریوان بن پێش ئەوەی وەزیری بەرگریی ئێران (مستەفا چەمدان) بگاتە مەریوان، چونکە پەلاماری شاری "پاوە"ی دابوو و گرتبووی و ڕەوتەکەی بەرەو مەریوان و بانە بوو. کاک فوئاد پێشنیاری کرد کە پێکەوە لەگەڵ کەرتەکەی ئێمە و ١٠ پێشمەرگەی ئەوان بە ئۆتۆمبێل بەرەو سنووری مەریوان بڕۆین، تا لە نزیکەوە زانیاریی تەواو لەسەر هێزی ڕژێمی ئێران وەربگرین و ئامادەکاریی هێرشبردن ساز بکەین تا هەموو هێزەکان دەگەن.

ڕۆژی ١٩٧٩/٨/٢٦ ڕۆیشتین بەرەو مەریوان بە ئۆتۆمبێل، ڕێگاکە جگە لە ماشێنی حزبی دیموکرات و پێشمەرگەکانی کۆمەڵە، کەسی تر هاتوچۆی پێدا نەدەکرد. پاش یەک دوو سەعات گەیشتینە دێیەک لە پەڕی جادەکە، لەوێ دابەزین، لەو دێیە بنکەیەکی کۆمەڵەی ئامۆزای لێ بوو، دوو ڕۆژ لەوێ ماینەوە. شەهید فوئاد هەر خەریکی کۆبوونەوە بوو لەگەڵ کەسانێک کە خەڵکی ناوچەکە و مەریوان بوون.

شوێنی حەوانەوەی کاک فوئاد و بەندە و دوو پێشمەرگەی کۆمەڵە کە لەگەڵ کاک فوئاد بوون، لە ماڵێک بووین زۆر جێگەی متمانەی کاک فوئاد بوون. لە ڕۆژی دووهەمدا هاواری برام بەتەنیا پێی وتم کە ئەو ماڵە مەترسیدارە، لە پێشمەرگەکانی کۆمەڵەی بیستووە کە ئەو ماڵە دوو کوڕیان جاشی ڕژێمی ئێرانن و لە مەریوانن لەناو سوپای پاسداراندان، من بە کاک فوئادم وت وام زانی ئەو ئەو هەواڵە نازانێ، بەڵام پێی وتم کە ماڵەکە زۆر دڵسۆزی شۆڕشن و کوڕەکانیشیان ئەندامی کۆمەڵەن لەناو سوپادا. شەوی ۱۹۷۹/۸/۲۸، هەر لەو ماڵە کاک فوئاد و دووانی تر لە فەرماندەی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە و بەندە کۆبوونەوەیەکی کورتمان کرد لەسەر ئەوەی کە چی بکەین، هەر چاوەڕێی هێزەکە بکەین، من ڕام وا بوو کە نزیکەی ٦٠-٧٠ پێشمەرگە بن با هەندێ چالاکی بکەین و لە ڕەبایەکانی دەوروبەری شاری مەریوان بدەین تا هێزەکەش دەگەن. کاک فوئاد پێی باش نەبوو هێزی ڕژێم لە خۆمان ئاگادار بکەینەوە، نەبادا پلانەکەمان تێک بچێ. پاشان کاک فوئاد پێی باش بوو بۆ بەیانی کە ۱۹۷۹/۸/۲۹ بوو، هەردووکمان دووقۆڵی بچینە سەر جادە و لەو پێشەوە بە ئۆتۆمبێل بڕۆینە بانە تا بزانین باسوخواسی هێزەکە و تۆپەکانی حزبی دیموکرات بە چی گەیشتووە و بۆ شوێنەواریان دیار نەبوو.

ڕۆژی ۱۹۷۹/۸/۲۹ کاک فوئاد و بەندە و پێشمەرگەیەکی سازمانی ئینقلابی ئێران بە ناوی "تامورز" و "شێخ عوسمانی شێخ خالید"ی بانەیی و کوڕەکەشی وتیان لەگەڵ ئێوە دێین بۆ بانە. هەر ئەو ڕۆژە بەردەوام بەپیادەڕۆیی دەڕۆیشتین تا نزیک ئێوارە لامان دایە دێیەکی نزیک جادە، لە ماڵی ناسیاوێکی کاک فوئاد شەو ماینەوە. لە ماڵەکەمان پرسی بۆ جادە وا چۆڵە و هیچ ماشێنێک هاتوچۆ ناکات، وتیان دوو ڕۆژە ڕێگە بەستراوە و کۆپتەریش هەر بەسەر ناوچەکەدا دەخولێتەوە. بەیانی پێش هەتاوکەوتن کەوتینە ڕێ، لەدوای هەتاوکەوتن دوو کۆپتەری "کۆبرا" واتە بارهەڵگر کەوتنە هاتوچۆ لەنێوان بانە و مەریواندا، لە عەسردا گەیشتینە بەرامبەر پاسگایەک کە ناوی "کانعمت" بوو، بە دووربین سەیرمان کرد، لە سەربانی پاسگاکە جووڵەی خەڵک هەبوو، وامان زانی پێشمەرگەی دیموکراتن و ئامادەکارییان بۆ پاراستنی هێزەکەیان کردووە و سەر ڕێگاکەیان گرتووە، تا نزیک بووینەوە ئەوسا لێمان ڕاپەڕین و

هاواریان لێ کردین "ئیست"، زانیمان کە سووپای پاسدارانن و بە درێژایی ڕۆژ هێزیان بە کۆپتەر گواستۆتەوە بۆ ناو پاسگا چۆڵەکانی سەر ڕێگای مەریوان-بانە، کەوتینە شەڕەوە لەگەڵیان تا ئێوارە تاریک داهات[٣٤].

## شەهیدبوونی کاک فوئاد سوڵتانی و هێن فرسەتی

لەو شەڕەدا کاک فوئاد بەداخەوە شەهید بوو لەگەڵ تامرزدا، شێخ عوسمان و کورەکەی کە شارەزای ڕێگا و ناوچەکە بوون؛ دەرباز بووبوون بەرەو بانە، منیش بەنەشارەزایی کەوتمە ئەو دۆڵ و شیو و کێوانەی ناوچەکە، پاش دوو ڕۆژ و شەو ڕێبڕین گەیشتمەوە دووئاوی سەقز-بانە، لەوێ تووشی پێشمەرگەکانی هێزەکەی کاک بەکر حاجی سەفەر بووم، لایان سەیر بوو کە منیان بینی، چونکە ڕۆژی پێشووتر ڕژێمی ئێرانی لە ئێزگەی کرماشانەوە بڵاویان کردبۆوە کە لە شەڕی کانعمتدا دوو "زدی ئینقلابیان کوشتووە" بە ناوەکانی (فوئاد سولتانی؛ کادری ڕەهبەری کۆمەڵە، مەلا برایم؛ کادری ڕەهبەری اتحاد مهنی کردستان). کاک بەکر پێی وتم لەسەر فەرمانی مام جەلال، دوو ڕۆژە هەموو ناوچەکە دەگەڕێین بەدوای تۆدا یان تەرمەکەت بدۆزینەوە. دوای گەڕانەوەم بۆ سەرکردایەتیی یەکێتی، سالار عەزیز و هاوڕێکانی ئەو ڕووداوەیان بە هێن فرسەتی قۆستبۆوە و پروپاگەندەی بەجێهێشتنی کاک فوئاد و شەڕنەکردنی منیان بڵاو کردبۆوە، بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو تۆمەتە (هێن فرسەتییە) داوام لە مام جەلال و کۆمەڵەی ئامۆزا کرد کە دەبێ لێکۆڵینەوە لەو ڕووداوە بکەن. پاشان لە ١٩٧٩/١٠/٢٥ سەرانی کۆمەڵە بەفەرمی بە نامەیەک مام جەلال و "م. س"ی یەکێتی و کۆمەڵەی ڕەنجدەرانیشیان ئاگادار کردەوە کە پاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد، تۆمەتەکەی سالار عەزیز ناراستە و هەر لەو نامەیەشدا داوایان لە ناوەندی کۆمەڵە و مام جەلال کردبوو کە دووبارە بمنێرنەوە بۆ هاوکاریی کۆمەڵەی ئامۆزا.

---

[٣٤] تکایە بۆ زانینی درێژەی ئەو ڕووداوە، سەیری کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" بکە.

## پۆستەرەکە و زیندووبوونەوەم

پاش بڵاوبوونەوەی شەهیدبوونم لە شەڕی "کانعمت"، مام جەلال داوای لە کاک بەکر حاجی سەفەر کردبوو کە بە پێشمەرگە شارەزاکانی ناوچەی بانە بۆ دۆزینەوەم بە زیندوویی یان مردوویی کێومالّم بۆ بکەن، لە لایەکی تریشەوە بە مەکتەبی ئیعلامی وتبوو کە پۆستەرێکم بۆ بکەن. کە گەڕامەوە ناوزەنگ، دکتۆر خدر مەعسوم کە تاکە دکتۆری شۆڕش و برای دکتۆر فوئاد مەعسوم بوو، هاتە لام و دڵخۆشیی دەربڕی بە سەلامەتیم و وتی "وەڵا قەت نەمدەزانی ئەوەندەت خەم بۆ دەخۆم، بە خوای پۆستەرەکی جوانیان بۆ کردی".

## گەڕانەوەم بۆ سەرکردایەتی و کۆبوونەوەی سەرکردایەتی

دوای گەڕانەوەی نەوشیروان لە ئەورووپا لەنزیکی ناوەڕاستی مانگی (١٩٨٠/٢) ەوە بۆ سوودوەرگرتن لە ئەزموونە تاڵەکەی جیابوونەوەی بزووتنەوە ڕەسەنەکە و دروستکردنی بزووتنەوە نوێیەکە و بە هۆی بەربوونی هاوڕێیانی سەرکردایەتیی پێشوو و هاوڕێیانی تری کۆمەڵە لە زیندانی بەعسییان و هاتنەدەرەوەیان بۆ ناوزەنگی بارەگاکانی سەرکردایەتی، بڕیار درا کۆبوونەوەیەکی فراوانی سەرکردایەتیی یەکێتی بکرێ. دوای مانەوەم لەگەڵ کۆمەڵەی ئامۆزا بۆ ماوەی نزیکەی چوار مانگ، منیش داوا کرامەوە بۆ سەرکردایەتی بۆ بەشداری لەو کۆبوونەوە فراوانەی یەکێتی کە یەکەم کۆبوونەوەی فراوانی یەکێتی بوو لە دامەزراندنیەوە. ئەو کۆبوونەوەیە زۆر درێژخایەن بوو، نزیکەی ١٥ ڕۆژی خایاند و مشتومڕی زۆر کرا لەسەر جیابوونەوەی بزووتنەوە و دروستکردنی بزووتنەوەی نوێ و پاشان کێشە و ململانێکانی نێوان کوتلەی هەرێمەکان و کوتلەی زیندانی کۆمەڵە. بەو جۆرە لەو کۆبوونەوەیە ژمارەی "م. س" دیاری کرا بە ٦ ئەندام و ژمارەی سەرکردایەتی بە ٢١ ئەندام و ژمارەی مەکتەبەکان و لقەکانی یەکێتییش هەریەکەیان بە ٣ ئەندام، واتە لە هەموویاندا ١ ٣ کۆمەڵە ١/٣، بزووتنەوە ١/٣، هێڵی گشتی دانران.

## بۆردوومانی سەرکردایەتی و ڕووداوەکەی بنیۆخەلەف

مەکتەبی دارایی کە من ئەندامی بووم، لەگەڵ مەکتەبی عەسکەری لە دوو خێمەی تەنیشت یەک بووین لەناو دارگوێزەکانی "توژەڵە". پێش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٨٠/٧/٨، من چووبوومە لای خاڵە سەیید مەجید؛ ئەندامی مەکتەبی عەسکەری لەسەر بەشی بزووتنەوە بە سەردان، پێش نیوەڕۆ بوو، لەپڕ گرمەی فڕۆکە و گرمەی چەند بۆمبێک هات، خاڵە سەیید خۆی هەڵدایە ناو جۆگە ئاوەکەی تەنیشتی خەیمەکە و بن کونی ئاودرەکەوە، من هەر لەناو خەیمەکەدا بەڕاکشاوی مامەوە، خاڵە سەیید هاواری لە من و میرانی فوئاد مەستی کرد کە ئێمەش خۆمان فڕێ دەینە ناو کەندە ئاودرەکەوە. میران کە لە خەیمەکەی خۆمان بوو، ئەندامی مەکتەبی دارایی بوو، خۆی فڕێ دایە لای خاڵە سەیید مەجید، بەڵام من هەر لە شوێنی خۆم مامەوە. لەپڕ یەک دوو فڕۆکەی تر دەستیان کرد بە تەقەکردن لەناو چەم و دار گوێزەکاندا، پاش چەند چرکەیەک دەنگی فڕۆکە و تەقە نەما، خاڵە سەیید هاواری کرد "بریندارم"، ڕامکردە لایان، بینیم هەردووکیان بریندارن و پارچەی بەرد لێی داون و برینەکانیان سووک بوو، ئەوان هاتنەوە ناو خەیمەکە و بەرەو نەخۆشخانەکە چوون بۆ چارەسەر، لەوبەرمانەوە گوێم لە دەنگەدەنگ و هاوار بوو کە چووم، هاوڕێ (حەمەسەعید) حسێن شێخ کەریم و هاوڕێ جەبار بریندار بوون، هەموو دەموچاو و جلەکانیان خوێن بوو. حەمەسەعید دەیتوانی بڕوا، بەڵام هاوڕێ جەبار نەیدەتوانی، چوومە ژێر باڵی جەبار و لەگەڵ حەمەسەعیددا چووینە خەیمەی برینپێچەکان، لەناو خەیمەکە بینیم "پێشڕەوی سەیید برایم" بەپشتا کەوتبوو بێدەنگ، وتیان بریندارە، بەڵام هیچ خوێن بە لەشیەوە نەبوو، تومەز "تاسابوو". لەو بۆردوومانەدا دەزگای ڕاگەیاندن بەخەستی بەر کەوتبوو کە شەش بریندار و شەهیدێکیان هەبوو کە "بورهان ئەحمەدی مەحموودە گێژی هەمەوەندی" بوو، لە سکرتاریەتی مام جەلالیش پێشمەرگەیەک شەهید بوو ناوی "مامۆستا محەممەد" بوو، خەڵکی کۆیە بوو. هەر ئەو ڕۆژە "کاوەی شێخ لەتیف" هاتبوو بۆ سەرکردایەتی، هەمان ڕۆژ وێنەگرێکی تەلەفزیۆنی فەرەنسییش هاتبوو بۆ سەرکردایەتی، پێش بۆردوومانەکە وێنەی بارەگاکانی سەرکردایەتی و بازاڕەکەی ناوزەنگی سەر سنووری ئێران-عێراقی گرتبوو و لە کاتی بۆردوومانەکەشدا دووبارە

وێنەی بازاڕە سووتاو و خانوو و خێمە سووتاو و ڕووخاوەکانیشی گرتبوو. ئێمە بریندارەکانمان بردە گوندی "بنێوخەلەف" لە مزگەوتەکە دامانان تا ولاخیان بۆ دەگیرێ و دەبرێنە سەردەشت بۆ چارەسەر. کابرای وێنەگری فەرەنسییش بەو شەوە فلیمی بۆردوومانەکەی لێدایەوە تا بزانێ چۆن دەرچووە، لەگەڵ دەنگی فڕۆکە و بۆمبا هات، کاوەی شێخ لەتیف و هەندێکی تر بەپەلە دەرپەڕینە دەرەوەی مزگەوتەکە، وایان زانیبوو دووبارە فڕۆکەکان هاتوونەتەوە.

## شەمەندەفەرە سێ فارگۆنییەکەی زەڵێ

بە هۆی چوونی سەدام بۆ لوتکەی دەسەڵات و دەرکردنی لێبوردنی گشتی، بەو بۆنەیەوە هاوڕێیانی زیندان بەر بوون و شوکریی هاوڕێ و هاوسەریشم لە زیندان بەر بوو، ئەویش لەگەڵ هەرسێ منداڵەکانم؛ سروشت و ژین و دەروون هاتنە شێنێ بۆ لام، جەبار فەرمان و سەبیحەی هاوسەریشی هاتنە دەرەوە، عەلی بچکۆلیش لەو کاتەدا ڕووناکی هاوسەری خواستبوو هێنابوویە سەرکردایەتی. عەلی و جەبار و من بڕیارمان دا کە سێ ژوور بەتەنیشت یەکەوە بکەین کە هەرسێ ژوورەکە وەک فارگۆنی شەمەندەفەر بەیەکەوە لەسەر یەک هەیوان بێ، بە هەرسێ ماڵەکەش یەک سەرشۆرکمان دروست کردبوو، ئەو ڕیزە ژوورەیان ناو نابوو شەمەندەفەرەکەی زەڵێ.

## پوور کەسکە و ڕەدووکەوتن

هەر لە زەڵێ ماڵێکی شێنەیی لێ بوو، پیاوێک و ژنێکی بەتەمەن و کچێکی بێوەرژنیان هەبوو، ئەویش کچێکی بچووکی هەبوو باوکی لێیان جیا بووبۆوە. پیرەژنەکە ناوی "پوور کەسکە" بوو، پیاوەکەشی ناوی "مام ئەحمەد" بوو، ماوەیەک دوو ڕۆژ بوو پوور کەسکە دیار نەبوو، لە مام ئەحمەدمان پرسی بۆ پوور کەسکە دیار نییە، بەدڵتەنگییەوە وەڵامی داینەوە: "کەسکە ڕەدوو کەوتووە"، واتە هەڵگیراوە. ئێمەش لامان سەیر بوو بەو تەمەنەوە هەڵبگیرێ، پێمان گوت: "مام ئەحمەد پێت ناخۆش نییە؟" وەڵامی داینەوە: "ناوەڵا، دەزانم هەر دێتەوە، ئەوە سیانزەهەمین جارە

ڕەدوو دەکەوێ، هەموو جاران هەر هاتووەتەوە کنە خۆم، پێم ئەمنی لە هەمووان پێ پیاوترە."

ڕەدووکەوتن یان هەڵگرتن لەناو عەشیرەتی مەنگوڕ و ناوچەی مەنگوڕایەتی کە لە شارویرانی ڕۆژهەلاتی کوردستانەوە دەستی پێ دەکا تاکوو ناوچەی پشدەر و نزیک بە ناوچەی ئاکۆیەتی باوە، زۆر کەم وا بووە کە ژنهێنان و شووکردن بە خوازبێنی بووبێ، هەر بە هەڵگرتن یان ڕەدووکەوتن بووە، کچ و کوڕ یەکتریان خۆش ویستووە و حەزیان لە یەکتری کردووە، لەگەڵ یەکتریدا ڕێک کەوتوون و بێ ئاگاداریی باوک و دایک و خزم و کەس بەیەکەوە ڕۆیشتوون بۆ ناوچەیەکی تر بۆ ماڵی ئاغایەک یا کوێخایەک یا ناسیاوێکی، لە ڕێگەی ئەو ماڵەوە پەیوەندییان بە ماڵی باوکی کچەکەوە کردووە و (مصلەتیان) ڕێککەوتنیان کردووە، ئەوسا لە یەکتری مارە کراون و لەلایەن باوک و کەسوکاری کچە و کوڕەشەوە بەخشراون. ئەو نەریتە کە سەدان ساڵە لەناو ئەو عەشیرەتەدا هەیە، هەمان نەریتە کە لە ئەورووپاش لەنێوان کچان و کوڕاندا هەیە و پێیان دەڵێن "هاوڕێی کچ و هاوڕێی کوڕ"، بەڵام جیاوازییەکە ئەوەیە لای ئێمەی کورد نەنگییە و بە شەرمەزاری دادەنرێت، لای ئەورووپییەکان بە پێشکەوتن و شارستانی دادەنرێ.

## گەڕانەوەی هێزەکان و شەڕی جەلک و مەمکان

لەپاش سەرکەوتنی یەکێتی لە شەڕی مامەندە و پووچەڵبوونەوەی پلانی ڕژێمی بەعس و پلانی قیادە موەقەتە، کۆمەڵێک گۆڕانکاری لە مەڵبەندی دەشتی هەولێر کرا و پاشان هێزێکی پتەو تێکەڵاو لە کەرتی بازیان و هێزەکانی دەشتی هەولێر و کەرتێکی گەرمیان بە سەرپەرشتیی عومەری سەیید عەلی و فەرەیدوون قادر و عەلی بچکۆل وەک ئەندامانی سەرکردایەتی و سەیید کەریمیش وەک لێپرسراوی عەسکەریی مەڵبەندی چوار و بەندەش وەک ئەندامی مەکتەبی دارایی و بەرپرسی دارایی لە سەرکردایەتییەوە ئەو هێزە زورە کەوتنە ڕێ بەرەو قەلاتووکان و ئەبو بەکرە و پاشان ئێندزە و دۆڵی کەندەبووکە بەرەو ماخۆبزنان و دۆڵەڕەقە. ڕۆژی ۱۹۸۰/۱۱/۱۸ بەو نیوەڕۆیە سەیید کەریم کە بەرپرسی ڕەتڵەکە بوو، تا دەشتی هەولێر بڕیاری دا

کە بەسەر دێکانی جەلکان و مەمکان و زەنگلان و پیرانە ڕەشەدا دابەش بین و بۆ پشوودان و لە عەسردا بڕۆینە دیوی دۆڵی ئاکۆیان بە شاخی کێوەڕەشدا، ئەو دێیانە هەمووی ڕەبایەی حکومەتی لێ دیار بوو کە بەسەر شاخی کێوەڕەشەوە بوون، ڕۆژی پێشووتریش کەرتەکەی "عەولا سوور" لە ڕەبایەیەکیانی دابوو، زیانی زۆری پێ گەیاندبوون، بۆیە ڕەبایەکان زۆر ئامادە و وریا بوون.

لەگەڵ ڕۆستەمدا بە سەیید کەریممان وت کە با بمێنینەوە لە دۆڵی کەندەبوکە تا ڕۆژ ئاوا دەبێ، ئەوسا بچینە دیوی دۆڵەڕەقە، بەڵام وەڵامی سەیید کەریم ئەوە بوو کە ئەو بەرپرسی عەسکەری ڕەتڵەکەیە. هێشتا پێشمەرگەکان نیوەیان نانیان نەخواردبوو، چوار کۆپتەر کەوتنە خولانەوە بەسەر دۆڵەڕەقەدا و پاشان کەوتنە گوللەبارانکردنی هێزەکە، زیانی زۆر بەر پێشەکیی هێزەکە کەوتبوو کە کاک عومەر و مامۆستا نازم و ئەوانی تێدا بوو. لەو گوللەبارانکردنە، ١٢ بریندار و ٨ شەهیدمان دا، لەوانە شەهید جەمیل ڕەنجبەری شاعیر و ئەندامی لقی هەولێر و شەهید دڵشاد کە ئەندامی لیژنەی ناوچەی کۆیە بوو لەگەڵ ٦ پێشمەرگەی دەشتی هەولێر. بریندارەکانیش عومەری سەیید عەلی کە زۆر بەخەستی بریندار بوو، دوای چارەسەری چەند ساڵیش لە سوید، تا ئێستاش هەر بە گۆچان دەڕوا. بریندارەکانی تریش مامۆستا نازم دەباغ و مەحموود بەنزین و سابیر ڕەسوول کە ئەمیش چاوێکی لەدەست دا لەگەڵ ٨ پێشمەرگەی تر کە ناوەکانیانم لەیاد نەماوە. لە ڕاستیدا ئەگەر ئەو ڕووداوە لە هێزێکی سوپای حکومیدا ڕووی بدایە، دەبووایە سەیید کەریم بە جۆرێک سزا بدرایە کە بوو بە هۆی ئەو کارەساتە، بەڵام بەپێچەوانەوە گەورەترین پشتیوانیی لێ کرا لە مەڵبەندی چوار لەلایەن سەرکردایەتی و خودی نەوشیروان.

## جەولەکەی من بۆ مەڵبەندەکان و گرتنی نەوشیروان مستەفا

دوای ناشتنی تەرمی شەهیدەکان لە شەودا لە دۆڵەڕەقە، بە شەوێکی تاریک و ئەنگوستەچاو و باراناوی بەسەر شاخی کێوەڕەشدا سەر کەوتین. لەبەر ئەوەی من خەڵکی ناوچەکە بووم، بوومە چاوساغی هێزەکە. منیش لە شۆڕبوونەوەدا بەرەو خوار بۆ دۆڵێ، ڕێگەکەم لێ تێک چوو، لەجیاتیی ئەوەی بەرەو سەرکەپکان بڕۆم، بەرەو

گوندی هەنجیرە ڕۆیشتم کە دەکەوتە ژووورووی شاری ڕانیەوە، وەختێک زانیم گوێم لە دەنگی سەربازەکانی ڕەبایەکە بوو، دیسان بەرودوا ئەو هێزەم گەڕاندەوە دواوە و سەر کەوتین بەلای ڕاستدا بەرەو سەرکەپکان ڕۆیشتین کە سوارە ئاغا چاوەڕێی ئێمە و بریندارەکانی دەکرد. لە ڕێگەدا ئەو پێشمەرگانەی کە عومەری سەیید عەلییان بە دارەبەست هەڵگرتبوو لەبەر هیلاکی و ئەو ڕێلێتێکچوونەش کەوتبوونە جنێودان بە چاوساغ و دەلیلەکە، وایان دەزانی من یەکێکم لە دانیشتووانی گوندی پیرانەڕەشە، کە گەیشتمە ماڵی سوارە ئاغا و ئاشکرا بووم کە کێم؛ زۆر پۆزشیان هێنایەوە بۆم، پاشان وتیان بۆ خۆت ئاشکرا نەکرد یا هیچت نەوت، ئێمە ئەو هەموو هەڵەیەمان کرد، منیش پێم وتن لەبەر ئەوەی من ڕێگەکەم هەڵە کردبوو، ئێوەش بارتان قورس و ماندووتر بوون، شەویش تاریک و ڕێگاش هەمووی بەردەلانی و هەڵەت بوو، هیچم نەوت.

## لێکۆڵینەوە لە سوارە ئاغا

دوای لێکۆڵینەوەیەکی ورد لە سوارە ئاغا کە لێپرسراوی هەرێمی ١٢ بوو، دەرکەوت کە پارەی مانگانەی کەرتەکانی تری چوار مانگی نەدابوو کە لە سەرکردایەتییەوە بۆی هاتبوو، پاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد لەگەڵ ڕابەری سیاسییەکەیان (دکتۆر مشیر) و لێپرسراوی دارایی هەرێم؛ کاک عەزیز ناسراو بە عەزولە و لێپرسراوی لیژنەی ناوچە (عەزیز بەگ) توانیم نیوەناچڵ پارە خوراوەکان لە سوار ئاغا وەرگرمەوە و بیدەمەوە بە کەرتەکان. پاش ئەوەی ڕاپۆرتێکی داهات و خەرجیی هەرێمەکەم بە سوار ئاغا لە ماوەی ٣ ڕۆژدا واژۆ کرد، لەگەڵ هێزەکە پاش حەسانەوەیان؛ بەرەو دەشتی هەولێر و ناوچەی کۆیە و پاشان بەرەو بازیان و قەرەداغ ڕۆیشتین. پاش لێکۆڵینەوە لە هەرێمی گەرمیان و قەرەداغ، ڕاپۆرتی دارایی خۆم ئامادە کرد و ناردمەوە بۆ سەرکردایەتی بۆ دەزگای دارایی. پاشان ڕووەو شارەزوور و شارباژێڕ کەوتمە ڕێ بەرەو هەرێمی سێ، کە کاک بەکر حاجی سەفەر؛ فەرماندەی هەرێمەکە بوو.

ڕۆژی ١٩٨١/١/١٠ گەیشتمە گوندی بزینیان، کاک بەکر لەوێ بوو، هەرێمی یەک و هەرێمی سێیان کۆ کردبۆوە، سالار عەزیز و مەلا بەختیار و ئەبو شەهاب و ئاسۆی شێخ نووریش لەوێ بوون. ئەبو شەهاب لێپرسراوی لق بوو، ئاسۆ ڕابەری

سیاسی، سالار عەزیز نوێنەری "م. س" و مەلا بەختیار لێپرسراوی هەرێمی یەک بوو. کە پرسیارم لە کاک بەکر کرد، ئەم هەموو هێزە بۆچی؟ وتی: "هەموومان بەدوای هێزەکەی حسک کەوتووین تا فشار بخەینە سەر حسک، بەڵکوو ناچار بن نەوشیروان بەر بدەن." من بە کاک بەکرم وت: "بە ڕای من ئەو ڕاونان و فشارخستنە و هەڕەشە و گوڕەشەیە، مەترسیی لەناوبردن یان دوورخستنەوەی نەوشیروان لە ناوچەکە و بردنی یا بۆ ئێران بۆ لای پارتی یان ڕادەستکردنی بە ڕژێمی عێراقی پتر دەکات." حسک چەند مەرجێکیان لەسەر یەکێتی دانابوو بۆ بەردانی نەوشیروان، یەکەم: ڕێگەیان بدرێ ئەوانیش وەک یەکێتی لە ناوچەکانی هەورامان و هەڵەبجە و شارەزوور بوونی خۆیان ڕاگەیەنن و هەمان دەسەڵاتی یەکێتییان هەبێ لەو ناوچانە.

٢. یەکێتی ١٠٠ چەک بدا بە حسک[٣٥].

من ڕام وا بوو کە چەکەکانیان بدەنێ، بەڵام بە مەرجی بەردانی نەوشیروان. سالار عەزیز ڕای وا بوو کە یەک چەکیشیان نەدرێتێ، تەنانەت وتی: "یەکێتی و کۆمەڵە کۆمەڵێک سەرکردەی شەهید بووە، با نەوشیروانیش یەکێک بێ لەوانە." من پاش تەواوبوونی کارەکەم، وەک نوێنەری دەزگای دارایی لەو هەرێمە گەڕامەوە سەرکردایەتی. لە ١٩٨١/١/١٨ گەیشتمەوە سەرکردایەتی و لەوێ د. عومەر شێخ مووس و د. کەمال خۆشناوم لە ڕاپەکانی سالار عزیز و مەلا بەختیار تێگەیاند و ئەوانیش کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتیی بەپەلەیان ئەنجام دا و لەو کۆبوونەوە ئەم بڕیارانەیان دا:

١. قایلبوون بە دانی ١٠٠ چەکەکە و بڕیارەکەشیان بە جەمال ئاغا و شێخ دارای حەفیددا نارد بۆ تایەری عەلی والی بەگ و حەمەی حاجی مەحموود، ئەو دووانە ئەندامی "م. س" و سەرکردایەتی بوون لەسەر بەشی بزووتنەوە.

٢. بڕیاریان دا کە بەندە بنێرن بۆ لای د. مەحموود عوسمان کە تازە لە سووریاوە گەڕابۆوە بۆ سەرکردایەتیی حسک لە گوندی بیدەلان، وە ڕاسپاردەی سەرکردایەتیی

---

٣٥ درێژەی ئەو بابەتە لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"دا باس کراوە.

یەکێتیی پێ بگەیەنم سەبارەت بە گرتن و بەردانی نەوشیروان[٣٦].

من ئەرکەکەی خۆم بەجێ گەیاند و د. مەحموودیش بەڵێنی دا کە نەوشیروان بەبێ مەرج بەر بدرێ و ئەگەر برادەرانی شارەزوور و شارباژێڕی حسک و "م. س"ی حسک بەگوێیان نەکرد، ئەوسا ئەو حسک هەڵوەشێنێ. ئەنجامەکەشی هەر وا بوو، برادەرانی حسک نە بە پەیامەکەی جەمال ئاغا و شێخ دارا قایل بوون و نە بە داواکەی د. مەحموودیش، بەڵام نەوشیروان هەم مەرجەکانی حسکی ترۆ کرد و هەم یەکێتییشی لەو بارە گرانە دەرباز کرد و هەم ئاواتی دوژمنەکانیشی بۆ لەناوچوونی خۆی پووچەڵ کردەوە، ئەویش بە خۆدەربازکردنی لە ئەشکەوتی هەزار ستوون لە هەورامان لە ١٩٨١/٢/٦.

٣٦ درێژەی ئەو بابەتە لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"دا باس کراوە.

## بەشی حەوتەم
## کۆنفرانسی یەکی کۆمەڵە و دەرئەنجامەکانی

لەو کاتەی کە نەوشیروان لەلایەن حسکەوە بە پیلانێکی "هێن فرسەتی" گیرا، لە سەرکردایەتییش دەزگای ڕاگەیاندن کە فازڵ کەریم لێپرسراوی بوو، مام جەلالیش لە دەرەوەی وڵات بوو بە فرسەتی زانیبوو، وتارێکی لە ژمارە ٦ی کۆمەڵەدا نووسیبوو لەژێر ناوی "ئۆپۆرتونیزم" کە زۆربەی مەبەستەکانی ناوەڕۆکی بەیانەکە لەسەر بۆچوون و هەڵوێستی نەوشیروان بوو کە پێی وا بوو نەوشیروان سیاسییەکی ئۆپۆرتونیستە، نەوشیروان لە نووسینی ئەو وتارە زۆر بێتاقەت بووبوو بەتایبەتییش لە کاتێکدا نووسراوە کە نەوشیروان وەک سکرتێری کۆمەڵە لە مەترسیی لەناوچووندا بوو. لەناو کۆمەڵە بەگشتی و لە سەرکردایەتیدا بەتایبەتی تا دەهات ململانێی نێوان (کتلەی زیندان و کتلەی کۆمیتەی هەرێمەکان) زۆر بەهێزتر و توندوتیژتر دەبوو. ژمارەیەکی زۆری هاوڕێیانی کۆمەڵەش لە شارەکانەوە هاتبوونە دەرێ و زۆربەیان لەدەوری سەرکردایەتی کۆ بووبوونەوە.

ڕۆژێک نەوشیروان ناردی بەدوامدا، کە چووم؛ دەربڕی کە ڕای وایە ئێستاکە فرسەتە کۆنفرانسی یەک بگرین، ئەو ژمارە زۆرەی ئەندامانی کۆمەڵە لێرەن و بشنێرین کادرە پێشکەوتووەکانی کۆمەڵە لە هەرێمەکانەوە بێنە سەرکردایەتی بۆ بەشداریی کۆنفرانس، وتیشی گەر خولێکی ڕۆشنبیری بۆ ئەو کادر و ئەندامانە بکرێتەوە تا شارەزاییەکیان لەسەر کۆنفرانس و مەبەست لە کۆنفرانس هەبێ؛ زۆر باشە. داوای لە من کرد کە من لە شێنێ خولەکە بکەمەوە، ئاسۆی شێخ نووریش لە زەڵێ، مەلا بەختیاریش کە بەوەی زانی؛ ئەویش خولێکی بۆ ئەو کادرانە کردەوە کە خۆی و سالار عەزیز و فازیل مەبەستیان بوو. بەر لە بەستنی کۆنفرانس بە ٣ ڕۆژ، نەوشیروان

داوای لێ کردم ژوورێکی لە بارەگاکەم بۆ تەرخان بکەم، بەڵام بەو مەرجەی لە یەک پێشمەرگە زیاتر کەسی تر نەزانێ کە لای ئێمەیە. لەو دوو سێ ڕۆژەی کە لای ئێمە بوو، بە سەری ڕەحەت و فکری ئاسوودەوە ڕاپۆرتی گشتیی بۆ کۆنفرانس ئامادە کرد.

ڕۆژێک پێش کۆنفرانس ئێوارە بوو، نەوشیروان خۆی ئامادە کردبوو بڕواتەوە بارەگاکەی خۆی لە ناوزەنگ، دووبەدوو بووین، پێی وتم: "تۆ بڵێی لەم کۆنفرانسە سەر کەوین؟"، منیش وتم: "مام جەلال لێرە نییە، گەر تۆ پشتیوانی و لایەنگرییان نەکەیت و گەر دەرنەچوون بەزۆر نەیانخەیتەوە سەرکردایەتی؛ دڵنیا بە سەرکەوتوو دەبین." لە وەڵامدا وتی: "من حەقم بەسەریانەوە نییە و لایەنگری هیچ لایەکیشیان ناکەم، کێ دەرچوو با دەرچێ، بەڵام گەر ئەمانە دەربچنەوە (مەبەستی فازیل و سالار بوو)، من واز دەهێنم و بیر لە پێکهێنانی ڕێکخراوێکی تر دەکەمەوە دایمەزرێنین، لەگەڵمدای؟" بێ سێ و دوو کردن وتم لەگەڵتدام.

کۆنفرانس بە قرەقرێکی زۆر و مشتومڕێکی زۆر لە ۱۹۸۱/۵/۷ بەسترا بە بەشداریی ۱۸۵ ئەندام، لە ئەنجامدا تەنیا ۷ کەس دەنگی لە نیوە زیاتری بەشداربووانیان هێنا: ۱. نەوشیروان، ۲. کەمال خۆشناو، ۳. عومەری سەیید عەلی، ٤. فەرەیدوون، ٥. ملازم عومەر، ٦. مەلا بەختیار، ۷. عەلی بچکۆل بە تەسەلسولی دەنگەکان. منیش کە خۆم هەڵبژاردبوو، دەرنەچووم و لە نیوە زیاتری دەنگەکانم نەهێنا، بەڵام نەوشیروان بەڵێنەکەی نەبردە سەر، چونکە بە هۆی دەرنەچوونی سالار عەزیز و فازیل کەریم و ئازاد هەورامییەوە، مەلا بەختیار و ملازم عومەریش لەگەڵ ئەوان بڕیاریان دا کە واز لە یەکێتی بهێنن و بڕۆنە دەرەوەی وڵات. نەوشیروان سێ ڕۆژ لە هاتوچۆدا بوو بۆ لایان، تا قایلیان بکات نەڕۆن و بەڵێنی دانێ کە سالار و فازیل و ئازاد هەورامییش بخرێنەوە سەرکردایەتی و "م. س"، بەڵام هەوڵەکەی سەری نەگرت. ئەو سەرکردە مارکسییە عەیار تەواوانە لەبەر دەرنەچوونیان، وازیان لە یەکێتی و کۆمەڵە و فکریان هێنا و ڕۆیشتنە تاران بە مەبەستی چوونەدەرەوەی وڵاتیان، بۆ شانسی ئەوان لەو کاتەدا مام جەلال لە دەرەوەی وڵات گەڕایەوە و گەیشتە تاران و قایلی کردبوون کە لەگەڵیا بگەڕێنەوە ناوزەنگ و گەڕانەوە و بێ شەرعیەتی دەرچوونیان؛ قایل بوون بخرێنەوە سەرکردایەتی.

# پشووی سەری ساڵی خوێندن

## خۆشی و ناخۆشی

یەکەم هەفتەی پشووی سەری ساڵ، مامۆستا شوکریی هاوژینم منداڵەکانی هێنابوو بۆ سەنگەسەر بۆ ماڵی مام عەوڵای ئەبو بەکرە، لەوێشەوە هاواری برام هێنانی بۆ شێنێ. دوو ڕۆژ بوو ئەوان گەیشتبوون، مام جەلال ناردی بەدوامدا تا بچمە تاران. ئەو پارەیەی کاک شازاد صائب لە دەرەوە ناردبووی بۆ شۆڕش و درابوو بە د. فوئاد مەعسوم، من بە هۆی ئەوەی ئەندامی دەزگای دارایی بووم، دەبوو بچم بیهێنمەوە بۆ سەرکردایەتی. کە چووم بۆ لای مام جەلال، پێم نەوت منداڵەکانم هاتوون دوو ڕۆژە، بەڵام شەهاب عوسمان لەلای بوو بە مام جەلالی وت کە خێزانەکەی و منداڵەکانی هاتوون بۆ لای دوای بەربوونی خێزانی لە زیندان، خێزانەکەی و منداڵەکانی کاک برایمیان نەدیوە. مام جەلال بڕیاری دا کە بڕۆم، بەڵام چەردەیەک پارەشی دامێ تا مامۆستا شوکری و منداڵەکانیش لەگەڵ خۆمدا ببەم بۆ تاران و دوو هەفتەیەک بمێنینەوە، بەڵام ئێمە ١٠ ڕۆژ ماینەوە. تا ئێرە خۆشییەکەم بوو، بەڵام لە گەڕانەوەماندا لە گوندی "بنیوخەلەف" لەنێوان سەردەشت و سەرکردایەتی؛ هاواری برام بینی، بە برینداربیەکی زۆر سەخت بەسەر ئێسترێکەوە بوو، شەهید مستەفای پێشمەرگەی لەگەڵدا بوو، ڕۆژی ١٩٨١/٨/٢٧ بوو، بەسەر وڵاخەکەوە لێم پرسی لەکوێ و چۆن بریندار بووە؟ بەکورتی باسی کرد کە لە بەستەسێن لەگەڵ جاش و سوپای ڕژێمدا ڕووبەڕووی یەک بوون، لەو شەڕەدا شەهید عەبدوڵڵای کادر شەهید بووە و هاواریش بەسەختی بریندار بووە و مام عوسمانیش دەرباز بووە؛ دەڕوا بەرەو سەردەشت و پاشان تاران بۆ چارەسەر، هەر لە دەمی خۆی زانیم کە سێ گوللە و پێنج پارچەی نارنجۆکەکەی خۆی بەری کەوتووە و یەک لە گوللەکان بەر بەینی چاوی و لووتی کەوتبوو، یەکیش بەر قوڵی و یەکیش بەر قاچی و پارچەکانیش هەمووی بەر ڕانەکانی کەوتبوون، ئەمەش ناخۆشییەکەم بوو، نەمدەزانی شوکری و منداڵەکان بنێرمەوە شێنێ و لەگەڵیا بڕۆم بۆ تاران، یان بڕۆمەوە سەرکردایەتی و پارەکە ڕادەستی دەزگای دارایی بکەم و منداڵەکانیش بنێرمەوە سلێمانی و خۆیشم بڕۆم بەدوای هاواردا. هاوار زۆر دڵی دامەوە و پێی وتم کە ئەو باشە و خۆی دەتوانێ بچێتە تاران و لەوێش

مامۆستا موحسین و د. فوئاد سەرپەرشتیی چارەسەرەکەی دەکەن. من گەڕامەوە ناوزەنگ و پارەکەم دا بە مام جەلال و چوومەوە شێنێ، بەڕاستی دڵم بواری نەدام بێئاگا بم لە هاوار، بۆیە پاش ئەوەی خەیمەیەکم لەنزیک بارەگاکەی خۆمانەوە بۆ هەڵدان، ئاواتی کاک عومەر کە هەم خزمی خۆم بوو، هەم پێشمەرگەیەکی زۆر دڵسۆز و چالاک بوو؛ ڕامسپارد کە ئاگای لێیان بێت، من دەچمە سەردەشت بۆ بینینی هاوار. هێشتا هاوار نەچووبوو بۆ تاران، لە نەخۆشخانەی سەردەشت بوو، شەو بەدرێژی باسی شەڕەکەی بۆ کردم و شوێن برینەکانی پیشان دام و بەڕاستی زۆر بەسەرسامی ڕزگاری بووبوو کە بە شەو لەناو تووتن و گوڵەبەڕۆژەدا خۆی حەشار دابوو، بەسنگەخشکە خۆی گەیاندبووە یەک لە ماڵە تووتنەوانەکان کە لەسەر شینایییەکانیان بوون، ئەوان وڵاخیان بۆ پەیدا کردبوون و گەیاندبوویانە سەرکردایەتی. بۆ ڕۆژی دوایی، هاوار و دوو برینداری تر ڕۆیشتن بۆ تاران و منیش گەڕامەوە شێنێ.

## شەهیدبوونی کاک خەلیل و درۆی ناچاری

لە مانگی ١٠ منداڵەکانم ناردەوە بۆ سلێمانی، بە شەو لە ڕێگەی نێوان "سیوەیس" و بەستەسێن کەوتبوونە کەمینەوە، بەڵام بە هیممەتی مستەفای پێشمەرگە و کاروانچییەکان لەو کەمینە دەرباز بووبوون بەسەلامەتی، منیش چووم بۆ سەردەشت تا تەلەفۆن لەگەڵ هاواری بکەم. هاوار لە چارەسەرکردنی برینەکانیدا بوو، بەڵام هێشتا چاوی و لووتی نەشتەرگەریی بۆ نەکرابوو. هەواڵی خەلیلی پرسی و گەڵەیی کرد، وتی وا دوو هەفتەیە تێلی بۆ نەکردووم، ڕۆژی دوایی گەڕامەوە بۆ شێنێ، کات عەسر بوو، بە پێچەوانەی جارانەوە کە دەگەڕامەوە؛ پێشمەرگەکان دڵخۆش دەبوون، بەڵام ئەم جارە هەموویان مات و خەمبار دیار بوون، لە هۆکارەکەیم پرسی، دیسان هەموویان مات و بێدەنگ بوون، تا ناچارم کردن باسی بکەن، حەسەن بەماتییەکەوە بە قورگی نووساوەوە وتی: "کاک خەلیل لە گردی ڕەمکان بە هاوەنی ڕەبایەکە بریندار بووە، ئاوات و مستەفا ڕۆیشتوون بیانهێننەوە." من یەکسەر دڵم داخورپا و ترسێک و تەزوویەک بە لەشمدا هات و زۆر ماتییەکەی ئەوانیش تێیگەیاندم کە کاک خەلیل شەهید بووە، سێ چوار پێشمەرگەی ترم نارد بەدوای ئەوانی تردا، لەو

کاتەشدا هەندێ لە هاوڕێیانی سەرکردایەتی کە زانیبوویان من گەڕاومەتەوە؛ هاتن بۆ لام، چونکە ئەوان لە عەسردا زانیبوویان کە کاک خەلیل و هاوڕێیەکی تریش شەهید بوون. تەرمەکەی کاک خەلیل و کاک سەلام عومەر پێکەوە هێنرانەوە شێنێ. سەلام هاوڕێی کۆمەڵە بوو، خزمی شوکرییش بوو، لە سەربازی ڕایکردبوو، هاتبووە بەستەسێن، لەوێ زانیبووی کاک خەلیل بۆ کاری یەکێتی لەوێیە، پەیوەندیی پێوە کردبوو، بەیەکەوە ڕۆژی دوایی هاتبوون بۆ سەرکردایەتی، بەنیازی ئەوەی ببێ بە پێشمەرگە، بەڵام بەداخەوە پێش ئەوەی چەکی پێشمەرگایەتی و نیشتمانپەروەری بکاتە شانی؛ شەهید بوو. لە تاریکیی ئێوارەیەکی درەنگدا هەردوو شەهیدەکەیان شت. بینیمن شەهید خەلیل یەک پارچە بەر ڕانی کەوتبوو، دیار بوو کە تووشی خوێنڕێژی بووبوو، کەس نەبووە بیگەیەنێتە شوێنێک خوێنەکەی بوەستێنێ، شەهید سەلامیش پارچە هەموو ناوسکی هەڵتەکاندبوو. دوای شتنیان و کفنکردنیان، ئەو شەوە تا بەیانی لەنێوان هەردووکیاندا ڕاکشام. هەر لەگەڵ ئەواندا دوو پێشمەرگەی باڵەکایەتییشیان لەگەڵ دەبێ، یەکێکیان بریندار دەبێ بەسووکی و ئەوی تریشیان لەگەڵ بریندارەکە دەگەنە سەرکردایەتی و هەواڵی شەهیدبوونی شەهید خەلیل و شەهید سەلامیش دەگەیەنن. بۆ من شەهیدبوونی کاک خەلیل کۆستێکی زۆر گەورە بوو، ئێمە برا بووین. بەڵام هاوڕێیەکی زۆر دڵسۆز و خۆشەویستی یەک بووین.

شەهید خەلیل لەدایکبووی مانگی ٢ی ساڵی ١٩٤٥ بوو، تەنیا ساڵێک و سێ مانگ لە من بچووکتر بوو، لەدوای شەهید خەلیل؛ سێ برای ترمان بووبوو: ئیسماعیل. سمکۆ، بەختیار، بەڵام هەرسێکیان بەمنداڵی مردبوون. من و شەهید پێکەوە کاتی منداڵیمان بەسەر بردووە و پێکیشەوە لاوی و خوێندن و قوتابخانەمان بەسەر بردبوو تا ساڵی ١٩٧٠ لێک دانەبڕابووین، جگە لە کاتی پێشمەرگایەتیم لە شۆڕشی ئەیلولدا. شەهید خەلیل دەرچـووی قوتابخانەی ئامادەیی "نیشتمان" (وطـن) بـوو، پاشان فەرمانبەر بوو بە پلەی سەرۆکی شارەوانیی سەنگەسەر، چوارقوڕنە، تەوێڵە. ساڵی ١٩٧٤ لە دەستپێکردنەوەی شەڕدا وەک ئەندامی کۆمەڵە چووەتە ناو شۆڕش، لە کاتی بۆردوومانکردنی قەڵادزێ، ئەویش دەکەوێتە ژێر داروبەردی سەقفی خانوویەکەوە. بەڵام بەریندار نابێ. هەر لە ساڵی (١٩٧٣)ەوە لەگەڵ شەهید هاواردا دەبنە کۆمەڵە

لە ڕێگەی منەوە، لەدوای ئاشبەتاڵ نەگەڕایەوە بۆ سەر کارەکەی تا مانگی ١٩٧٦/٦دا داوامان لێ کرد نامەیەکی شەهید ئارام و من بەرێ بۆ «فەقێ حەسەنی حەمەد ئاغای کاسکان» تا بەو چەکانەی پاش ئاشبەتاڵ شاردبوونیەوە، مەفرەزەیەکی سەرەتایی دروست بکەن لەگەڵ خوالێخۆشبوو قادر خەبات لە باڵەکایەتی یەک بگرنەوە. لە کاتی ڕۆیشتنی لە قەڵادزێوە بەرەو دۆڵی شەهیدان، لەسەر پردەکەی خوار قەڵادزە کە ڕەبایەی سەربازیی لێ دەبێ؛ دەیگرن و دەیپشکنن، شەهید خەلیل هەردوو نامەکە قووت دەدات، دەیبەنەوە قەڵادزێ و لە زیندانی سەرای قەڵادزە زیندانی دەکەن، پاش پێنج ڕۆژ دەیانەوێ ببەن بۆ بارەگای هەواڵگری (استخبارات)، لە ڕێگا فرسەت دێنێ لەدەست دوو پۆلیسەکە ڕادەکا و کۆڵانە و کۆڵان خۆیان لێ ون دەکا و خۆی دەکا بە سەرە مەنهۆڵی زێرابێکدا، پاشان لە دیوی سەرچۆمەکەوە دەچێتە دەرەوە و خۆی لەناو دار و درەخت مات دەکا تا شەو، شەو لە بەلاڕێدا لە قەڵادزەوە بەرەو سوڵتانەدێ و پاشان ڕووەو ئەبو بەکرە و قەلاتووکان دەڕوا، و لەوێ یەکەم مەفرەزەی سەرەتایی لەگەڵ مام عەوڵای ئەبو بەکرە و حەسەن برایم شوان قەلاتووکان و یەک دوو کەسی تر پێک دەهێنن. شەهید خەلیل لە پێشمەرگایەتیدا پیاوێکی دڵسۆز و هێمن و لەسەرخۆ و مولتەزم بوو، تا کاتی شەهیدبوونی بە پلەی فەرماندەی کەرت.

شەهید خەلیل لە ١٩٨١/١١/٢٠، لە گردی ڕەمکان لە حەوزی چیای گەڵاڵە لەنزیک گوندی شەرویت شەهید بوو. شەهید خەلیل لە دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی و گەرمیان و قەرەداغ پێشمەرگایەتیی کردووە، تا بوو بە فەرماندەی کەرت لە تیپی قەلاتووکان. دوای تەواوبوونی پرسەکەی، مام جەلال ناردی بەدوامدا کە پارە هاتووە بڕۆم بۆ تاران بۆ هێنانی، بەڵام پێی وتم کە باسی شەهیدبوونی شەهید خەلیل بۆ هاوار نەکەم، نەوەک نەشتەرگەرییەکەی چاوی نەکات و بگەڕێتەوە سەرکردایەتی. کە چوومە تاران و هاوارم بینی، یەکەم پرسیار هەواڵی شەهید خەلیلی لێ پرسیم و پێی وتم: "کاک خەلیل چۆنە، بۆ نامەی بۆ نەناردووم؟ ئەی بۆ لە سەردەشتەوە تێلم بۆ ناکات؟" منیش بەناچاری پێم وت کە خەلیل زۆر باشە و بە کەرتەکەیەوە ناردوویانە بۆ دەشتی هەولێر، بۆیە نامەی ئەوم پێ نییە و هەر بۆیەش تەلەفۆنی بۆ نەرکردووی. لە ڕاستیدا لەگەڵ وەڵامدانەوەکەی لە دڵەوە و لە ناخەوە دەکوڵام، بەڵام

ناچار بووم کە هەم درۆی بۆ بکەم و هەم بە ڕووشیدا پێبکەنم. دوای گەڕانەوەم بۆ سەرکردایەتی بە دوو هەفتە، کاک هاوار لە شێنێ لە بارەگاکە پەیدا بوو، زۆر بە ماتی و قورگی نووساوەوە پاش ڕۆژباشکردن، ڕووی کردە من و پێی وتم: "کاکە، تۆ خۆت لە من بە خۆڕاگرتر دەزانی، بۆ پێت نەوتم کاک خەلیل شەهید بووە؟ بۆ لات وایە من نازانم کە هەریەک لە ئێمە لە کات و شوێن و بە هۆکاری جیاجیاوە شەهید دەبین!" پاشان ڕووەو سەرقەبرانەکەی شێنێ لەگەڵ مندا کەوتینە ڕێ و چووینە سەر گڵکۆی شەهید خەلیل و بۆ ساتێک چەند دڵۆپە فرمێسکێک لە چاوەکانی هاتنە خوارەوە و پاشان ماڵئاوایی لێ کرد و گەڕاینەوە بارەگاکەمان. دوای دوو ڕۆژ هاوار پێی وتم کە دەگەڕێتەوە تاران تا سەرکردایەتی نەڵێن ئەو هەموو پارەیەمان تیا خەرج کردووە، کەچی نەشتەرگەرییەکەشی نەکرد.

## یادی هەشت ساڵەی بۆردوومانی قەڵادزە
## ١٩٨٢/٤/٢٤

لە ساڵیادی ئەو بۆردوومانە و بە هاندان و سەرپەرشتیکردنی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و یەکێتی، بڕیار درا کە لە ١٩٨٢/٤/٢٤ یادی هەشتەمین ساڵڕۆژی ئەو بۆردوومانە، جەماوەر هان بدرێ کە سەرەتای یادەکە لە گردی شەهیدەکانی بۆردوومانەکە لە ١٩٧٤/٤/٢٤دا کرابوو؛ شەهید بووبوون، لەو گۆڕستانەوە سەرەتای خۆپیشاندان دەست پێ بکات. شەهید هاوار بەو پێیەی کە لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی قەڵادزەی یەکێتی بوو و حاکم ئیبراهیم حەسەنیش کە ڕابەری سیاسیی تیپەکەی قەڵاتووکان بوو کە شەهید هاوار سەرتیپی بوو، پێکەوە بە هاوکاریی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و یەکێتی لە قەڵادزە کەوتبوونە دارشتنی نەخشە و پلانی خۆپیشاندانەکە و دیاریکردنی درووشمەکان و پاشان داخوازییەکان. شەوی ٢٣ لەسەر ٤/٢٤، حاکم ئیبراهیم و هاوار وتارێکی زۆر هەستبزوێن و وورووژێنەری شۆڕشگێڕانە دەنووسن و شەهید هاوار بەو شەوە دەچێتە قەڵادزە و بە هاوکاریی هەڤاڵەکانی خۆی حەشار دەدا تا بەیانی ڕۆژی خۆپیشاندان و بەیانی لە کاتی دەستپێکردنی خۆپیشاندان. ئەویش لە بڵندگۆی مزگەوتەوە وتارەکە ڕادەگەیەنێ و پاشان تێکەڵ بە خۆپیشاندەران

دەبێ بۆ گوتنەوەی درووشمەکان و هاندانی جەماوەر، دواجار خۆی ون دەکات و دەگەڕێتەوە قەلاتووکان[37]. ئەو خۆپیشاندانەی قەلادزە هەر بە قەلادزەوە نەوەستا، بەڵکە لە ناوچەکەدا تەنییەوە، سەنگەسەر و بەستەسێن و ئۆردووگای توومەسووران و پاشان ڕانیە و چوارقوڕنە و سلێمانییشی گرتەوە. لەو خۆپیشاندانانە چەندین پیاو و ژنی تێکۆشەر شەهید بوون، کار گەیشتە ئەوەی کە هەندێ لە حزبەکانی تریش خەڵکیان بخزێننە ناو خۆپیشاندانەکانەوە. خۆپیشاندان بە جۆرێک قەبە و گەورە بوو، هەم بە ژمارەی خۆپیشاندەران و هەم بە قەبارەی تەنینەوەی بە زۆربەی شار و شارۆچکەکانی کوردستان کە ڕژێمی سەدام مەترسیی گەورەی لێ دەکرد کە ببێتە هۆی ڕاپەڕینی جەماوەریی سەرتاسەری، یەکێتی و کۆمەڵە مەترسیی بەلاڕێدابردنی خۆپیشاندانەکە و درووشمەکانیان لێ نیشت، بۆیە ورده ورده پلانی کشانەوەیان بۆ داڕشتن، نەک زیانەکانی لە سوودەکانی پتر ببێت، لەبەر قورسنەبوون و زۆر قەبەنەبوونی داواکارییەکانی خۆپیشاندانەکان لە ڕژێمی بەعس[38]. داواکان:

١. بەردانی گیراوەکانی خۆپیشاندانەکە.

٢. گەڕانەوەی ڕاگوێزراوەکان بۆ گوند و ناوچەکانی خۆیان و دەستهەڵگرتنی ڕژێم لە ڕاگواستن.

٣. ڕاگرتنی ڕاوەدوونان و تۆقاندنی خۆپیشاندەران.

ڕژێم بەناڕاستەوخۆ هەندێ لەو داواکارییانەی جێبەجێ کرد. ئەو خۆپیشاندانانە هێندە کاریگەر و مێژوویی بوو، کە تا ئەو کاتە بێوێنە بوو کە ناکرێ لە مێژووی یەکێتی و کۆمەڵە و شۆڕشی نوێدا فەرامۆش بکرێت. زیانەکانی ئەو خۆپیشاندانانە پتر لە ٢٥-٣٠ شەهید و ١٥٠ بریندار و نزیکەی ٦٠٠ گیراوی هەبوو.

---

[37] ئەم ڕاستییە لەسەر زاری شەهید عەبدولڕەحیم و شەهید هاوار و حاکم ئیبراهیم باس کراوە و سەرکردایەتیی کۆمەڵەش و یەکێتییش، کاتی خۆی لێی ئاگادار کراوەتەوە.

[38] سەیری ئەم بابەتە بەدرێژی لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" بکە.

## شەهیدبوونی شەهید هاوار
## ١٩٨٢/٧/١٠

هێشتا یەکەم ساڵیادی شەهیدی هەمیشە زیندووم شەهید خەلیلم نەکردبۆوە، دوای کۆستی یەکەمم بە حەوت مانگ و ٢٠ ڕۆژ، کۆستی دووەمیشم بە سەختترین ئازارەوە کەوت. من ڕۆژی ١٩٨٢/٧/١١ تازە گەیشتبوومەوە بارەگاکەی خۆم کە لە "جەولە" سەردانی مەڵبەندەکان بووم، کاک نەوشیروان ناردی بەدوامدا کە نیوەڕۆ بڕۆم لەلای ئەو نان بخۆم. کە چوومە لای لە بارەگاکەی، کۆمەڵێک هاوڕێی تری لێ بوو، وام زانی ئەوانیش بانگهێشت کراون، پاشان کاک "ڕەفعەت مەلا" کەوتە قسەکردن و دڵدانەوەم. یەکسەر دڵم داخورپا و موچڕکێکی بەهێز بە جەستەمدا هات، وتم: "من خۆم زۆر لەو وشە و باسانەم بۆ پێشمەرگە و کەسوکاری پێشمەرگە کردووە لە کاتی شەهیدبوونی ئازیزەکانیان، پێویست بە شێر و ڕێوی ناکات، پێم بڵێن هاوار ئەم جارەش بریندارە یـ شەهید بووە؟" نەوشیروان بێ پێشەکی و یەکسەر وتی: "بەڵێ، دوێنێ لە بەستەسێن تووشی شەڕ بووە لەگەڵ جاشەکانی حەمەی مەلا شەریف، دوای شەڕێکی نیوسەعاتی شەهید بووە و تەرمەکەشی کەوتۆتە دەست ئەوان، چونکە یەک پێشمەرگەی لەگەڵ بووە (عوسمانی برای شێخە کوڵ)، ئەویش پێش دەستپێکردنی تەقە ڕایکردووە." بۆ من ئەو هەواڵە جەرگبڕە سوێیەکی زۆر گەورەی خستە دڵمەوە، هێشتا سالرۆژی ماڵئاوایی شەهید خەلیلی برام نەگیشتبوو، ئەم کۆستەشی هاتە سەر و کۆنە برینەکەی شەهید خەلیلیشی لێ هێنامەوە سوێ. داخی هەرە ئازاربەخشی شەهید هاوار ئەوە بوو کە کەوتبووە دەست دوژمن، پاش ئەوەی بە هەژدە جاش، هەریەکەیان ٣٠ سێ فیشەکیان بەبێگیانی لێ دابوو، بە بەردیش سەریان پان کردبۆوە. من ئەو ڕاستییەم لە دەمی مردووشۆرەکەی مزگەوتی سەنگەسەر و مەلای مزگەوتەکەم وەرگرت و پاشان یەک لە جاشە بەشداربووەکانیش کە گیرا و هێنرایە سەرکردایەتی، دانی بەو تاوانە نامرۆڤایەتییەدا نا.

شەهید هاوار لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٥ بوو، پاش مردنی سێ برای ترمان (ئیسماعیل و سمکۆ و بەختیار) لەدایک بوو، لە باوک و دایکم بیستبوو کە لە کاتی بوونی مندا کێشە لەسەر ناوەکەم لەنێوان باپیرم و ڕەحمەتی عەلی والی بەگدا دروست بووبوو.

ئەوکات عەلی والی بەگ (قۆمیسەر) واتە (مفوض) بەڕێوەبەری مەرگەزی تەینال دەبێ و باوکیشم لەوێ چاخانە و چێشتخانەی دەبێ، بۆیە عەلی والی بەگ (عەلی قامچی ڕەش) ناوی ناوم، باپیرم ویستوویەتی ناوی هاوارم لێ بنێت بە ناوی باوکیەوە، بەڵام بەلای ڕەحمەتی عەلی والی بەگەوە خۆش نەبووە، بۆیە بە ناوی باپیری باپیرمەوە (ئیبراهیم) ناویان ناوم. من ناوی هاوارم زۆر لەلا خۆش و کوردی و مانادار بوو، بۆیە من سوور بووم لەسەر ئەوەی کە ئەم برایەمان من ناوی کوردیی لێ بنێم و ناومان نا هاوار بە ناوی باوکی باپیرمەوە. شەهید هاوار لە شاری ڕانیە هاتە دنیاوە، هەر لە ڕانیەش خوێندنی سەرەتایی تا پۆلی پێنجی سەرەتایی تەواو کرد و پۆلی شەش لەگەڵ پۆلی یەک و دووی ناوەندی لە سلێمانی خوێند و پۆلی سێی ناوەندی دووبارە لە ڕانیە تەواو کرد و پۆلی چوار و پێنجی لە سلێمانی تەواو کرد لە بەشی زانستی. شەهید هاوار لە تەمەنی سەرەتای لاویدا کەوتە ناو جیهانی سیاسەتەوە، لە ساڵی ١٩٧٣ پەیوەندیی بە ڕێکخستنەکانی خوێندکارانەوە کرد، هەر لەو ساڵەشدا لە ڕێگەی منەوە پەیوەندیی بە ڕیزەکانی کۆمەڵەوە کرد. لە دەستپێکردنەوەی شەڕی ١٩٧٤، ڕۆیشتە ناو شۆڕش و لە شۆڕشدا خولی فێربوونی چەکە قورسەکانی وەک تۆپ و هاوەن بینی و چووە بەشی تۆپخانە. لەپاش ئاشبەتاڵ، شەهید هاوار و ڕزگاری براشم لە ڕانیە نەمان و لەگەڵ ماڵی باوکم لە ١٩٧٦ بەحەشاردراوی برانە سلێمانی و لە ماڵی هاوڕێیەکی کۆمەڵە و هاوڕێیەکی دێرینی خۆم حەشار دران، ماڵی "وەستا برایم مەجید"، ناسراو بە وەستا برایمی گوڵبەهار.

حەشاردرانەکەیان بە هۆی ڕۆیشتنی شەهید خەلیل بوو بۆ شاخ و پێکهێنانی یەکەم مەفرەزەی سەرەتایی شۆڕشی نوێ لە حەوزی گەڵاڵە و باڵەکایەتی لەگەڵ سەرکردە و تێکۆشەری دێرین؛ قادر خەبات لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٦، کە بە هۆیەوە باوکم لە ڕانیە لەلایەن چەتەکانی ئاسایشی ڕانیەوە گیرا و بڕیاری گرتن و دوورخستنەوەی سەرجەم خێزانەکەمان دەرچوو، بۆیە برانە سلێمانی و حەشار دران. شەهید هاوار لە سلێمانی ویستی پۆلی شەشی دواناوەندی تەواو بکات، بەڵام پاش سێ مانگ خوێندن ئاشکرا بوو، ئاسایش چوون بۆ گرتنی، توانیی ڕابکات و پاش دوو سێ ڕۆژ، لە ڕۆژی ١٩٧٧/٢/٢٢ لە ڕێگەی دۆڵەڕووتەوە دەچێتە دەرەوە و لە شاربازێڕ پەیوەندی

بە مەفرەزەکانی شۆڕشی نوێوە دەکات. پاش دوو هەفتە، ڕێگەی قەندیل دەگرێتە بەر تا دەگاتەوە بە شەهید خەلیل. لە سالانی ۱۹۷۷ و ۱۹۷۸ وەک کادری کۆمەڵە و لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە قەڵادزە و ڕانیە و سەنگەسەر کار دەکات، پاشان لەلایەن "م. س"ی یەکێتییەوە دەکرێتە لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی قەڵادزە، لە ڕووی ئەرکی پێشمەرگانەشەوە دەکرێتە فەرماندەی مەفرەزە و پاشان لە ۱۹۷۸ دەکرێتە فەرماندەی کەرت لە هەرێمی ڕزگاری. شەهید هاوار لەگەڵ شەهید خەلیلی برا گەورەی جگە لە ئەرکی پێشمەرگایەتیی خۆیان، ئەرکی دروستکردنی پردی پەیوەندیی نێوان سەرکردایەتی و ڕێکخستنەکانی ناوخۆیی لە قەڵادزەوە تا سلێمانی دەگرنە ئەستۆ و هێڵێکی پەیوەندیی نهێنی و مسۆگەر دروست دەکەن لە ڕێگەی بەستەسێن (خوشکە ئایشێ) و لە سوڵتانەدێ کاک خدر و لە ڕانیە (سەیید ئەحمەد و خاڵم؛ حەمەی مەجید هاوار) تا سلێمانی (بەندە).

شەهید هاوار کادرێکی وشیار و پێشمەرگەیەکی ئازا و لەخۆبورد و بەهەڵوێست بوو، هەر کارێک و بۆ هەر ناوچەیەکیان پێ بسپێرایە و بنێردرایە، جێبەجێی دەکرد. ماوەیەک لە سنووری ڕانیە و باڵەکایەتی و سنووری مەڵبەندی ۳ کاری کردووە و وەک کادری سیاسی و ماوەیەکیش لە دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی. لە مانگی ۱۹۷۹/۳ وەک کادری سیاسی نێردرا بۆ سنووری لقی کەرکووک و گەرمیان، پاشان برایەوە سەرکردایەتی و کرا بە سەرتیپی تیپی قەڵاتووکان، کە پاش شەهیدبوونی؛ شەهید عەبدولڕەحیم بوو بە سەرتیپی ئەو تیپە.

## کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە و هۆڵی شەهید شەهاب

۱. کۆمەڵە لەپاش دەستپێکردنی شەڕی ئێران-عێراق و شاڵاوی بەکۆمەڵگرتن و ڕەشبگیرکردنی گەنجان و بەتەمەنەکانیش و بردنیان بۆ بەرەکانی شەڕ و ڕاکردنی دانیشتووانی شارەکان بۆ ناوچە ئازادەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش، فراوانبوون و هەڵاوسانێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی لە ڕووی چەندایەتییەوە.

۲. بۆ ئەوەی کۆمەڵە بتوانێ ئەو هەڵاوسانە سنووردار بکات و لە ڕووی چۆنایەتییشەوە پەرەی پێ بدا، وەرزنامەی کۆمەڵە کەوتە بڵاوکردنەوەی زنجیرە

وتارێکی زۆر بەپێز و تیۆریی بابەتی ڕۆژ.

سەرکردایەتیی ڕێکخستنی ناوخۆ لە شارەکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکووکدا ڕۆڵی زۆر گرنگیان گێڕا لە ئامادەکردنی کەسانی وشیار و سیاسی و ناردنیان بۆ دەرەوە بۆ ناو شۆڕش و بوونیان بە کادر و ئەندام ڕێکخراو ناوچە و فەرماندەی مەفرەزە و کادری کۆمەڵایەتی. ئەمانە و چەندین هۆکاری تر وای لە ناوەندی کۆمەڵە کرد کە بیر لە دروستکردنی هۆڵێکی گەورەی وشیاری بکاتەوە بە ناوی هۆڵی شەهید شەهاب، ئەو هۆڵە بووە سەرەتای دەستپێکردنی کردنەوەی قوتابخانەیەکی وشیاری کە بەردەوام سمینار و خولی ڕۆشنبیریی تیا دەکرایەوە.

- بە هۆی ئەو قەبەبوونەی کۆمەڵە لەناو یەکێتی و قورسبوونی ئەرکەکانی لە ڕووی بەڕێوەبردن و بەکاربردن و پەروەردەکردنی ئەو لەشکرە زۆرەی ئەندامان لە دەرەوە.

- بە هۆی پەرەسەندنی ناکۆکی و ململانێکانی نێوان کوردستانی و عێراقچێتیی ناو کۆمەڵە لە سەرکردایەتییەوە تا شانەکانی کەرتەکانی ڕێکخستن.

- یەکلاییکردنەوەی کێشەی دروستکردنی "پارتی پێشڕەوی کرێکارانی کوردستان" کە بە نامیلکەیەک لە ١٩٨١/١٢/١دا دەرچوو، بووە هۆی مشتومڕێکی زۆر لەسەری، هەم بە نووسین و هەم بە چەلەحانێ لەناو ئەندامناندا کە لە دژی ئەو نامیلکەیە لە ١٩٨٢/٢/٥دا نامیلکەیەک بە ناوی "چەند سەرنجێکی ڕەخنەگرانە دەربارەی نووسینی پارتی پێشڕەوی کرێکارانی کوردستان" دەرچوو، دیسان لەلایەن ڕێکخستنی شارەوە لە سلێمانی نامیلکەیەک بە ناوی "لێدوانێک لەسەر نامیلکەی چەند سەرنجێکی ڕەخنەگرانە" بڵاو کرایەوە، بۆ چارەسەری ئەم کێشە گەورەیەش.

- بۆ دانی جۆرێک لە ئۆتۆنۆمیی کارکردن لە ڕێکخستنە دوورەدەستەکانی سەرکردایەتی لە ڕووی ڕێکخراوەیی و کاری پێشمەرگانەوە و دابەشبوونی ئەندامانی سەرکردایەتی بەسەر سنووری شارەکانی هەولێر و کەرکووک و سلێمانی و بادیناندا.

- بۆ چارەسەری کۆمەڵێ کێشە و بابەتی تری ڕێکخراوەیی و پێشمەرگانە، سەرکردایەتی بە پێویستی زانی کە کار بۆ گرتنی کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە بکرێ.

کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە لە مانگی ١٩٨٢/٨ بە بەشداریی ٢٢٢ ئەندام گیرا،

کە نوێنەری ڕێکخستنەکانی دەرەوە و شارەکانیش بەشدار بوون. لەو کۆنفرانسەدا کۆمەڵێ بابەتی سیاسی و فکری و پێشمەرگانە باس کران و مشتومڕی زۆری لەسەر کرا، کۆنفرانس لە هۆڵی شەهید شەهاب لە خڕی نێوزەنگ گیرا.

## بەرهەمە هەرە گرنگەکانی کۆنفرانس:

١. یەکلاییکردنەوەی کێشەی کوردستانی و عێراقچێتی بۆ دیاریکردنی ڕەوتی هزری و سیاسیی کۆمەڵە بەکوردستانیەتی کۆمەڵە.

٢. لەدایکبوونی مەڵبەندەکان و دابەشکردنی ئەندامانی سەرکردایەتی لە هەرسی باڵەکە بەسەر مەڵبەندەکاندا کە لەسەر بنچینەی شارەکانی هەولێر و کەرکووک و سلێمانی و بادینان و باڵەکایەتی دامەزران و کران بە چوار مەڵبەندەوە، مەڵبەندی سێ: باڵەکایەتی و وەرتێ، مەڵبەندی چوار: هەولێر، مەڵبەندی ٢: کەرکووک و مەڵبەندی یەک: سلێمانی.

٣. دانانی بەرنامەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی کە خۆی لە "ئازادییە دیموکراتییەکان. گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان"دا دەنواند.

٤. دانانی بەرنامەی چارەسەری کێشەی نەتەوایەتی.

٥. دانانی بەرنامەی ئاشتبوونەوەی گشتی، بۆ هەنگاونان بەرەو لایەنەکانی تری وەک پارتی، حسک، پاسۆک، شیوعی.

٦. دوا بەشی کۆنفڕاس تەرخان کرا بۆ هەڵبژاردنی سەرکردایەتی و ناوەندی کۆمەڵە.

بەندە بەشدار بووم لەو لیژنەیەی کە بۆ داڕشتنی پڕۆژەی پەیڕەوی ناوخۆ دیاری کرابوون.

## کێشەی چەرمەگا و لیژنەی لێکۆڵینەوە

ڕێککەوتنی پشتئاشان لەنێوان یەکێتی و پارتی و بە ناوبژیی حزبی شیوعی هێشتا نەکەوتبووە گروگاڵ، کێشەیەکی گەورە لەنێوان پێشمەرگەی یەکێتی و پارتی لە سنووری چەرمەگا ڕووی دا، مام جەلال ئەو کاتە لە "ساوێن" بوو بۆ سەرپەرشتیی

هێزی یەکێتی کە بۆ پشتیوانیی هێزەکانی حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی زەحمەتکێشان چووبوون بۆ بەرگری لە ناوچە ئازادکراوەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە هێرش و پەلاماری سوپای پاسداران و ئەرتەشی کۆماری ئیسلامیی ئێران، ناردی بەدوامدا، کە چووم سەرەتای مانگی ١٩٨٢/١١ بوو، پێی ڕاگەیاندم کە وەک نوێنەری یەکێتی بڕۆمە شارباژێڕ و لەوێ پێشمەرگە چەندی بمەوێ لە کاک بەکری حاجی سەفەر وەرگرم و لەگەڵ نوێنەرانی پارتی (نادر هەورامی، یادگار برازای فەتاح ئاغا، مامۆستا قادر (قالە ڕەش)) یەک بگرینەوە و وەک لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی هاوبەشی یەکێتی و پارتی؛ بکەوینە لێکۆڵینەوەیەکی (مەیدانی) لە ڕووداوە خوێناوییەکەی نێوان پێشمەرگەکانی پارتی و یەکێتی لەنزیک گوندی چەرمەگا. مام جەلال دەسەڵاتی چەککردن و دەرکردن و زیندانیکردنی پێشمەرگەکانی یەکێتیی دامێ، ئەگەر خەتابار و هێرشبەربوون بێ هۆکار.

کاک بەکر لە شارباژێڕ لە گوندی چنگیان تەنها دوو پێشمەرگەی دامێ لەگەڵما بن، بە بیانووی ئەوەی پێشمەرگەکانی مەڵبەندەکە براون بۆ ڕۆژهەڵات وەک هێزی پشتیوان. هەر لە چنگیان، لەگەڵ نالە هەورامی و یادگار و قالە ڕەش یەکمان بینی و ڕێک کەوتین لەسەر ئەوەی کە ١٩٨٢/١١/٧ لە گوندی قزلەر یەک بگرینەوە و لێکۆڵینەوەکەمان دەست پێ بکەین، من ئەو کاتەم دیاری کرد بە مەبەستی ئەوەی لەو چەند ڕۆژەدا هەندێ لەو پێشمەرگانەی کە لە پشوودا بوون و بە ناوچەکەدا بڵاو بووبوونەوە؛ بتوانم کۆیان بکەمەوە، تا ئەو کاتەش خۆم لە بروبیانووی پارتییەکان بپارێزم. لە هەموو شارباژێڕدا تەنیا کەرتەکەی شەهید "جەلال محەممەد" ناسراو بە جەلالی حەمەی محەممەد مابوو، ئەوانیش بڵاو بووبوونەوە، وەڵامم بۆ شەهید جەلال نارد، لە ڕاستیدا لە ماوەی سێ ڕۆژدا هەموو ئەو پێشمەرگانەی لە ناوچەکە مابوون؛ کۆی کردنەوە و پێکەوە بەرەو قزلەر ڕۆیشتین. لە ١٩٨٢/١١/٥ من گەیشتمە قزلەر. هەوڵم دا ئەو پێشمەرگە بریندارەی ئەوان بدۆزمەوە کە لەو شەڕەدا بریندار بووبوو، لە گوندی قزلەر خۆی حەشار دابوو. پێشمەرگەکەم دۆزییەوە و لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا کرد بۆ زانینی ڕاستیی ڕووداوەکە. پێشمەرگەکە لە پێشدا خۆی نەدا بەدەستەوە و دەترسا، بەڵام پاش ئەوەی قەولی سەلامەتیم پێ دا، داوای کرد نەشیدەینەوە بە

پارتییەکان، چونکە دەیەوێ لە ناوچەکە خۆی حەشار دا و نەگەڕێتەوە لای پارتی، قەولی ئەوەشم پێ دا کە بیپارێزین و بیشارینەوە تا لێکۆڵینەوە تەواو دەبێ و پارتی لە ناوچەکە دەڕۆن. پێشمەرگە بریندارەکە بەم جۆرە گێڕایەوە و منیش لای خۆم لەسەر کاسێتێک تەواوی لێدوانەکەیم تۆمار کرد، وتی مەفرەزەیەکی ئێمە لەگەڵ مەفرەزەیەکی یەکێتی لە چەرمەگا، بڕیارمان دا کە پێکەوە شەو بچینە سلێمانی و چالاکییەکی هاوبەش ئەنجام دەین. شەو لە ڕێگا فەرماندەی مەفرەزەکەی ئێمە (واتە پارتی) پێی گوتین ئێمە لە دوو سەیارەدا دەبین بە جیاجیا لەگەڵ ئەوان تێکەڵ نابین، سەیارەکەمان دەخەینە دوای سەیارەکەی مەفرەزەکەی یەکێتییەوە لە دواوە دەیاندەینە بەر دەسترێژیی گوللە، دەیانکوژین و چەکەکانیان دەبەین و دەڕۆین ناوچەکە چۆڵ دەکەین، لەسەر جادەی تاسڵوجە خۆیان ڕادەستی حکومەت دەکەنەوە. وتی "بەپێی ئەو پیلانە کە لەسەر جادەی چەرمەگا کەوتینە ڕێ، ئێمە لە دواوە بووین، مەفرەزەکەی یەکێتیمان دایە بەر دەسترێژیی گوللە، چوار لە پێشمەرگەکانی یەکێتی کە لە دواوەی سەیارەکەیان دانیشتبوون؛ پێکران و شەهید بوون، پێشمەرگەکانی تری ناو سەیارەکە بە خێراییەکەی زۆر خێرا دابەزین و دامەزران و دایانینە بەر ڕێژنەی گوللە کە ئەنجام حەوت لەوانەی ئێمەش کوژران و منیش بریندار بووم و خۆم کرد بە مردوو، تا پێشمەرگەکانی یەکێتی تەرمی شەهیدەکانی خۆیان و چەکەکانی ئێمەشیان برد و ڕۆیشتن. دوای ئەوان بەبریندارى خۆم گەیاندە بناری زیوێ و پاشان بە هاوکاریی کەسانی ناوچەکە گەیشتومە قزلەر و لەوێ خۆم شاردەوە. وتی من هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ ئەو مەفرەزەی خۆمان بەنیازی ئەوە هاتوومەتەوە و زۆر بێزار بووم لە ژیانی ئاوارەیی لە ئێران، ئەم ڕێککەوتنەی یەکێتی و پارتیم بە هەل زانی لەم جەولەیە بگەمە نزیک سلێمانی و کەسوکارم ببینم و کە زیاتر لە ٢ ساڵە نەمدیون و پاشان خۆم ڕادەستی یەکێتی دەکەم و نامەوێ جارێکی تر لەناو پارتی بم. لە ڕۆژی ١٩٨٢/١١/٧ هێزەکەی پارتی گەیشتن کە نزیک بە ٢٠٠ کەس دەبوون، ئێمەش کاک جەلال نزیکەی ٥٠ پێشمەرگەیەکی کۆ کردبۆوە. لە قزلەر بە برادەرانی پارتیم وت کە دوو ڕێگە هەیە بۆ لێکۆڵینەوە:

١. یان مەفرەزەیەکی ئـەوان و مەفرەزەیەکی ئێمە لەگەڵ بەندە و یـەک لە بەرپرسەکانیان، جا نـادر هەورامی یان یادگار یا قـالـەڕەش، بڕۆینە چەرمەگا و لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی بکەین لەگەڵ مەلای مزگەوتەکە کە ئاگاداری شتن و ناشتنی تەرمی شەهیدەکانی هەردوو لا بووە، لەگەڵ چەند کەسێکی خەڵکی دێکە کە ئاگاداری ڕووداوەکە بوون، پاشان بانگکردنی ئەو پێشمەرگانەی یەکێتی کە ماون و بەشدار بوون لەو شەڕە؛ بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵیان.

٢. یان بانگکردنی مەلای چەرمەگا و ئەو کەسانەی کە ئاگایان لە ڕووداوەکە بووە، لەگەڵ بانگکردنی پێشمەرگەکانی یەکێتی کە لەو شەڕەدا بوون.

برادەرانی پارتی ئامادەی چوون بۆ چەرمەگا و لێکۆڵینەوەی مەیدانی نەبوون، بۆیە ناردمان بەدوای مامۆستاکەی چەرمەگا و ئەو دوو پیاوەش کە ئەو ئێوارەیە پێشمەرگەکان لەماڵیان بوون و ئەو پێشمەرگانەی یەکێتییش لە شەڕەکەدا بوون و مـاون. مەلا لەبەردەم لیژنەکەمان سوێندی خـوارد کە چی دەزانێ، دەیڵێ. وتی من کە بەشداریی شتنی پێشمەرگە شەهیدەکانی یەکێتیم کـردووە، هەرچواریان لە پشتەوە پێکرابوون و شەهیدەکانی پارتییش هەموویان لە پێشەوە پێکرابوون، دەشتوانن بێن گۆڕەکانیان هەڵدەنەوە بۆ زانینی ڕاستییەکە. هەردوو کەسایەتییەکە کە خەڵکی چەرماگاش ئەو ئێوارەیە هـەردوو فەرماندەی مەفرەزەکان لە ماڵیان بوون، سوێندیان خـوارد  کە دەستپێشکەری تەقەکەرەکان؛ پارتی بـوون، گەرچی ناله هەورامی و فایەقە ڕەش و یادگار ملیان بۆ ڕاستییەکان نـەدەدا، بەڵام چونکە ئامادەی لێکۆڵینەوەی مەیدانییش نەبوون، کەمێ بەشەرمەوە دەیانسەلماند کە هەڵەکە و تاوانەکە لە مەفرەزەکەی خۆیانەوە بووە. من بۆ ئەوەی بەیانێکی هاوبەش و بە واژۆی هەردوولامان بنووسین و ئەوان هیچ بیانوویەکیان نەمێنێ، ناردم پێشمەرگە بریندارەکەشیان هێنا و لەبەردەمی لیژنەکە هەموو ئەو ڕاستییانەی وت کە تەسجیلم کردبوو، پێشمەرگەکە هەر لەو دانیشتنە داوای کرد کە چیتر لەگەڵ پارتی نابێ و دەبێتە پێشمەرگەی یەکێتی.

هەر ئەو ڕۆژە بەیانێکمان پێکەوە نووسی، کە سەرئەنجامی لێکۆڵینەوە دەرکەوت کە دەستپێشکەری تاوانەکە لە برادەرانی پارتییەوە بووە، بۆیە بڕیارمان دا کە:

١. هیچ کام لە پێشمەرگەکانی یەکێتی کە لەو شەڕەدا بوون، سزا نادرێن.

٢. چەکەکانی ئەو مەفرەزەیەی پارتی کە لە کوژراوەکانیان بەجێ ماوە و کەوتۆتە دەست پێشمەرگەکانی یەکێتی، بدرێتەوە بە پارتی.

٣. ئەو پێشمەرگە بریندارەش سەلامەتیی پارێزراو بێ و ئازاد بێ لە هەڵبژاردنی هەر لایەک کە کاری تیا بکا.

٤. ئەم بەیانە لە ئێزگەی پارتی و یەکێتی بخوێنرێتەوە.

٥. ئەو هێزەی پارتی کە بە مەبەستی ئەو ئەرکە هاتوونەتە ناوچەکە، بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان.

لەلایەن پارتییەوە نادر هەورامی و یادگار واژۆیان کرد و لەلایەن یەکێتییشەوە بەندە. ئێمە ناردمان بە برووسکە بۆ ئێزگەی یەکێتی. ڕۆژی دوای ئەمە بڕیارێکمان لە سەرکردایەتییەوە بۆ هات کە ئاگاداریی پارتی بکەین هەموو هێزەکە بکشێنەوە و ناوچەکانی خۆیان لەودیوی سنوور، واتە بەشی ڕۆژهەڵات و ئەو ناوچانەی یەکێتی چۆڵ بکەن، لەبەر ئەوەی پارتی ڕێککەوتنەکەی پشتئاشانی شکاندووە و ڕێگە نادات هێزی یەکێتی بچێتە بادینان. دوای دوو ڕۆژ، لە خەڵکی ناوچەکەوە هەواڵمان بۆ هات کە هێزەکەی پارتی نیازی مانەوەیان هەیە و بە شەڕیش ناوچەکە چۆڵ ناکەن، بەڵام لە ١٩٨٢/١١/١٥ عەلی بچکۆل و دەستەی مەڵبەندی ٢ لەگەڵ هێزەکەی مەڵبەنددا گەیشتنە بەرگەڵوو و مالوومە و نامەیەکی سەرکردایەتییشیان بۆ من هێنابوو کە بگەڕێمەوە سەرکردایەتی، لەبەر ئەوەی بە ئەندامی مەڵبەندی ٣ دانرابووم. هێزەکەی پارتییشیان ئاگادار کرد لە نزیکترین کاتدا بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان. لە گەڕانەوەیان بەرەو شاربازێڕ، لەگەڵ مەڵبەندی ١ بە لێپرسراوێتیی مەلا بەختیار تووشی پێکهەڵپرژان بووبوون کە ئەوەش بووە سەرەتای شەڕێکی سەرتاسەریی نێوان پارتی و یەکێتی.

## لەدایکبوونی یەکێتیی شۆڕشگێڕان

لەو کاتەی کە کۆمەڵە سەرقاڵی کۆنفرانسی دوو بوو، بزووتنەوە دروستکراوەکە و هێڵی گشتییش لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی خۆیاندا کە ناویان نا کۆنفرانسی یەکگرتن؛ یەکیان گرت و ناویان نا "یەکێتیی شۆڕشگێڕان". ئەم یەکگرتنە لەسەر داخوازیی

مام جەلال بوو بۆ ڕاگرتنی تەرازووی هێزەکانی ناو یەکێتی کە کۆمەڵە و بزووتنەوە و هێڵی گشتی بوون، بۆ ئەوەی ئەو هێزە لەبەرانبەر کۆمەڵەدا قوت بکرێتەوە کە بە قەبارەش زل و بە تواناش هاوتای کۆمەڵەی پێ بکات. مام جەلال گرنگییەکی زۆری بەو کۆنفرانسە دا تا ڕادەی بەشداریکردنی لە هەڵبژاردنی سەرکردایەتی و پەسەندکردنی بوونی بە سکرتێری ئەو حزبە نوێیە. کۆمەڵە لە لایەکەوە زۆری پێ خۆش بوو، چونکە لانی کەم لە هەوێسارییەکی سێبەگایی ڕزگاری دەبوو و لایەنەکانی ناو یەکێتی لە سیانەوە دەبوویە دووان، بەڵام لە لایەکی ترەوە کۆمەڵە بە پەسەندی نەدەزانی کە مام جەلال هەم سکرتێری گشتی و هەم سکرتێری شۆڕشگێڕانیش بێت، بۆیە کۆمەڵە بە نامەیەک ئاگاداری مام جەلالی کرد کە یان دەبێ سکرتێری شۆڕشگێڕان بێ یا سکرتێری گشتی، وە ئەگەر بە سکرتێری شۆڕشگێڕان بمێنێتەوە، دەبێ یەکێتی کۆنگرە بگرێ و سکرتێری گشتی هەڵبژێرێ یان سکرتێری گشتی بە خول بێ، واتە شەش مانگ سکرتێری شۆڕشگێڕان؛ سکرتێری گشتی بێ و شەش مانگیش سکرتێری کۆمەڵە لە سکرتێری گشتی بێ، یان دەبێ مام جەلال واز لە سکرتێریی شۆڕشگێڕان بهێنێ. دیار بوو مام جەلال ئەمەی دوایی پێ باش بوو، بۆیە وازی لە سکرتێریی شۆڕشگێڕان هێنا و د. فوئاد مەعسوم بوویە سکرتێر.

## شەڕی یەکەمی قرناقاو و پشتئاشان
## قوتابخانەکەی خانەقا و بەکلاوپێوان

ڕۆژی ۱۹۸۳/٥/۳ نیوەڕۆ بوو لەناو ژووری قوتابخانەی گوندی "خانەقا"، نەوشیروان و خاڵە سەیید مەجید و بەندە لەگەڵ (مامۆستا کەریم ئەحمەد و مەلا ئەحمەدی بانی خێڵانی و قادر ڕەشید ناسراو و بە قالەی ئایشێ) کە هەرسێکیان سکرتێر و ئەندامانی "م. س"ی حزبی شیوعی بوون لە شەڕدا بەدیل گیرابوون؛ دانیشتنێکمان کرد، لەو دانیشتنەدا کەریم ئەحمەد گلەیی کرد کە بۆ شەڕمان لەگەڵ کردن، نەوشیروان مستەفا وەڵامی دایەوە و گوتی: "سێ نامەمان بۆ ناردوون، دووانیان بە برووسکە و نامەی سێیەم بەدەستی لەلایەن برایمەوە بۆتان نێردراوە، لە هەرسێ نامەکەدا بۆمان نووسیبوون کە شەڕی ئێمە لەگەڵ حزبی شیوعی نییە،

تکایە خۆتان لە شەڕ بپارێزن و شەڕمان لەگەڵ مەکەن، کە ناشتوانن لە ناوبژیکردندا سەرکەوتوو بن، ئێمە هەرگیز شەڕمان ناوێ لەگەڵ هیچ لایەکدا ئەگەر شەڕمان پێ نەفرۆشن. ئێوە وەڵامی نامەکانتان نەداینەوە، بەپێچەوانەوە ئێوە هەر لە گردی ڕەمکان و قەڵاتووکانەوە ئێمەتان دایە بەر هاوەن و لە قەرناقە و پشتئاشانیش لە هەموو هێزەکانی تر بەرهەڵستیتان زیاتر کردین، ئێمەتان ناچار کرد کە ئاوا ئێمەش بەرگری لە خۆمان بکەین، بینیتان بنکردایەتی و سەرکردایەتیتانمان تێک شکاند." کەریم ئەحمەد نکوڵیی لە نامەکان کرد و وتی پێمان نەگەیشتووە، منیش پێم وتن کە خۆم دوا نامەم بۆ ناردوون و تەتەرەکەش گەڕایەوە، بەڵام دڵنیای کردم کە نامەکەی داوە بە مەلا ئەحمەدی بانی خێڵانی، ئەوسا مەلا ئەحمەد دانی بە هەرسێ نامەکەدا نا کە هەرسێ نامەکەی پێش دەستپێکردنی شەڕەکە وەرگرتووە، بەڵام پیشانی کەسی لە سەرانی حزبی شیوعیی نەداوە، چونکە خۆی سوور بووە لەگەڵ پارتی و حسکدا کە لە یەکێتی بدەن. کەریم ئەحمەد زۆر دڵتەنگ بوو، بەهێواشی وتی: "ئاخر بۆیە وامان بەسەر هات، چونکە کەستان... بە کڵاوی من نەپێوا."

## چیمان دوورییەوە لەو شەڕە براکوژییانە..

"حاجی قادری کۆیی" درروودی کورد و کوردستانی لەسەر بێ، دەفەرمووێ:

کوردی ئێمە نەزان و پاشەکەوتن
هەموو پێکەوە پووش و ئاگر و نەوتن
بێ ئەگەر پێکەوە دەستی یەکتری بگرن
وەک ئەسکەندەر هەموو جیهان دەگرن

سەدان ساڵە کورد بە دەردی ئەو دوو نیوەدێڕە هەڵبەستەی ئەو فەیلەسووفە چووە و هەرگیز ئەو ڕووڕەشییەمان لە خۆمان دانەماڵیوە، هەتا ئەو ڕووڕەشییە لە ڕووی خۆمان وەک کورد دانەماڵین، لە مەحاڵیش مەحاڵترە ببینە خاوەنی یەک شار و یەک گوندیش بێ کێشە و سەرئێشە و خۆخۆری.

بەرهەمەکانی ئەو شەڕە نەگریسەش ئەمانە بوون:

١. شەهیدبوونی پتر لە (١٩٠) پێشمەرگەی پیاو و ژن کە ٤٠ پێشمەرگەیان هیی یەکێتی و ١٥٠ پێشمەرگە هیی لایەنەکانی بەرەی جود بوون کە پشکی شێر بەر حزبی شیوعی کەوتبوو لە پیاو و ژن.

٢. بریندار‌بوونی پتر لە ٢٠٠ پێشمەرگەی هەموو لایەک.

٣. ساردبوونەوە و دڵڕەشبوون و خۆبەدەستەوەدانی پتر لە ٤٠٠ پێشمەرگە بە ڕژێمی عێراقی لە هەموو لایەنەکان و بەشی هەرە زۆری پێشمەرگەکانی بەرەی جود بوون.

٤. پتر لە شەش مانگ کات بە شەڕی ناوخۆ و براکوژی بەفیڕۆ چوو، کە لەو کاتە ڕژێمی عێراقی بە هۆی شەڕی ئێرانەوە سەرقاڵ بوو، دەتوانرا بە هەموو لایەنەکان گورزی زۆر کوشندە لە ڕژێم بدەن، ئەو هەموو فیشەک و زەخیرە سەربازییەی لە لێدانی یەکتر یا خەرج کرا، لە لێدانی دوژمندا خەرج بکرایە؛ دوژمنی ناچار بە پاشەکشە و تەنانەت ڕێککەوتنیش دەکرد.

من ئەو کاتە بەرپرسی بەشی دارایی مەڵبەندی ٣ بووم کە بارەگامان لە وەرتێ بوو، چاودێری و بەڕێوەبردنی گیراوەکانی حزبی شیوعیم دەکرد کە ژمارەیان ٤٧ کەس بوون، لەوانە پێنجیان ژن بوون و گیراوەکانی حسک (٧) کەس بوون لەناو مزگەوتی گەورەی وەرتێدا جێمان کردبوونەوە، کە پێخەفیان و خواردنیان وەک پێشمەرگەکانی خۆمان بوو، (٥) ڕادیۆم بۆ دابین کردبوون، هەر کتێبێکیش کە لە کتێبخانەکەی مەڵبەند هەبوو؛ بەپێی خواستی ئەوان دەماندانێ، بڵاوکراوەکانی ڕۆژانەی هەموو لایەنەکایشم بۆ دەناردن، ڕۆژانەش جگەرەکێشەکان پاکەتە جگەرەیان دەدرایە و ڕۆژانە سەردانم دەکردن بۆ زانینی کەموکورییەکان و چارەسەرکردنیان. هەرسێ سەرکردەکەی حزبی شیوعی: کەریم ئەحمەد و مەلا ئەحمەد و قادر ڕەشید دوای بەسەرچوونی دوو ڕۆژ بەسەر گرتنەکانیاندا کە وەک میوان لە بارەگای مەڵبەند لامان بوون، لەسەر داوای مام جەلال نێردران بۆ سەرکردایەتی. پاش گەیشتنیان بە بەشداری و ڕەزامەندیی هەردوو لا، یەکێتی و شیوعی ڕێککەوتننامەیەکیان واژۆ کرد[٣٩]. بەپێی ئەو ڕێککەوتننامەیە، بڕیار درا هەموو گیراوەکان ئازاد بکرێن، مەڵبەندیش هەموویانی ئازاد کرد و وڵاخیشمان بۆ ئەوانە گرت کە نەیاندەتوانی بەپێی بگەنەوە بنکەکانی خۆیان لە بادینان و بۆ هەر یەکێکیشیان

٣٩ درێژیەکەی لە "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"دا بخوێنەوە.

١٠ دینارمان دانێ بۆ ڕێگایان.

## دانانی بارەگا لە دۆڵی ئاکۆیەتی

دوای تەواوبوونی شەڕەکانی یەکەمی بەرەی جود، نەوشیروان بە مەزاجی خۆی بڕیاری گۆڕینی سەرجەم ئەندامانی مەڵبەندی ٣ی دەرکرد، لەگەڵ ئەو هەموو سەرکەوتنانەی کە مەڵبەندی ٣ لەو شەڕە بەدەستی هێنابوو. منیش خۆم و ئەو مەفرەزە پێشمەرگەیەی کە پێکەوە بووین، چووینە دۆڵی شاوری گوندی "دارەبەن". پێشمەرگەکان لەلای کەرتی ڕێکخستنی کۆمەڵەی ڕانیە بوونە میوان و منیش لای "ئەرسەلان کاک هەمزە"، وە لەسەر کانییەک چادرێکم داکوتا تا مانگی ١٩٨٣/١٠ و پاشان گەورێکی چۆڵکراوم پاک کردەوە و بە نایلۆن لەناو گەوڕەکەدا ژوورێک و هەیوانێکم تیا دروست کرد. لە شەڕی دووهەمی بەرەی جوددا سەردانی نەوشیروانم کرد، داوام لێ کرد کە ئامادەم هەر کارێکم پێ بسپێردرێ، بەڵام دیار بوو بەدڵی نەبوو، دیسان گەڕامەوە دۆڵی. بە هەلم زانی لەو ماوەیەدا کە بە ڕۆژ لە قەلەندەرخانەکەمدا بەسەرم دەبرد، تەنیا شەوانە و کاتی نانخواردن دەچووم بۆ کەرتی ڕێکخستن؛ دەست بکەم بە نووسین، لەو ماوەیەدا توانیم پاکنووسی کتێبی "فەرهەنگی سیاسی" بکەم کە لە ١٩٨٤/٤/١ چاپ کرا و بڵاو کرایەوە بە تیراژی ٥٠٠ دانە لە چاپخانەی کۆمەڵە، دواجاریش چاپی دووەمیش بە تیراژی ٢٠٠٠ دانە بڵاو کرایەوە.

لە ١٩٨٣/٩/٥ لەگەڵ پێشمەرگەکانی مەفرەزەکە کە زۆربەیان خەڵکی سلیمانی بوون و ئارەزوویان بوو کەسوکاریان ببینن، بڕیارمان دا کە بەرەو مەڵبەندی ٢ بڕۆین، بەشکم لەوێش کەسوکاریان ببینن. ئێمە نزیکەی ١٥ ڕۆژ لە گوندەکانی قزلەر و گاپیلۆن و سەرگەڵووماینەوە، هەموو کەسوکار هاتن بۆ لایان، گەڕاینەوە گوندی هەنجیرە لە بەری مەرگە، لەوێ هەواڵی بێتواتەمان زانی، زانیمان کە یەکێتی لە مۆڵگەی جاشەکانی ئەنوەر بەگی بێتواتەی داوە[٤٠].

گەڕاینەوە "دارەبەن"، لەو شەڕە یەکێتی سەرکەوتنی زۆر مەزنی بەدەست هێنا. بەڵام سەرەتای ڕەفتاری زۆر نەشیاویشی تێدا ڕووی دا لە دزی و گەندەڵی و

---

[٤٠] زۆر بەدرێژی و بەوردی سەبارەت بەم بابەتە لە کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" دواوم لەژێر ناونیشانی "لێدانی مۆڵگای جاشایەتیی بێتواتە..."، لاپەڕە ٣٩٤.

کاری نامرۆڤانە. بەندە گەر دانەنرامایە بە ئەندامێکی لیژنەی لێکۆڵینەوە لە دزی و تالآنییەکان، کە وام دەزانی پاش لێکۆڵینەوە تاوانباران سزا دەدرێن بە قورسترین شێوە، لەبەر ئەو هەموو ڕەفتارە نامرۆڤانە و ناپێشمەرگانە، ناوچەکەشم چۆڵ دەکرد و دەچووم لە گوندێکی دوور لە شارباژێڕ، وەک هاولآتییەکی ڕاکردوو دادەنیشتم. دوای لێکۆڵینەوە، هەموو بەرپرسەکانی بەرپرس لەو کارە نەشیاوانە پلەوپایەیان پتر و بالآتر بوو. بۆیە بێ هیچ کار و بەپرسیارێتییەک لە قەلەندەرخانەکەی خۆمدا کەوتمە نووسین و پاکنووسکردن کە لەو ماوەیەدا بەرهەمم هێنان.

## بەندە و پشووی دانوستاندن

هەر لەدوای ئاڵوگۆڕەکانی مەڵبەندی ٣ لە مانگی ١٩٨٣/٧دا، من بێکار بووم و بنەوبارگەی خۆمم پێچایەوە و بەرەو دۆڵی شاوری کە بۆ من نزیکترین شوێن بوو لە ڕانیەوە، لە دۆڵی شاورێش چوومە گوندی "دارەبەن" پەنای کەرتی ڕێکخستنی کۆمەڵەی ڕانیە. تا نزیک سارد و سەرما چادرێکمان هەبوو، لەوێ هەڵمدا. پێشمەرگەکان لەگەڵ پێشمەرگەکانی کەرتی ڕێکخستن لە کەپرا بوون، کە سەرمای زستان کەوتە سەرەتاتکێکردن، منیش کەوتمە مشوورخواردنی پەیداکردنی "نوا"یەک بۆ خۆم، چونکە لە ڕانیەوە زۆر نزیک بووم و ماڵی خاڵیشم لەوێ بوون، میوانم جار جارە دەهات، پێویستیم بە نوایەک هەبوو لیی بحەوێمەوە. لە خواری دێکە، گەورێکی چۆڵکراو و سواغنەدراو نە لە ناوەوە و نە لە دەرەوە هەبوو، بە نایلۆن لە ناوەوە ژوورێک و هەیوانێکم دروست کرد و پاش پاککردنەوەی، لە هەیوانەکەی زۆپایەکی دارم تیا دانا، لە ژوورەکەش تەلەڤزیۆنێکی ڕەشوسپی بە پاتریی ئۆتۆمبێل ئیشی دەکرد؛ دامنا، کە هەر هەفتەی جارێک کاک محەممەدی نەبی شین بە جێبە لاندرۆڤەرەکەی پاترییەکەی بۆ دەبردمە ڕانیە، پڕی دەکردەوە (چارج) و بۆی دەهێنامەوە.

ژوورەکەم جگە لەو تەلەڤزیۆنە، ڕادیۆیەک و چوار بەتانی و سەرینێک و قۆری و پیاڵە و شەکر و چا و جگەرەی تێدا بوو لەگەڵ چرایەکی نەوتیی "لامپا" و چەند کتێبێکیش. ئەو ماوەیەم بە هەل زانی، کەوتمە پاکنووسکردنی کتێب و نامیلکەکانم. بۆ خۆشبەختیی من، لەو کاتەدا بە بۆنەی بوونی مام جەلال لە دۆڵی و پاشان بالیسان

لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا، چاپخانەکەی کۆمەڵەش (چاپخانەی شەهید جەعفەر) هاتبوونە دۆڵێ، هەموو ستافی چاپخانەکە هاوڕێم بوون. لەو کارانەی کە لەوێ کردم:

١. پاکنووسکردن و بەچاپگەیاندنی بەرگی یەکەمی "فەرهەنگی سیاسی".

٢. وەرگێڕانی نامیلکەی "مەتەریالیزمی دیالەکتیک" لە فارسییەوە و بەچاپگەیاندنی.

٣. کتێبی "کادر کێیە و چۆن پەروەردە دەکرێ" بە ناوی "هاوار"ەوە.

ئەمانە هەموویان لە مانگی ١٩٨٤/١دا چاپ کران، جگە لە کتێبی "کادر کێیە و چۆن پەروەردە دەکرێ" کە چاپکردنەکەی دوا کەوت بۆ مانگی ١٩٨٥/١، ئەم کتێبە لە خولی کادراندا بوو بە دەرسێکی سەرەکیی ئەو خولە لەلایەن خوالێخۆشبوو د. خەسرەو خاڵ دەوترایەوە. لەو دەمەدا کە سەرەتای وتووێژی یەکێتی بوو لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا، برادەرانی عێراقچییەکان کەوتنە جموجۆڵێکی ئاڕاستەکراو بۆ دوو مەبەست:

١. بۆ دژایەتیکردنی وتووێژ (دانوستاندن) و بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی نەشیاو و پووچ، گوایە باڵی ڕاستڕەوی کۆمەڵە و یەکێتی کەوتوونەتە ناو چاڵی خیانەتەوە و وازیان لە شۆڕش و کێشەی کورد هێناوە و بوونەتە پاشکۆی بەعس.

٢. هەوڵیان دەدا کە لەپەنای دژایەتیکردنی وتووێژدا، برەو بە هێڵی عێراقچێتیی کۆمەڵە بدەن.

تا ئەو کاتەش هیچ کتێب یان نامیلکەیەک لەلایەن ناوەندی کۆمەڵەوە دەرنەچووبوو بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێبازی کوردستانیەتی کۆمەڵە. شەوێک لەگەڵ کاک "موراد عیززەددین" لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی ڕانیە، لەلای من پێکەوە دانیشتبووین باسی پێویستیی بوونی ڕێکخراو یان حزبێکی چەپی کوردستانیمان دەکرد، کاک موراد بە منی وت بۆ شتێک نانووسی لەسەر ئەو بابەتە، منیش پێم وت کە بیری لێ دەکەمەوە. شەو نزیکی کاتژمێر ١٠، کاک موراد ڕۆیشتەوە بارەگای کەرت، منیش هات بەبیرمدا کە شتێک لەسەر ئەو بابەتە بنووسم، دەستم کرد بە نووسینی، بێئاگا لە کات و درەنگیی شەو، کاتێ لە نووسینەکەم تەواو بووم، بەرەبەیان بوو. بۆ نانی نیوەڕو چوومە بارەگای کەرت و بە مورادم وت شتێکم نووسیوە ئەمشەو. پاشان موراد لە کۆبوونەوەیەکی بچووکی کەرتدا کە ئەندامانی کەرت و پێشمەرگە ئامادەبوومکان بەشدارییان کرد و داوای لێ کردم وەک نیمچەسمینارێک لەسەر ئەو بابەتە بگرم

بابەتەکەم ناو نا "کۆمەڵەی ڕەنجدەران بۆ کوردستانییە". ڕۆژی دواتر هاوڕێیانی چاپخانەی شەهید جەعفەر داوایان کرد کە ئەو بابەتە بکەمە سمینارێک و هەموو کادر و ئەندامانی چاپخانە و کەرتی ڕێکخستن بەشدار بن. دوای ئەو سمینارە، هاوڕێیانی چاپخانە پێشنیاری چاپکردنیان کرد، سەرەتا ٢٠٠ دانەیان لێ چاپ کرد و نێردرا بۆ مەڵبەندەکانی ١، ٢، ٣، ٤، مەڵبەندی چوار کە د. کەمال خۆشناو لێپرسراوی بوو؛ لای خۆیان ١٠٠٠ دانەیان لێ چاپ کرد، نێردرا بۆ ڕێکخستنی شارەکان و سەرکردایەتیی ڕێکخستنی ناوخۆ. ڕێکخستنی سلێمانی داوای لەچاپدانەوەیان کرد، چاپخانەی شەهید جەعفەر ٢٠٠٠ دانەی تریان چاپ کردەوە.

"کتێبی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بۆ کوردستانییە"، هەڵایەکی گەورەی لەناو ڕێکخستنەکاندا نایەوە، سەرانی عێراقچی خۆیان پێ ڕانەگیرا بێدەنگ بن، چوونە لای مام جەلال و داوای کۆکردنەوەی کتێبەکە و سزادانی منیان کرد. مام جەلال هەروەک بیروڕای هەمیشەیی خۆی کە بێسنوور بڕوای بە ئازادیی دەربڕینی بیروڕا هەبوو، لە وەڵامدا پێی وتبوون: "لەم شۆڕشەدا لەناو یەکێتیدا نووسین و دەربڕینی بیروڕا ئازادە، هیچ کەس لەسەر بیروڕا دەربڕین سزا نادرێ، فەرموون ئێوەش بڕۆن بەرپەرچی بدەنەوە بە نووسین." پاشان چووبوونە لای نەوشیروان وەک سکرتێری کۆمەڵە داوایان لێ کردبوو کە لێپێچینەوە لەگەڵ ستافی چاپخانەی شەهید جەعفەر و مەڵبەندی ٣ و ٤ بکات لەسەر چاپکردنی نامیلکەکە بێ پرس و ڕەزامەندیی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و یەکێتی و منیش سزای توند بدرێم، نەوشیروانیش بە یەک دێڕ وەڵامی دابوونەوە و وتبووی: "دەستی خۆش بێ، بڕۆن ئێوەش وەڵامی بدەنەوە، برایم ڕاستیی ڕەوت و بیری کۆمەڵەی نووسیوە."

## کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە و وەرچەرخانێکی ڕێکخراوەیی

پاش تێپەڕبوونی ٢٣ مانگ بەسەر کۆنفرانسی دوودا، ئەم کۆنفرانسەش بەسترا. ئەم کۆنفرانسە لە ٢٠ی تەممووزی ١٩٨٢ لەسەر "کانی سێوە" لە بناری پیرەمەگروون لە مێرگەپان بەسترا بە بەشداریی ٢٨٧ ئەندام و ١١ چاودێر، ژمارەی نوێنەرانی ڕێکخستنی شارەکان لەم کۆنفرانسەدا زۆر زیاتر بوو لە ژمارەیان لە کۆنفرانسی دوو،

ئەمەش بە هۆی کەشی دانوستاندن لەگەڵ ڕژێم کە جۆرێک ئازادیی هاتوچۆ هەبوو لە شارەکانەوە بۆ دەرەوە. لە کۆنفرانس کۆمەڵێک بابەت تاووتوێ کران، کە گرنگترینیان ئەمانە بوون:

١. سەبارەت بە دانوستاندن، لەگەڵ ئەوەی کۆنفرانس گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە ڕژێم هیچ نیازپاکییەکی لە دانوستاندن نییە، بەڵام بە زۆربەی دەنگی کۆنفرانس بڕیاریان لەسەر نەپچڕاندنی دانوستاندن دا، کە تا دوا چۆڕی هیوا بەردەوام بین لە دانوستاندن و گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێمی بەعس، ئەمەش لەبەر ڕۆشنایی سوودەکانی ئەوکاتی گفتوگۆ.

٢. گفتوگۆ و مشتومڕی تێروتەسەل لەسەر یەکرێزیی کۆمەڵە و ڕێبازە کوردستانییەکەی کرا و بڕیار درا کە هەر کەس ڕەوتی کوردستانیبوونی کۆمەڵەی پەسەند نییە، ئازادە لە کۆمەڵە بچێتە دەرەوە، دەنا هەموو ئەندامانی کۆمەڵە دەبێ پابەندی پەیڕەو و پرۆگرام و بڕیارەکانی سەرکردایەتییەکەی بن.

لەو کۆنفرانسە وەرچەرخانێکی نیمچەڕیشەیی بەسەر ڕەوت و سەرکردایەتیی کۆمەڵەدا هات. نەوشیروان کەوتە لێدانی ناڵ و بزماریش، واتە هەم لە کوتلەی زیندانی دا بە هاوکاریی فەرەیدوون قادر و جەبار فەرمان، وە هەم لە کوتلەی عێراقچییە ناسراو بە کۆمیتەی هەرێمەکانی دا بە هاوکاریی ڕێکخستنی شارەکان و مەلازم عومەر و ئازاد عەبدولمەجید. لەو کۆنفرانسە سەرکردایەتی هەڵبژێردرا و بریتی بوو لە: (نەوشیروان مستەفا، مەلازم عومەر، فەرەیدوون قادر، جەبار فەرمان، ئازاد عەبدولمەجید، مەلا بەختیار، کۆسرەت ڕەسوول، قادر حاجی عەلی)، یەدەگەکانیش: (عومەر فەتاح، خەسرەو خاڵ، دلێر ئەحمەد شکری، حەسەن کوێستانی، محەممەد تۆفیق ڕەحیم). گەر بەوردی سەرنج بدەینە ئەنجامی هەڵبژاردنەکە، جگە لە مەلا بەختیار، سەرجەم ئەوانی تر ستافی نەوشیروان خۆی بوون. نەوشیروان کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر کۆنفرانسەکە و هەڵبژێردراوەکانیش جگە لە مەلا بەختیار و شەهید ئازاد و مەلازم عومەر کە بە دەنگی خۆیان دەرچوون، لیژنەی سەرپەرشتیکردنی کۆنفرانسەکە پێک هاتبوو لە (ئازاد هەورامی، قادر حاجی عەلی، جەبار فەرمان، کاکە عەبە، و بەندە[41]).

---

[41] من لە هەرسێ کۆنفرانسەکاندا ئەندامی لیژنەی سەرپەرشتیکردنی کۆنفرانس و ئەندامی لیژنەی ڕەشنووسی پەیڕەوی ناوخۆ بووم.

## لە مەڵبەندەوە بۆ ڕێکخراو

لەدوای کۆنفرانسی ٣، سەرکردایەتیی کۆمەڵە بڕیاری دا کە ڕێکخراوەکانی خۆی لە نوێ دامەزرێنێتەوە لەسەر بنچینەی شارەکان. پاش نەمانم لە مەڵبەندی ٣ و ماوەیەک بێکاری و خەریکبوون بە کاری نووسینەوە، پاش دامەزراندنی ڕێکخراوەکانی ١، ٢، ٣، ٤، کۆمەڵە بڕیاریان دا کە ببمە ئەندامی ڕێکخراوی ٢ی سلێمانی  کە موحسین عەلی ئەکبەر کرابوو بە لێپرسراوی و پاش ماوەیەکی کەم لەبەر گومانلێکردنی کە یەکێک بێ لە سەرانی ئاش، ئەویان کێشایەوە بۆ سەرکردایەتی و کردیان بە ئەندامی مەکتەبی ڕێکخستن لای خۆیان، من بوومە لێپرسراوی ئەو ڕێکخراوە و هەر بەو ئەرکە مامەوە لە مانگی ئابی ١٩٨٤ تاکوو مانگی ١٩٨٦/٥ دوای دەستپێکردنەوەی شەڕ لەگەڵ ڕژێم و سەرنەکەوتنی گفتوگۆ، بارەگای ڕێکخراوەکەمان لە گوندی "نۆدێ"، شارباژێڕەوە گوێزایەوە بۆ گوندی "یاخسەمەر"ی دۆڵی جافایەتی. سەرەتا لەسەر "کانی مراد" کەپرێکمان دروست کرد و خەیمەکیشمان هەڵدا، ئەندامانی ڕێکخراو؛ بەڕێزان: (شۆڕش حاجی، هەڵۆ ئەحمەد سمیل) بوون. لە ڕاستیدا کاری ڕێکخراوەیی ئێمە دوو بەش بوو:

١. سەرپەرشتیی ڕێکخستنی کۆمەڵە لە سەرجەم ناوچەکانی سنووری مەڵبەندی (٢)، واتە شارۆچکەکانی سەر بە سلێمانی و ئەو مەڵبەندە و پێشمەرگەکانی مەڵبەندەکە.

٢. چاودێریکردنی هەڵسوکەوت و جموجووڵی عێراقچییەکان کە پاشان ناوی "ئاڵای شۆڕش"یان لە خۆیان نا.

## ڕەشەبای تووڕە و نەگبەتیی بەفر و باران

لە کاتی ئاشتی و گفتوگۆدا، مەڵبەندی ٢ کە بارەگایان لە سیتەک دانابوو و ڕێکخراویش بارەگای لە نۆدێ بوو، هەندێ کابینەی حکومەتیان بۆ ناردین بۆ ئەندامانی مەڵبەند کە پێک هاتبوون لە: (جەبار فەرمان، ئاوات عەبدولغەفوور، سامان گەرمیانی، مامۆستا ساڵح ژاژڵەیی...)، کابینەیەکیشیان پاش چوار پێنج مانگ بۆ من نارد، ئەوان هەریەکەیان یەک دوو ژووریان بەدەم کابینەکانی خۆیانەوە دروست کرد، من هەر بە کەلوپەلی ناو کابینەکە قایل بووم، هیچ خەرجییەکم تێدا نەکرد، شەوی سەری ساڵ بوو بۆ یەکەم جار چوومە ناو کابینەکەوە، ناردبووم بەدوای شوکری و مناڵەکاندا

هاتبوون بۆ لام. هەموو دڵخۆش بووین بەوەی ئەو شەوی سەری ساڵە بەخۆشی بەسەر دەبەین. جەبار فەرمان لە ئێوارەدا بە هاوڕێکانی وت مادام کاک برایم جەلال ئەمشەو هاتۆتە ناو کابینەکەوە، شتێک ڕوو دەدا. ڕاستییش وا بوو، دوای دە چرکە کارەبای سیتەک بە کابینەکانیشەوە کوژایەوە، دوای ١٥ چرکە کارەبای چوارتاش کوژایەوە، ئەو شەوەمان بەتاریکی بردە سەر. شەڕ دەستی پێ کردەوە و هێز کۆ کرایەوە بۆ لێدانی هەموو ڕەبایەکانی ڕژێم لە شاخی چەرماوەند و پیرەمەگروون و سەربازگەی شەدەڵە. ئێمەش وەک ڕێکخراو بڕیارمان دا بەشداریی هێرش بکەین. لە ڕۆیشتنمان بەرەو سەرگەڵوو، لەسەر جادەی تەگەران تووشی قافڵەی سەربازی بووین، بەڵام هێزەکە خۆی لێ لا دا، نەک پلانەکە تووشی شکست ببێ. جەبار فەرمان کە زۆر هاوڕێ بووین، وتی ئەمەش بە هۆی تووەیە خوا ڕەحم بکات داخۆ چیی ترمان بەسەر بێ، منیش تووڕە بووم وتم ئەی بە هۆی تووە نییە! پاشان نزیکی ئێوارە هێزەکە گەیشتە هەڵەدن و یاخسەمەر و سەرگەڵوو و بەرگەڵوو، بڕیار درابوو شەو لە لێدانی سەربازگەی شەدەڵەوە دەست پێ بکرێ، بەڵام لەو شەوەدا بوو بە بەفربارینێک، بە هیچ جۆرێک بواری هێرش نەبوو. دیسان جەبار وتی: "ها برادەرینە، نەموت کاک برایم جەلالمان لەگەڵە، خوا ڕەحم بکات!" شێرکۆ بێکەس پاش ئەوەی سمینارێکمان بۆ گرت لە نوزبیرگ و زۆر سەرکەوتووانە بوو، لە گەڕانەوەی بۆ سوید نامەیەکی بە شەهاب عوسمان نووسیبوو کە زۆر سوپاسی ئەو هاوڕێیانەی کردبوو کە ئەرکیان کێشابوو بۆ سەرخستنی سمینارەکە، لە نامەکەدا نووسیبووی: "ڕێزی زۆرم هەیە بۆ برای بەڕێزم ڕەشەبای تووڕە، برایم جەلال."

## لێکۆڵینەوە و پیاوخراپ دەرچوون

دوا دواییەکانی دانوستاندنی نێوان یەکێتی و ڕژێم، ڕۆژێک مام جەلال ناردی بەدوامدا و پێی وتم حزبی دیموکرات و کۆمەڵە لە هەورامان لە یەکیان داوە و ژمارەیەک لە ئەندامانی کۆمەڵە لە پیاو و ژن کوژراون، کۆمەڵەش دەیەوێ تۆڵەی ئەو ڕەشەکوژییەی لە بێئاگاییدا کراوە؛ لە حزبی دیموکرات بکاتەوە، ئێمە وەک یەکێتی هەردوو لایانمان قایل کردووە کە شەڕی نێوانیان ڕاگرن و قایل بن بە ناوبژیوانیی ئێمە

و لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکە و سزادانی بەرپرسانی ئەو ڕەشەکوژییە، هەموو لایەک قایل بوون بە پێکهێنانی لیژنەیەکی سێ قۆڵی یەکێتی و کۆمەڵە و حزبی دیموکرات کە لە هەر لایەک دوو ئەندامی بەرپرس ئەندامی لیژنەکە بن، لەلایەن یەکێتییەوە؛ تۆ و جەمیل هەورامیمان دیاری کردووە. ئێمە هەندێ زانیاریی سەرەتاییمان لە مام جەلال لەسەر ڕووداوەکە وەرگرت. لە ناوەڕاستی مانگی ١٩٨٤/١٢ کاک جەمیل و بەندە لەگەڵ کاک مەستەفای شەڵماشی؛ ئەندامی سەرکردایەتیی حزبی دیموکرات و برای شەهید مەلا ئاوارە و مامۆستا گۆران؛ یاساناس و ئەندامی پێشکەوتووی حزبی دیموکرات، بە لاندکرۆزەرێکی ئەوان لە گاپیلۆنەوە بەرەو سلێمانی و هەڵەبجە و تەوێڵە و پاشان بە لاڕێدا بەرەو شوشمەی خواروو ڕۆیشتین، ئەو کاتە شەڕی قورسی نێوان عێراق و ئێران بوو بە فڕۆکە و بە تۆپ تۆپبارانی یەکتریان دەکرد، شوێنی لێکۆڵینەوە مەیدانییەکەش کەوتبووە نێوان ڕەبایەکانی ئێران و عێراقی لە شوشمەی خواروو و سەروو نەوسود. نوێنەرەکانی سازمانی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی ئێران-شاخەی کوردستان، پێک هاتبوون لە: (کاک فارووق بابە میری، فاتح شێخ الاسلام) کە ئەمانیش ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵە و یاساناس و ئەندامی پێشکەوتووی کۆمەڵە بوون. لە ڕۆژی ١٩٨٤/١٢/١٧ دەستمان بە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانیی چڕوپڕ کرد، سەرەتا لە دانیشتووانی دێکانەوە دەستمان پێ کرد، تەنیا کاک جەمیل و من، هەر وتەیەکمان لێ وەردەگرتن؛ بە ئامێری تەسجیلی بچووک تەسجیلمان دەکرد، خاڵە گرنگەکانیشمان دەنووسییەوە، ئەم پرسیارانەمان لە دانیشتووان دەکرد: ئەم شەڕە کەی ڕووی دا؟ لەکوێ ڕووی دا؟ بە شەو بوو یان بە ڕۆژ؟ لە چ کاتێکدا بوو؟ کێ دەستپێشخەر بوو؟ چەند کەس کوژران؟ لە کام لا کوژران؟ پیاو بوون یان ژن؟ چەند ژن و چەند پیاو؟ چۆنتان بینی، بەدرێژی بۆمان باس بکەن! کاک جەمیل چونکە هەورامیی دەزانی، بە هەورامی ئاخاوتنی لەگەڵ دەکردن، زیاتر ئەو لەگەڵیان دەدوا. شێوەی دووەمی لێکۆڵینەوەکەمان هەوڵمان دا لە شەودا لە ماڵەکاندا بیکەین، بۆ ئەوەی پاش لێکۆڵینەوە بتوانین سوود لە تاریکیی شەو وەربگرین بۆ گوێهەڵخستن لە دەرەوە لەپەنای دیوار و پەنجەرەی ماڵەکان، تا سوود لە مشتومڕی نێوان خێزانەکە وەربگرین لە ڕۆیشتنی ئێمە لە ماڵەکان لەناو خۆیان کە زۆر جار دەبووە قڕەقڕ

لەنێوانیان. لە شەوی ۱۹۸٤/۱۱/۱۹، لەپاش ۱۰ ڕۆژ لە لێکۆڵینەوە،ماڵێکمان دۆزییەوە دوو کوڕیان هەبوو، یەکێکیان کۆمەڵە بوو، ئەوی تریان دیموکرات بوو، بۆ ئێمە باشترین شوێن بوو کە ڕاستییەکانمان دەست بکەوێت. چووینە ماڵەکە هەردووکمان کەوتینە پرسیارکردن، هەر چەند برا بچووکەکە کە کۆمەڵە بوو؛ هەوڵی دەدا وەڵامی پرسیارەکانمان بەڕاستی بداتەوە، هەستمان کرد باوکی و برا گەورەکەی بە چاو و بە پەنجە هەڕەشەیان لێ دەکرد، لە ماڵەکە هاتینە دەرەوە، وامان پیشان دا کە دەڕۆین. بەڵام پاش چەند هەنگاوێک دوورکەوتنەوە؛ گەڕاینەوە بەر دیوار و پەنجەرەی ماڵەکە. گوێمان لێ بوو کوڕە بچووکەکە بە باوکی و براکەی دەوت: "بشمکوژن بەیانی دەچمە لایان بۆ مزگەوت و پێیان دەڵێم کە شوێنی تەرمەکان وا لەو بەر پردەکەی ئاواییەوە. لەبەر جادەکە بە گڵی کەندەکە داپۆشراون." بۆ ئێمە ئەم زانیارییە زۆر بەسوود و کلیلی کردنەوەی گرێکوێرەی لێکۆڵینەوەکەمان بوو، بەڵام ئەو زانیارییانەمان لای هیچ لایەکیان نەدرکاند. زۆربەی شەوەکان بۆ هێمن و خۆشکردنی کەشی لیژنەکە و نەهێشتنی توندی لە ئاخاوتندا، بە گێڕانەوەی نوکتە و سەرگوزشتە و پێکەنین دەمانبەردە سەر. ئەو شەوە کاک "حەکیمی ڕەزایی" فەرماندەی هێزی حزبی دیموکرات لە هەورامانات لە مزگەوتەکە بوو، بۆی گێڕاینەوە کە بەمناڵی شێخێک چۆتە دێیەکەیان و کەوتۆتە زکرکردن و حاڵی لێ هاتووە، پەلاماری مناڵێکی ۷-۸ ساڵانەی چلکنی داوە و قووتی داوە، پاش نیوسەعاتێک مناڵەکەی لە دەمیەوە هێناوەتە دەرەوە، بەڵام هیچ چڵم بە لووتیەوە نەماوە، منیش و کاک جەمیل بووراینەوە لە پێکەنینا. بۆ بەیانی ئاگاداری نوێنەری کۆمەڵە و دیموکراتمان کرد کە لەگەڵمان بێن بۆ لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی و پێشمان وتن ئێمە زانیاریمان دەست کەوتووە و دەچین بۆ زانینی ڕاستی و ناڕاستیی ئەو زانیارییە. هەر بە ڕێگەوە پرسیارمان لە خەڵکی دێکە کرد کە پردەکە لە کوێوەیە و ئەو گردی سەر جادەیەش کە شەڕەکەی تیا کراوە، کامەیە. خەڵکی دەستیان بۆ شوێنەکە ڕادەکێشا و پێشیان دەوتین کە ئەو گردە مەترسیدارە، چونکە لە پردەکە بەو بەرەوە هەموو بە مین (لوغم) چێنراوە، جادەکە مینڕێژ کراوە، داوامان لە نوێنەری هەردوو لایان کرد لەگەڵمان بێن بۆ ئەو شوێنەی کە شکمان لێی بوو، بەڵام نە نوێنەرانی حزبی دیموکرات و نە کەسیش لە خەڵکی دێیەکە نەهاتن هاوکاریمان بکەن.

من و جەمیل بەوریاییەوە چووین بەرەو لاپاڵی گردەکەی سەر جادەکە، شوێنێکی هەڵتۆقیومان بەرچاو کەوت. هەر بە دەست هەندێ گڵمان لا دا، تەرمی ژنێک دەرکەوت و بەردەوام بووین لەگەڵ نوێنەرانی کۆمەڵە لە لادانی گڵ، دەرکەوت کە هەموویان بەدەستبەستراوی لە پشتەوە لێدراون و کوژراون و خراونەتە تەنکەچاڵێکەوە و گڵیان بەسەردا دراوە. کوژراوەکان ٨ تەرم بوون کە ٣ دانەیان ژن بوون، پاش دەرهێنانی هەموویان و شتن و کفنکردنیان و ناشتنیان، ئینجا سەرەتای لێکۆڵینەوە لە دەمی دوو پێشمەرگەی حزبی دیموکرات و خەڵکی دێکەش زانیمان کە شەوی ڕووداوەکە "حەکیمی ڕەزایی" فەرماندەی هێزی حزبی دیموکرات لەگەڵ ژمارەیەک چەکداری خۆیان داویانە بەسەر مزگەوتی دێکەدا و ئەو ٨ پێشمەرگەی کۆمەڵەیان چەک کردووە و گرتووە و پاشان دەست و چاویان بەستوون و بردوویاننەتە دەرەوەی دێ و لەپەنای ئەو کەندەدا لە پشتەوە گوللەبارانیان کردوون و هەمووشیان خستوونەتە چاڵێکەوە و بە گڵ دایانپۆشیون. پاش لێکۆڵینەوە و دانپێدانانی حەکیمی ڕەزایی و هەندێ لە پێشمەرگە بەشداربووەکانی حزبی دیموکرات، دەرکەوت کە چەکدارانی کۆمەڵەش لە شوێنێکی تر ٣ سێ پێشمەرگەی دیموکراتیان کوشتووە، دیموکراتیش لە تۆڵەی ئەو سێ پێشمەرگەیان؛ هاتوون ئەم ٨ پێشمەرگەیەی کۆمەڵەیان کە بێئاگا بوون لە کوشتنی پێشمەرگەکانی دیموکرات؛ کوشتوتەوە. لێکۆڵینەوە تا ڕۆژی ١٩٨٥/١/١٠ خایاند، ڕۆژانە تۆپی ئێران و عێراق لە ڕەبایەی یەکتریان دەدا و شوشمە و نەوسووش کەوتبووە نێوان بەرەکانی شەڕی هەردوو لایان. لەو ماوەیەی کە ئێمە خەریکی ئەو کارە بووین و وتووێژ لە کۆتایی و دەستپێکردنەوەی شەڕیش لە سەرەتادا بوو، من و کاک جەمیل وا ڕێک کەوتین کە من لەگەڵ نوێنەرانی حزبی دیموکرات، کاک جەمیلیش لەگەڵ نوێنەرانی کۆمەڵە بگەڕێنەوە دۆڵی جافەتی.

پێکەوە ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلمان لەسەر لێکۆڵینەوەکە و ئەنجامگیرییەکەی و پێشنیاریشمان نووسی کە ئەگەر حزبی دیموکرات سزای بەرپرسانی ڕووداوەکە نەدا، دەبێتە سەرەتای شەڕێکی خوێناویی درێژخایەنی نێوان ئەو دوو لایەنە. ڕاپۆرت و پێشنیارەکەمان دا بە مام جەلال. ئەو کاتە "عەبدولڕەحمان قاسملۆ" لە بەغداد بوو، "مەلا عەبدوڵڵای حەیاکی" جێگری بوو، مام جەلال ئەنجامی لێکۆڵینەوە و پێشنیارەکەی

ئێمەشی دا بوو بە مەلا عەبدوڵڵا و وریاشی کردبۆوە کە ئەگەر "حەکیمی ڕەزایی" ئەندامی سەرکردایەتیی حزبی دیموکرات و فەرماندەی هێزی هەورامانیان لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی کە بەشدار بوون لەو دیل کوشتنە؛ بانگ نەکرێن و سزا نەدرێن، کۆمەڵە هەڕەشەی تۆڵەکردنەوە دەکات، پێویستە حزبی دیموکرات بەر بەو شەڕە نەخوازراوە بگرێ. مەلا عەبدوڵڵا بەو ڕاپۆرتەی ئێمە قایل نەبوو، لێکۆڵینەوەکەی بە ناعادلانە لەقەڵەم دابوو کە گوایە بەندە کۆمەڵەم و بەلای کۆمەڵەدا دامشکاندووە و ٧٩-١٩٨٠ کارم لەگەڵ کۆمەڵەدا کردووە. سەرانی کۆمەڵەش لای مام جەلال گلەییان لە ئێمە کردبوو کە گوایە بە کاک جەمیل و بەندە مافی تەواومان نەداوە بە لێکۆڵینەوەکە. سەرئەنجامی ئەو هەموو ماندووبوون و خۆخستنە ناو ئاگری نێوان شەڕی ئێران و عێراقەوە، هەردوو لا گلەییان لێ کردین، بەڵام مام جەلال دەستخۆشیی لێ کردین و کارەکەشمانی بە سەرکەوتوو دانا.

## یاخسەمەر، داخوازییەکەی مام جەلال

لەدوای گوێزانەوەی بارەگای ڕێکخراو لە نۆدێوە بۆ یاخسەمەر و سەر "کانی مراد" لەگەڵ ئەندامانی ڕێکخراو (شۆڕش حاجی، هەڵۆ ئەحمەد)، کەوتینە هەڵسووڕاندنی کاری ڕێکخراوەیی ڕێکخستنەکانی شار و شارۆچکەکانی سەر بە پارێزگای سلێمانی. جگە لە ڕێکخستنی ناو شاری سلێمانی، بە ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگەی سنووری مەڵبەندی ٢ی سلێمانییشەوە. ئەو شوێنەی ئێمە بۆ هاوین زۆر فێنک و خۆش بوو، کەوتبووە پەنا شاخی هەلاج و زۆر پارێزراویش بوو لە تۆپبارانی ناوچەکە، چ لە سورداش و چ لە پیرەمەگروونەوە بکرایە. گفتوگۆ بەسەرنەکەوتوویی کۆتایی هات، شوێنی مام جەلال و سەرکردایەتی و ناوەندی کۆمەڵە لە چنارێ و کانی توو و ئاوەژێ پارێزراو نەبوو. لە مانگی ١٩٨٥/٦، مام جەلال وەڵامی دایێ کە دێتە سەردانمان، ئێمەش خۆمان بۆ میوانداریيەکی شایستە ئامادە کرد. ئێمە بێئاگا بووین کە "شەوکەتی حاجی مشیر" لای مام جەلال زۆر بە شانوباڵی ئەو شوێنەی ئێمەیدا هەڵدابوو، وتبووی شوێنەکەی برایم جەلال لە یاخسەمەر نە تۆپ دەیگرێتەوە نە فڕۆکەش دەتوانێ بۆردوومانی بکات. مام جەلال لە ١٩٨٥/٦/٢١ بە سەردان بۆ بینینی شوێنەکان هاتە لامان و خوازبینیی

ئەو شوێنەی لە ئێمە کرد، منیش لە وەڵامدا وتم مام جەلال خوازبێنیی ناوێ، بڵێ برایم جەلال بگوێزنەوە، دیار بوو جەبار فەرمان و فەرەیدوون ئەو وەڵامەی منیان لا جوان نەبوو، بەڵام ئەوەی من ڕاستی بوو، چونکە نەمدەتوانی بڵێم نارۆین و نایدەین، نە ئەویش ئەوەی قبوڵ دەکرد لە ئێمە. هەر لەو دانیشتنەدا کە هەموو سەرکردایەتی و "م. س" لەگەڵیان بوو، جگە لە لێپرسراوی لقەکانی یەکێتی و لێپرسراوی ٣ مەڵبەندەکەی تر، مام جەلال وتی برادەرینە لەم شۆڕشەدا هیچم بەدەست نییە، با دابەشکردنی شوێنی بارەگاکان من بیکەم، منیش وتم مام جەلال بفەرموو هەموو شتێک لەم شۆڕشەدا بەدەست منە، با دابەشکردنی شوێن و بارەگای دەزگا و مەکتەبەکانیش من بیکەم. لە دەموچاویانا دیار بوو زۆربەی ئامادەبووان وتەکانی منیان لا خراپ بوو، بەو جۆرە بارەگای کاک نەوشیروان و ناوەندی کۆمەڵە و دەزگای ڕاگەیاندن لەخوار ئاشەکانی بەرگەڵوو جێگیر بوون. مام جەلال و سکرتاریەت لە کانی مراد خانوویان کرد، دەزگای دارایی چوونە ئاوەڕێژی نێوان یاخسەمەر و دیوی چوخماخ، بەشێکی سەرکردایەتی چوونە سەرگەڵوو، ڕێکخراوەکەی ئێمەش چووینە چوخماج[٤١]، ڕاگەیاندنی کۆمەڵەش چوونە گوندی چالاوا، مەکتەب عەسکەری چووە هەڵەدن، بەو شێوەیە دامودەزگاکانی سەرکردایەتیی شۆڕش لەو دۆڵ و پێنج شەش دێیەدا دامەزران[٤٢].

---

٤٢ سەبارەت بە ڕێکخراو و چاودێریکردنی جموجوڵی برادەرانی ئاش، بەدرێژی لە کتێبی «چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە» باس کراوە دووبارەکردنەوەیم بە زیاد زانی.

# بەشی هەشتەم
## ئاش یا ئالأی شۆڕش

پێشەکی دەمەوێ ئەوە بڵێم گەر ئەو کێشەیە نەبووایە بە بەشێک لە ژیاننامەکەم، هەرگیز ئارەزووی دووبارە نووسینەوەی ئەو چەند لاپەڕە ڕەش و قێزەونەم نەدەکرد، بەڵام ئەم ژیاننامەیە لەبەر ئەوەی تایبەتە بە خۆم و ئەو بەشە مێژووە تاڵ و ڕەشەش ئەو ماوەیەی ژیانی منیشی گرتۆتەوە، ناچارم کە لەم کتێبەشدا دووبارەی بکەمەوە، بەتایبەتی کە دوای دەرچوونی کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە"، سێکوچکە هەناو بۆگەن و قینلەدڵ و تاوانبارەکانی ناو ئاش (حیکمەت محەممەد کەریم، فازل کەریم، حاجی عەباس) کەوتنە نووسینەوەی کاوێژەکانیان و بەتەواوی مۆراڵی خۆیان بۆ خوێنەران دەرخست، لێرەدا بە پێویستم زانی کەمێک باسی ئەو مێژووە ڕەش و قێزەونەی سەرانی ئاش بەدرێژی بکەم. بۆ وەڵامی ئەو سیانە و ئەوانەی تریش کە باسکردنی ڕاستیی ڕەفتار و کردارەکانی ئاشم لەو کتێبەدا نووسیوە، تەنیا لە لێکۆڵینەوە لەسەر دانپێدانانەکانی ئەو سێ "بەڕێز"ەوە دەست پێ دەکەم، کە بە دەستوخەتی پیرۆزی خۆیان دانیان بە تاوان و تاوانباریی خۆیاندا ناوە، بەڵام پاش تێپەڕبوونی پتر لە سێ ساڵ لە کەشوهوای دەسەڵاتداریی مەلا بەختیاری؛ یەک لە سەرانی ئاش و ماکی خیانەت و تاوانکاری بەرامبەر یەکێتی و کۆمەڵە، سیان و چوار بە کۆمەڵ چ بە نووسینی کتێبی پڕ لە درۆودەلەسە و چەواشەکاری، چ بە چەواشەکردنی بینەران و بیسەران لە کەناڵەکەی ئێن ئارتی کەوتنە حاشاکردن لە نووسینەکەیان و خۆیان بە خاوەن فکر و جیاوازیی فکری و تەنانەت سزاکانیشیان بە نادیموکراتی و دژەئازادیی بیروڕا دەربڕین ناوزەد کرد.

## نامەی ڕۆژی ١٩٨٥/١٢/١٧

دانپێدانانی حیکمەت محەممەد کەریم (مەلا بەختیار) و عەینەددین نەجمەددین (پشکۆ) و مەحموود عەبدولڕەحمان (شێخ عەلی) بە تاوانی خۆیان سەبارەت بە ڕێکخستنی ڕێکخراو لەناو ڕێکخراودا واتە ئاش لەناو کۆمەڵەدا، بەندە کە لێپرسراوی لیژنەی لێکۆڵینەوە بووم لەگەڵ ئەو سیانە، دەقی نامەکەیانم کۆپی کرد بە چەند وێنە، کە یەکیان بۆ مام جەلال و یەکێکیشیان بۆ نەوشیروان، یەکیشیان کە (اصلیە) کە بۆ لای خۆم هێشتمەوە، تا ساڵی ١٩٩٥ کە نەوشیروان لە لەندەنەوە هاتە شاری "نورنبێرگ"ی ئەڵمانی کە من لەو شارە دەژیام، داوای ئەو وێنە ئەسڵییەی نامەکەی لێ کردم و بەڵێنی دامێ کە پاش نووسینەوەی؛ دەمداتەوە، بەڵام لە ساڵی ٢٠١١ کە خەریکی نووسین و چاپکردنی کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" بووم، داوای نامەکەم بەتەلەفۆن لێ کردەوە، نکوڵیی لە بوونی نامەکە کرد، پاشان دانی پێدا نا کە لایەتی و نامداتەوە، تەنانەت قادری حاجی عەلی و سەلاح ڕەشیدیشم لێ ڕاسپارد کە بمداتەوە، هەر نەیدامەوە. لە کاتی تەواوبوونی کتێبەکەمدا بووم بۆ بەختی باشی کتێبەکەم، ژمارە ٦ی گۆڤاری ململانێ ڕۆژی ٢٠١٠/٩/٢٦م دەست کەوت کە دەقی نامەکەی تێدا بڵاو کرابۆوە، نازانم ئەو نامە زۆر نهێنی و پارێزراوە کە تەنیا لای مام جەلال و نەوشیروان دەست دەکەوت؛ چۆن کەوتبووە دەستی ئەو گۆڤارەی سەر بە ڕاگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان! بە بۆچوونی خۆم تەنیا لە نەوشیروانەوە دزەی کردبوو، دیارە بۆ مەبەستێک.

## دەقی نامەکە بە شیکردنەوەی خۆمەوە

بۆ کۆمیتەی سەرپەرشتیی ئاڵای شۆڕش

پاش سڵاو...

پاش ئەو هەموو ململانێ و ناکۆکی و دژایەتییانەی پێشوومان لەناو کۆمەڵەدا، دواتریش تاوانی خۆئیعلانکردنمان وەکوو ئاڵای شۆڕش بەرامبەر بە کۆمەڵە و یەکێتی وەکوو جیابوونەوە لێیان، گەیشتینە ئەو قەناعەتەی هەموو ئەو کارە ناڕاستانەی پێشووی ناو کۆمەڵەمان و کردەوەکانی ئەم دواییەشمان ئیدانە بکەین و بە تاوانیان

بزانین بەرامبەر کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و بزووتنەوەی کرێکارانی کوردستان و شۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلەکەمان. بۆیە بڕیارمان دا کە چیتر لەمەودوا لەگەڵ ئێوەدا کار نەکەین واز لە سیاسەت بێنین و هەموو پەیوەندییەکی خۆمان لەگەڵتاندا ببڕین، لەبەر ئەم هۆیە فکری و سیاسییانەی خوارەوە:

ا. ئەو شێوە کارکردنە کە ممارەسەمان کرد لەناو کۆمەڵە و یەکێتیدا و پاشان پەیوەندیکردنمان لەگەڵ ئاڵای شۆڕش، وە نەپساندنی پەیوەندیی حزبی لەگەڵ کۆمەڵە بەڕەسمی، واقعەکە سەلماندی کە ئەو شێوە کارە ناشەرعی و نادروست بووە و ئێمە بەش بە حاڵی خۆمان لێی پەشیمانین، وە دەرکەوت لەناو شۆڕشی گەلەکەماندا لە کوردستانی عێراقدا تەئسیری سەلبیی زۆری بووە لەسەر بزووتنەوەی کرێکاران و یەکێتیی ڕیزەکانیان و مارکسییەکان، بۆیە پاشگەزبوونەوەمان وە دوورکەوتنەوەمان لە قازانجی شۆڕشدایە، چونکە ڕێبەرایەتیی بەرگریی شۆڕشگێڕانە کە مەسەلەی سەرەکییە بە هێزێکی وەک یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەکرێ نەک بە چەند ئەڵقەیەکی بچووکی بێهێز، بەڕاستی دەبووایە باشتر ڕەچاوی واقعی خەباتی گەلەکەمان و شۆڕشەکەی بکەین، تەنانەت ئەگەر قەناعەتی فکری و تایبەتی و جیاوازیشمان بووبێ، ڕاستتر وا بوو لە ڕێگەی ئسوڵی حزبایەتییەوە وەک شەخسی؛ خۆمان دوور خستبایەتەوە لە کۆمەڵە و یەکێتی، چونکە دەبووایە بمانزانیایە ئەم کارانەی ئێمە، بە حوکمی مەرکەزمان لەناو شۆڕش و کۆمەڵەدا، دەبێتە مایەی کێشە و گیروگرفتی ئاو کە گیانی بەرەنگاری لاواز دەکات و ئەویش سەرئەنجامی ئەو سیاسەتە هەڵەیەی کە ئێمە گرتبوومانە بەر.

ب. کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان وەک ڕێکخراوێکی مارکسی لینینی شۆڕشگێڕیی ئەساسیی کۆڕی خەبات، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش وەک لایەنێکی نیشتمانپەروەری ڕزگاریخوازی کاریگەر و باڵادەست، شۆڕشیش وەک بڕبڕەی پشتی گەلەکەمان و بزووتنەوەی نیشتمانی لە عێراقدا دژی فاشستەکان. ئەرکی سەرشانی هەموو کەس و لایەنێکی شۆڕشگێڕ و دیموکراسی و چەپێکە، ئەمرو دریغی نەکات لە پشتیوانی و دۆستایەتیکردنیان، کارێکی وا نەکەن لەبەرامبەر دوژمندا لاواز بێت، چونکە لاوازکردنیان دەبێتە هۆی پاشکەوتنی سەرکەوتنی جوولانەوەی

ڕزگاریخوازانەی کوردستان، ئەمە ڕاستییەکە تا دێت ڕووداوەکان باشتر دەیسەلمێنن، بۆیە لەمەوبەر کارەکانی ئێمە کە پێچەوانەی ئەو ڕاستییانەی سەرەوە بووبێ؛ ئیدانەیان دەکەین، بەتایبەت پاش ئیلتیزامکردنمان بە ئالای شۆڕشەوە.

ج. خۆتان دەزانن کە هەڵویستمان بەرامبەر نووسراوەکانی کاک سالار و م. جەعفەر بەتوندی ڕەتکردنەوەیمان بووە، چونکە بە گیانێکی دوژمنکارانە و ناڕاست بەرامبەر کۆمەڵە و یەکێتی نووسراون[٤٣]، ئێستاش هەمان هەڵوێستی ئیدانەکردنمان هەیە سەبارەت بە هاندانی لایەن و دەوڵەتەکانی ناوچەکە بۆ دوورکەوتنەوە لە یەکێتی و دژایەتیکردنیان، هەر لەلایەن ئەو برادەرانەوە بە تاوان و خیانەت لەقەڵەم ئەدەین، لە کاتێکدا پێویست بوو بەپێچەوانەوە دۆست و پشتیوان و ئیمکانیات بۆ شۆڕش و جووڵانەوەی گەلەکەمان زیاد بکرێ و هەوڵی نزیکخستنەوە و یەکخستنەوەی لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی-چەکداریی کۆڕی خەبات بدرێ، بەمەش بۆ نەهێشتنی شەڕی ناوخۆ، ئێمەش دەبوو پێشوەخت لەم بارەیەوە ململانێکانمان لەگەڵ ئەو برادەرانە یەکلا بکردایەتەوە.

د. هەرکە گەیشیتنە قەناعەتی بێهیوایی لە کۆمەڵە لە ڕووی ئسوڵی حزبایەتییەوە، پێشوەخت دەبوو ئیستیقالەی ڕەسمیمان لە کۆمەڵە بکردایە لە پاشان بیرمان لە چوونە ناو لایەنێکی تر بکردایەتەوە.

کارکردنمان بە چەشنی (تسلل) تاوانێکی تەنزیمی و سیاسیی گەورە بوو، کارێکی ناشەرعی بوو، زیانی بۆ هەردوو لا هەبوو، بۆیە لەو شێوە کارە پەشیمانین، بەتوندی ڕەخنەی لێ دەگرین و بە پێویستیشی دەزانین هەوڵ بدەن ئەو شێوە کارکردنە بنبڕ بکرێ و هەر کەس لای خۆیەوە چاوی پێدا بگێڕێ و پاشماوەکانی نەهێڵێ، تا چیی کە نەبێتە زیان بۆ کۆمەڵە و شۆڕش. هەر دەربارەی کەرتوپەرتکردن و پەیوەندیکردن بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان، هەر چەند ئێمە بە کارێکی نالەبار و تاوانمان زانیبێ، بەڵام شێوەی سراعەکە و سیاسەتەکە دەرکەوت هەر بۆ ئەوەی دەبرد، بۆیە دیسان دژی جیاکردنەوەی هێزی پێشمەرگەی کوردستانین، وە هەموو تەقەلایەک بۆ ئەو مەبەستە، واتە جیاکردنەوەی هێزی "پ. م" کوردستان بە خیانەت و تاوان دەزانین، وە بەتوندی

٤٣ مەبەست لە نامیلکە عەرەبییەکەیە کە ناوی "لم یعد الصمت ممکنا".

لایەنگری یەکێتیی ڕیزەکانی و گیانی برایەتی و هاوڕێیەتیی ڕاستەقینەین لە ڕیزەکانیدا. دەستهەڵگرتن لەو جۆرە سراع و سیاسەتە، تاقە زامنی ڕەوانەوەی ئەو مەترسییەیە کە دەبێتە هۆی لاوازکردنی شۆڕش و قووڵکردنەوەی ئەو کێشە نامەبدەئییانەی پێشوو، بۆیە هیوامان وایە هەر کەسێک بە هۆی کێشەکانی ئەم دواییە و لەژێر تەئسیری ئەو وەزعە سیاسییەدا تووشی دوورەپەرێزی و لادان و دوورکەوتنەوە بووە لە یەکێتی و هێزی "پ. م" و کۆمەڵە، وەک پێویست دان بە هەڵەکانی خۆیاندا بنێن و بگەڕێنەوە ناو هێزی "پ. م" و براکانی خۆیان لە یەکێتیدا، چونکە ئەو واقعە هەرگیز بەرگەی جیابوونەوە و شەڕی ناوخۆ و زیادکردنی لەشکرکێشی ناگرێ[44]. هەر ئەوەش جەرگی دوژمن دەبڕێ و دڵی میللەتەکەمان خۆش دەکات، ئێمە لەلایەن خۆمانەوە لەو جۆرە سراعە کە ئەم ئەنجامەی دا بەدەستەوە؛ پەشیمانین و هیواداریین هەموو برایەکی تریش ئەم هەڵوێستەی ئێمە وەربگرێ و چی کە درێژە بەو سیاسەتە هەڵەیە نەدا.

برایان...

ئەوەی لە سەرەوە نووسیومانە، پوختەی هەڵوێست و ڕا و قەناعەتی ئێمەیە سەبارەت بە ئاڵای شۆڕش و سەرجەم مەسەلە سیاسییەکان، بە بڕوای تەواوەوە دوور لە هەموو تەئسیرێکی ئەم یان ئەو، لە کاتی گرتنماندا لەلایەن کۆمەڵە و یەکێتییەوە، لە جەوێکی زۆر هێمن و ئارام و دیموکراسیدا، بێ هیچ زۆر و فشاری، بۆیە دیسان دووپاتی دەکەینەوە ئیتر ئێمە کە لە خوارەوە ئیمزامان کردووە، هیچ جۆرە ئیلتیزامێکمان پێتانەوە نەماوە و نامێنێ وەکوو کوردێکی بێلایەن و دڵسۆز و دوور لە ژیانی سیاسی، دوور لە کوردستانی عێراق ژیان دەبەینە سەر، بۆ ئەم مەبەستەش داوامان لە کۆمەڵە و یەکێتی کردووە یارمەتیی چوونەدەرەوەمان لە هەموو بارێکەوە بۆ مەیسەر کەن، ئەوانیش بە سوپاسەوە گفتیان پێ داوین. وە ماندووبوونی چەند ساڵی ڕابردوومانیان بە گیانی مەسئولانەوە ڕەچاو کردووە، سەرەڕای ئەو هەموو ناکۆکی و دژایەتیکردنەمان لە ماوەیەکی دیاریکراودا بەرامبەریان.

| ئیمزا | ئیمزا | ئیمزا |
| --- | --- | --- |
| پشکۆ | شێخ عەلی | بەختیار |

---

[44] دیارە مەبەستی لەشکرکێشییان هەبووە بۆ سەر یەکێتی و کۆمەڵە، ئەگەر پلانەکانی سەری بگرتایە.

## شیکردنەوەی دانپێدانانەکەیان

لە پێشەکیی نامەکەیاندا دەڵێن: "ئەو کارە ناڕاستانەی پێشووی ناو کۆمەڵەمان و کردەوەکانی ئەم دواییەشمان ئیدانە دەکەین و بە تاوانیان دەزانین بەرامبەر کۆمەڵە... هتد"، واتە سەرجەم کارە ناڕاستەکانی پێشووی پێش دروستبوونی ئاش و سەردەمی کۆمیتەی هەرێمەکانیش، لەگەڵ کردەوەکانی ئەم دواییەیان واتە هەوڵدان بۆ تێکدانی ڕیزەکانی کۆمەڵە و یەکێتی و شۆڕش "ئیدانە دەکەن و بە تاوانیان دەزانن"، کەواتە دانیان بەوەدا ناوە کە تاوانبار بوون. کەواتە "سراعی فکرییان" نەکردووە، بەڵکە تاوانیان کردووە، دەی باشە ئەو چوار تەورات نووسینەیان لە چی، هەر چواریان بە کتێبەکەی من و ڕاستییەکان کەوتبوونە هەلەکەسەما (حیکمەت، عەینەددین، فازیل، عەباس)! کەسانێک کە خۆیان ئیدانەی خۆیان بە نووسین و دەستخەتی خۆیان و بە دەمییش بکەن و دان بە تاوانی خۆیاندا بنێن، ئیتر هیچ شک و گومانێک دەمێنێ لە خیانەتکارییان!

لە خاڵی (ب)دا دەڵێن: "تا دێت ڕووداوەکان باشتر دەیسەلمێنن، بۆیە لەمەوبەر کارەکانی ئێمە کە پێچەوانەی ئەو ڕاستییانەی سەرەوە بووبێ؛ ئیدانەیان دەکەین، بەتایبەت پاش ئیلتیزامکردنمان بە ئاڵای شۆڕشەوە"، ئاڵای شۆڕش ناوی ئەو گۆڤارە وەرزییە بوو کە لە ساڵی ١٩٧٦دا لە سەردەمی شەهید ئارامدا دەرکرا و پاشان لەلایەن سالار عەزیز و مەلا بەختیار و تاقمەکەیانەوە کرا بە ناوی ڕێکخراوێکی دژەکۆمەڵە و دژەیەکێتی و دژەشۆڕش. واتە کارە دوژمنکارییەکان و ڕووداوەکانی کە بە هۆی کارە خراپەکارییەکانی ئاشەوە ڕوویان دا، سەلماندیان کە چ خراپەکارییەکیان کردووە، بۆیە ئیدانەی کارەکانی لەوەوبەری خۆیان کردووە، بەتایبەت پاش ئیلتیزامکردنیان بە ئاڵای شۆڕشەوە، واتە بەگشتی سەرجەم کارە تێکدەرانەکانیان پێش ئاڵای شۆڕش و بەتایبەتییش دوای دروستکردنی ئاڵای شۆڕش. "و شهد شاهد من اهلها." لەسەر ئەو دانپێدانانەیان کە خیانەتیان لە شۆڕش و کۆمەڵە و یەکێتی کردووە، دەبووایە ئەو سزایە بدرانایە کە شایستەی بوون نەک ڕێگەیان بدرایە بڕۆنە ئێران و لای بەرەی جود و بکەونە ئەنجامدانی خیانەتی گەورەتریش یان جارێکی تر ڕێگەیان بدرایە خۆیان بخزێننەوە ناو یەکێتی و بکەونە تۆڵەکردنەوە لە یەکێتی وەک گورگی ناو پێستی مەڕ

کە تا ئێستاش یەکێتی بەدەست کردەوە خواروخێچەکانیانەوە دەناڵێنێ. ئێستاش مەلا بەختیار هەموو تەقەللایەکی بۆ ڕووتکردنەوەی یەکێتییە لە جەماوەرەکەی، ئێستاش هەوڵی وەدەرنانی دڵسۆزانی یەکێتی دەدەن لە یەکێتی.

کێ خوالێخۆشبوو ڕەسوول مامەندی لە یەکێتی دەرپەڕاند؟

کێ نەوشیروان مستەفا و هاوڕێکانی لە یەکێتی تەرە کرد؟

کێ پاڵی بە د. بەرهەم ساڵحەوە نا بچێتە دەرەوە لە یەکێتی؟

کێ عارف ڕوشدی و ئازاد جندیانیی ناچار کرد یەکێتی بەجێ بهێڵن؟

کێ هەوڵی دەرپەڕاندنی کۆسرەت ڕەسوول و ناوەندی بڕیاری دا و سەری نەگرت، ئەی نمەکبەحەرامەکان!

فازیل کەریم یەکێتیی کاندیدی کرد بۆ پەرلەمانی عێراق، بەڵام کە دەرنەچوو، دەیویست شکات و سکاڵا لەسەر یەکێتی لە دادگا تۆمار بکات.

لە خاڵی (ج)دا دەڵێن "خۆتان دەزانن کە هەڵوێستمان... هتد"، واتە دەکەونە پاکانەکردن و نکوڵیکردن لە بەشدارییان لە هەوڵەکانی سالار عەزیز و فازل کەریم (م. جەعفەر) و بە کاری دوژمنکارانە و ناڕاستیان لەقەڵەم دەدەن. ئەی ئەگەر ئیدانەی هەوڵەکانی جەعفەر و سالاریان بەڕاستی دەکرد و لەگەڵ ئەو تاوانانەی ئەوان نەبوون بەرامبەر یەکێتی، ئەی بۆ دوای بەربوونیان لە زیندانی یەکێتی، هەموو پاڵەوانە بڤەکانی ئاش پێکەوە لای حزبی زەحمەتکێشان یەکیان گرتەوە؟ هەر کەس "لم یعد الصمت ممکنا"ی تاقمەکەی ئاش کە بە ناوی کۆمەڵەشەوە نووسیویانە؛ بخوێنێتەوە، دەزانێ ئەمانەی خاوەنی چ زەهرێکی کوشندەی خیانەتکاری بوون.

دەڵێن: "کارکردنمان بە شێوەی "تسلل"، تاوانێکی تەنزیمی و سیاسیی گەورە بوو و کارێکی ناشەرعی بووە، لەو شێوە کارە پەشیمانین... هتد." بەڵێ، ڕاستە کارکردن بە شێوەی تسلل لە کاری سیخوڕانە و خیانەتکارانەی جاسووسەکانی سی ئای ئەی و کەی. جی. بی و بەعسییە کوردکوژەکان و جاشەکانی پارتی دەوەشایەوە، ئەمانیش ئەو ڕێچکەیەی ئەوانیان گرتە بەر کە بە دوو سەر دەڕۆیشتن، پێیەکیان لەناو کۆمەڵە، وە یەکێتی، وە شۆڕش، یەکیان لەناو ئاش، دوای ئاشکرابوونیان و گرتنیان و لێکۆڵینەوە لەگەڵیان، ئینجا دانیان بە خراپی و تاوانکاریی کاری تسلل دانا.

دەڵێن: "هەر دەربارەی کەرتوپەرتکردنی هێزی پێشمەرگە و پەیوەندی کردن بە هێزی پێشمەرگەوە..." هەتا دەگاتە "بۆیە دیسان دژی جیاکردنەوەی هێزی پێشمەرگەی کوردستانین... هتد"، گەورەترین خیانەت لە حزب و تاوان بەرامبەر بە حزب؛ هەوڵدانە بۆ کەرتوپەرتکردنی هێزە چەکدارییەکەی بە مەبەستی کودەتاکردن بەسەر حزبەکەدا.

ئەمانە لێرەدا دان دەنێن بەو خیانەتە گەورەی کە هەوڵی جێبەجێکردنیان داوە، بەڵام سەری نەگرتووە و بەسەریدا گیراون (دەک ڕووڕەشی دنیا و قیامەت بن). وەک مەلا کرێکار دەڵێ، من لەوە زیاتر هیچ ڕوونکردنەوەیەکم نییە لەسەر ئەو تەقەللا قێزەون و خیانەتکاری و ڕووڕەشییەتان بەرامبەر ئەو ڕێکخراو و حزب و شۆڕشەی کە ئێوەی لە کوناوکونکردنی ماڵان هێنایە دەرەوە و کردنیانن بە خاوەن مەوقعێکی دیاری سیاسی، وەک خۆتان دەڵێن.

لە دوا پەرەگرافی خاڵی (ج)دا دەڵێن: "چونکە ئەو واقعە هەرگیز بەرگەی جیابوونەوە و شەڕی ناوخۆ و زیادکردنی لەشکرکێشی ناگرێ." ئەوەش سەلماندنی ئەو ڕاستییەیە کە نەخشەکەی ئەمانەی سەرانی ئاش بریتی بووە لە هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ و لەشکرکێشی بۆ سەر سەرکردایەتیی یەکێتی و کۆمەڵە، گەر تەقەللا خیانەتکارییەکانیان سەری بگرتایە. ئافەرم نانخۆری سفرە دڕی نمەکبەحەرام[٤٥]!

## دوایین کارم لە شۆڕشدا لەناو وڵات

دوای تەواوبوونی لێکۆڵینەوە لە مەلا بەختیار و پشکۆ و شێخ عەلی و لەسەر داوای مام جەلال کە لە نەوشیروانی کردبوو بۆ ئەوەی لە دامەزراندنەوەی مەکتەب عەسکەریی نوێدا منیش بکرێمە ئەندام مەکتەب، نەوشیروان پێی وتم کە مام جەلال داوایەکی وای کردووە، من بە نەوشیروانم وت هەرگیز ئارەزووی جێهێشتنی ڕێکخراوم نییە و پاشان من کەسێکی عەسکەری نیم، بەپێچەوانەوە هەموو ژیانی سیاسیی خۆم بە کاری ڕێکخراوەییەوە بردۆتە سەر. نەوشیروان وتی مام جەلال دەیەوێت بەشی سیاسی ڕۆڵی هەبێت لە مەکتەبی عەسکەریدا، واتە تۆی بۆ لێپرسراوی سیاسیی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەوێ، من گەرچی زۆر ناقایلیم دەربڕی،

٤٥ تکایە بۆ زانیاریی زیاتر کتێبی "چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە" بخوێنەوە لەسەر ئەم بابەتە.

بەڵام ئەنجام بە بوونم بە ئەندامی مەکتەبی عەسکەری و لێپرسراوی سیاسیی هێزی پێشمەرگەدا شکایەوە. مام جەلال و "م. س" هەستان بە پێکهێنانی مەکتەب عەسکەری، لە کەسانێک کە هەیانبوو دەرچووی ئەکادیمی سەربازی بوو، هەبوو لە پێشمەرگایەتی لە شۆڕشی ئەیلوول و شۆڕشی نوێدا قاڵبووی کاری سەربازی بوو، هەشبوو لەگەڵ ئەوەی کە کۆلێژی سەربازیی تەواو کردبوو، بەڵام هیچ ڕۆڵێکی لە کاری سەربازیدا نەبوو. مەکتەبی عەسکەری بە سەرپەرشتیی ڕاستەوخۆی مام جەلال پێک هاتبوو لەم بەڕێزانە: (شێردڵ حەوێزی، عەلی بچکۆل، سەلاح چاوشین، ملازم فوئاد چەلەبی و بەندە)، لە یەکەم کۆبوونەوەمان لەگەڵ مام جەلال، مام جەلال گەلێ بەباشی باسی ئەرکی مەکتەب عەسکەری کرد و کەوتە دابەشکردنی ئەرکەکانی بەسەر ئەندامەکاندا، بە منی وت کە ئەرکی من جگە لە سەرپەرشتیی کاری ڕابەر سیاسییەکانی مەڵبەند و کەرتەکانی پێشمەرگە، دەبێ پێکەوە گۆڤارێکی سیاسی و ڕۆشنبیریی مانگانەش بۆ شۆڕش و ڕابەر سیاسییەکان دەربکەین کە بیر و فەلسەفە و هزری یەکێتی و شۆڕشی نوێ تیا ڕەنگ بداتەوە، پاشان کەوتە باسکردنی ئازادیی کار و بیروڕای مەکتەب و نیمچەئۆتۆنۆمی لە کارکردنیدا. کاک عەلی ویستی ڕای خۆی لەسەر مەکتەب عەسکەرییەکە بڵێ و قسەکانی بە مام جەلال بڕی، مام جەلال بیری چووبووەوە کە هەر ساتێک لەوەوپێش باسی ئازادیی ڕادەربڕینی بۆ کردووین، هاتەوە بەگژ دەمی عەلی بچکۆلدا، سەرەتای سەرنەکەوتنمان لە یەکەم کۆبوونەوەدا دەرکەوت، وەک کورد دەڵێ "مانگەشەو سەرلەئێوارە دیارە". کۆبوونەوە تەواو بوو، مام جەلال داوای لێ کردم کە پێش هەموو شتێک بڕۆمە سەردانی مەڵبەندەکان و بینینی ڕابەر سیاسیی مەڵبەند و تیپ و کەرتەکان و جۆری پەیوەندییان لەگەڵ بەشە عەسکەرییەکاندا، وە لێکۆڵینەوە لەو ڕووداوانەی کە لە گرتنی سەنگاودا ڕووی داوە، لەگەڵ مەڵبەند و ناوچەکە لەسەر ڕاپۆرتی سامان گەرمیانی و ئەبو شەهاب. لە ناوەڕاستی مانگی ١٩٨٦/٥، دەستبەکار بووم لە مەکتەبی عەسکەری. لە ١٩٨٦/٦/١ لە مەڵبەندی ٢ەوە دەستم بە جەولە کرد بەسەر مەڵبەند و تیپ و کەرتەکاندا و کۆبوونەوەم لەگەڵ ڕابەر سیاسیی مەڵبەند و تیپ و کەرتەکان کرد، پاشان چوومە مەڵبەندی ٣ و دواتر مەڵبەندی ٤ی دەشتی هەولێر و دواجار چوومە بەری قەرەداغ بۆ سنووری مەڵبەندی

١. لە کاتی چوونی مندا، مەڵبەندی (١) چالاکییەکی گەورەیان ئەنجام دابوو کە بریتی بوو لە گرتنی ناحیەی سەنگاو، هەواڵ وا گەیشتبووە مام جەلال کە دوای گرتنی سەنگاو، ناحیەکە تالان کراوە بە ماڵی خەڵکەکانیشەوە. سامان گەرمیانی و ڕۆستەم کە هەردووکیان مەسئول عەسکەریی مەڵبەند بوون و شەوکەتی حاجی موشیریش لێپرسراوی مەڵبەند بوو، سامان لە مەڵبەند زوویر بووبوو، هاتبووە سەرکردایەتی و لە ڕێگەی ئەبو شەهابەوە کە بەرپرسی سکرتاریەتی مام جەلال بوو، ڕاپۆرتێکی دوورودرێژی لەسەر ئەو تالانییە دابوو بە مام جەلال. مام جەلال وەڵامی بۆ ناردم کە لێکۆڵینەوەیەکی ورد و تایبەت لەسەر ئەو بابەتە بکەم. یەکەم کۆبوونەوەم لەگەڵ ڕابەر سیاسیی مەڵبەند؛ ئاوات عەبدولغەفوور و پاشان لەگەڵ لێپرسراوی مەڵبەند و دواجار لەگەڵ ڕابەر سیاسیی تیپەکان کرد. پاش ئەوە گەیشتمە ئەنجامی ڕاستیی تالانکردنەکە، لە کۆبوونەوەم لەگەڵ کاک شەوکەت و ڕابەر سیاسی و ئەندامانی مەڵبەند، داوام لێ کردن هەموو کەلوپەلی خەڵکی سەنگاو بگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکانیان و لیستێکیش بۆ کەلوپەلەکانی ناحیەی سەنگاو بکەن و بیدەنە "م. س". کاک شەوکەت و مەڵبەند بەڵێنی جێبەجێکردنی ئەو کارەیان دا بە من. من لە گەڕانەوەدا بووم بەرەو سەرکردایەتی و مەکتەب عەسکەری، مام جەلال بە برووسکە داوای هاتنی هەموو ئەندامانی مەڵبەندی کردبوو بۆ سەرکردایەتی و لای خۆی. هێشتا ئەوان نەگەیشتبوونە سەرکردایەتی، من بە ڕاپۆرتێک سەرجەمی جەولەکەم و کارەکانم دا بە مام جەلال، مام جەلال ڕاپۆرتەکەی لێ وەرنەگرتم و پێی وتم کە ڕاپۆرتێکی دەوێ باس لەوە بکات کە کێ دزیی کردووە، کێ تالانیی کردووە، کێ پیاوخراپیی کردووە، کێ... کردووە!

ڕاپۆرتەکەی من دەقاودەق پەیوەندیی بە ئەرک و کارەکەی خۆمەوە بوو کە گەیاندنی داخوازی و پێشنیار و ڕەخنەکانی ڕابەر سیاسییەکان بوو. بە مام جەلالم وت ئەو ڕاپۆرتەی من ئەرکی خۆمە و جێبەجێم کردووە، ئەوانەی بەڕێزت لە منت دەوێ؛ ئەرکی هەواڵگرییە. مام جەلال زۆر تووڕە بوو، پێی وتم کە دەبێ ڕاپۆرتێکی بۆ بنووسم لەسەر هەموو ئەندامانی مەڵبەندی (١) کە چی دزراوە و چی تالان کراوە. من ئەو ڕاپۆرتەم نەنووسی، چونکە هەم کاری من نەبوو، هەم دەمزانی کە برادەرانی مەڵبەند بانگ دەکات و پێشیان دەڵێ ئێوە لەسەر ڕاپۆرتی برایم جەلال بانگ کراون.

دوایین جار بە ئامادەیی زۆربەی "م. س" بە نەوشیروانیشەوە ناردی بەدوامدا و لەبەر چاوی ئەوان پێی وتم: "یا تۆ لەم شۆڕشەدا نابی، یا من سکرتێری گشتی نابم، یان ئەو ڕاپۆرتەم بۆ دەنووسی." وتم بەڕێز مام جەلال تۆ هەر سکرتێری گشتییت و منیش هەر پێشمەرگەیەکی سادەم و ئامادەم بڕۆمە هەر مەفرەزەیەک بە پێشمەرگایەتی تا شەهیدبوونم وەک براکانم، یان بەلاداکەوتنی شۆڕش، بەڵام ڕاپۆرت لەسەر هەڤاڵەکانم نانووسم. من لە بارەگای مام جەلال چوومە دەرەوە، چووم بۆ لای دەزگای دارایی (مامۆستا نازم)، کە چووم؛ شێخ داراش لەوێ بوو، بۆ بەیانی شەوکەت و هەموو ئەندامانی مەڵبەند هاتنە لای مامۆستا نازم تا لە پێشەوە کەشوهەوای مام جەلال تاقی بکەنەوە. هەر هاتنە ژوورەوە، پاش ماندوونەبوون لێکردن و بەخێرهاتن، کاک شەوکەت بە منی وت: "کوڕی باش، ئێمە کەم خزمەتمان کردی، تۆ بەڵێنت بە ئێمە نەدا کە شتەکان بگێڕینەوە بۆ خاوەنەکانیان، ڕاپۆرتمان لەسەر نەنووسی؟" من هیچ وەڵامم نەدایەوە. مامۆستا نازم هاتە وەڵامدانەوەیان و پێی گوتن ئەوە ٥ ڕۆژە مشتومڕی نێوان مام جەلال و برایم جەلالە لەسەر نووسینی ئەو ڕاپۆرتە، کار گەیشتۆتە ئەوەی مام جەلال سوێندی خواردووە کە یا دەبێ ڕاپۆرتتان لەسەر بنووسێ یان نابێ لەو شۆڕشەدا بمێنێ.

ئەوسا هەموو ئەندامانی مەڵبەندەکە پۆزشیان بۆ هێنامەوە، بۆ بەیانی چوونە لای مام جەلال، مام جەلال پێی وتبوون کە سامان گەرمیانی و ئەبو شەهاب ڕاپۆرتیان لێ داون، هەمووشیانی بۆ نیوەڕۆ بانگهێشتی سەرخوانی خۆی کردبوو و هەریەکەشیان دەمانچەیەک و ڕادیۆیەکی گرانبەهای "S-S-B"ی دابوونێ. دوو ڕۆژ دوای چوونی ئەوان بۆ لای مام جەلال، لەسەر نەنووسینی ئەو ڕاپۆرتە لەسەر ئەوان، بڕیاری لادانم لە "م. ع" دەرچوو. پاش یەک هەفتە مام جەلال ناردی پێشمەرگەکانی مەفرەزەکەم چەک بکەن، چەکەکان هیی ناوەندی کۆمەڵە بوون کە لە ڕێکخراوەوە چووم بۆ "م. ع"، ڕێگەیان دام لەگەڵ خۆم بیانبەم، بۆیە چەکەکانم نەدا بە "م. س" و ناردمەوە بۆ ناوەندی کۆمەڵە، ناوەندی کۆمەڵەش ٣ پێشمەرگەی بە چەکەوە ڕێگە دا کە لەگەڵمدا بن. لەو ماوەیە کەپرێکم لەبەردەم ئەو کونە فرۆکەیەی کە بۆ زیندانی مەلا بەختیار دروست کرابوو، دروست کرد. کونە فرۆکەکە هەر ژوورێکی هەڵکۆڵراوی ٣×٢م

دەبوو. لەو ماوەیەش باوکم ماڵئاوایی یەکجاریی کردبوو، دایکم و خوشکەکانم و هاوسەرم بەو بۆنەیەوە هاتبوون بۆ لام، ئا لەو کاتەدا مام جەلال بە سەلاح چاوشین و عەلی بچکۆل و فەرەیدوون قادردا وەلامی بۆ ناردبووم کە ئەو کونە فرۆکەیە چۆڵ بکەم، دەیکەین بە "مشجب"ی "م. س" لە هەڵەدن کە بارەگای "م. ع" لەوێ بوو. بەڕاستی سەیر بوو کە کونێکی وا چۆن دەکرێ بە "مشجب"، چەک و تەقەمەنیی تیا دادەنرێ!

بە زۆرملێ و ناچاری چۆڵم کرد و چوومە ناو خانوویەکی چۆڵی یاخسەمەرەوە، مام جەلال وازی لێ نەهێنام، بڕیاری دابوو لە شۆڕشدا نەبم، بۆیە دواجار بە نەوشیروانی وتبوو کە بە برایم بڵێن با بنێرێ هاوسەری و منداڵەکانی بێن بۆ لای، چونکە وەک نوێنەری یەکێتی دەینێرین بۆ ئەڵمانیا بۆ کاری ڕێکخراوەیی. چوومە لای مام جەلال و بە بەڕێزیم ڕاگەیاند کە ئێمە سێ برابووین لەم شۆڕشە، دووانیان شەهید بوون، ئێمە بەڵێنمان بە یەکتری دابوو کە هەرگیز یەکتری و شۆڕش و کۆمەڵە و یەکێتی بەجێ نەهێڵین، ئەوان شەهید بوون و من نامەوێ گۆڕەکانی ئەوان پشت خۆم خەم و بڕۆمە دەرەوەی وڵات، جگە لەوەش:

١. من زمانزان نیم، نە ئینگلیزی، نە ئەڵمانی، نە فەرەنسی، تا بتوانم کاری نوێنەرانی یەکێتی بکەم لە ئەڵمانیا.

٢. من لە تەمەنێکدا نیم چاوم لە خوێندن و بەڵگەنامەی بەرز بێ.

٣. من کوڕی پیاوێکی دەوڵەمەند نیم، تا ئارەزووی خەرجکردنی سامانی باوکم بکەم.

٤. لە شۆڕشیشدا هیچم نەدزیوە تا لە دەرەوە سپیيان بکەمەوە.

٥. گەنجێکی سەرچڵیش نیم، ئارەزووی ڕابواردنم هەبێ لە دەرەوەی وڵات.

٦. من هاوسەرێک و سێ منداڵم هەیە، بۆ کوێیان بەرم!

مام جەلال وەلامی دامەوە کە بارودۆخی سەرکردایەتیی شۆڕش لە بارێکی خراپدایە و نامانەوێ تۆش وەک براکانت شەهید ببی، بۆیە بڕیار دراوە کە د. خەسرەو خاڵ بۆ سووریا و د. کەمال خۆشناو بۆ لیبیا و تۆش بۆ ئەڵمانیا بنێرین، تۆ وەک ئەندامی مەڵبەندی دەرەوەی وڵات، بۆیە وەلام بۆ هاوسەرت و منداڵەکانت بنێرە با

بێن و خۆتان ئامادە بکەن بۆ سەفەر. مام جەلال بەڵێنی پێ دام کە لە ئەڵمانیا شوێنی نیشتەجێ و مانگانەی خەرجی و بژێویی مناڵەکانم، یەکێتی دابینی دەکات.

## ڕۆیشتنم بەرەو هەندەران

ئەو کاتە گەرمەی هێرشەکانی ڕژێمی بەعس بوو بۆ سەر ناوچەکانی سەرکردایەتی. لە ١٩٨٦/١٠/١٢ ناردم بەدوای شوکریی هاوسەرم و مناڵەکانم هاتن بۆ لام. بۆ سەلامەتیی ئەوان لە تۆپبارانی ناوچەکە، چووینە دەزگای دارایی کە کونە فڕۆکەیەکی زۆر قایم و سەلامەتیان دروست کردبوو. لەوێ کە نزار بەرپرس بوو، خەیمەیەکیان داینێ لەپەنای کونە فڕۆکەکەدا هەڵماندا. وەرز بەرەو ساردی و تەڕوتووشی دەچوو. ماوەی ١٧ ڕۆژێک لەو بەرباران و تۆپبارانە بە نانەسکیی دەزگای دارایی بردمانە سەر. لە ١٩٨٦/١٠/٢٩ لەژێر تۆپبارانی ڕژێم بەرەو سەفەرە ڕۆیشتین، دوو وڵاخمان پێ بوو، دوو پێشمەرگەشمان لەگەڵ بوو (ئاوات عومەر کاکل و مەلا خالید)، لە سەفەرە ئەوانم ناردەوە بۆ لای سەرکردایەتی و خۆیشمان شەو لە کونە فڕۆکەکەی ماڵی کاک حەمیدی گومرگ ماینەوە، مناڵەکانی ناردبۆوە بۆ سلێمانی، لە تۆپبارانی نیوەشەودا تۆپێک دای لە نزیک کونە فڕۆکەکە، ئیتر مندالەکان نەیانوێرا لە کونەکە بمێننەوە، تا بەیانی لە دەرەوە لەبەر باران مانەوە.

ڕۆژی دوایی کاروانچییەکان لەبەر زۆریی باران و هەستانی ئاوی چەمەکە نەیانتوانی لە چەمەکە بدەن، ئەو ڕۆژ و شەوەش لەبەر بەزەیی باران و تۆپ ماینەوە. ڕۆژی ١٩٨٦/١٠/٣١ لە چەمەکەمان دا و ڕووەو ئەودیوی سنووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەژێر دەستڕێژیی گوللەی بیکەیسیدا تا ئێوارە گەیشتینە ئەو گوندەی کە ماڵی کاروانچییەکەی لێ بوو. هێشتا نانمان نەخواردبوو، لەبەر زۆپا دارەکەیان خۆمان وشک دەکردەوە، لەپڕ مامۆستا عەزیزی نوێنەری یەکێتی لەسەر سنوور لەگەڵ دوو پاسدار خۆیان کرد بە ژووری ماڵەکەدا، خاوەن ماڵ زۆر ترسا و داچڵەکی و کەوتە پاڕانەوە لە من کە باسی تووڕەبوونەکەی ڕێگەی بۆ مامۆستا عەزیز نەکەم، ناحەقیشیان نەبوو، چونکە زۆر ماندوو بوون بەدەست مندالەکانمەوە لە سەرکەوتن و دابەزینی دۆڵ و شاخەکان. شەوی ١٩٨٦/١١/١ لە کەمپەکەی ئەوان ماینەوە، ڕۆژی

١٩٨٦/١١/١ مامۆستا عەزیز بە ئۆتۆمبێلی سوپای پاسداران ئێمەیان نارده سەردەشت. دوای ئێمە بە ٥ ڕۆژ، د. خەسرەو خاڵ و د. کەمال خۆشناو و شێرکۆ بێکەسیش گەیشتنە سەردەشت، وتیشیان نەوشیروانیش هاتووە و چووە بۆ تاران. ماوەی ٤ مانگ لە سەردەشت ماینەوە، خانووم گرتبوو. لە مانگی ١٩٨٧/٣ کاک ڕەفعەتی مەلا تەلەفۆنی بۆ کردم کە بچینە تاران و چاوەڕێی هاتنی ڤیزاکەمان بکەین. لە تارانیش ژووریکمان لە کوچەی عەرەب گرت، چونکە توانای کرێی هوتێل پارسمان نەبوو کە خواپێداوەکان لێی دەژیان. لە ڕۆژی ١٩٨٧/٤/١٢ کاک ڕەفعەت ناردی بەدوامدا کە بچینە ئوتێل پارس، وتی گوایە ڤیزەکانمان بۆ ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات هاتووە دەتوانین برۆین، بەڵام برووسکەیەک لە مام جەلالەوە هاتووە، دەڵێ بەپەلە برایم جەلال بگەڕێتەوە سەرکردایەتی، هەندێ بەڵگەنامەی بەپەلە هەیە لەگەڵ خۆی بیبات بۆ ئەڵمانیا و بیدا بە نەوشیروان و کەمال فوئاد. کاک ڕەفعەت ئەوەشی وت کە گوایە مامۆستا نازم لە گوندی "بنیو خەلەف" ئاگادار کراوە کە کارئاسانی بۆ چوونم بکات بۆ یاخسەمەر بۆ لای مام جەلال.

ڕۆژی ١٩٨٧/٤/١٤ گەیشتمە گوندی "بنیو خەلەف"، بارەگای دەزگای دارایی لای مامۆستا نازم و ڕاسپاردەکەی مام جەلال و کاک ڕەفعەتم پێ وت، مامۆستا نازم وەڵامەکەی ئەوە بوو کە ئەو هیچ شارەزاییەکی نییە و ناتوانێ هیچ هاوکارییەکی من بکات. منیش ئەو شەوە لەوێ مامەوە و بۆ بەیانی بە نازمم وت کە دەگەڕێمەوە تاران، بەڵام لەپشتی ئەوەوە بە چەماوچەم بەرەو شێنێ ڕۆیشتم و لەوێشەوە بۆ سونی بۆ لای بارەگای مەلا حەسەن ئەندامی دەفتەری سیاسیی حزبی دیموکرات کە بەرپرسی نێوان قەڵادزێ و ئەودیوی سنوور بوو، پەیامەکەی مام جەلالم بەدەمی پێ گەیاند. مەلا حەسەن هاوکارییەکی لەڕادەبەدەری کردم و گەیاندمیە گوندی "سندۆلان"، لەوێشەوە بە شاخی ئاسۆسدا ئاودیوی گوندی مەرگە بووم، شەو لەلای کاک زیرۆ عەبدوڵڵا مامەوە. ڕۆژی ٤/١٦ ئێوارە گەیشتمە لای مام جەلال، دوو ڕۆژ پێشتر کیمیابارانی دۆڵی جافایەتی کرابوو، واتە لە ٤/١٤دا. مام جەلال هەموو بەڵگەنامەکانی دامێ کە پەیوەندیی بە پارەکەی بانکی ڕافیدەینەوە هەبوو کە حەمە میرزا لای دابوو، ناردبوویە بانکەکانی سوید، تا د. عومەر شێخ موس بەو بەڵگەنامانە بتوانێ وەریبگرێ. من ڕۆژی

دواتر گەڕامەوە بەرەو تاران و ڕۆژی ١٩٨٧/٥/١ ڕۆژی یادی جەژنی کرێکاران لە ئێوارەدا بوو، گەیشتینە بەرلینی ڕۆژهەڵات.

## مەرگی کتێبەکانم

بەندە هەر لە مێردمنداڵییەوە کاتێ کە قوتابیی ناوەندی و دواناوەندی بووم، ئالوودەی کتێب کڕین و کتێب خوێندنەوە بووم، بۆیە تا ساڵی ١٩٦٣ کتێبخانەیەکی بچووکی خنجیلانەم بنیات نا. پاش بوونم بە پێشمەرگە ساڵی ١٩٦٢، کتێبەکانم بوونە بەشێکی گرنگی ئەرکی دایکم لە پاراستنیان لەو هەموو کۆچوبەرەی کە بە هۆی من و شۆڕشی ئەیلوول تووشی ماڵی باوکم هاتبوو، لە ڕانیەوە بۆ دۆڵی شەهیدان، لەوێوە بۆ دیوی مەرگە و کانی توو، گەڕانەوە بۆ سەنگەسەر تا لە هاوینی ١٩٦٣ و هێرشی کتوپڕی جاش و سەربازی میری بۆ سەنگەسەر، هەموو کتێبەکانم بوونە خۆراکی ئاگری دروستکردنی کولێرە ساوەر. دیسان هەر لە ساڵی (١٩٦٤)ەوە کەوتمە کتێب پەیداکردن و کۆکردنەوەی کۆمەڵێک دەستنووسی مەلا و مامۆستا و زانای ئایینیی مزگەوتەکانی ئەو دێیانەی لە شۆڕشدا ڕێم تێیان دەکەوت و پاشان ئەو کتێبانەی کە لە ساڵی ١٩٦٧ و تا ساڵی ١٩٧٧ کۆم کردبوونەوە، ئەو کتێبانەشم پاش چوونەدەرەوەم بۆ شۆڕشی نوێ لە ١٩٧٨دا، وەک هەتیوی بێ کەسوکار بەسەر ماڵی خزماندا دابەش کرا، ئەوانیش لە ترسا لە توونی حەمامی ماڵەکانیان حەشاریان دابوو کە نەبوومە خاوەنی یەک تاکە کتێب. دواجار کەوتمە کۆکردنەوەی کتێب لەناو شۆڕش و لە بارەگا کاتی و سەفەرییەکاندا دەمپاراستن، تا بڕیاری شۆڕش بەدەرکردنم، پێش ڕۆیشتنم بۆ ئێران، ئەوانەشم دایە باوەڕپێکراوترین هاوڕێم؛ شەهید سالاری حاجی دەروێش کە ئەگەر یەکمان دیتەوە، ببمەوە بە خاوەنی کتێبەکانم، بەڵام ئەمانیش وەک سالار بە ناحەق جوانەمەرگ کران و چاوم پێیان نەکەوتەوە.

## لە یاخسەمەرەوە بۆ بەرلینی ڕۆژهەڵات

هێشتا ڕۆژ مابووی ئاوا ببێ، فڕۆکەکەمان لە تارانەوە بەڕێ کەوتبوو، لە فڕۆکەخانەی بەرلینی ڕۆژهەڵات نیشتەوە، بەرواری ١٩٨٧/٥/١، ڕۆژی جەژنی

کرێکاران لە وڵاتێکی سۆشیالیستی و لە گۆڕەپانی کارل مارکس. دوای دابەزینمان لە فڕۆکەکە، ڕووەو ناو فڕۆکەخانەکە ڕۆیشتین، خەڵکەکە هەموو ڕیزیان بەست لەبەردەم سێ دەرگای شووشەدا کە پۆلیسەکانی فڕۆکەخانە پشکنینیان لەسەر پاسپۆرت و ڤیزە و کەلوپەلەکانی سەفەرکەران دەکرد، هەر کەس پاسپۆرتەکەی دەدا بە پۆلیسێک، دوای کەمێک سەیرکردنی؛ ڕێگەیان دەدا کە ئاودیوی هۆڵی کەلوپەل وەرگرتنەوەکەیان ببن. ئێمە و ماڵێکی تریان گل داینەوە و هەر ماڵەیان کردینە ژوورێکەوە، شوکری و مناڵەکان ترسێکی زۆریان لێ نیشت، نەک لەبەر گەڕانەوەمان کە شوکری زۆری پێ خۆش دەبوو، بەڵکە لە ترسی گرتن و ئازاردانمان. دوای سێ چارەک سەعاتێک، دەرگاکەیان لێ کردینەوە و ئێمەشیان مەرەخەس کرد بۆ چوونمان بۆ هۆڵی کەلوپەل وەرگرتنەوە. کە ئاودیو بووین، هۆڵەکە جگە لە پۆلیسەکان؛ هیچ سەفەرچییەکی لێ نەمابوو. ئێمە نەناس و نەشارەزا نەماندەزانی چی بکەین، ژمارەی تەلەفۆنی د. کەمال فوئادمان لا بوو، تێلم بۆ کرد، ئامۆژگاریی کردین کە هەر چەندە زۆر گرانە، بەڵام باشتر وایە یەک دوو ڕۆژێک لە ئوتێلی فڕۆکەخانە بین. ئوتێلەکە لە فڕۆکەخانەوە نزیک بوو بە پرسیاری و زمانی نێونەتەوەیی کە ئاماژەکردنە، چووینە ئوتێلەکە. لە ئوتێلەکەوە گوێمان لە هاتوهاوار و مۆسیقای ئاهەنگەکە بوو و خۆمان نەگرت و پاش دانانی شتەکانمان، چووینە دەرەوە بەرەو ئاپۆرای خەڵکەکە. ئەوەندەی جۆری ڕازاندنەوەی مەیدانی کارل مارکس و هەیکەلەکەی سەرنجی ڕاکێشام، ئەوەندەش لام سەیر بوو کە تووشی خەڵکانێک بووم بە عەرەبی ئاخاوتنیان دەکرد. لێیان نزیک بوومەوە، ئەوانیش جلوبەرگ و شێوەی ئێمە سەرنجی ڕاکێشان، یەکیان هاتە لامەوە بە عەرەبی وتی دۆلار ناگۆڕیتەوە، منیش وەک هەنگم لە کلۆرەداردا دۆزیبێتەوە، خێرا دوو سەد دۆلارم دایە، ئەویش پێنج سەد مارکی ئەڵمانیی ڕۆژهەڵاتیی دامێ. ئەو ئێوارەیە و دوو ڕۆژی تریش لە بەرلینی ڕۆژهەڵات ماینەوە، سەرسام بووین بە شێوەی خانووبەرە و شەقام و شێوەی بازارەکانیان، بەڵام پێمان سەیر بوو کە ئەوێ گوایە ئەورووپایە، بەڵام جگە لە شێوەی پۆشینی پۆشاکی کچ و ژنانیان کە زۆر جیاواز بوو لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی وڵاتانی لای خۆمان، دەنا تاران زۆر لەو بەرلینە پێشکەوتووتر بوو. ڕۆژی سێیەم د. کەمال فوئاد تێلی بۆ کردم بۆ ئوتێلەکە کە ئامادە بین لە ئێوارەدا دێ بۆ لامان و دەمانبات بۆ

بەرلینی ڕۆژئاوا. ئێوارە هات و کەلوپەلەکانمان کە لە ٤ جانتادا بوو، بەدوای خۆمانا ڕامانکێشا و دوای ئەو کەوتین. ئێمەی کرد بەژێر زەوییەکدا کە شەمەندەفەری پیا دەهات و دەچوو، پاشان بردینی بۆ بەردەم سێ چوار دەرگای شووشە و پێی وتین ئەمدیو بەرلینی ڕۆژهەڵاتە و ئەودیوی ئەو پۆلیسانە بەرلینی ڕۆژئاوایە، واتە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوان، وتیشی من لە ئێوە جیا دەبمەوە، ئەگەر ئێوەیان گل دایەوە و نەیانهێشت بڕۆن؛ باسی من مەکەن، خەمتان نەبێ هیچتان بەسەر نایەت، چونکە ئێوە بە ڤیزەی فەرمیی یەک مانگ هاتوون، دەتانگێڕنەوە بۆ ئوتێلەکەتان، لە هەلێکی تردا هەوڵی قوتاربوونتان دەدەین. ئێمەش چووینە ڕیزەوە، پیرە لێزە پاسم گرت بە دەستمەوە، بەڵام لەو کاتە لەو دەرگایەی ئێمەی لێ وەستابووین، پۆلیسەکە خەریک بوو بە کارێکەوە ئاگای لە ئێمە نەبوو، ئێمەش بێ وەستان و خۆتێکدان بەردەوام بووین لە ڕۆیشتن، من لە پێشەوە و شوکری و منداڵەکانیش بە کێشکردنی جانتاکان بەدوامەوە هاتن، هەر ئەوەندەی ١٠٠ سەد مەترێک لەو بازگەیە دوور کەوتینەوە، د. کەمال لەسەرمان وەستابوو، بەیەک گەیشتین، پێی وتین تەواو ئێرە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و بەرلینی ڕۆژئاوایە. بەردەوام بووین لە ڕۆیشتن، پاش تۆزێک سواری شەمەندەفەری ژێرزەویی کردین، لەپڕ لە وێستگەیەک ئێمەشی لەگەڵ خۆی دابەزاند.

باران وردە وردە دەباری، بە منی وت کاک نەوشیروان و کاک سەلاح ڕەشید لە قاوەخانەیەکی نزیکی ئەم ناوە چاوەڕێتانن. بەو باران و بەو شەوە لەسەر ئەو شەقامە بە تەقەتەقی جانتاوە دەڕۆیشتین، منداڵەکان هاواریان لێ هەڵستا کە سەرمایانە با بە تەکسی بڕۆین، د. کەمال قایل نەبوو، نازانم بۆچی، هەر دەیوت ئەوەندەمان نەماوە. بە کوردی و کورتی ٤٥ خولەک بەو بارانە ڕۆیشتین تا گەیشتینە قاوەخانەکە. دوای بەخێرهاتن و قاوە خواردنەوە، بەڵگەنامەکانی کە بردبووم؛ دامە دەست نەوشیروان. پاشان وتیان نان بخۆین، من وتم نانمان خواردووە، چونکە هەر یەکەم ڕۆژ دوو سەد دۆلارم گۆڕیوەتەوە، (٥٠٠) مارکیان داومەتێ. د. کەمال پێکەنی و وتی: "پارەی سەد دۆلاریان داوە بە تۆ، چونکە هەر سەد دۆلار؛ نرخی ٥٠٠ مارکی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتییە و ئەو پارەیەشتان لێرە لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا شتێکی ئەوتۆ ناکا." ئەوسا زانیمان کە فێڵمان لێ کراوە. دوای کاتژمێرێک بە دوو ئۆتۆمبێلی سەلاح ڕەشید و د. کەمال فوئاد

سواریان کردین و بردیانینە بەردەم دەرگایەکی حەوشەی گەورە و دایانبەزاندین وتیان ئێرە لاگەرە (کەمپی ئاوارە و ڕاکردووانە)، لێرە دەتاندەین بەدەستەوە. لەبەردەم دەرگاکە ژوورێکی بچووک هەبوو، پیاوێکی ئەڵمانی زاتی شەقوشڕ هاتە بەر دەرگا، نەوشیروان و د. کەمال فوئاد لەناو ئۆتۆمبێلەکەی د. کەمال فوئاد مانەوە دانەبەزین، بەلام سەلاح ڕەشید بە ئەڵمانی بە کابرای وت ئەمانە هاتوون خۆیان دەدەن بەدەستەوە، شارەزا نەبوون من هێناومن، هەر ئەوەندە و ئیتر ئێمەیان کردە ئەودیوی دەرگاکە و لێیاندا ڕۆیشتن. کابرای کە هیچ شێوەی لە ئەڵمانی نەدەچوو، بە ئاماژەکردن بۆمان پێشمان کەوت و ئێمەی بە کەلوپەلەکانمانەوە کرد بە ژوورێکی زۆر گەورەی پڕ لە دۆشەک و بەتانی و سەرین و سەرچەف و بەرگی پیس و بۆندارددا. ئەو شەوە شەوی شەممە بوو، بۆ شانسی ئێمە سێ ڕۆژ لەسەر یەک پشووە، ئێمە هەر لەو عەماری کەلوپەلە پیسانەدا ماینەوە. دوایی زانیمان ئێشکچییەکە فارسە و ئەڵمانی دەزانێ.

## بەشی نۆیەم

## لاگەر - کەمپ - شوێنی ئاوارەکان

لە ژیانم تا ئەو شەوە کە یەکەم شەوی لاگەرمان بوو، زۆر ڕۆژان و شەوانی سەخت و دژوارم بینیوە، بەڵام هەرگیز وەک ئەو شەوە کاری لە بیر و هزر و ویژدانم نەکردبوو، ئەو شەوە وەک ئەم کتێبە؛ هەموو ڕابردوو و قوربانییەکانی خۆمم هاتەوە بەرچاو، لە بەرامبەردا بەڵێنە ناڕاستەکانی کە پێیان دام و بێوەفایی و بێتوانایی ناوەندی کۆمەڵە و سەرکردایەتیی یەکێتی بەرامبەر بڕیاری مام جەلال. لە سەرکردایەتی بە منیان وت کە د. خەسرەو خاڵ و د. کەمال خۆشناو و بەندە وەک نوێنەر و کاربەڕێکەری یەکێتی لەو سێ وڵاتە کار دەکەین، کرێی خانوومان، خەرجیی ڕۆژانە و مانگانەمان لەسەر یەکێتی دەبێ، کەچی نوێنەرانی یەکێتی لە بەرلین بۆ یەک شەویش لە ماڵی خۆیان نەیانحەواندینەوە، چ جای گرتنی ئوتێل و خانوو بۆمان، ئای کە سیاسەت پڕە لە فێڵ و تەڵەکەبازی! وای کە درۆ بۆ پیاوی گەورە و سیاسەتمەدار بەشێکە لە ژیانیان! لە لایەکەوە بۆگەنی دۆشەک و بەتانی و بەرگە سەرین و چەرچەفی پیس و بۆگەن، لە لایەکی تریشەوە تانەوتەشەری شوکریی هاوسەرم کە لێی دەدام سەبارەت بە ڕەنجی بیستساڵەی پێشمەرگایەتیم و ٢٥ ساڵەی خەباتی سیاسیم و گریانی بەکوڵی منداڵەکانیشم وەک سەربار، بە جۆرێک هەراسانی کردبووم کە نە هۆش و نە بیرێکی حەساوەم لا نەمابوو. نە ئەو شەوە و نە دوو شەوەکەی تری ناو ئەو کانتینە، خەو نەچووە چاومان و هەر بەچیچکانەوە لەسەر جانتاکانمان بەڕێمان کرد. هەموو ساتێکم بە ساڵێک لێ دەڕۆیشت و تفم لە خۆم و لە بەڵێنی درۆ و لە هەموو شتێک دەکرد. دوای ئەو سێ ڕۆژی پشووە، فەرمانبەرەکانی کەمپ گەڕانەوە کەمپەکە و ئێمەیان بردە ژوورێکی پوخت و گەرم و پاکوتەمیز کە دوو قەرەوێڵەی

سەروخواری دوو کەسی و قەرەویڵەیەک تەنیا و پێخەفی پاک و بەفرگرێک (سەلاجە) و تەلەڤزیۆنێکی بچووکی تێدا بوو، ژوورەکە لەسەر ڕاڕەوێک بوو کە چەندین ژووری تری لەسەر بوو، دوو مانگمان لەو دەستبەسەرخانەیە بردە سەر، هەفتەی دوو جار تکتی پاس و شەمەندەفەریان دەداینێ بۆ چوونە بازاڕ و ناوشار. ڕۆژانە بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە دەبووایە بە خۆمان و قاپەکانمانەوە بڕۆیشتینایە بەردەم چێشتخانە و لە ڕیزدا بوەستاینایە تا سەرەمان بەر دەکەوت. لەو دوو مانگە، وێنەی خۆمان و پەنجەمۆری هەر دە پەنجەکانیان گرتین و لێکۆڵینەوەی سەرەتاییان لەگەڵ کردین. هەر لە گەیشتنمان بە بەرلین، د. کەمال فوئاد ئامۆژگاریی کردم کە لە لێکۆڵینەوەدا نەڵێم پێشمەرگە بووم، دەبێ بڵێم مامۆستا بووم لە دێیەکانی ناوچەی دەسەڵاتی شۆڕش دەرسم وتۆتەوە، بەڵام من لە یەکەم لێکۆڵینەوەدا هەموو ڕاستییەکان و پلە و کاری ناو حزب و شۆڕشم باس کرد. لە ماوەی ئەو دوو مانگە، یەک جار د. کەمال فوئاد سەردانی کردین، یەک جاریش سەلاح ڕەشید بانگهێشتی ماڵی خۆی کردین بۆ نیوەڕۆخوانێک، یەک جاریش هاوڕێ شاخ بانگهێشتی ئێوارەخوانێکی کردین، سێ چوار جاریش فایەق مەنمی بانگهێشتی ماڵەکەی کردین کە خێزانەکەی ئەڵمانی بوو. د. کەمال فوئاد و سەلاح ڕەشید پەیتا پەیتا دووپاتیان دەکردەوە کە داوای مانەوە نەکەم لە بەرلین، لەبەر ئەوەی کە حکومەتی بەرلین لەگەڵ پەنابەران باش نین و بە چەندین ساڵ دان بە مافی پەنابەرێتی دانانێن. ئێمەش لە لێکۆڵینەوەدا کە شاخ وەرگێڕمان بوو، داوامان کرد لە بەرلین نەمێنین. من لەپاش یەک دوو ساڵ درکم بە هۆکاری هەوڵی ئەو دووانە کرد کە بۆ دەیانویست لە بەرلین نەبم، بەڵام تازە بەسەر چوو. دوای دوو مانگ ئێمەیان نارد بۆ کەمپێکی تر لەسەر ئاوی «راین» بە شێوەی کاتی کە هەر ٢٠ ڕۆژی خایاند و پاشان ناردیانین بۆ گوندی «بروخ میوهل باخ» کە سەر بە سنووری شاری «کایزەر سلاوتێرن» بوو.

## بروخ میوهل باخ، جێ نزرگەی دوو ساڵمان

بروخ میوهل باخ (Bruchmuhlbach)، گوندێکی زۆر بچووکە کە نزیکەی ٨٠ ماڵی تێدا دەژیا، ساڵی ١٩٨٨ لەو ٨٠ ماڵە، ٥٠ ماڵیان ئەمەریکی بوون و سێ ماڵی

پەنابەریشی لێ بوو، ئێمە و ماڵێکی فارس و ماڵێکی کوردی ئێزیدیی خەڵکی باکووری کوردستان، نزیکەی ۲۵ ماڵێکی ئەڵمانیشی لێ بوو کە هەموویان بە جۆراوجۆر کاریان لەلای ئەمەریکییەکان دەرکرد. لەدوای شەڕی جیهانیی دووەم کە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات لە نیشتمانی ئەڵمانیا دابڕا و کەوتە ژێر دەسەڵاتی یەکێتیی سۆڤیەتەوە. بەشەکەی تری ئەڵمانیا کە بە "ئەڵمانیای ڕۆژئاوا" یان "ئەڵمانیای دیموکرات" ناو نرا. لە ڕووی سەربازییەوە بوو بە مۆڵگای دەسەڵاتی سەربازی (ئەمەریکی، ئینگلیزی، فەرەنسی)، ئەم بروخ میوهل باخە یەکێک بوو لە سەربازگە گەورەکانی ئەمەریکا لە ئەڵمانیا. ئەم گوندە کرابووە جێگەی پەزمەنەکردنی چەکە دوورهاوێژەکانی ئەمەریکا و فرۆکەخانەیەکی تایبەت بە فڕۆکە جەنگییە پێشکەوتووەکانی ئەمەریکا. لەم دێیە فەرمانگەیەکی بچووکی جێبەجێکەری کاروباری هاوڵاتیانی ئەڵمانی و پەنابەرانی تێدا بوو، خوێندنگەیەکی (سەرەتایی، ناوەندی، دواناوەندی) تێدا بوو، بەشی فێربوونی پیشە و سوپەرمارکێتێکی بە ناوی (LIDL) لیدل و دووکانێکی گۆشتفرۆشی و فیتەرخانەیەک و بەنزینخانەیەک و سێ پاسی هاتوچۆی تێدا بوو. ئەو دێیە سەر بە ناوچەی "راین لاند پفالس" بوو، شارە گەورەکەی کە زۆر لێی نزیک بوو، ناوی "کایزەر سلاوتێرن" بوو. سەرەتای دەستپێکردنی کاری سیاسیی من لە ئەڵمانیا لەم دێیەوە دەستی پێ کرد و لەم دێیەوە شوقەیەکیان لە قاتی سێی باڵەخانەیەک دایێ کە هۆڵێک و سێ ژووری نووستنی تێدا بوو، لەگەڵ گەرماو و دوو باڵکۆنی هەبوو. سۆسیال هەموو کەلوپەلە سەرەتاییەکانی بۆ دابین کردین، وەک: پێخەف و قاپوقاچاغ و تاقمی دانیشتنی هۆڵ و تەختی نووستن. لە مانگی (۱۹۸۷/۸)ەوە کەوتمە گەڕان بەدوای ئەو هاوڕێیانەی کە سەلاح ڕەشید لیستی ناوەکانی بە پۆست بۆ ناردبووم کە تەنیا ۱۷ ناوی تیا بوو، لەوانە ۱۱ ئەندامی کۆمەڵە و ٦ ئەندامی شۆڕشگێران. سەرەتا بە شەمەندەفەر دەچوومە لایان کە بەڕاستی هەر چییەکم لە یارمەتیی سۆسیال وەردەگرت، لە ڕێگەی هاتوچۆدا خەرجم دەکرد. پاشان لەو پارەیەی کە مام جەلال دابووی پێم، ۱۵۰۰ دۆلاری مابوو کردم بە مارک و ئۆتۆمبێلێکی کۆنی ئۆپڵ کادێتم لێ کڕی بە ۸۰۰ مارک، هاتوچۆی ئەو شارانەم پێ دەکرد کە کوردی لێ بوو، بەتایبەتی کوردی سۆرانی، پاشان کەوتمە سمینارگرتن لەسەر کیمیابارانکردنی

هەڵەبجە و دۆڵی جافایەتی و بالیسان و شێخ وەسانان و بەری گەرمیان، لە شارەکانی (هامبرگ، هانۆڤەر، ماینز، میونشن، بەرلین). ڕۆژێک لە سۆسیالەوە نامەیەکم بۆ هات کە بچمە لایان، سۆسیالەکەمان لە گوندێکی تری نزیکمان بوو ناوی "میساو" بوو، بە ئۆتۆمبێلەکەم چووم بۆ سۆسیال، فەرمانبەری سۆسیال ناوی "میڤس" بوو، لێی پرسیم کە من یاسای پەنابەریی ئەڵمانی دەزانم؟ منیش بەو چەند کەلیمە ئەڵمانییەی کە هەموو بەیانییەک ٢٠ وشەم دادەنا بۆ لەبەرکردن و لە فەرهەنگێکی فارسی ئەڵمانیم دەردەهێنان، بە (nien) ناین وەڵامم دایەوە، پاشان کات ١٠ی بەیانی ڕۆژی دوایی دامێ کە وەرگێڕێک لەگەڵ خۆم بەرم کە ئەڵمانی بزانێ، بۆ ڕۆژی دوایی کاک فەرهادی مامۆستا عومەر عەبدولڕەحیمم برد کە لە شارۆچکەیەکی زۆر نزیک گوندەکەی ئێمە دەژیـان ناوی "هۆم بـورگ" بوو، لەو ماوەیەش ئاشنایەتییەکی باش و تێکەڵاویی خێزانیمان لەگەڵ یەک پەیدا کردبوو. میڤس لەگەڵ فەرهاد بە ئەڵمانی کەوتە دووان و پاشان فەرهاد پێی وتم دەڵێ: بۆ ئەوەی لە یاسای پەنابەری ئەڵمانی بزانێ پێی بڵێ:

١. بۆی نییە لە ٣٠ کیلۆمەتر لەو دێیە دوور بکەوێتەوە.

٢. بۆی نییە هیچ پارەیەکی لە بانکدا هەبێ.

٣. بۆی نییە کە ئۆتۆمبێلی هەبێ، چونکە ئەو پارەیەی ئێمە دەیاندەینێ بۆ ژیانە، نەک بۆ خەرجیی ئۆتۆمبێل.

٤. بۆی نییە هیچ جۆرە ئیشێک بکات بە پارە، هەتا بڕیاری وەرگرتنی بە پەنابەری سیاسی دەردەچێ.

٥. بۆی نییە هیچ دەستکەوتێکی ماددیی لە هەر شوێنێکەوە پێی بگات، لە سۆسیالی بشارێتەوە.

بەکورتی: بەم خاڵانە و بە بەڵگەوە پێی وتم کە من زۆر پێچەوانەی ئەو یاسایانە جووڵاومەتەوە، دراوسێ ئەڵمانەکان لای سۆسیال زمانیان لێ داوم کە زۆر سەفەر دەکەم کە ئۆتۆمبێلم هەیە. منیش هەموو ڕاستییەکانم پێ وت کە من بۆ کاری سیاسی بۆ حزبەکەم هاتوومەتە ئەڵمان و بۆ هەموو شارە زۆر دوور و نزیکەکانی کە کوردی لێ بێ؛ ڕۆیشتووم و ئەو ئۆتۆمبێلەشم کڕیوە، چونکە دەرەقەتی پارەی سەفەر بە شەمەندەفەر نایەم. میڤس پێکەنی و وتی مادام ئاوا ڕاشکاوانە ڕاستییەکان دەڵێی،

نامەیەک بنووسە "ئەو ئۆتۆمبیلەی" بەدیاری لە کەسێک یا هاوڕێیەکی وەرگرتووە و ئەم پسووڵەیەی ئێمەشی پێ بێ کە ئێمە ڕێگەی هاتوچۆمان داوە بۆ شارەکان لەبەر نەخۆشی و باری دەروونیی خراپی هاوسەرەکەی. ئەگەر پۆلیس لە هەر شوێنێک گرتیان، ئەو پسووڵەیە نیشان بدات، لەگەڵ ڕاپۆرتی پزیشک کە دکتۆر لەسەر نەخۆشیی هاوسەرەکەی نووسیوە. دوای ئەوە سەرفراز بووم لە سکاڵای ئەڵمانەکان و داواکاریی سۆسیال. هەر لەو ڕۆژەوە کە براین بۆ دێی "بروخ میول باخ" و شوکری هەستی بە ئاوارەیی و نامۆبوون کرد و کەوتە بیرکردنەوە لە وڵات و کەسوکار، ئیتر وردە وردە تووشی نەخۆشیی دەروونی بوو، ڕۆژانە دەگریا و قژی خۆی دەڕنییەوە و بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد: "من دەڕۆمەوە، من دەڕۆمەوە، ئەمە کەی وڵاتە! خەڵک چۆن خاک و وڵاتی خۆی جێ دەهێڵێت!" ئەم قەوانە ڕۆژانـەی پتر لە دە جار بەگریانەوە لێدەدرایەوە، چەند جار بردم بۆ لای دکتۆر، دکتۆر دەیوت تووشی نەخۆشیی دەروونـی بووە، پێویستی بە گەڕان و شتی دڵخۆشکەر هەیە، ئەوەشم بۆ بوو بە بیانوو کە جارجار لەگەڵ خۆمدا بیبەم بۆ ماڵی هەندێ لە هاوڕێیانم لە شارەکان کە دەچووم بۆ کۆبوونەوە.

لە ڕاستیدا کۆمەڵێ کۆسپی گران لە بەردەممدا بوو بۆ کارکردن:

١. دابەشبوونی کوردەکان بەسەر شارە گەورەکاندا، کە هەر دوو دوو و سێ سێ و یەک یەکیش لە شارێک دەژیان و پێکەوە نەبوون.

٢. سەرقاڵیی هاوڕێکان بە ئیشوکارەوە کە زۆربەیان کاری "شیشت"، واتە گۆڕینی کاتی ئیشەکانیان لە سەردەمی بەیانی ٦ بۆ ٢، دووەم لە سەعات ٢ تا ٨ی شەو، سێیەم لە سەعات ٨ی شەو تا ٦ی بەیانی، واتە هەموو هەفتەیەک کاتەکانیان دەگۆڕا.

٣. کەمیی دەرامەت و گرانیی کرێی هاتوچۆ.

لەگەڵ ئەو هەموو ئاستەنگییانەش بە هیممەتی و جوامێری و سووربوونی هەڤاڵ و هاوڕێکان لەسەر بەرەوپێشەوەچوون و گەشەکردنی ڕێکخستن کە بەڕاستی لە ماوەی ساڵێکدا دووقات و سێ قات و زیاتریش ژمارەی هاوڕێیان لە زیادبووندا بوو.

## ئەڵمانیا و ئایندەی خوێندنی کچەکانم

پاش گەیشتنمان بە بروخ میول باخ کە تازە پشووی قوتابخانە تەواو بووبوو، کچەکانم برد بۆ قوتابخانە، سروشتیان بۆ ماوەی شەش مانگ بە گوێگر بۆ باشکردنی زمانە ئەڵمانییەکەی و پاش ئەو شەش مانگە نووسراوێکیان دایە بۆ قوتابخانەی گومنازیوم لە پۆلی ١٠ لە شـاری کایزرس سلاوتیرن کە مـاوەی سەعاتێک بە شەمەندەفەر دوور بوو لێمانەوە، ژینیان لە پۆلی شەش دانایەوە، دەروونیشیان لە پۆلی سێی سەرەتایی دانایەوە، لە سەرەتایی چوونمان بۆ ناو خانوو لە بروخ میول باخ، کابرای "هـاوس مایستەر"، واتە بەرپرس لە پاکوخاوێنیی شوقەکان و باری ئاسایش و کلیلداری هەموو شوقەکان کە شوقەکەیان داینێ، بردمی کلیلی (کیلەر) ژێرزەمینێکیشی دامێ کە سەر بەو شوقەیە بوو بۆ دانانی کەلوپەلی زیادە لەناویا، کابرای هاوس مایستەر بەهەڵە کلیلی کێلەری ماڵێکی تری داینێ کە لە ناویا سێ پاسکیلی تیا بوو، پیاوانەیەک و ژنانەیەک و منداڵانەیەک، ئیتر ئێمە وامان زانی کە حکومەت بۆ ئێمەی کڕیوە و دایناوە. ڕۆژانە من و کچەکان پاسکیلەکانمان بەکار دەهێنا، تا ڕۆژێک دراوسێکەمان کە ناوی "پاسکاڵ" بوو، بە منی وت ئەو پاسکیلانە هیی ئەوانن و کلیلی هەردوو کیلەرەکەی ئەوان و ئێمەش لەیەکن، خۆیشیان پێویستیان بە پاسکیلەکانە. دەروون پاسکیلە منداڵانەکەی بەکار دەهێنا، هەر یەکەم ڕۆژ منداڵێکی ئەڵمانی ناوی شتیڤانی بوو، کچی ئەو پاسکاڵ ناوە بوو، بە ئەڵمانی بە دەروونی دەوت پاسکیلی خۆمە دابەزە من سواری دەبم، دەروونیش بەنیوەناچڵی لەگەڵی دەدوا و نەیدەدایەوە، وای دەزانی هیی خۆمانە.

– ئێمە کە تازە چووبووینە ئەو دێیە، خواخوامان بوو ماڵێک خێزانێک هەبێ تا تێکەڵاویان بین. بە هۆی کچەکانەوە کە لەگەڵ کچێکی ماڵێکی ئێزدی یەکتریان ناسیبوو لە قوتابخانە، ئێمەش تێکەڵاویان بووین. ڕۆژێک هاتنە ماڵمان هەندێ نانی تیریی ساجیان هێنابوو، وتیان کە خۆیان بە ساجی کارەبا دەیکەن. بۆ ڕۆژی دوایی ساجەکەیان بۆ ناردین، ئێمەش کەوتینە نانکردن بە ساج، پاش دوو مانگ سۆسیال ناردی بەدواماندا وتی ئێوە کارەبا دەخۆن؟ چۆن لە دوو مانگدا بایی ١٠٠٠ هەزار مارکتان کارەبا کار کردووە؟ منیش پێم وت کە دەڕۆم و ئێستا دێمەوە، چوومە ماڵەوە

٥-٦ نانی تیریم بۆ برد و بۆم باس کرد کە چۆن ئەو نانە بە کارەبا دەکەین، کابرای سۆسیال تێر پێکەنی و پاشان وتی ئەگەر ئەو ساجە بەکار بێنن، ئێمە پارەی کارەباتان بۆ نادەین، ئیتر کۆتایی بە نانی تیری هات.

- جارێکی تر تازە منداڵەکان خەریکی گروگاڵی زمانی ئەڵمانی بوون، نیوەڕۆ بوو. من و شوکری لە کڕینی پێویستیی ڕۆژانە گەڕاینەوە. هێشتا لەبەر دەرگای سەرەکیی باڵەخانەکە بووین، سروشت لە قاتی چوارەوە پەنجەرەی ژوورەکەی کردەوە و هاواری کرد: "باوکە! باوکە! بیتاقەمان بۆ دەرچووە!" تومەز پڕوپاگەندەی بیتاقەی (loto)لۆتۆ بوو، نووسرابوو گەر بیبەنەوە؛ ئەوەندەتان بۆ دەردەچێ، من توانیم سروشت تێبگەیەنم کە ڕاستییەکە چی بووە، بەڵام شوکریم بۆ تێنەدەگەیەنرا، هەر دەیوتەوە تۆ بیتاقەت کڕیوە بە ئێمەت نەوتووە.

## هۆم بورگ و دۆزینەوەی کوردان

دێکەی ئێمە لە شارۆچکەی "هۆمبورگ"ەوە زۆر نزیک بوو، بۆ یەک جار لەگەڵ شوکری چووینە ئەو شارۆچکەیە، بەڕێکەوت کوردێکی لاومان بینی لەگەڵ یەکێکی تردا بە کوردی ئاخاوتنیان دەکرد، من و شوکرییش لەگەڵ یەکدا دەدواین، هەستیان کرد ئێمە کوردین، کوردە لاوەکە هاتە لامانەوە و پێی وتین: "ئێوە کوردن؟" زۆر دڵخۆش بووین و ئیتر ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پەیوەندی و ئاشنایەتیمان بەهێزتر دەبوو. ئەو کوڕە کوردە ناوی "فەرهاد عومەر عەبدولڕەحیم" بوو، لە عێراق کۆلێژی ئەندازیاریی تەواو کردبوو، خێزانەکەشی ئامۆزای خۆی بوو ناوی "ئاسکە" بوو، لەو شارۆچکەیە لە زانکۆ لە کۆلێژی پزیشکی دەیخوێند. فەرهاد حزبی نەبوو، سەر بە هیچ لایەک نەبوو. بەڵام زۆر کوردپەروەر بوو، ئارەزووی بە یارمەتی و هاوکاریی کوردان دەکرد. لە ڕێگەی فەرهادەوە هەموو کوردانی ئەو شارۆچکەیە و دەوروبەرم ناسی و توانیم سێ شانەیان لێ پێک بێنم، یەکێک لەوان "عادل موراد"ی خانەقینی بوو، لەو هاوڕێیانە چواریان پێشمەرگەی دێرین بوون، عادل ئێستا کە لە سەفارەتی عێراقی لە نەمسا کار دەکات. لە کاتی کیمیارانەکەی هەڵەبجەدا بوو لەنزیک شاری "مانهایم" لە گوندێک بوو، ناوی گوندەکەیم لەبیر نەماوە، هاوڕێیەکی دێرینی کۆمەڵەم دۆزییەوە ناوی

"بورهان" بوو، پیاوێکی زیرەک و نووسەرێکی باش، دڵسۆزی ڕێبازی کوردایەتی، بەڵام دڵڕەنجاو لە یەکێتی، لە هەوڵی دەرکردنی گۆڤارێکی وەرزیدا بوو بە ناوی "وەسانان"، وەک وەفایەک بۆ ڕۆحی شەهیدانی کیمیابارانی گوندی "شێخ وەسانان" بە هاوکاریی هاوسەرە دڵسۆز و ڕۆشنبیرەکەی (شیرین خان)، بەو پارەیەی کە سۆسیال دەیدانێ بۆ ژیانیان. پاش یەکتربینین، ڕێک کەوتین کە ئەو بگەڕێتەوە ناو یەکێتی و کارکردن، منیش هاوکاریی بکەم لە نووسین و پەیداکردنی نووسەر و سەرچاوەی ماددییش بۆ درێژەدان بە تەمەنی گۆڤارەکە.

## کۆبوونەوەی فراوانی فرانکفۆرت

لە مانگی ١٩٨٨/٢، دووەم کۆبوونەوەی فراوانی یەکێتیمان لە شاری فرانکفۆرت ئەنجام دا بە بەشداریی ٤٧ هەڤاڵی یەکێتی، کۆبوونەوە شەش سەعاتی خایاند. بەرنامەی کۆبوونەوەکە:

١. باسکردنی بارودۆخی یەکێتی لەناو وڵات و هێرش و پەلاماری بەعسییان.

٢. چۆنیەتیی کارکردن بۆ بەهێزکردنی ڕێکخستن لە ڕووی فکری و ڕێکخراوەیی و داراییشەوە.

٣. هەوڵدان بۆ هاوکاریی بنکەی پێشمەرگەکانی سەر سنوورە دەستکردەکەی نێوان ڕۆژهەڵات و باشوور.

هەر لەو کۆبوونەوەیەدا جارێکی تر بە زۆربەی دەنگ هەڵبژێردرامەوە بە لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی ئەڵمانیا. لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦ کارەساتی کیمیابارنی هەڵەبجە ڕووی دا، جگە لە خودی شاری هەڵەبجە، کوردانی دەرەوەی وڵات لەپێش هەموو شار و شارۆچکەیەکی تری کوردستان ئەو کارەساتەیان بەزیندووی بینی، بە هۆی دەزگای ڕاگەیاندنی کۆماری ئیسلامیی ئێران و کەناڵەکانی (الجزیرة، العربیة). کوردانی ئەڵمانیا بێ جیاوازیی بیروباوەڕ و سنووری دەستکردی داگیرکەران؛ کوردانی ڕۆژهەڵات، ڕۆژئاوا، باکوور، باشوور ڕژانە سەر شەقامەکانی شارەکانی هامبرگ، هانۆڤەر، مانهایم، کۆلن، فرانکفۆرت، ئاخن، میونشن، نورنبێرگ، بەتایبەت لە بەرلین و فرانکفۆرت و میونشن، خۆپیشاندانیان بە چڕی و بەردەوامیی هەفتەیەک

دەست پێ کرد، بۆ بەردەم سەفارەتخانەکانی عێراقی و بەریتانی، رووسی و سەرجەم کونسوڵگەرییەکان. لە شاری میونشن بە هاوبەشیی کونسوڵگەری ئێرانی کە پۆستەری زۆربەی هەرە زۆری شەهید و بریندارەکانی کارەساتەکەیان ئامادە کردبوو، سمینارێکمان ئامادە کرد بۆ پیشاندانی قەبارەی کارەساتەکە بە سلاید و فوتوشۆپ. هەر لەو کاتەدا وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتی (ئیدوارد شیڤرنادزە) چوو بۆ لەندەن و لە بەریتانیا بوو بە پارێزەری سەدام حسێن و زۆر بێشەرمانە هەموو کەناڵ و رۆژنامە و گۆڤارەکانی جیهانی بە درۆ باسکردن پڕ کرد، فەرمووی سەدام بۆمبارانی هەڵەبجەی بە کیمیایی نەکردووە، فەرمووی ئەوە پروپاگەندەی ئەو کوردانەیە کە ترسنۆکانە لە بەرەکانی شەڕدا رایانکردووە بۆ دەرەوەی وڵات. من بە مەقالەیەک لە گۆڤاری وەسانان[٤٦] وەڵامم دایەوە، وتارەکەش کرایە ئەڵمانی و ئینگلیزی و دابەشمان کرد بەسەر سەفارەت و کونسوڵگەرییەکانی ئەورووپی و بەریتانی لەگەڵ کۆپیی بەڵگەنامە چاپکراوەکانی سەفارەتی ئێرانی[٤٧]. لەو ماوەیەدا یەکێتی باری ئابووریی زۆر خراپ بوو، زۆربەی پێشمەرگەکان و بەرپرسەکان لە ئۆردووگاکانی سەردەشت و ورمێ و شارەکانی تر، سەرکردایەتی رێگەی دابوو بە کادران و پێشمەرگە و هەر ئەندامێکی یەکێتی بیەوێ بگەڕێتەوە وڵات کاری خۆی بکات یا کێ دەتوانێ بە هاوکاریی کەسوکار بڕوات بۆ دەرەوەی وڵات؛ با بڕوات، ئەنفالەکانی یەک و دوو سێ و چوار و پێنج و شەش کە پاش رێککەوتنی ئێران و عێراق، دەستی حزبی بەعس وا واڵا بوو بۆ لێدانی شۆڕشی نوێ، کەوتە ئەنفالکردنی کوردستان و کاولکردن و سووتماککردنی تەڕ و وشک، بێ دەست پاراستن لە ژن و منداڵ لە پیر و گەنج، لە مرۆڤ و لە ئاژەڵ، لە درەخت و لە کانیاو، لە هەموو گیانلەبەرێکی سەر زەویی کوردستان. یەکێتی و لایەنەکانی تری بەرەی کوردستانی کە بە ماوەیەکی کەم پێش ئەنفالەکان پێک هاتبوو، بڕیاریان دا کە بۆ سەلماندنی بەردەوامیی شۆڕش و ئاشبەتاڵنەکردنی، بکەونە پێکهێنانی مەفارزی چەکداری گەڕۆک بە ژمارەی کەم بە چەکی چاک لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا. یەکێتی لەو نەخشەیە پشکی شێری

---

٤٦ وێنەی گۆڤارەکە لە پاشکۆکەدا بڵاو بکرێتەوە.
٤٧ وێنەی خۆپیشاندانەکان و بریندارەکانی هەڵەبجە لە پاشکۆی کتێبەکەن.

بەر کەوت، کە چالاکیی ئەو مەفرەزانە بە هیمەت و ئازایەتیی پێشمەرگەکانی سەرجەم ناوچەکانی دۆڵی جافایەتی و شارباژێڕ و شارەزوور و قەرەداغ و گەرمیان و بیتوێن و دەشتی کۆیە و هەولێر و باڵەکایەتیی گرتەوە. یەکێتی دوو بنکەشی پێک هێنابوو لە بلەکی و چەمپاراو بۆ دروستکردنی پردی پەیوەندیی نێوان مەفرەزە پارتیزانییەکان و نێوان سەرکردایەتی، بەڵام بارودۆخی بژێوی و پێویستیی ڕۆژانەیان باش نەبوو، جگە لەوەش هەندێ هاوڕێ هەبوون کە دەیانویست لە ئێرانەوە لە ڕێگای سووریاوە سەفەر بکەن بۆ دەرەوەی وڵات. من و شوکریی هاوسەرم کەوتینە کاری پاککردنەوەی قوتابخانەکان بە کاری ٢ سەعاتی و ڕۆژانە، مانگی هەریەکەمان بە ٤٠٠ مارک، مانگێک لە ڕێگەی بانکی سەردەشتەوە دەماننارد بۆ بنکەکانی بلەکی و چەمپاراو بە ناوی "قرض الحسنة" و مانگێکی تر دەماننارد بۆ هاوڕێیەک خۆی و منداڵەکانی بە هاوکاریی خەڵکی تر پێی دەرباز بن بۆ سوید یا لەندەن یا سووریا یا ئەڵمانیا، بەو جۆرە ساڵێک توانیمان بەو کارە هەڵسین کە ئیتر بارودۆخی ناو وڵات گۆڕا.

## کۆنفرانسی "ئارن هایم"

ئەم کۆبوونەوەیە سەبارەت بە هاتنەدەرەوەی ژمارەیەکی زۆر لە ئەندام و کادرانی یەکێتی بۆ ئەڵمانیا و بەریتانیا و سوید و شوێنانی تر بە پێویست زانرا کە بگیرێ لە شاری ئارن هایم، کە لەنێوان فرانکفۆرت و مانهایمدا بوو لە ئەڵمانیا. ئەڵمانیا دیاری کرا بە هۆی ئەوەی تا ڕادەیەک ناوەڕاستی ئەورووپا و وڵاتانی سکەندینافیە، کاتەکەش بۆیە ئەوسا دیاری کرا کە هەم عومەر فەتاح؛ ئەندامی سەرکردایەتی لە ئەڵمانیا بوو، هاتبوو بۆ چارەسەر و هەم مام جەلالیش هاتبووە ئەورووپا لە هەوڵی باشکردنی بارودۆخی سیاسی و دارایی یەکێتیدا بوو. کوردانی ئەورووپا بە هەر چوار پارچەکانیەوە کە ئاوارەی ئەورووپا بووبوون، لە جۆشوخرۆشێکی بەکوڵدا بوون، بەردەوام لە هەموو شارە گەورەکانی وڵاتانی ئەورووپا و سوید و نەرویج لە خۆپیشاندان‌دا بوون. ئەو کۆنفرانسە بۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخی وڵاتی ئەنفالکراو و ئەرکی کوردانی دەرەوەی وڵات بەرامبەر وڵات دیاری بکرێ، بەسترا. لەو کۆنفرانسەدا ١٣٧ ئەندام بەشدار بوون، کە لە مانگی ١٩٨٩/٦دا گیرا. لەو کۆنفرانسەدا جارێکی

تر بەندە هەڵبژێردرامەوە بە لێپرسراوی یەکێتی لە ئەڵمانیا و ئەندامی لقی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە دەرەوەی وڵات، کە پێشتریش بە بڕیاری سەرکردایەتی و "م. س" کە لە دەرەوە پێک هێنرا، من ئەندامی بووم، ئەرکەکان کران بە دوو بەشەوە:

١. کۆکردنەوە و هاندانی کوردانی ئاوارە لە دەرەوەی وڵات بۆ بەردەوامی بە خۆپیشاندان و مانگرتن لەبەردەم کونسوڵخانە و سەفارەتەکانی وڵاتاندا بۆ گەیاندنی کارەساتی ئەنفال و جینۆسایدی کورد و باشووری کوردستان.

٢. بۆ کۆکردنەوەی کۆمەک بۆ شۆڕش لە ڕێگەی دانانی سندووقی (شپیندە)، واتە دەخیلەی قفڵدراو لەلایەن شارەوانییەوە، کە پاش پڕبوونی بە ئاگاداریی نوێنەری شارەوانی و دوو کەس لەوانەی لەسەر سندووقەکان دەبوون؛ دەکرایەوە و پارە دەژمێردرا و دەخرایە سەر حسابێکی کراوە لە بانکێکی ناسراو بە ناوی هاوکاریی کوردانی باشوور. ڕۆژێک لە شاری توزبێرگ لە ئەڵمانیا لەبەردەم کەنیسەیەک کە ناسراوە بە "لۆرنس کرشە" و مەیدانی خۆپیشاندان و مانگرتن و سواڵکردن، ئێمە دەخیلەمان دانابوو و لەگەڵ هەڵواسینی درووشمەکانمان (هاوکاری بۆ کوردستان)، نەختێک دوور لە ئێمە پیاوێکی پیری ڕیشداری ئەڵمانی بە کەمانێکەوە مۆسیقای دەژەند و گۆرانییشی دەوت، سندووقی کەمانەکەی کردبۆوە خەڵکی پارەیان بۆ تێ دەکرد، یەک لە هاوڕێکانمان هات وتی: "تۆ سەیری ئەم چاوەشە بکە چۆن ڕزقی ئێمەی بڕیوە"، ئێوارە کە کاتەکەمان تەواو بوو؛ درووشمەکانمان دەپێچایەوە، دیمان کابرای ئەڵمان هاتە لامان و هەر چی ئەو ڕۆژە پەیدای کردبوو، کردیە دەغیلەکانی ئێمەوە، وتی: "ئەمەش هاوکاریی من بۆ کوردستان".

## قوتابخانەی کوردی لە "نورنبێرگ"

لە شاری نورتنبێرگ نزیکەی ١٥ خێزانی کوردی باشووری تێدا بوو لەگەڵ نزیکەی ٢٠ زگورتییەک، خێزانەکان و زگورتییەکان چونکە زۆربەی هەرە زۆریان سەر بە یەکێتی بوون؛ تێکەڵاوییەک لەنێوانماندا هەبوو، هەوڵمان دا کە قوتابخانەیەکی یەک پۆلی بۆ منداڵە کوردەکان بکەینەوە کە هەفتەی یەک جار، ٤ کاتژمێر وانەی کوردییان پێ بڵێینەوە. ڕەزامەندیی پارێزگاری شارمان وەرگرت و ژوورێکیان لە

قوتابخانەیەکی ئەڵمانی داینێ کە ڕۆژی پێنجشەممان ئەو چوار کاتژمێرە دەرسیان پێ بڵێین. وانەکان: ئەلفوبێی کوردی، مۆسیقای کوردی، مێژووی کورد و شۆڕش، لەگەڵیدا جینۆسایدکردنی کوردی باشوور. مامۆستاکان: کوردە عەزیز کە خۆی پیشەی مامۆستا بوو، ئاراس فەرەیدوون دارتاش دەرسی مۆسیقای دەوتەوە، بەندە مێژووم دەوتەوە، مامۆستاکانی تر: نەجمەددین قەلادزەیی، هانا لورە ئەڵمانی بوو دەرسێکی ئەڵمانی سەرەتایی پێ دەوتنەوە. ئەو قوتابخانەیە دەتوانم بڵێم یەکەم قوتابخانە بوو بۆ منداڵانی کورد کە لە شارەکانی ئەڵمانیا بکرێتەوە، ماوەی چەند ساڵێکی خایاند.

## کۆنفڕانسی لقی یەکێتی لە ڤیەننا

"م. س" و سەرکردایەتی لەناو وڵات بڕیاریان دابوو کە گرنگیی زیاتر بە دەرەوەی وڵات بدەن، بەتایبەتی یۆنان کە دەرگای چوونەناوەوەی ئەورووپا بوو لەلایەن کوردانی باشوور و ڕۆژهەڵاتیش و پاشان بە ڕێکخستن و پەیوەندییەکانیش لە هەموو ئەورووپا و ئەمەریکاوە. مام جەلال بە پێویستی زانیبوو کە کۆنفڕانسێکی یەکێتی لە دەرەوەی وڵات بکرێ لە نەمسا لە ڤیەننا بێت و نوێنەر و لێپرسراوی هەموو وڵاتەکان بەشداریی تێدا بکەن. هەر دوای کۆنفڕانسەکەی ئەڵمانیا، ئەم کۆنفڕانسەش لە مانگی ١٩٨٩/٧ کرا. لەبەر ئەوەی من هێشتا دان بە پەنابەرییە سیاسییەکەمدا نەنرابوو، بۆم نەبوو بڕۆمە نەمسا، بۆیە بە ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلی ڕێکخراوەیی و سیاسی و دارایی و چالاکیی ڕۆژانە، لەگەڵ پێشنیارەکانمان بۆ کاری داهاتوو و گرنگیدان بە لقی دەرەوەی یەکێتیی نووسی، بەشداریمان لە کۆنفڕانسەکە کرد بەو ڕاپۆرتە. سەبارەت بەوەی کە زۆرترین ژمارەی کوردان و ڕێکخستنەکانی یەکێتییش لە ئەڵمانیادا بوون و ئەڵمانیاش چەقی وڵاتانی ئەورووپا بوو، کۆنفڕانس گرنگییەکی زۆری بە ئەڵمانیا و ڕاپۆرتەکەی دابوو. زۆرێک لە پێشنیارەکان پەسەند کرا بوون و دەنگیش درابوو بە ڕاپۆرتەکەی ئەڵمانیا کە دەنگی زۆربەی هێنابوو. لە دواساتی کۆنفڕانس، هەڵبژاردن و دەنگدان کرابوو بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی لق و پاشان گۆڕینی ناوی لق بە مەڵبەندی دەرەوەی وڵاتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە سەرپەرشتیی مام جەلال. ئەنجامی دەنگەکان: سەعدی ئەحمەد پیرە لە نەمسا، د. ساڵح لە ئەمەریکا، تەلعەت گلی لە کەنەدا

و بەندە لە ئەڵمانیا دەرچووبووین، شازاد صائیبیش لە هۆڵەندا، د. بەرهەم لە بەریتانیا بە ئەندامی یەدەگ دەرچووبوو. مام جەلال بە کۆنفرانس دەڵێ من نوێنەرایەتیی برایم جەلال دەکەم کە بەرهەم بخرێتە جێگەی برایم جەلال و برایم جەلال ببێتە یەدەگ (احتیاط). کە منیان ئاگادار کرد، من لە مافی دەنگەکانی خۆم خۆش نەبووم، بەڵام د. بەرهەم لەسەر داوای مام جەلال، هەر بوو بە ئەندامی مەڵبەند.

## کاک عومەر فەتاح و بێئاگاییمان

کاک عومەر فەتاح لە کاتی دوای ئەنفالەکان لە تاران دوچاری ئازاری گەدە هاتبوو، پێشنیاریان بۆ کردبوو کە نەشتەرگەریی بۆ بکەن، بەڵام پاش نەشتەرگەرییەکەش ئازاری پتر بووبوو، دیار بوو نەشتەرگەرییەکەی سەرکەوتوو نەبووبوو، هات بۆ ئەڵمانیا بۆ چارەسەر. چەند رۆژێک لە ماڵی ئێمە مایەوە، لەو ماوەیەدا هەموو بەیانییەک دوای نانخواردنی بەیانی؛ من و هاوسەرم دەبوو بەپەلە بڕۆین بۆ کارە ٢ سەعاتییەکەمان، دەڕۆیشتین، کچەکانیش دەمانەوە تا کاتی چوونیان بۆ قوتابخانە، ئێمە دوای ئیش دەگەڕاینەوە بۆ لای کاک عومەر. شوکری بە ئامادەکردنی خواردنەوە خەریک دەبوو، منیش لەگەڵ کاک عومەر یا دەمەتەقێمان دەکرد و باسی وڵات و ناو ئەڵمانیامان دەکرد، یان دەڕۆیشتینە دەرەوە. رۆژێک کاک عومەر پرسیار و گلەیی لێ کردین، وتی: "ئەرێ ئێوە هەموو رۆژێ بەپەلە دەڕۆن بۆ ئیش قاپ و پیاڵە پیسەکان بەجێ دەهێڵن، کە دێنەوە پاکوتەمیز شۆراوە و هەڵگیراوە، ناڵێن کێ دەیشوات؟" شوکرییش وتی: "ئەی کچەکان نایشۆن؟" کاک عومەر پێکەنی و وتی: "نەوەڵا هەموو رۆژێ من دەیشۆم." هەردووکمان زۆر داوای لێبوردنمان لێ کرد، بەڵام ئەو زۆر ئاسایی وەریگرت و دیسان بەپێکەنینەوە وتی: "برادەرینە، من چاوەڕێی سوپاسم دەکرد." بەڕاستی ئەو ماوەیەی کە پێکەوە بووین، زۆر خۆشمان بەڕێ کرد و زۆر سوودیشمان بینی، ئەو هاتنەی کاک عومەر بۆ چارەسەر؛ خێری پێوە بوو. بە هۆی ئەنفالی گەرمیانەوە کە ئەوسا کاک عومەر بەرپرسی سیاسیی لقی کەرکووکی یەکێتی بوو، زمانیان لای نەوشیروان لێ دابوو کە گوایە بەر لە دەستپێکردنی ئەنفال؛ خەڵکی ناوچەکە ویستوویانە ڕەو بکەن بەرەو سلێمانی و چەمچەماڵ و هەڵەبجە و شوێنی تر.

بەڵام گوایە ئەو ڕێگەی لێ گرتوون و پاشان خۆیشی لەگەڵ مەڵبەند ناوچەکەیان چۆڵ کردووە، نەوشیروان لەسەر ئەوە ڕقی لێ هەڵگرتبوو، نەیدەدوان و داوای سزادانیشی دەکرد، بێ ئەوەی ڕێگە بە عومەر فەتاح بدات بۆی ڕوون بکاتەوە، بەڵام لەو سەفەرەیدا لە کۆبوونەوەیەکی تایبەتی مام جەلال کە نەوشیروان و سەلاح ڕەشید و شازاد و بەندە بەشدار بووین، هەم نەوشیروان و هەم عومەر فەتاح ئاشت بوونەوە و هەم مام جەلال و سەربەست بامەڕنییش ئاشتبوونەوە.

## ڕاپەڕین و کارەساتەکانی دوای ڕاپەڕین

لەپاش ڕێککەوتنی نێوان عێراق و ئێران و کارەساتی شەش ئەنفالەکە و غرووری لەڕادەبەدەری عێراق لە سەرکەوتنەکانی، سەدام حسێنی تووشی گەورەترین کارەسات کرد کە ئەنجامەکەی بە شەڕ بۆ خۆی و خێر بۆ گەلانی عێراقدا شکایەوە. سەدام پاش ڕێککەوتنەکەی عێراق و ئێران لەسەر ڕاگرتنی شەڕ، کەوتە هەڕەشە لە سعودیە و ئیمارات و کوێت و داوای قەرەبووی زیانەکانی هەشت ساڵی شەڕی ئێران و عێراقی لێ دەکردن، پاشان کەوتە لەشکرکێشیی کتوپڕی بۆ سەر کوێت و کوێتی گرت، کونی زەردەواڵەکانی عەرەبی و جیهانی لە خۆی ورووژاند، گەلەکۆمەکەی وڵاتانی عەرەبی و جیهانی بەتایبەتی ئەمەریکی و ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی و... هتد، لە ماوەی یەک هەفتەدا، کوێتیان لەدەست عێراق دەرهێنا و کۆمەڵێ مەرجی زۆر قورسیشیان وەک تێشکاوێکی شەر لەسەر دانا. بڕیاری ٦٨٨ بڕیاری دژەفڕینی فڕۆکەی کۆپتەری جەنگیی عێراقی، یەکێک بوو لە بڕیارە هەرە گرنگەکان کە شۆڕشی کوردستانی تووشی بەرەوپێشچوون و پەلاماردان کرد، گەلی عەرەب لە خواروو و ناوەڕاست ڕاپەڕین، بەڵام ڕاپەڕینەکە هەم بە پلان نەبوو، هەم بێ پشتیوانییش بوو، بۆیە هەر زوو دامرکایەوە، بەڵام لە باشووری کوردستان یەکەم بانگی ڕاپەڕین لە شاری ڕانیە درا و لە ١٩٩١/٣/٥ شاری ڕاپەڕین بێ جیاوازی لە بیروبۆچوون و حزبایەتی، تەنانەت چەکدارە کوردەکانی سەر بە ڕژێمیش چوونە پاڵ جەماوەر و لە ماوەیەکی زۆر کەمدا سەرا و پۆلیسخانە و ئاسایش و مۆڵگای سوپای ڕژێمیان گرت و دەستیان بەسەر هەموو چەک و جبەخانەکاندا گرت و سەرباز و ئەفسەرێکی زۆریان بەدیل گرت.

ئەو ئاگرە وەک "ماوتسی تونگ" دەڵێ: "ڕەنگە پزیسکێک دەشتاییەک بسووتێنێ"، ئاگری ڕاپەڕینی ڕانیەش سەرتاسەری باشووری کوردستانی گرتەوە و دەست بەسەر دامودەزگا سەبازی و پۆلیسی و ئاسایشی سەرکوتکەرەکانی ڕژێمدا گیرا لە هەر چوار پارێزگاکانی باشوور و سنوورەکانیان: سلێمانی، هەولێر، دهۆک، کەرکووک، هەر چی قەڵای زۆر و ستەم و دڕندەکاریی دکتاتۆریەتی ڕژێم هەیە، هەمووی ڕووخا و دەستی بەسەردا گیرا، بەڵام پشتتێکردنی هاوپەیمانان لە ڕاپەڕینی کوردان، گڵۆپی سەوزیان بۆ سەدام هەڵکرد کە هەڵبستێت بە هێرشی چەواشە و گرتنەوەی شارەکان، بەڵام بە دڕندەترین شێوە. گەلی باشووری کوردستان بەو زستانە ساردەی ساڵی ١٩٩١ ئامادەی ژیانی ژێردەستەیی نەبوون، کۆڕەوی ملیۆنی لە باشووری کوردستانەوە بەرەو سنوورە شاخاوی و دەستکردەکانی نێوان و عێراق-ئێران-تورکیا دەستی پێ کرد.

## ڕاپەڕین و دەرئەنجامە کاتییەکانی

لە کاتی ڕاپەڕیندا ڕاستە بەرەی کوردستانی هەبوو کە لە هەموو حزبەکانی یەکێتی و پارتی و حسک و حزبی شیوعی و پاسۆک پێک هاتبوون، بەڵام یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ڕۆڵی سەرەکیی هەبوو لە نەخشەکێشان و پلاندانان و دەستپێشکەریدا کە لە ڕانیەوە دەستی پێ کرد. بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییەش، سەیری نووسینەکەی "عەباس البدری" کە لە کوڕاسێکدا بە ناوی "ئەندازیاری ڕاپەڕین" دەیسەلمێنێ کە نەوشیروان مستەفای جێگری سکرتێری گشتی بە هاوکاری و پەیوەندیی بەردەوامی لەگەڵ سکرتێری گشتیی یەکێتی کە ئەوسا لە دەرەوەی وڵات بوو، هەستا بە کێشانی نەخشەی ڕاپەڕین کە زۆر لە حزبەکان، بەتایبەت پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرۆکەکەی؛ مەسعوود بارزانی ڕایان وا بوو کە وەک ئەزموونە سەرنەکەوتووەکەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان گەل بەقڕ دەدرێ، بەڵام پاش سەرکەوتنی ڕاپەڕین لە ڕانیە و دەوروبەری و سلێمانی و چەمچەماڵ و هەولێر و کەرکووک، ئەوسا پارتی کەوتە خۆی لە دهۆک و زاخۆ.

## ئەندازیاری ڕاپەڕین

"عەباس البدری[48]" لە نامیلکەکەیدا دەنووسێ: لە بارەگای سەرکردایەتیی ڕاپەڕیندا "نەوشیروان مستەفا"م بینی، خاوەنی پلانی ڕاپەڕین -ئەندازیاری ڕاپەڕین-. کات شەو بوو، زووری ڕابەرایەتیی ڕاپەڕین کۆمەڵێ کەسایەتیی شۆڕشگێڕی لێ بوو، کاتێ تێبینیی خۆم سەبارەت بە خێرایی تەنینەوەی ڕاپەڕین دەربڕی و چاوەڕوانم دەکرد کە بەو خێراییە تەنانەت بەغداش بگرێتەوە. دەڵێ: زۆر دڵخۆش بووم تا ئەو ڕادەیەی کە ڕووم کردە کاک نەوشیروان و پێم وت کە لەوانەیە من و تۆ لە بەغداد یەک بگرینەوە. نەوشیروان پێی وتم بەڵێ، بەڵێ، فەرموو تۆ بڕۆ بۆ بەغداد و ئێمەش لە دواتەوە دێین. عەباس البدری دەڵێ پیلانەکەی ڕاپەڕین تەنیا بۆ ڕانیە و چوارقوڕنە و حاجیاوا نەبوو، بەڵکە بۆ سلێمانییش بوو، ئەو پلانە گەورەیە هیچ شار و شارۆچکە و ئۆردووگایەکی زۆرەملێش نەمابوو کە لەو پیلانی ڕاپەڕینەدا نەبێ. شانە چەکدارە شۆڕشگێڕەکانی ناو شارەکان کە ناوی "برووسک"یان لێ نابوون، ئەرکەکانی خۆیان بەباشی بەجێ دەگەیاند کە بریتی بوو لە ڕێنماییکردن و دەستنیشانکردنی شوێنە گرنگەکانی مۆڵگاکانی جاش و سوپا و ئاسایش و هەواڵگرییەکانی ڕژێم بۆ پەلاماردان و داگیرکردنیان.

ڕۆژی ١٩٩٠/٣/٤، جموجووڵە گرنگەکەی ئۆردووگای خەبات بوو کە چەخماخەشی بۆ ڕانیە لێدا و ڕۆژی ٣/٥ دەروازەی ڕاپەڕین مەشخەڵی ئاگری ڕاپەڕینی بەرپا کرد کە هەموو کوردستانی گرتەوە. ڕۆژی ٣/٧ برووسکەی "لە زمناکۆوە بۆ شانەی ئازاد ١٧٦٠، ئاگاداری برایان بکەن کە لە ٣/٧ بە ئاهەنگی خۆیان هەڵسن، ئێمەش بەرێوەین بەرەو لای ئێوە". ڕاپەڕینی سلێمانی بوو بە هۆی لابردنی وەزیری ناوخۆی عێراق (سمیر الشیخلی) و دانانی تاوانبار "عەلی کیمیایی" لە جێگەی. ڕۆژی ٣/٨ ڕۆژی ڕاپەڕینی هەڵەبجە و هەستانەوەی ٥٠٠٠ شەهیدی گازی کیمیایی بۆ سەندنەوەی تۆڵە. ڕۆژی ٣/٩ ڕۆژی ڕزگارکردنی دەربەندیخان و شەقڵاوە، چەمچەماڵ، کۆیە، کەلار، حەریر، باسرمە، تەقتەق، ئاغجەلەر، قەرەهەنجیر، چۆمان، حاجی ئۆمەران، خەلیفان، ڕێزانوک، دیانە، ڕواندوز، مێرگەسۆر، لەو ڕۆژەدا پەنجا هەزار سەرباز بە خۆیان و

[48] یومیات الانتفاضە، عباس البدری

هەموو چەک و جبەخانەیان خۆیان ڕادەستی ڕاپەڕین کرد. ڕۆژی ٣/١١، هەولێری پایتەخت. ڕۆژانی ٣/١٢،١٣، ڕاپەڕینی خانەقین و گەرمیان و بادینان. ڕۆژی ٣/١٩،٢٠، ڕاپەڕینی ڕزگارکردنی کەرکووکی قودسی کوردستان.

## پاشبەندە خراپەکانی ڕاپەڕین

دیاردەی سەرهەڵدانی دزی و ڕاوڕوت و ئاودیوکردن، ئەم دیاردەیە بەداخەوە هەر لە دزینی پارەی بانکەکانەوە تا بردنی قەرەوێڵەی ژێر نەخۆشەکانی نەخۆشخانەکانی گرتەوە، هەر لە کەلوپەلی عەمارەکانی ڕژێم تا کەلوپەلی دوکانی دوکاندارەکانیشی گرتەوە، هەر لە دزین و ئاودیوکردنی تەلی کارەبا و تەلەفۆن تا گەلابە و شۆڤل و بلدۆزەر و گرێدەری فەرمانگەکانیشی گرتەوە، هەر لە تالانکردن و تالانفرۆشی مس و ئاسن و وەرشاوەوە تا هەڵوەشاندن و ئاودیوکردن و بردنی هەموو ئامێرەکانی بەنداوی بێخمەشی گرتەوە کە بە ئێران تالانفرۆش کرا. گەر بەنداوی بێخمە لەجیاتیی هەڵوەشاندنی و تالانفرۆشکردنی؛ تەواو بکرایە، کارەبای ٢٤ سەعاتی هەموو کوردستانی دەدا و لێشی دەفرۆشرا بە عێراق.

## ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ و یادکردنەوەیەک لە کۆماری مهاباد

لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٠ و سەرەتای ساڵی ١٩٩١، بەدیاریکراوی لە ١٩٩١/١/٣١دا و پاش دروستبوونی گفتوگۆی نێوان بەرەی کوردستانی و ڕژێمی سەدام حسێن، بە پێویستم زانی بۆ یادکردنەوەیەک لە ڕابردووی مێژووی خۆمان، لە کۆبوونەوەیەکی زۆر فراواندا لە شاری نورتنبیرگ کە ژمارەیەکی زۆر کوردی ئەو شارە و شارە نزیکەکانی هەرێمی "بایرن" بەشدار بوون، پانۆرامایەک وەک یادکردنەوەیەک لەسەر کۆماری مهاباد و هەم وەک ئەزموونێکی تری تاڵی گەلەکەمان پێشکەش بکەم کە ئەوە دەقەکەیەتی.

## بە بۆنەی چل و پێنج ساڵیادی کۆمارەوە
## "کۆماری مهاباد"

کۆماری مهاباد ئەو ئەزموونە مێژووییە بەنرخەیە لە مێژووی کورددا کە نە کۆن دەبێ و بەسەر دەچێ، نە لێدوانیشی لەسەر تەواو دەبێت. ئەزموونی کۆماری مهاباد ئەڵقەی ناوەندی ئەو زنجیرەیە کە مێژووی ڕابردووی حکومڕانی کوردی تا سەردەمی مهاباد بە مێژووی ئەم سەردەمەی ئێستا و دواتری دەبەستێتەوە. گەر ئەو نووسینانەی کە لەسەر کۆماری مهاباد نووسراون؛ هەموویان پێکەوە کۆ بکرێنەوە، چەندین کتێبی قەبارە گەورەی لێ دەردەچێ، کە هەریەکەیان لەسەر چمکێک و بەشێک و قوژبنێکی مێژووی کۆماری مهابادی نووسیوە و لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە (٢ی ڕێبەندانی ساڵی ١٣٢٤)ی هەتاوی کە ڕۆژی هەڵکردنی ئاڵای پیرۆزی حکومەتی کوردستان و ڕاگەیاندنی دامەزراندنی کۆمارێکی کوردی بووە، لەسەری نووسراوە و لەسەریان نووسیوە تا دەگاتە دوا نووسەر کە لە ساڵی ١٩٩٣دا لەسەری نووسیوە بە کوردی، بە عەرەبی، بە فارسی، بە ئینگلیزی، بە فەرەنسی، بە ئەڵمانی لەسەر ئەم ئەزموونەی کورد نووسراوە، بەڵام هێشتا هەر نەتوانراوە پەردەی تەواو لەسەر هەموو نهێنییەکانی ئەو ئەزموونە هەڵبدرێتەوە، هێشتا نەتوانراوە هەموو کەلێن و قوژبنەکانی ئەم ئەزموونە بەتەواوی بپشکنرێ، هێشتا زۆر هەڵەی مێژوویی کە لەسەر ئەم ئەزموونە نووسراوە یا خراوەتە پاڵی یا ویستراوە بشێوێنرێت؛ ڕاست نەکراوەتەوە.

کۆماری مهاباد لەگەڵ ئەوەی کە بەرهەمی هەستی نەتەوایەتیی ئەوکاتی ڕۆشنبیرانی کورد و عەشایەری کورد و کوردپەروەران و بەتەنگەوەهاتووی کوردستان بووە، لە هەمان کاتیشدا ئەڵقەی ناوەندی ناکۆکی و ململانێی نێوان دەوڵەتە زلهێزەکانی ئەوکات بووە، سۆڤیەتی ئەوسا، ئەمەریکا، ئینگلیز، ئەڵمان، وە دەوڵەتە مەرکەزییەکە کە تاران بووە، دراوسێکان: عێراق، تورکیا. کاتێک مێژووی ئەو ئەزموونە بەنرخە تەواو تێروتەسەل و بێ کەموکورتی دەبێت، کە بتوانرێ هەموو بەڵگەنامەکانی ناو گەنجینە نهێنییەکانی ئەو دەوڵەتانەش بەدەست بهێنرێ و بخرێتە سەر ئەو گەنجینە بەنرخەی کە تا ئێستا لەسەر ئەو کۆمارە کۆ کراونەتەوە.

ئەوەی دەمەوێ لەم بۆنەیەدا لەسەر کۆماری باس بکەم، تەنیا کورتە پانۆرامایەکە و هیچی تر.

یەکەم: ڕێککەوتننامەکان

١. ڕێککەوتننامەی نێوان مەلیک فەیسەڵی عێراق و شای ئێران لە ساڵی ١٩٣٢ لەسەر سنووری ئاو جیاکردنەوە، کێشەی نەوت، کێشەی کورد.

٢. ڕێککەوتنی نێوان ئێران و تورکیای کەمالی لە ساڵی ١٩٢٦ لەسەر دیاریکردنی سنوور، پاراستنی ئاسایش، کێشەی کورد.

٣. پەیمانی سەعد ئاباد، ڕێککەوتنامەی نێوان ئێران-عێراق-تورکیا-ئەفغانستان لە ساڵی ١٩٣٦دا، لەسەر دەستوەرنەدانە کاروباری ناوخۆی یەکتر، پاراستنی حورمەتی سنووری نێوانیان، بەشدارینەکردنی هیچ لایەک لە شەڕ دژی لاکەی تر، هاوکاریکردنی تەواو بۆ کوژانەوە و نەهێشتنی ئاژاوەی ناو هەر یەکێک لەو دەوڵەتانە کە ئەم خاڵەیان لە مادەی (٧)ی بەیاننامەکەدا هاتووە، پەیوەندیی بە مەسەلەی کوردەوە بووە.

٤. پەیمانی نێوان سۆڤیەت و ئێران ساڵی ١٩٢١ لەسەر هاوکاریی ئاشتیی نێوانیان و دەستوەرنەدانە کاروباری ناوخۆی یەکتری.

٥. پەیمانی نێوان ئێران و ئەڵمانیای هیتلەری ساڵی ١٩٣٥-١٩٣٨، لەسەر هاوکاریی ئابووری و پێکەوەبەستنی ڕێگای ئاسمانیی نێوان هەردوو وڵات.

دووەم: هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم و تێوەگلانی ئێران لەو جەنگە.

١. داگیرکردنی زۆربەی سەرزەمینی ئێران لەلایەن سوپای سۆڤیەتی و ئینگلیزەوە لە بەشی سەرووی ئێران و خواروو و ڕۆژئاوایەوە لە ساڵی ١٩٤٢دا.

٢. ڕاگەیاندنی شاهنشینی ڕەزا شا سەبارەت بە شەڕنەکردن لەگەڵ سوپای سۆڤیەت و ئینگلیزدا و تەسلیمبوونی ئێران بە هەردوو دەوڵەتەکە لە هەمان ساڵدا.

٣. بەپێی ئەو ڕاگەیاندنە، لە دەریاچەی ورمێوە تا دەگاتە قەزوین و دەریای خەزەر لە بەشی باکووری ئێران، دەکەوێتە ژێر حوکم و دەسەڵاتی سوپای سۆڤیەتی، وە لە کرماشانەوە تا دەگاتە بەندەری دەیلەم و ئەبادان کەوتە ژێر حوکمی سوپای ئینگلیز.

٤. هەر بە هۆی ئەو ڕاگەیاندنەوە، ڕەزا شا لە شایەتی خرا و محەممەدی کوڕی لە شوێنی دانرا و ئێرانیش بووە لایەنێکی شەڕ دژی ئەڵمان.

سێیەم: پەیمانی نێوان سۆڤیەت-ئینگلیز-ئێران ساڵی ١٩٤٢، کە خاڵی گرنگی ئەو پەیمانە بۆ ئەم یادە، ئێستا بریتییە لە مادەی یەکەمی کە بەڵێنیدانی سۆڤیەت و ئینگلیز بوو بە ڕێزگرتنی یەکێتیی خاک و حکومڕانی و سەربەخۆیی ئێران.

بوونی سێ دەسەلات، دەسەڵاتی جیاوازی سۆڤیەتی ئینگلیزی ئێرانی لە کوردستاندا بووە هۆی بوودەڵەیی و بێتوانایی دەسەڵاتی ئێران لە لایەک و دروستبوونی بۆشاییەکی گەورەی حکومڕانییش لە لایەکی ترەوە.

چوارەم: هەلومەرجەکانی ڕێگاخۆشکەری لەدایکبوونی کۆمار:

١. ڕووخانی ڕژێمی ڕەزا شا و جێگیربوونی لەشکری سووری سۆڤیەتی لە بەشێکی ژووررووی کوردستانی ئێران لە ساڵی ١٩٤١دا.

٢. بزووتنەوەی ورمێ لە ساڵی ١٩٤٢ و ڕاکێشانی سەرنجی سۆڤیەتی بۆ مەسەلەی کورد.

٣. بانگهێشتکردنی پیاوە ناودارە ئایینی و عەشایەری و سیاسییەکانی کورد و لەلایەن سۆڤیەتەوە بۆ باکۆ (کە ناسراوە بە هەیئەتی سەرانی کورد بۆ باکۆ کە لە (٣٠) پیاوماقوڵ پێک هاتوون، لە سەروویانەوە قازی محەممەد).

٤. دەستپێکردنی جموجووڵی کوردەکانی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز لە بانە و مەریوان و سەقز بە فەرماندەیی حەمە ڕەشید خانی بانە و بوونی حەمە ڕەشید خان بە حاکمی بانە فەرمانداری بانە لە بەهاری (١٩٤٢)دا و تا هاوینی ئەو ساڵەی خایاند و ئیتر بانە لەلایەن لەشکری ئێرانەوە بە یارمەتیی سوپای ئینگلیز گیرایەوە.

٥. نە ئینگلیز و نە سوپای ئێرانی هەر لە هاوینی (١٩٤٢)وەوە تاکوو زستانی ساڵی ١٩٤٤ نەیانتوانی جموجووڵی کوردەکانی ناوچەی سەقز و بانە سەرکوت بکەن و لەناو ببەن یان حەمە ڕەشید خان دەستگیر بکەن.

٦. دەستپێکردنی جموجووڵی کوردەکانی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی سۆڤیەت لە ورمێ لە ساڵی (١٩٤٢)ەوە بە ڕابەریی سەرەکعەشرەتەکانی کوردی ناوچەکە و درێژەکێشانی تا ساڵی ١٩٤٥، کە ئیتر لە سەرماوەرزی ئەو ساڵەدا بەتەواوی ورمێ

کەوتە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی دیموکرات.

ئاڵۆزییەکانی ئەو هەلومەرجانەی ئەوسا:

١. هیچ پەیوەندییەک لە دوور و نزیکەوە لەنێوان جموجووڵی چەکداریی کورد و سەرۆکعەشرەتەکانی ناوچەی ورمێ و ناوچەی سەقز و بانەوە نەبووە.

٢. داواکارییەکانی هەردوو جووڵانەوەکە، زۆربەی خۆی لە خواستی عەشایەری و دەستکەوتی تایبەتی سەپاندنی دەسەڵاتی حکومڕانیی عەشایەری دادەنواند.

٣. پەیدابوونی گومان لەنێوان دەسەڵاتی سۆڤیەتی و ئینگلیزی بەرامبەر یەکتری لەسەر جووڵانەوەی ناوچەی ورمێ و بانە و سەقز کە هەم ئینگلیزەکان پێیان وا بوو جووڵانەوەی کوردەکان لە ورمێ بە فیت و پیلانی رووسە و هەم ڕووسیش وایان دەزانی هیی سەقز و بانە بە فیت و پیلانی ئینگلیزە.

٤. لەگەڵ ئەوەی لە ناوچەی سەقز و بانە بە فەرماندەیی زۆربەی سەرەکعەشرەتەکانی ئەو ناوچەیە و ڕابەریی حەمە ڕەشید خان بووە، وە لە ناوچەی ورمێش بە فەرماندەیی زۆربەی سەرەکعەشرەتەکان و دەمڕاستی سەیید عەبدوڵلای شەمزینی بوو، بەڵام هێشتا کوردەکان نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی لە هیچ لایەکیان کە یەک سەرکردە یان سەرکردایەتی ڕابەریان هەبێت، بۆیە هەردوو جووڵانەوەکە لە جوغزی پاشاگەردانی و بۆشاییەکی سیاسیی گەورەدا دەخولایەوە.

## پێکهاتنی ڕێکخراوی سیاسی

پێکهاتنی کۆمەڵەی "ژ. ک" لە مانگی ئەیلوولی ١٩٤٢ لە ناوچەی مهاباد، ئامانجی سەرەکیی کۆمەڵە؛ ئەو کاتە خودموختاری کوردستان بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٤دا کە شەڕی جیهانیی دووەم بەرەو تەواوبوون دەڕۆیشت، کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەی "ژ. ک" بڕیاریان دا کە:

١. هەرکە شەڕی جیهانی کۆتایی هات، دەوڵەتی کوردستان ئیعلان دەکرێ.

٢. خاکی دەوڵەتی کوردستان لەلای ژووررووی عێراقەوە بە بانەدا دەست پێ دەکات بەرەو سەقز و لای سنووری ڕۆژهەڵاتی عێراق تا شاخەکانی داڵانپەڕ لەسەر سنووری تورکیا، وە خوارووی ئەو سنوورە لە ڕۆژئاوای تاکوو بە کەناری گۆمی

ورمێدا بۆ ناوچەی ئەفشار دەکشێ.

٣. ڕژێمی دەوڵەتی کوردستان، کۆماری دەبێ.

٤. بۆ پاراستنی دەوڵەتی کوردی، کۆمەڵە سوپا (میلیشیا) پێک دێنێت.

٥. لە ئایندەدا کۆمەڵە کار بکا بۆ ڕزگارکردنی ناوچەکانی تری کوردستان.

گۆڤاری نیشتمان کە زمانحاڵی کۆمەڵە بوو و یەکەم ژمارەی لە مانگی (١٩٤٣/٦) دا دەرچوو لەژێر درووشمی "کۆمەڵەی 'ژ. ک' تێدەکۆشێت دژی هەموو بەرهەڵست و قورت و چەڵەمەیەکی دوژمنایەتیی خۆبەخۆ، دووبەرەکی، خۆخۆری، پوڵ پەرستی و بێگانەپەرستی کە لە ڕێگای سەرکەوتن و پێشکەوتنی کورددا هەیە". ئەم گۆڤارە بەنرخە (٩) ژمارەی دەچوو. دوای چەند مانگێک تێپەڕبوون بەسەر دامەزراندنی "ژ. ک"دا، لە ساڵی (١٩٤٣) قازی محەممەد بۆتە ئەندامی کۆمەڵە و سوێندی ئەندامێتیی کۆمەڵەی خواردووە. بە چوونی قازی بۆ ناو کۆمەڵە (ژ. ک)، زۆر فراوان بووە و پەرەی سەندووە و لەگەڵ فراوانبوونی "ژ. ک"دا، دەسەڵاتی قازییش لەناو کۆمەڵەدا پەرەی سەندووە کە لە ماوەیەکی کەمدا قازی بە پراکتیک بۆتە سەرۆکی کۆمەڵە.

## کۆمەڵەی "ژ. ک" و هەڵوێستیان لە شۆڕشی (١٩٤٥)ی بارزانییان

هەڵوێستی کۆمەڵە لەو نامەیەدا بەڕوونی دەردەکەوێ کە بۆ مەلا مستەفای بارزانیی نووسیوە، مەبەست لە باسکردنی ئەم خاڵە؛ خستنەڕووی هەستپێکردنی "ژ. ک"ە بە ئەرکە نەتەوەییەکە، کە هیوای بەوە بووە لە هەردوو پارچەی کوردستاندا جۆرە یەکگرتن و یەکیەتی و هاوکارییەک پێک بێنێ، بەڵام بە تێکشکانی بارزانییەکان لە (١٩٤٥/١٠/١١)دا و گەیشتنیان بەودیوی سنووری ئێران، ئەو هیوایەش تووشی لەناوچوون بوو.

٢. ڕاگەیاندنی حزبی دیموکراتی کوردستان:

ا. حزبی دیموکرات لە مانگی (١٠)ی ساڵی ١٩٤٥دا دامەزراوە و لە (١٩٤٥/١٢/٦) دا یەکەم ژمارەی گۆڤاری "کوردستان" زمانحاڵی حزبی دەرکرد کە هەواڵی یەکەم کۆنگرەی خۆی تیا بڵاو کردەوە.

ب. یەکەم بەیاننامەی حزبی دیموکرات کە هاوکات لەگەڵ دامەزراندنیدا دەرچوو،

ئامانجەکانی خۆی لەژێر ناوی "درووشمەکانی حزبی دیموکرات"، بەو جۆرەی خوارەوە دەستنیشان کرد:

١. بەدەستهێنانی خودموختاریی نەتەوەی کورد لە کاروباری محەلیی خۆیدا لە سنووری دەوڵەتی ئێراندا سەبەخۆ و ئازاد بێ.

٢. مافی خوێندن بە زمانی زگماکیی خۆی بێ و تەواوی ئیدارات بە کوردی بێت.

٣. لەسەر بناغەی قانوونی ئەساسی، ئەنجوومەنی ویلایەتی کوردستان هەڵبژێردرێ و بە هەموو کاروباری کۆمەلایەتی و دەوڵەتی ڕابگات.

٤. کاربەدەستانی دەوڵەت دەبێ بەبێ هیچ قسەیەک لە خەڵکی ناوچەکان بن.

٥. کێشەی نێوان لادێیی و خاوەن موڵک لەسەر ئەساسی قانوونێکی گشتی. دوارۆژی هەردوو لا دابین بکرێ.

٦. پەیوەندیی برایانە هەبێ لەنێوان کوردستان و ئازربایجان.

ج. حزبی دیموکرات و هەڵکردنی ئالای کوردستان.

مانگی سەرماوەرزی (١٣٢٤)ی هەتاوی، واتە مانگی (١٩٤٥/١١)ی زایینی، مانگی ڕاپەڕینی سەرتاسەری ئازەربایجان و فیداییەکانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان بوو کە تەورێز و شارەکانی تری ئازەربایجان یەک لەدوای یەک گرت، بە شاری ورمێشەوە کە کوردەکانی ئەو ناوچەیە بەشدار بوون لەگەڵیاندا لە گرتنی ورمێ. لە ڕۆژی (١٩٤٥/١٢/١٧)، (٢٦)ی سەرماوەرز، جەماوەری شاری مهاباد بە هاندان و ڕابەریی هەندێ لە سەرکردەکانی حزبی دیموکراتی کوردستان، شارەبانی مهابادیان گرت و دوا دەسەلاتی بەرواڵەتی دەوڵەتی ئێران لە شارەکەدا ڕاپێچەک کرد. ئالای حکومەتی ئێران داگیرایە خوارەوە، ئالای کوردستان لە شوێنەکەی هەڵکرا. دوای مهاباد، لە نەغەدە و بۆکان و چەند شارێکی تریش ئالای کوردستان هەڵکرا.

د. ڕاگەیاندنی حکومەتی کۆماری کوردستان لە (١٩٤٦/١/٢٢)دا، بە خوێندنەوەی وتارێک لەلایەن (ڕەئیس جمهوری بەرزی کوردستان) قازی محەممەدەوە کە ناسراوە بە ئاهەنگی (٢)ی ڕێبەندان، ئەو بڕیارە مێژووییە بوو کە پێشتر سەرکردایەتیی حزبی دیموکرات و پێشەواکەی، پاش پرسوڕاکردن بە کاربەدەستانی سۆڤیەتی و ژمارەیەکی زۆری گەورەپیاوانی کورد دابوویان.

هـ دەزگاكانی حكومەتی جمهوری كوردستان.

١. هەیئەی ڕەئیسی میللی، هەیئەی ئیداری، وەزارەتی حكومەت، دوای دانانی سەرۆككۆمار قازی محەممەد، كوردستان پێویستی بە دەزگایەكی بەڕێوەبەرایەتیی حكومەتەكە هەبوو، بۆیە كۆمیتەی مەركەزی حزبی دیموكرات؛ هەیئەتی ڕەئیسی میللی كوردستانیان پێك هێنا لە (١٤) كەس:

١. ڕەئیس هەیئەت، ٢. وەزیری جەنگ، ٣. وەزیری كیشوەر، ٤. وەزیری اقتصاد، ٥. وەزیری پۆستە و گەیاندن، ٦. وەزیری فەرهەنگ، ٧. وەزیری تەبلیغات، ٨. وەزیری كار، ٩. وەزیری تجارەت، ١٠. وەزیری كشاوەرزی، ١١. وەزیری ڕێگاوبان، ١٢. وەزیری بهداری، ١٣. وەزیری مشاور، ١٤. وەزیری عدلیە.

٢. خوێندنگاكان و بوونی زمانی كوردی بە زمانی ڕەسمیی خوێندن.

٣. بوونی زمانی كوردی بە زمانی ڕەسمیی دەوڵەت.

٤. مزگەوت و كردنی خوتبەی نوێژی جومعە بە كوردی.

٥. كردنەوەی قوتابخانەی شەو بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری.

٦. دامەزراندنی هەیئەت بۆ ڕێكخستنی زمانی خوێندن، حكومڕانی، شەرعی، قانوونی، بازرگانی، سوپایی بە كوردی.

٧. دامەزراندنی چاپخانەی كوردستان و ئیدارەی ڕۆژنامەی "كوردستان" كە یەكەم ژمارەی لە (١٩٤٦/١/١١)دا دەرچوو.

٨. دەرچوونی چەندین كتێب بە زمانی كوردی و پاشان وەرگێڕانی چەندین كتێبی تر بۆ سەر زمانی كوردی پاش دامەزراندنی چاپخانەی كوردستان و دەرچوونی گۆڤاری "هاواری نیشتمان"، هەر لەو چاپخانەیەدا یەكەم ژمارەی لە (١٩٤٦/٣/٢١)دا دەرچوو كە گۆڤاری جەوانانی دیموكرات بوو.

دوابەدوای هاواری نیشتمان، گۆڤاری "گڕوگاڵی منداڵان" و گۆڤاری "هەڵاڵە"ش دەرچوو.

٩. ڕادیۆی كوردستان لە مانگی (١٩٤٦/٣)دا لە مهابادی پایتەختی كۆماردا كرایەوە.

١٠. دامەزراندنی كتێبخانەی گشتی و سینەما.

## هێزی چەکدار - سوپای کۆماری کوردستان

پێش (٢ی ڕێبەندان)، واتە پێش (١٩٤٦/١/٢٢)، کەسانێکی زۆری سەر بە حزبی دیموکرات چەکدار بوون، بەڵام بە شێوەی هێزێکی ڕێکخراو نەبوون، بەڵام لە (٢ی ڕێبەندان) حزبی دیموکرات توانیی لانی کەمی ڕێکخستنێکی میلیشیایان تێدا دروست بکات و ئامادەیان کات بۆ بەیعەتکردن بە سەرۆکی کۆمار و سوێندخواردن، کە ژمارەیان لە (٢٥٠٠) چەکداری تێنەدەپەڕی، بەڵام پاش پێکهێنانی وەزارەتەکان، لەوانە وەزارەتی جەنگ، سوپای کوردستان تەشکیل کرا لە (١٢٧٥٠) چەکدار دابەش کران، بەم شێوەیە:

١. بارزانییەکان ٢١٠٠ پیادە
٢. جەلالی و عێلاتی ٤٠٠ سوار
٣. شوکاک ١٢٠٠ سوار
٤. هەرکی ١١٠ سوار، وە ٧٠٠ پیادە
٥. زەرزا ٣٠٠ سوار
٦. شەمزینی ٢٠٠ سوار
٧. قەرەپاپاخی تورک ٥٠٠ سوار
٨. مامەش ٩٠٠ سوار
٩. پیران ٣٠٠ سوار
١٠. مەنگوڕ ٩٠٠ سوار
١١. گەورک ٩٠٠ سوار
١٢. خێڵەکانی تری سەردەشت ٥٠٠ سوار
١٣. سوێسنی ١٠٠ سوار
١٤. دێبوکری بۆکان و مهاباد ٩٠٠ سوار
١٥. فەیزوڵا بەگی سەقز و بۆکان ٨٠٠ سوار
١٦. بداغی سەقز ٢٠٠ سوار
١٧. باقیی تیرەکانی تری مهاباد ٣٠٠ سوار
١٨. حەمە ڕەشید خانی بانە ٣٠٠ سوار

١٩. جوانرۆ و هەورامان ١٥٠ سوار

واتە هەمووی (٩٩٥٠) سوار و (٢٨٠٠) پیادە.

## پلەی فەرماندەیی لە هێزی میلیشیادا

سەبارەت بەوەی کە کوردستان لە سیاسەتی ڕەزا شادا تەنیا دواکەوتوویی و هەژاری و بێدەرەتانی بەشی بوو، لە سوپا و ئەرتەشی ئێرانیشدا کورد هەر لەو پلەوپایەی سوپایی و دانشگایی سەربازیدا بێبەش بوو، بۆیە لە کاتی دامەزرانی کۆمار و سوپادا کادری پێگەیشتوو و کارامەی کیشوەری و لەشکرییان هەر نەبوو یان زۆر کەم بوو و لە پلەیەکی نزمیشدا بوو.

بۆ ڕێکخستنی میلیشیاکە و دابەشکردنی بەسەر بەشەکانی میلیشیاکەدا، بە بڕیاری حزبی دیموکرات و فەرمانی سەرەککۆمار (قازی محەممەد) چەندین پلەی سوپایی دران بە کادرە سیاسی و پێشمەرگەییەکان:

١. جەنەراڵەکان

سەرەککۆمار پلەی ژەنەراڵی دا بەم ناوانە:

ا. محەممەد حسێن خان (سەیفی قازی) - وەزیری جەنگ

ب. عومەر خانی شەریفی شوکاک

ج. محەممەد ڕەشید خانی بانە

د. مەلا مستەفای بارزانی

وە پلەی مایور (مێجەر)یشی دا بەم ناوانە:

ا. جەعفەری کەریمی: معاونی وەزیری جەنگ

ب. ئیبراهیم صلاح: سەرۆکی ستادی گشتی

ج. محەممەد ئەمین شەرەفی: سەرۆکی تەخشایی هێز

د. هەموو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حزبی دیموکرات

وە پلەی کۆڵۆنێل درا بە محەممەد نانەوازادە: معاونی سیاسیی وەزیری جەنگ، پلەی کاپتان درا بە عەزیزی سدیقی: بازرەسی سوپا.

## مەلا مستەفای بارزانی، پلەی لە کۆماردا

لە سەرەتادا مەلا مستەفا و بارزانییەکان بە جۆرێک پشتگوێ خرابوون و ئاوڕیان لێ نەدەدرایەوە، کە بیریان لە خۆتەسلیمکردنەوە بە عێراق کردبۆوە، بەڵام:

١. مەزبەتەیەک بە ناوی سەرەکعەشیرەتەکانی کوردی عێراق و تێکۆشەرە کوردەکانی عێراقی و ئەفسەرە کوردە عێراقییەکانەوە بە دەستپێشکەریی شێخ لەتیف شێخ مەحموودی حەفید کە ئەوکات هەم لەلای سەرۆککۆمار و هەم لای حزبی دیموکرات و هەم لەلای هەموو عیلەکانی کوردی کوردستانی ئێرانیش جێگای تایبەتی بنەماڵەی خۆی هەبوو، درا بە قازی محەممەد و مەلا مستەفایان بە نوێنەری کوردە عێراقییەکان ناو نا و بەو ناوەشەوە بە قازی محەممەدیان ناساند.

٢. لەو کاتەدا مەترسیی پەلاماری ئەرتەشی ئێرانی هەبوو بۆ سەر سنوورەکانی ناوچەی سەقز و بانە، کۆمار پێویستی بە بارزانی و کوردە عێراقییەکان هەبوو.

پاش ئەو مەزبەتەیە، قازی محەممەد مەلا مستەفای بانگ کرد بۆ مهاباد و بەرەسمی پێشوازیی لێ کرا.

پاش بەخێرهاتنی مەلا مستەفا لەلایەن قازی محەممەدەوە، لەباتیی مەلا مستەفاش: محەممەد مەحموود "قودسی" کە ئەفسەرێکی لێهاتووی سوپایی و نووسەرێکی سیاسیی شارەزا و خەطیبێکی بەتوانای زمانپاراو و ڕۆشنبیرێکی شارەزا و سەرکردەیەکی دیاری ناو حزبی هیوا و هەیئەی ئازادی بوو، لەباتیی مەلا مستەفا بۆ ستایشی کۆمار و سەرۆککۆمار؛ وتارێکی خوێندەوە.

## بنگای مەشقی سوپایی و ڕۆڵی ئەفسەرە کوردەکانی عێراق

پاش تشکیلاتی سوپا، کۆماری کوردستان هەڵسا بە دامەزراندنی ئەفسەرد کوردەکانی عێراق و سوودلێوەرگرتنیان بەم جۆرە:

بەکر عەبدولکەریم حەوێزی، مستەفا خۆشناو، نووری ئەحمەد تەها، میرحاج ئەحمەد، کران بە سەرلکی سوپا کە هەر چواریان ئەفسەری دەرچووی زانستگای جەنگیی عێراقی بوون.

عیزەت عەبدولعەزیز، عەبدولڕەحمان موفتی، خیروڵا عەبدولکەریم، محەممەد ساڵح، وە نائب ظابط ئەحمەد ئەفەندی لە ستادی کل دانران بۆ مەشقپێدانی سوپای کوردستان.

محەممەد مەحموود قودسی، جەلال ئەمین بەگ لەگەڵ مەلا مستەفا کران بە هەیئەتی ئەرکان هێزی بارزانییان.

یەکەم شەڕی پاش لەدایکبوونی کۆمار و دەستپێکردنی قۆناغی گفتوگۆی لەگەڵ ناوەنددا:

ا. لە ڕۆژی (١٣٢٥/٢/٣)دا واتە لە (١٩٤٦/٤/٢٣)دا، نوێنەرانی حکومەتی کوردستان و ئازەربایجان لە تەوریز پەیمانی یەکیەتی و برایەتییان مۆر کرد و هەر لەو کۆبوونەوەیشدا بڕیاریان دا نوێنەری هاوبەش بنێرنە تاران بۆ گفتوگۆ.

ب. ڕۆژی (١٣٢٥/٢/٨)دا، واتە (١٩٤٦/٤/٢٨)، نوێنەرانی هەردوو حکومەت ڕۆیشتن بۆ گفتوگۆ.

ج. ڕۆژی (١٣٢٥/٢/٩)، واتە (١٩٤٦/٤/٢٩)، کە یەکەم ڕۆژ و گەرمەی سەرقاڵی گفتوگۆ بوون، هێزەکانی ئێران لە سەقز هێرش و پەلاماریان بردۆتە سەر بنکەکانی هێزی دیموکرات لە سەقزدا، بەپێی نامەی میجەر جەنەراڵ حەمە ڕەشید خان بۆ سەرەککۆمار، ئەو شەڕە (٧) سەعاتی خایاندووە و هێزی ئێرانی شکاوە.

د. سوپای سووری سۆڤیەتی لەسەر کشانەوەی یەکجاری بوون لە ئێراندا و دیارە چۆڵکردنی کوردستانیش، لەولاشەوە سوپای ئێرانی لە هەوڵی ئەوەدا بوو هەر چی زووتر شوێنەکانی سوپای سوور بگرێتەوە، لە لایەکی تریشەوە هەم کۆماری کوردستان و هەم ئازربایجان لە هەوڵی کۆکردنەوەی زۆرترین ژمارەی هێزدا بوون بۆ بەرگریکردن لە خۆ.

دوای شەڕی سەقز، کۆماری کوردستان لەوە گەیشت کە دەوڵەتی مەرکەزی بەرنامەی گفتوگۆی بەکۆتاییە، بۆیە کەوتنە بەهێزکردنی جەبهەی سەقز بانە کە جەبهەی پێشەوەی پێشڕەوی چاوەڕوانکراوی سوپای ئێرانی بوو. بەڵام بەپێی نامەیەکی فەرماندەی گشتیی ناوچەکە (حەمە ڕەشید خان) بۆ قازی محەممەد لە ١٩٤٦/٥/١دا، وەڵامی قازی لە ١٩٤٦/٥/٢دا ئەوە بووە کە تەنیا دفاع بکەن و هیچ

هێرشێک نەکەنە سەر سوپای ئێران، لەبەر ئەوەی هێشتا نوێنەرانی هاوبەش لە تارانن. نوێنەران بێ ئەنجام گەڕانەوە، بەڵام وردەشەڕ هەر بەردەوام بوو.

هـ. سوپای ئێرانی خەتی سەردەشت-بانە-سەقز لەژێر باری ئابڵوقەی سوپایی و ئابووریی هێزی دیموکراتدا بوون، چونکە هەموو ڕێگاوبانەکانی هاتوچۆی نێوان ئەو سێ شارە لەژێر کۆنترۆڵی هێزی دیموکراتدا بوو، بۆیە دوژمن دەیویست دیسان بە ناوی گفتوگۆ دەبێ زیانی ئەو ئابڵوقەیە لا بەرێ.

ڕۆژی ١٩٤٦/٥/٢٥ عەلی ڕەزم ئارای سەرلەشکری ئێرانی لەگەڵ نوێنەرانی کوردستان لەژێر ناوی "نوێنەرانی ئێرانی و کوردستان لە سەقز" دانیشتن. ڕۆژی ١٩٤٦/٥/٢٦ کۆمیتەی مەرکەزی نامەیەکی ئاڕاستەی نوێنەرانی کرد کە گفتوگۆ لەگەڵ ڕەزم ئارا ببڕنەوە، چونکە پێیان وایە ڕەزم ئارا دەیەوێ کات بەسەر بەرێ بۆ جێبەجێکردنی مەرامی خۆی نەک بۆ سوڵح و ڕێککەوتن.

و. جیاوازیی بیروڕای سەرانی حزب و سەرەککۆمار و هەیئەتی ڕەئیسەی میللی لەمەڕ گفتوگۆ و شەڕ و مقاوەمەت.

بەپێی هەموو نامەکانی سەرانی دیموکرات و فەرماندەی هێزەکانی دیموکرات، لەو ماوەیەدا کە سوپای ئێرانی سەرگەرمی جموجووڵ و پلانگێڕانی بۆ گرتنەوەی کوردستان یان هەر نەبێت سەندنەوەی کۆنترۆڵ لەدەست کۆماری کوردستان، داوای فەرمانی بەرەنگاری و لێدانی سوپای ئێران و پێشڕەوییان کردووە، بەڵام بەپێی وەڵامی نامەکان لەلایەن سەرەککۆمارەوە، ڕای سەرەککۆمار هەر وەرگرتنی مەوقیفی دفاع بوو، بەو هیوایەی کە هەم گفتوگۆ سەر بگرێ و هەم لە دەوڵەتە گەورەکان شتێک بۆ کورد بەتایبەتی لە سۆڤیەتەوە بەدەست بێنێ.

## جارێکی تر گفتوگۆ

لە (٢٤) تاکوو ١٩٤٦/٥/٢٧، دیسان گفتوگۆ لە تەورێز دەستی پێ کردەوە. هاوزەمان لەگەڵ گفتوگۆدا، سوپای ئێرانی دیسان بە فەرمانی سەرلەشکر ڕەزم ئارا هێرش و پەلامار دەبەنەوە سەر پۆستەکانی هێزی کوردستان لە قوڵی سەقزەوە. ڕۆژی ١٩٤٦/٥/٢٩ ئاگربەست لەنێوان قازی محەممەد و ڕەزم ئارا بەسترا و بەو پێیە

سوپای ئێرانی لە ئابلۆقەی ئابووری دەرباز بوو.

## ڕێککەوتنی سوپایی نێوان کوردستان و ئازەربایجان

مەترسیی هێرش و پەلاماری سوپای ئێرانی پاش دەستپێکردنی کشانەوەی سوپای سوور لە ناوچەی ئازەربایجان و کوردستان، هەردوو حکومەت ناچار بوون پێکەوە بۆ بەرگریکردن، ڕێککەوتننامەیەکی سوپایی مۆر بکەن.

بۆیە لە ١٩٤٦/١٠/١٦دا سەرانی هەردوو حکومەت، لیژنەیەکی بەرگریی هاوبەشیان پێک هێنا:

هەندێک لە بەندەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە:

١. پێکهێنانی سوپایەکی کوردی-ئازەریی هاوبەش، مەرکەزەکەی تەورێز بێت.

٢. ناردنی هێزی نیزامیی ئازەربایجان بۆ بەهێزکردنی جەبهەی سەقز.

٣. جەنەراڵ عەظیمی، سەرکردەی گشتیی هێزەکان بێ لە سەقز و سەردەشت و هەوشار.

٤. جەنەراڵ محەممەد ڕەشید خان، سەرکردەی گشتیی هێزی هاوبەشی کورد و ئازەر بێ لە جەبهەی سەقز.

٥. جەنەراڵ سەیفی قازی، سەرپەرشتیی ناوچەی هاوشار بکات.

٦. قازی محەممەد فەرماندەی هەرە بەرزی هەموو هێزەکانی کورد-ئازەر بێ لە کوردستان.

٧. پیشەوەری فەرماندەی هەرە بەرزی هێزەکانی کورد و ئازەر بێ لە ئازەربایجان.

بەڵام ئەم ڕێککەوتنەش کەوتە بەر خەنجەری بڕیاردانی بەرەنگارینەکردنی ئەرتەشی ئێرانی.

ئەم ڕێککەوتنە سوپاییە بەرهەمی ڕێککەوتنە سیاسییەکە بوو کە لەژێر ناوی "پەیمانی یەکیەتی و برایەتی" لە ١٩٤٦/٤/٢٣دا بەسترا. لەبەر گرنگیی مێژوویی ئەو پەیمانە، هەر (٧) بەندی پەیمانەکە باس دەکەین:

١. لەو شارانەی پێویست بێ، هەردوو حکومەت نوێنەر دەگۆڕنەوە.

٢. لەناو ئازەربایجاندا ئەو شوێنانەی کە کورد بن، کاری ئیداری بەدەست

کوردەوە دەبێ و لە کوردستانیش ئەو جێگایانەی کە ئازەر بن، لەلایەن ئازەرەوە ئیدارە دەکرێن.

٣. کۆمسیۆنی هاوبەشی لە هەردوو لا بۆ چارەسەری کێشەی ئابووری دادەنرێ.

٤. لە کاتی پێویستدا لەبەینی حکومەتی میللیی کوردستان و ئازەربایجان هاوکاریی پێشمەرگەیی دەکرێ، دەبێ ئەوەی لازمە بۆ کۆمەکی یەکتری؛ ئەنجام بدرێ.

٥. هەر کاتێ پێویست بێ لەگەڵ حکومەتی تاران گفتوگۆ بکرێ، دەبێ مەوافیقی نەزەریی هەردوو حکومەتی میللیی ئازەربایجان و کوردستان بێ.

٦. حکومەتی ئازەربایجان بۆ ئەو کوردانەی کە لە خاکی ئازەربایجان دەژین، تا ئەو ئەندازەیەی کە بتوانێ؛ دەبێ بۆ پێشکەوتنی زمان و فەرهەنگی وان هەوڵ بدا، هەروەها بۆ ئەو ئازەربایجانانەش کە لە کوردستان دەژین، لەلایەن حکومەتی کوردستانە.

٧. هەر کەسێ بۆ تێکدانی ئەو پەیمانی برایەتی و یەکیەتییە کار بکات، هەردوو لا دەبێ بە یەک دەست ئەو مورتەکیبانە بە جەزای خۆیان بگەیەنن.

## ڕاستیی ڕووداوەکان و کۆماری کوردستان:

١. دەرەنجامی گفتوگۆی تەوریز لە ئازەربایجان تا ڕادەیەک دانپێدانانێکی حکومەتی تاران بە نەتەوەی ئازەربایجان و شرەمافێکی فەرهەنگیی بۆ سەلماندن، بەڵام بە هیچ جۆرێک دان بەو شرەمافانەشدا نەنرا بۆ کورد و بەڵکە مەسەلەی کورد لەو گفتوگۆیەدا کرایە پاشکۆی ئازەرییەکان.

٢. ڕەواجی کێشەی کوردیش لەلای ئازەرییەکان، بۆچوونی ئازەرییەکان بۆ مەسەلەی کورد، بەو جۆرە بوو کە لەبەر ئەوەی لە ئێران و عێراق و تورکیا و سوریا هەیە، سۆڤیەتیش نایەوێ دڵی ئەو دەوڵەتانە هەمووی لە خۆی بڕەنجێنێت، بۆیە ناشکرێ لە ئێرانیشدا وەک مەسەلەی ئازەری چارەسەر بکرێ، وە لە لایەکی تریشەوە خۆبەزلزانیی ئازەری لەبەردەم کورددا، وە ئازەرییەکان پێیان وا بوو کە کێشەی کورد وەک کێشەی شارێکی ئازەر وایە لە ئازەربایجاندا.

٣. وەعدەکانی سۆڤیەتیش بۆ کورد، دەرئەنجام هاتە سەر سفر (هیچ).

ا. دانی (١٠) هەزار تفەنگی بڕنەو.

ب. (٦٠) لاوی کوردیان لە باکو وەرگرت بۆ پەروەدەکردنی سوپایی.

ج. چاپخانە کۆنەکەی تەوریزی خۆیشیان دا بە مهاباد.

٤. ئامۆژگاریی سۆڤیەت بۆ کۆماری مهاباد.

لە کاتی شەڕی مامەشدا، هاشمۆفی کونسوڵی ڕووسی لە ورمێ چووە بنکەی دیموکرات و داوای لێ کردن کە شەڕ لەگەڵ ئەرتەشی ئێران نەکەن باشە، چونکە لەگەڵ لەشکری ئینگلیز ڕووبەڕوو دەبنەوە، لەبەر ئەوەی ئینگلیز نەوتی کرماشانی لە مەسەلەی کورد زۆر لا گرنگترە، ئەو ئامۆژگارییە خراپەی ڕووس کاری لە سەرانی کۆمار کرد و جێی خۆی گرت و وازیان لە مقاوەمەت و پێشڕەوی هێنا.

٥. دوا سەفەری قازی محەممەد بۆ تاران، پاش بێهیوابوونی لە هاوکاریی سۆڤیەتی و ئازەربایجانی و هەوڵدانی بۆ سازین لەگەڵ دەوڵەتی مەرکەزیی ئەوکات "قوام السلطنە"ی سەرەکوەزیرانی ئێران، بەوە ڕازی بوو کە هەموو ناوچە کوردنشینەکان بکرێتە یەک ئوستان و ئیدارەکەشی بە کوردەکانی بسپێردرێ، کە تا ڕادەیەک لە هیچ باشتر بوو، بەڵام ڕووسەکان ئەوەشیان بە کورد ڕەوا نەبینێ و کەوتنە دانی وەعد و وعودی درۆودەلەسە بە کورد بۆ پەشیمانبوونەوەیان لەو دەستکەوتە و پاشان پەشیمانکردنەوەی تاران لەو وەعدەش بە مەبەستی:

ا. ئەگەر سەری بگرتایە، ناوەندی ئازەربایجانی پێ لاواز دەبوو کە ڕووسەکان بە هیی خۆیان دەزانی.

ب. ئەگەر ئەو سازشە سەری بگرتایە، ئیتر ڕووس وەرەقەی کوردیان بەدەستەوە نەدەما گەمەی پێ لەگەڵ تاران بکەن.

## کابینەی "قوام السلطنە" و سەردانی مۆسکۆ

چوونی "قوام السلطنە" بۆ مۆسکۆ و چاوپێکەوتنی لەگەڵ ستالین، گەیشتنە ئەم ئەنجامانە:

١. هەموو هێزەکانی لەشکری سوور لە (١٩٤٦/٣/٢٤)ەوە تا کۆتایی مانگی (١٩٤٦/٦)، هەموو سەرزەمینی ئێران بەجێ بهێڵێ.

٢. ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی ژوورووی ئێران بدرێ بە سۆڤیەت.

٣. لە کابینەکەی خۆیدا چەند ئەندامێکی حزبی تودەیی ئێران بەشدار بێ.

٤. بە چاوی ڕەحم و خێرخوازییەوە سەیری مەسەلەی ئازەربایجان بکرێ، لەبەر ئەوەی مەسەلەیەکی ناوخۆییە.

بەو پێیە هەم هەندێ تودەیی بوونەوە وەزیر، هەم مەسەلەی ئازەربایجانیش کرایە ئاوی سبیل و هەم کوردیش کرایە قوربانیی نەوت و هەم سۆڤیەتیش بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ بووە خاوەنی (١٠٪)ی بەرهەمی نەوتی ژووروی ئێران.

## هەڵوەشاندنەوەی حکومەتی کوردستان

لە ١٩٤٦/١٢/٤دا ستادی ئەرتەشی ئێران، پلانی گرتنەوەی ئازەربایجان و کوردستانی دانا. لە ١٩٤٦/١٢/٥ قازی محەممەد تاقمێکی (١٠) کەسیی بۆ پێکهێنانی شووورای جەنگ لە مهاباد و بۆ کۆبوونەوە بانگ کرد، بەڵام بڕیاری پێکهێنانی شوورا خرایە ڕۆژی ١٩٤٦/١٢/٦ کە ژمارەیەکی زۆر لە سەرانی حزبی دیموکرات و سەرەکعەشیرەتەکان و گەورەپیاوانی مهاباد لە مزگەوتی عەباس ئاغا کۆ بوونەوە. قازی محەممەد و صەدری قازی ڕایان وا بوو کە پێشگیری لە سوپای ئێران بکەن، بەڵام هەندێک لە پیاوماقوڵانی مهاباد وەک مەلا عەبدوڵڵای مورسی و مەلا حسێنی مەجیدی ڕایان وا بوو کە ئاشبەتاڵ بکرێ. لە ١٩٤٦/١٢/١٠ هێزەکانی ئێرانی دەستیان بە هێرش کرد بەرەو تەورێز، لە ١٩٤٦/١٢/١٣دا سەرانی حکومەتی ئازربایجان بڕیاری خۆبەدەستەوەدانیان دا. لە کوردستانیش لە ١٩٤٦/١٢/١٢ فەرمان بە هێزەکانی سەقز-بانە-سەردەشت درا بکشێنەوە بۆ بۆکان و پاشان مهاباد. ڕۆژی ١٩٤٦/١٢/١٤ کۆمەڵێک لە پیاوماقوڵانی مهاباد چوون بەپیر لەشکری ئێرانەوە. ئێوارەی ڕۆژی ١٩٤٦/١٢/١٤ تاقمێک چوونە لای قازی محەممەد و داوایان لێ کرد کە لەگەڵیان بڕوا بە پەنابەری بۆ عێراق یا سۆڤیەت، بەڵام قازی پێی وتن: "ڕێتان لێ ناگرم بڕۆن و چیتان پێویستە لەگەڵ خۆتانی بەرن. من لەگەڵ خەڵکی مهاباد دەمێنمەوە و بەجێیان ناهێڵم، چونکە سوێندم خواردووە کە لەگەڵیان بم و چاوم لێیان بێت. حکومەتی تاران بە ڕق و تووڕەییەوە دێتەوە، ئەگەر من بگرێ؛ داخی خۆی بە من دەڕێژێ و واز لە خەڵکی دێنێ، جا بۆ

ئەوەی خەڵکی شار تووشی زەرەر و زیان نەبێ؛ دەمێنمەوە." ڕۆژی ١٩٤٦/١٢/١٦، سوپای ئێران گەیشتنە مهاباد. ڕۆژی ١٩٤٦/١٢/١٧، قازی محەممەد، سەیفی قازی، حاجی بابە شێخ و چەند کەسێکی تر خۆیان تەسلیم بە سەرتیپ هومایون کرد. هەمان ڕۆژ پێش تەسلیمبوونی قازی، مەلا مستەفا خۆی گەیاندە لای قازی و داوای لێ کرد کە لەگەڵ ئەودا بڕۆن، بەڵام بەڵێنی خۆی دابوو. لە ١٩٤٧/٣/٣١دا، (قازی محەممەد، سەیفی قازی، صەدری قازی) لەسێدارە دران. بە لەسێدارەدانی ئەوان، کۆماری مهابادیش لە مهاباد و کوردستان و ئێراندا کۆتایی هات، بەڵام لە مێژووی کورددا بەدرەوشاوەیی مایەوە و دەمێنێتەوە و دەبێتە بەشێکی گرنگی مێژوو.

## هاواری کوڕم و ڕاپەڕینی نەتەوەیی

پێشتر باسم کردووە کە باپیرەگەورەمان ناوی هاوار بووە و شەهید هاواری براشم هەر بە ناوی هاوارەوە ناو ناوە. دوای شەهیدبوونی شەهیدان خەلیل و هاوار، ئیتر هاوار ناو لەناو بەرە و نەوە و نەوەی هاوار ئاغا نەما، هەردوو شەهید بەگەنجی و بێ هاوسەر و منداڵ شەهید بوون، دایکم و باوکم لە تەمەنی بەدنیاهێنانی برایەکی ترمدا نەبوون تا هیوای جێگرەوەیەکی ترم بۆ هاوار ناو هەبێ. من پێشتر باسم کردووە کە سێ کچم هەیە: سروشت لە ١٩٧١/٩/١٢ و ژین هەر لە ١٩٧٤/٩/١٢، واتە هەمان ڕۆژ، بەڵام سێ ساڵیان نێوان هەبوو، پاشان دەروون لە ١٩٧٨/١/٢. ئیتر بە هۆی بوونم بە پێشمەرگە و چوونە شاخم لە ١٩٧٨/٧/١٠، منداڵی ترمان نەبۆوە تا چوونمان بۆ ئەڵمانیا، لەوێش پزیشکەکان دڵنیایان کردین کە هاوسەرم تەمەنی منداڵبوونی تێپەڕیوە و چیتر منداڵمان نابێ، بەڵام هاوار ڕاپەڕی و لە ١٩٩٠/٤/٥ یەک مانگ دوای ڕاپەڕینی کوردستان، ئەویش بەرپەرچی زانستی پزیشکیی دایەوە هاتە ژیانەوە. جارێکی تر هیوای بە باوکی بەخشییەوە کە ناوی هاوار لە بنەماڵەمان نابڕێ و بەردەوام دەبێن لە پیرۆزکردنی ئەو ناوە زۆر زۆر لەبەردڵان شیرینە، هەم بە هۆی گەورەیی ئەو ناوەی کە پتر لە (دوو قەرن) دوو سەدە باپیرەگەورەمان هەڵگری ئەو ناوە کوردی پەتییە بووە، هەم پیرۆزیی ناوی ئەو شەهیدە مەزن و نەمرەی کە لە تەمەنی ٢٧ ساڵیدا مۆمی تەمەنی خۆی کوژاندەوە و لە ڕێگەی ئازادیی گەلەکەیدا.

## بەشی دەیەم
## ڕاپەڕین و کۆڕەوی ملیۆنی

کۆڕەوە بەکۆمەڵییە ملیۆنییەکەی باشووری کوردستان بوو کە بە سەرما و بەستەڵەکی زستان رووی سپی بە بەفر داپۆشراوی هەموو گرد و شاخەکانی سەر سنوورە دەستکردەکەی نێوان عێراق-ئێران و عێراق-تورکیای بە جلوبەرگی کۆڕەوان، ڕووی ڕەشی بێدەنگیی مرۆڤایەتیی داپۆشیبوو. لە ١٩٩١/٣/٣١ لە ساردترین مانگی ئەو زستانە ساردە بوو، کە بە ملیۆنان منداڵ و ژن و پیری پەککەوتە و پیاوی بێئۆقرە کردبوو. بۆ مێژوو، کوردانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە چاونوقاندنی ڕژێمی ئێرانی، ڕەفتاری زۆر مرۆڤانە و دۆستانە و نەتەوەییانەیان نواند، کە ژمارەی هەرە زۆری کۆچپێکراوان ڕوویان لەلای ئەوان کردبوو، بێسنوور و بێ قسوور کەوتنە داڵدەدان و حەواندنەوەیان و هاوکاریکردنیان بە خۆراک و بە بەرگ و بە نوا پێدانیان. تەنانەت سەرباز و پاسدارانی سەر سنوورەکانیشیان بەڕێزەوە بەپیر کۆچبەرانەوە دەچوون. بەڵام بەبەر چاوی ڕاگەیاندنی سەرتاسەری ئێرانی و عەرەبی و جیهانی. جەندرمە و قەرەقۆڵە تورکەکانی تورکیا لەسەر سنوورە دەستکردەکە، بە پاڵپێوەنان و قۆناغەتفەنگ لێدان و کێبڵ و دارلێدان پێشوازییان لە کۆچبەران دەکرد، تەنانەت دزییان لە بەشێکی ئەو کۆمەکە خێرخوازییەش دەکرد کە لە وڵاتانەوە بە ڕێگەی تورکیادا بۆیان دەنێردرا.

ئەرکی ئێمە لە دەرەوەی وڵات، کۆکردنەوە و سواڵکردنی پارە و کەلوپەل و ئەو هاوکارییانەی کە لە کۆمەڵەی خێرخوازیی مەسیحییەکانەوە وەرماندەگرت، وەک کۆمەڵەی "کاریتاس" و "دیاکۆنە" لە جلوبەرگ و دەرمان و خۆراک و وەرگرتنی لۆریی گەورەی بارهەڵگر و بارکردنی و ناردنی بۆ سەر سنووری تورکیا-عێراق بوو

شارەکانی سنە، مهاباد، ورمێ، نەغەدە، سەقز، سەردەشت، بانە، بۆکان، قەسری شیرین، کرماشان، بەڕاستی هەوڵی مەردانە و کوردانەی خۆیان نواند کە مایەی شانازیی مێژووی گەلی کوردن. تراجیدیای کیمیاباران و ئەنفال و پاشان کۆڕەوی ملیۆنی، لەلایەن ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئێرانەوە یا ڕێگەدان بە ڕاگەیاندنکارەکانی کەناڵەکانی عەرەبیە و جەزیرە و وڵاتانی ئەورووپی، ڕاستەوخۆ هەواڵەکان بە جیهان و مرۆڤایەتی دەگەیەنرا، هەموو کەسێک لە ئەورووپا و ئەمەریکا و دەوڵەتە عەرەبییەکانەوە هەواڵ بە هەواڵی ڕۆژانەی ئەو تراجیدیایانەیان دەبینی و دەبیست لە ڕێگەی کەناڵەکانیانەوە.

بەندە، ١٢ کاسێتی دوو سەعاتیم لە ڕێگەی کەناڵەکانی (الجزيرة، العربية) لەسەر ئەنفال و کیمیاباران و کۆڕەو و شەڕی عێراق و کوێت و هاوپەیمانان تۆمار کرد. لەو کاتەی کە کورد و هەموو جیهان سەرقاڵی کۆڕەوێکی چەند ملیۆنیی بێوێنەی ئەو چارەکەسەدەیە بوون. لەو کاتەی کە ڕۆژانە کوردانی هەر چوار پارچەی کوردستان کە ئاوارەی وڵاتانی ئەورووپا بووبوون، ڕۆژانە بێ پسانەوە دەڕژانە سەر شەقام و مەیدانەکانی ناوەڕاستی شارەکان، خۆپیشاندان و مانگرتنیان دەکرد. لەو کاتەی کە کوردان لە تاراوگە شەو و ڕۆژ لە هەوڵی پارە کۆکردنەوە و سواڵکردن و وەرگرتنی خێری خێرخوازان بوون بۆ هاوکاریی کۆچپێکراوان، لەو کاتەی کە ڕۆژانە دەیان منداڵ و پیری پەککەوتە لە سەرما و لە بێخۆراکی و بێبەرگی دەمردن، لەو کاتەی کە گەورە و بچووکی کۆچپێکراوانی کورد ڕۆژانە چەندین جار دەکەوتنە بەر قۆناغە تفەنگ و داری تورکەکان کە هەڵپەی گەیشتنیان بوو بەدوای سەموونە ڕەقێک کە کۆپتەرێکی تورکی بۆی دەخستنە خوارەوە، بەڵێ لەو کاتەدا بەرەی کوردستانی بە دەستپێشکەریی سەدام و فشاری نێودەوڵەتی کەوتنە وتوویژ بۆ کۆتاییهێنان بەو تراجیدیا ویژدان هەژێنە. لەدوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی وتوویژ و دانوستاندنی نێوان بەرەی کوردستانی و ڕژێمی بەعسییان، ئیتر خۆپیشاندانی ڕۆژانەی کوردان کە پێشتر دەیان و بگرە سەدان ئەڵمانی و فەرەنسی و ئینگلیزی بەشدارییان لەگەڵدا دەکردین، دوای بڵاوبوونەوەی ئەو هەواڵە؛ بەتەنیا ماینەوە و یەک بیانییشمان لەدەوری خۆمان نەدەدی، تەنانەت زۆر لە کوردەکانی باکوور و ڕۆژئاواش لێمان تەکینەوە و وتوویژیان لەگەڵ سەدام بە تاوان دەزانی. ئەڵمانەکان بەتوانجەوە پێیان دەوتین: "ئێوە گەلێکن هەر

شایستەی ژێردەستەیی و داگیرکارین، دەنا نەدەچوون دەست بخەنە دەستی هتلەری دووەمەوە لە کاتێکدا کە پشتیوانی و بەزەیی گەلانی دنیاتان بەدەست هێنابوو." لە هەموو لایەکەوە دەنگی ناقایلیی کوردان، بەتایبەتی باکوور و ڕۆژئاوای و بەشێکی باشووری خۆیشمان بەرامبەر نوێنەرانی بەرەی کوردستانی لە دانوستاندن لەگەڵ بەغدا بەرز بۆوە. ڕۆژێک لە کاتی مانگرتندا لە پانتایی "لۆرینس کرشە"، دەمەتەقە و وتووێژ لەنێوان چەند کوردێکی دژەگفتوگۆ لەگەڵ پیاوێکی بەتەمەنی هەولێری کە ناوی "موحسین دزەیی" بوو؛ پەیدا بوو، دژەگفتوگۆکان بیانوویان دەهێنایەوە بۆ نەکردنی گفتوگۆ (مفاوضە)، کاک موحسین گوتی: "ئێوە لەم وڵاتە سەلامەتە، لەماڵی گەرموگوڕی خۆتان، لەناو بەرگ و پێخەفی گەرم و چاکی خۆتان، ناتوانن بەرگەی یەک بەیانی بگرن بە ئاوی سارد دەستوچاوتان بشۆن، لۆ لە تێری ئەو وشە گەورە و قەبانە دەکەن!" منیش بەبیرم دا هات کە سمینارێکی گەورە بۆ کوردانی نورتبیرگ بگرم لەسەر دانوستاندن.

## دەقی سمینارەکەی دانوستاندن

## مفاوەضە – وتووێژ – دانوساندن - دانوستاندن

وتووێژ وەک ڕاستییەکی مێژووی لە هەلومەرجێکی لەبار و لە زەمان و زەمینێکی گونجاودا، یاسای پێکەوەژیانی دوودژە، دوودژی هاوکێشەنەبوو لە هێز و دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری و سەربازی و لە جەوهەری هێزی مەعنەوییشدا، واتە پێکەوەژیانی دوو لایەن کە هەم دژ بە یەکن و هەم پێکیشەوە ناچاری گوریس کێشەکی دەبن لە پێکەوەژیان و دژایەتیکردنیشدا.

دانوستان: ئەو فاکتەرەیە کە لە پرۆسەی خەمڵاندنی کێشەیەکی دیاریکراودا سەرئەنجامێک دەدات بەدەستەوە، ئەو سەرئەنجامەش بە قازانجی هەردوو لای کێشەکەیە، زۆر جار وا هەست دەکرێت کە دانوستان هەر بە سوودی لایەنی بەهێزە. ملدان و سەرشۆڕکردن و دۆڕاوی بەشی لایەنی لاوازە. بەڵام ئەوە هەرگیز ناگونجی لەگەڵ یاسای دانوستاندندا، بەڵکە ڕاستی لە ئەنجامی دانوستاندندا خۆی لە هەردوو نرخی ماددی و مەعنەویدا دەبینێ.

ئێستا بەوردی دێینە سەر شیکردنەوەی ئەو بۆچوونانەی سەرەوە.

دانوستان هەرگیز لەنێوان دوو لایەنی مافگۆ و ڕەواخواز و بڕوا بوو بە یەکسانی و وەک یەکی مرۆڤ یان نەتەوە یا وڵاتدا ناکرێت، چونکە لەو هەلومەرجەدا هەردوولا بێ سێ و دوو لێکردن ئەوەی بە خۆیانی ڕەوا دەبینن، بە لایەنەکەی تریشی ڕەوا دەبینن و بێ مشتومڕ و کێشە و وتوویژ هەردوو لا یەکتری دەسەلمێنن. دیسانەوە دانوستان لەنێوان لایەنێکی دەسەڵاتدار و بەهێز، بەڵام بەبڕوابوو بە مافی مرۆڤ و گەلان و لەنێوان لایەنێکی لاواز و بێدەسەلات و داگیرکراودا ناکرێ، بەڵکە لایەنە دەسەڵاتدارەکە هەر لە هەڵوێست و بڕوابەخۆییەوە هەموو مافەکانی لایەنە لاوازەکە بێ وتوویژ بە یەک بڕوانامەی مێژوویی دەسەلمێنێت. بۆ نموونە: لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە یەکێتیی سۆڤێتدا، یەکسەر بە یەک بڕیار هەموو هێزەکانی ڕووسیایان لە ناوچەکانی کوردستان و قەفقاز و ئێراندا کێشایەوە و ڕاشیانگەیاند بە هیچ جۆرێک ئامادەی بەشکردنی دەستکەوتەکانی شەڕ نین کە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و ئەڵماندا کردبوویان و هاوپەیمان بوون لەگەڵ ئینگلیز و فەرەنسا و ئیتاڵیا و ئەمریکادا، وە بە فەرمانی لینین لە ڕۆژی ١٩١٧/١٢/٥ لە بەیانێکدا هەڵوەشاندنەوەی هەموو پەیمانە نهێنی و ئاشکراکانی سەردەمی قەیسەری سەبارەت بە دەستبەسەراگرتنی بەشێک لە ئێران و تورکیایان ڕاگەیاند. واتە وتوویژ و دانوستان هەمیشە خۆ بە مافزان و مافخوراو ستەملێکراو پاش ململانێیەکی زۆر و توندوتیژی و قوربانییەکی زۆر دەیکات لەگەڵ لایەنێکی مافخۆر و ستەمکەردا. هیچ دانوستانێک (وتوویژێک) بێ دەستکەوت نییە، بەڵام لانی کەم لانی زۆری داخوازییەکان واتە کەم و زۆریی دانوستانەکە دەکەوێتە سەر هەلومەرجی وتوویژەکە، بەڵام ئەوە هەرگیز ئەوە ناگەیەنێ کە ئەگەر لایەنێکی وتوویژ لە لاوازی و کەم دەسەڵاتیی ڕووەو تیاچوون بوو، ئیتر هەڵوێستی لاوازە و نابێت وتوویژ لەگەڵ لایەنە دەسەڵاتدارەکە بکات، بە بیانووی ئەوەی گوایە لە سەنگەری دواوە و لەوپەڕی لاوازی و بێدەسەڵاتی و بێهێزیدایە و هیچی پێ لە دەسەڵاتدارەکە ناسەنرێ و بەڵکە ناچار دەبێ کە تەسلیم ببێ. ئەگەر بەوردی سەرنج لەم بۆچوونە بدەین، دەبینین تەنانەت لەنێوان دوو کەسدا، یەکیان لاواز لە ڕووی قەبارە و لەش و وزەوە و دەسەڵاتی خێزانی و

عەشیرەت پشتوپەناوە، ئەوی تر بەهێز و بەتوانا لە ڕووی قەبارەی لەش و وزە و خێزان و عەشیرەت و پشتوپەناوە، گەر لە کێشەی نێوانیاندا وتوویژ دروست ببێ و دەسەڵاتدارەکە بەشێکی زۆر لە بەرژەوەندییە تایبەتەکانی بێدەسەڵاتەکە بۆ خۆی بەرێ، هێشتا هەر بێدەسەڵاتەکە لە وتوویژەکە سەرکەوتوو بووە! ڕەنگە بپرسی چۆن؟

هەر نەبێ ماف و ژیانی خۆی دەپارێزێ، چونکە گەر ئامادەی وتوویژ نەبێ، هەم بەرژەوەندییەکان و هەم گیانی خۆیشی لەدەست دەدا، کە گیانی خۆی گەورەترین سەرمایەیەتی لە ژیاندا. ماکیاڤیلی لەم ڕووەوە دەڵێ: سیاسەتی سەرکەوتوو ئەوەیە کە مرۆڤ پەنا بەرێتە بەر هەردوو ڕێوشوێنی مرۆڤانە و ئاژەڵانە، واتە بزانێ چۆن لەنگەری فێڵبازی ڕێوی و شاڵاوی شێر ڕابگرێ، چونکە پێوانەی بنچینەیی بۆ هەڵسەنگاندنی سیاسەتی ڕاست؛ سەرکەوتنە (ماکیاڤیلی، میر، ل١٧). "دەیدەبا"ش هەر لەم ڕووەوە دەڵێ: "پیاوی بێدەسەڵات بە لەسەرخۆیی و فرتوفێڵ زەفەر بە دوژمنە دەسەڵاتدارەکەی دەبات، فرتوفێڵ ڕێوی سواری کۆڵی فیل دەکا، مار لە کون دینێتە دەر و یاریی پێ دەکا، شێر لەناو تابووت دەنێ، ڕێ لە زەرەری ئاگر و لافاو و ڕەشەبا دەگرێ" (کەلیلە و دیمنە، ل١٧٢). پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر، لەو کاتەدا یەکێتیی سۆڤیەت (دەوڵەتی کرێکار و جووتیار) لە هەموو لایەکەوە بە هێزی دوژمن گەمارۆ درابوو، وە لە ناوخۆشدا هێزە سوپاییەکەی لە سوپای سەردەمی قەیسەر بوو، تووشی داتەپین و داهێزران و شیرازە تێکچوون بووبوو، وە هیوای پاراستنی دەوڵەتی کرێکاری و جووتیاریی لێ نەدەکرا، بۆیە لینین لە ٢٦ی ئۆکتۆبەری ١٩١٧دا بۆ پاراستنی دەوڵەتەکەی لە لەناوچوون و تێکشکان؛ بەیانێکی ئاشتیی ڕاگەیاند بەم جۆرە: "پێویستە لەسەر حکومەتی کرێکاران و جووتیاران، داوا لە هەموو دەوڵەتانی شەڕکەر بکات کە هەر ئێستا و بێ دواکەوتن دەست بە وتوویژ بکەن لە پێناو ڕێککەوتنێکی دیموکرات و عادلانەدا" (مرسوم السلام، لینین، ٢٦ی ئۆکتۆبەری ١٩١٧، مجلد ٣٥، ل١٣). دیسانەوە دەڵێ: "ئەوە "تاوانکردنە" لە پێناوی بەرگریکردن لە نیشتمان، بکەوێتە شەڕێکی نابەرامبەرییەوە لەگەڵ دوژمنێکی زۆر بەهێزتر و زۆر ئامادەباشتر بۆ شەڕ لە ئێمە هەتا کۆتایی. ئێمە لە پێناو بەرگری لە نیشتمان و دەستکەوتەکانمان ناچارین بە قبوڵکردنی ئاشتییەکی زۆر زاڵمانە و زۆرەملێیانە و دڕندانەش، نەک بۆ ئەوەی

خۆ تەسلیم بە ئیمپریالیزمی دوژمنانمان بکەین، بەڵکە بۆ ئەوەی هەلێک و دەرفەتێک بۆ خۆمان هەڵخەین کە بتوانین جارێکی تر بە وشیارییەکی زیاتر و شارەزاییەکی باشترەوە خۆمان ئامادەی شەڕ بکەینەوە، بەڵام بە شێوەیەکی لێبڕاوانەتر و هونەرێکی نوێتری جەنگی (لینین، مجلد ٣٥، ل٣٩٥).

وتووێژیش خۆی لە خۆیدا هەر خەباتە و تێکۆشانە، بەڵام بە شێوەیەکی تر، بە شێوەی بەرهەمێکی خەملاویی ناو پرۆسەی خەبات. خەبات بە پەیدابوونی هەستی چینایەتی یان نەتەوایەتی و خەملینی ئەو هەستە دەست پێ دەکات لە پێناو بەدیهێنانی بەرژەوەندی، لە پێشدا بە نارەزایی دەربڕین و پاشان داواکاری پێشکەشکردن و دوایی مانگرتن و خۆپیشاندان و پێکهێنانی دەستەی چەکداری و وردە وردە بەهێزکردنی بازووی خەباتی چەکداری لە رووی چەندایەتی و چۆنایەتییە لە پرۆسەی گۆرانکارییەکانی خەباتی چەکداریدا، هەر لە شەڕی پارتیزانییەوە تا بەرگریکردن و هێرشبردن و شەڕی رووبەڕووی درێژخایەن و پاشان راپەڕینی بەرفراوانی جەماوەر. دیارە ئەم پرۆسانەی خەبات هەموویان رێبازن بۆ یەک ئامانج، ئەویش بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی چینایەتی یان نەتەوایەتییە، وە هیچ کام لەمانە ئامانج نین تاکوو وەک شتێکی پیرۆز و ئەزەلی تەماشا بکرێت، ئامانجیش لە دوو حاڵدا پاش ئەو هەموو پرۆسانەی خەبات بەدی دێت، ئەویش یان حاڵەتی راماڵینی دوژمن و نەهێشتنی دەسەڵاتەکەیەتی بە رێگەی شەڕ و پاشان بڕواپێهێنانی بە رێگەی وتووێژ، یان حاڵەتی یەکسەر وتووێژە بۆ بەدەستهێنانی بڕواهێنانی دوژمن بە مافی چینایەتی یان نەتەوایەتی، واتە لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئەنجام هەر بە وتووێژ بەدەست دێت.

جا گەر دوژمنەکە زۆر بەهێزتر و بەتواناتر بوو لە رووی عەسکەری و تەکنیکی و پسپۆڕییەوە، مانای وا نییە کە نابێ لایەنەکەی تر وتووێژ پەسەند نەکات، بەڵکوو بەپێچەوانەوە هەرکە دوژمنە بەهێزەکە ئامادەی وتووێژ بوو، پێویستە لایەنەکەی تر پەسەندی بکات و ئەو هەلە مێژووییە لەدەست نەدات. چونکە گەرچی تەرازووی هێزەکانی هەردوو لا وەک یەک نەبن، بەڵام هەر هەڵبژاردنی وتووێژ لەلایەن دەسەڵاتدارەکەوە خۆی لە خۆیدا مانای بێدەسەڵاتی و ناچاربوونیەتی کە بڕوا بە بوون و وجوودی لایەنەکەی تر بکات. بەدەستهێنانی ئەو بڕوایەی لە دەسەڵاتدارەکە

لەلایەن کەم دەسەڵاتەکەوە، گەورەترین دەستکەوتی قۆناغییە و پلیکانەی سەرکەوتنی یەکجارییشیەتی. لەدەستدانی هەلومەرجی وتوویژ لەلایەن هەر لایەکەوە بێت، مانای سەرکەوتنی لایەکەی تر دەگەیەنێت. لینین لەم ڕووەوە دەڵێت: "پێویستە لەسەرمان هەرگیز ئەو هەلە نەدەینە دەست دوژمنەکانمان کە بە بیانووی قورسی و زۆریی مەرجەکانمانەوە مهانەی شەڕ پێ فرۆشتنمان مسۆگەر بکەن، چونکە هەر کاتێ مەرجەکانمان زۆر قورس بوون، نابێ بەهیوای ئەوە بین کە لەگەڵماندا وتوویژ بکەن. نەخێر، دەبێ ئێمە دوژمنەکانمان لەو بەهانەیە بێبەری بکەین و ناشبێ مەرجەکانمان لەبرانهاتوو بێ، بەڵکە دەبێ دوای هەموو جۆرە مەرجێک و هەموو جۆرە پێشنیارێکیش بگەڕێین بۆ ڕێککەوتن، وە دەبێ دژی هەموو جۆرە دیبلۆماسییەتێکی نهێنی بین و وتوویژەکانیشمان پێویستە ئاشکرا و ڕوون بێت لەبەردەمی هەموو گەلدا. هیچ شۆڕشێک نرخی نابێ گەر توانای پارێزگاریکردن و بەرگریکردنی لە خۆ نەبێ، هیچ شۆڕشێکیش کتوپڕ فێری بەرگریکردن لە خۆ نابێ" (لینین، مجلد ١٠، ل٣٣٥). ڕاستی و ڕەوایی وتوویژکردن لە بۆچوونی مارکسییانەوە، خۆی لە لەدەستنەدانی لەباریی هەلومەرجی وتوویژدا دەنوێنێ لە کات و شوێنی دیاریکراودا. واتە هەر کاتێ هەلومەرجی وتوویژکردن لەبار بوو لە کات و شوێنی دیاریکراودا، دەبێ بکرێ و گەر نەکرێ؛ مانای دانی بڕیاری خۆلەناوبردنە بەسەر خۆدا. لە ڕووی دیموکراتییشەوە: هەر لە کێشەی نێوان دوو کەس تا خێزان و تایەفە و تیرە و چین و گەل، ڕاستترین شێوەی چارەسەرکردنی بریتییە لە ڕێگەی دیموکراتیانە، واتە ڕێگەی ڕاوێژ و وتوویژ، وە هەر لای کێشەیەک گەر چەندە دکتاتۆر و خوێنمژ و خۆسەپێنەر و ستەمکەر بێت، کە داوای ڕێبازی وتوویژی کرد لەگەڵ لایەنەکەی دژ بە خۆیدا و لایەنە دژەکە پەسەندی نەکرد و ئامادەی وتوویژەکە نەبوو، هەر چەندە لەسەر حەق بێ و دیموکراتی و خوێندەر و ژێردەستە و ستەملێکراو بێت، هێشتا لەلایەن بێلایەنەکانەوە ئەو بە شەڕخواز و دژەئاشتی و دژەدیموکراتی ناو دەبرێت. واتە هەم بۆ ڕای بێلایەن و هەم بۆ سەلماندنی ئاشتیخوازێتی و گرتنی ڕێبازی دیموکراتیانەی چارەسەری کێشەکەی؛ پێویستە هەرگیز دژی وتوویژ نەبێت، هەوڵ بدا هەر چەند بۆی بکرێت فرسەت لەدەست خۆی نەدا و فرسەتیش نەداتە دەست دوژمن.

وتوویژ وەکوو چین (طبقه)، هەر لە پێکهاتنی چینایەتییەوە لەناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا کە دەگەڕێتەوە بۆ پاش قۆناغی کۆمۆنەی سەرەتایی و سەرەتای قۆناغی کۆیلەیی، هەمیشە مشتومڕ و کێشمەکێش و دژایەتیی نێوان دوو چین یان چەند چینی دژ بە یەک هەبووە، یا هەندێ جار هەندێ کێشە هەبووە کە ناکۆکیی پلە دووی بەخۆیەوە گرتووە بەپێی هەلومەرج و قۆناغی ململانێکە و کات و شوێنی ململانێکە، وە هەندێ جاریش بووە کە ناکۆکیی پلە یەک و توندوتیژیی بەخۆیەوە گرتووە، بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا ئەنجامەکەی بە وتوویژ کۆتایی هاتووە. بۆ نموونە لە قۆناغی کۆیلەییدا، ناکۆکیی نێوان کۆیلە و خاوەن کۆیلەکان یان سەردارەکان، قۆناغ بە قۆناغ بە ڕێککەوتن و وتوویژ و ململانێ؛ کۆیلە توانیویەتی خۆی لەدەست بەندوکۆتەکانی سەردارەکان ڕزگار بکات، هەنگاو بهاوێتە قۆناغێکی نوێی ترەوە کە قۆناغی دەرەبەگایەتی بووە، لە دەرەبەگایەتیشدا بەردەوام ململانێی نێوان جووتیاران و دەرەبەگایەتی لە لایەک و لە لایەکی ترەوە نێوان دەرەبەگایەتی و مانی فاکتۆرە و پاشان نێوان بۆرژوا و دەرەبەگایەتی و بە ڕێبازی ڕاپەڕین و پێکدادان و ڕێککەوتن و ململانێدا ڕۆیشتووە. لە قۆناغی سەرمایەدارییشدا دیسان ناکۆکی و ململانێی نێوان کرێکاران و بۆرژوا و سەرمایەداری بەردەوام تێکهەڵچوون و وتوویژ و تێکهەڵچوون و وتوویژ و تێکهەڵچوون تا سەرکەوتن ڕۆشتووە. لەم بۆچوونانەدا مەبەستمان هەرگیز لەوە نییە کە واز لە ئامانجە پیرۆزەکان بهێنرێ و بە ژەم و دەمێکی کەم قەناعەت بکرێ تا سەر، بەڵکە مەبەستمان ئەوەیە کە وتوویژ و دانوستاندن؛ هونەری بەکارهێنانی سیاسەتە لە هەلومەرجی ئاشتیدا (واتە دیبلۆماسیەت) کە نابێ فەرامۆش بکرێت و ڕەت بکرێتەوە، هەروەک چۆن خەباتی چەکداریی شەڕی ڕەواش هونەری بەکارهێنانی سیاسەتە لە هەلومەرجی هێرش و پەلاماری دوژمندا.

## کورد و وتوویژ

خەباتی گەلی کوردستان و ململانێی توندوتیژی لەگەڵ داگیرکەراندا، پتر لە ٤٥٠ ساڵ لەمەوبەرەوە لە شێوەی جۆراوجۆردا خۆی نواندووە. لەم باسەدا بە پێویستی نازانم هێندە درێژەی پێ بدەم کە ڕەنگە پتر لە دەیان کتێبی گەورەی لەسەر نووسرابێ.

با بێین لە شەڕی "قرم"ەوە دەست پێ بکەین کە لەنێوان ڕووسەکان و تورکەکاندا ڕووی دا لەساڵی (١٨٥٣–١٨٥٦)دا و بووە هۆی لەبارکردنی زەمینەی ڕاپەڕینی کوردستانی باکوور کە پاش ٢٠ ساڵ بە سەرکردایەتیی شێخ عوبەیدوڵلا واتە ساڵی (١٨٧٧-١٨٧٨) دەستی پێ کرد. لە ساڵی ١٨٧٩دا دەوڵەتی عوسمانی "سەمیح پاشا"ی نارده لای شێخ عوبەیدوڵلا بۆ وتووێژ، پاش هەوڵێکی زۆر؛ نەگەیشتنە ئەنجام و شێخ سەمیح پاشای بە دەستی بەتاڵەوە ناردەوە، لەباتیی بەردەوامبوون لە وتووێژدا و گوریس کێشەکێکردن لەگەڵ ڕژێمی تورکیادا کەوتە پەیوەندیکردن بە ڕووسەکانەوە لە ڕێگەی کونسوڵی ڕووسی لە وان "گامسەرکان" و بە ئینگلیزەکانیشەوە لە ڕێگەی بێکر (بەکر پاشا) و "کاپتان کلینتۆن" کونسوڵی ئینگلیزی لە وان، ئەنجامەکەشی دەستبەتاڵ دەرچوون، گوێپێنەدانی ڕووس و ئینگلیز بوو بە کورد. شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلا پەرەی سەند، تا ئەو ڕادەیەی کە دەیویست هەم باکووری کوردستان و ڕۆژهەڵاتی کوردستان ڕزگار بکات و موسڵیش بکاتە پایتەختی کوردستان. ئەوە بوو لە ئەیلوولی ١٨٨٠دا دوو لەشکر (هێز)ی گەورەی نارده ڕۆژهەڵاتی کوردستان و بە هاوکاریی کوردەکانی کوردستانی ئێران توانیی لە ماوەیەکی کەمدا هەموو کوردستانی ئێران جگە لە ئیلام و کرماشان ڕزگار بکات و تا نزیک تەبرێز بڕوات. "ن. آ. خەلەفین" دەڵێ: "لە ڕاستیدا پایتەختی ئازەربایجانی خواروو (تەورێز) لەشکرێکی ئەوتۆی تێدا نەبوو کە پارێزگاری بکات، بۆیە خەڵکی زراوی چووبوو. کوردەکان زۆر بەئاسانی دەیانتوانی شاری تەورێز بگرن. ڕووداوەکانی کوردستان مەترسییەکی زۆری خستە دڵی کاربەدەستانی ئێران، چونکە ئەگەر تەورێز بگیرایە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ دەتوانرا بوترێ گرتنی تارانیش نزیک دەبوو" (ن. آ. خەلەفین، خەبات لە ڕێی کوردستاندا، ل١٨٤). بەناچاری شای ئێران لە ڕێی حاکمی تەورێزەوە داوای لە عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوڵلا کرد کە با وتووێژ بکەن و ئامادەن ئیعتیراف بە بوونی حکومداریی شێخ عوبەیدوڵلا بکەن لە ویلایەتی ورمێ و سنەدا. بەڵام شێخ عوبەیدوڵلا ئەم داخوازییەی شای ئێرانیشی ڕەت کردەوە و ئامادەی دانیشتن و وتووێژ نەبوو. بۆیە شای ئێران تەنگاو بوو، لە ڕێگەی "زینۆفیف"ی باڵیۆزی ڕووسی لە تاران تەلەگرافێکی بۆ قەیسەری ڕووسی لە "پیتەربۆرگ" نووسی واتە "لینین

گراد". ن. آ. خەلەفین لەم بارەیەوە دەڵێت: "لە ٣ی ئەیلوولی ١٨٨٠دا شای ئێران تکا لە حکومەتی ڕووسیا دەکات کە لەشکر بنێرێتە سەر سنووری ئازەربایجانی خواروو، وە داواش لە حکومەتی عوسمانی دەکات کە هاوکاری بکات لە کوژانەوەی ئاژاوەی کوردەکان" (ل١٨٥). ڕووسیا زۆر مەبەستی بوو لەو کاتەدا کە پشتگیریی ئێران بکات دژی کوردەکان، چونکە لە دروستبوون و بەهێزبوونی دەسەڵاتی ئینگلیز دەترسا لە کوردستانی ئێراندا و وا تێگەیشتبوون کە بە پشتیوانیی ئینگلیز؛ کوردەکان تا نزیک تەوریزیان گرتووە. بۆیە لە ١٨ی تشرینی یەکەمی ١٨٨٠دا، قەیسەر ئەلکسەندەری دووەم بڕیاری لەسەر یارمەتیدانی ئێران دا.

مەبەستی ئێمە لەم کورتەباسە، لەدەستدانی هەلی هەڵکەوتوو بوو بۆ شێخ عوبەیدوڵا دوو جار کە ئامادەی وتووێژ نەبوو، تا هیچ نەبێ بوونی کورد بسەلمێنێ و بچەسپێنێ، جارێک لەگەڵ تورک و جارێک لەگەڵ شای ئێران. بۆیە لەژێر پاڵەپەستۆی ڕووسیا، حکومەتی عوسمانی ناچار لەگەڵ شای ئێران و سوپای ڕوسیا یەکیان گرت بۆ لێدانی شێخ عوبەیدوڵلا، تا لە کۆتایی تشرینی دووەمی ١٨٨٠دا بە هەرسێ لا شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلایان تێک شکاند، بووە مایەی کشانەوەیان بۆ سەر سنووری ئێران- تورکیا و قەڵاچۆکردن و کوردقڕانیش لە کوردستانی ئێراندا لەلایەن سوپای ئێران و ڕووسەوە و لە کوردستانی تورکیاش؛ تورکەکان کەوتنە لەناوبردنی کوردەکان. شۆلژیسکی باڵوێزی ڕووس لە ورمێ لە نامەیەکی بۆ زینۆفیف وەزیری دیفاعی ڕووسی نووسیوە سەبارەت بەو بارودۆخە و دەڵێ: "لە ناوچەی ورمێدا تەیمور پاشا خان کوردقڕانی دەست پێ کردووە، باری کوردەکانی سابلاخ لە هەمووان خراپترە، زۆربەی دانیشتووان لەناو بران" (ئارشیفی سیاسەتی دەرەوەی ڕووسیا، بڵاوکراوەی ژمارە ٤٠، فایلی ١٢٠٢، ل١٣٧).

## ڕاپەڕینی شێخ مەحموود

ڕاپەڕینی شێخ مەحموود هەر لە ساڵی ١٩١٩وە تاکوو ساڵی ١٩٢٢، گەرچی لە ناوچەیەکی زۆر تەسکی باشووری کوردستاندا بوو، بەڵام خۆی لە خۆیدا تەقەللایەکی

نەتەوەییانە بوو بۆ بەدەستهێنانی حوکمی خۆبەخۆیی لە پارچەیەکی کوردستاندا. ئەمیش دیسانەوە وەک سیاسەتی شێخ عوبەیدوڵلا ڕێبازێکی بیر تیرەگەرییانە و ئایینییانەی گرت لە مەسەلەی هەڵوێستوەرگرتن لە وتووێژدا. لە تەمموزی ۱۹۲۲دا، ئەدمۆنزی نوێنەر و سیاسەتمەداری ئینگلیز لە عێراق لەگەڵ حکومەتی عێراقیدا داوایان لە شێخ مەحموود کرد کە بچێتە بەغداد و بەیاننامەیەک ئیمزا بکەن، پاش وتووێژ سەبارەت بە حکومەتێکی کوردی لە چوارچێوەی عێراقدا. لەو ڕووەوە "کریس کۆچێرا"ی نووسەر و ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی نووسیویەتی: "لە ڕۆژی ۱۲ی تەمموزی ۱۹۲۲دا، نوێنەرە بەرزەکەی ئینگلیز (ئەدمۆنز) لە بەغداوە ڕایگەیاند کە دەوڵەتی بەریتانیا و حکومەتی عێراقی دان بە مافی سەربەخۆیی ناوخۆیی کوردەکان لە سنوور و چوارچێوەی وڵاتی عێراقدا دەنێ. حکومەتی عێراقی دەیەوێ کە لەناو وڵاتی عێراقدا حکومەتی کورد پێک بێت و بۆ ئەم مەبەستە پێویستە نوێنەری کوردەکان (مەبەستی شێخ مەحموود و حکومەتەکەی بوو) بێنە شاری بەغدا و لە بارەی مەسەلەی سیاسی و ئابووری لە مابەینی عێراق و ئینگلیز و کوردەکان باس بکرێ" (مێژووی کورد لە سەدەی ۱۹ و ۲۰دا، کریس کۆچێرا، ل۱۲۳). بەڵام شێخ مەحموود هیچ وەڵامێکی ئەو داخوازییەی نەدایەوە، بەڵکە بەپێچەوانەوە شێخ مەحموود لە تەقەللای ئەوەدا بوو کە هەم سمایل خانی سمکۆ و هەم سەیید تەهای فەرماندەی لەشکری سمکۆ و ڕاوێژکاری سیاسیی سمکۆ قەناعەت پێ بکات کە هاوکاریی تورکەکان بکەن دژی بەغدا و ئینگلیز، ئەو هەلە مێژووییەی لەکیس چوو. لەباتیی ئەوە، شێخ مەحموود پەیوەندیی لەگەڵ کۆلۆنێل عەلی شەفیق ئەلیاس ئۆزدمیری تورک کرد، کریس کۆچێرا دەڵێ: "شێخ مەحموود بەزوویی لەگەڵ کۆلۆنێل عەلی شەفیق ئەلیاس ئۆزدمیری تورکی پەیوەندیی کرد و دەریبڕی کە دەیەوێ بۆ هێزی تورک فیداکاری بکات و تەنها داوای مافی نەتەوایەتیی ناوخۆی کورد واتە ئۆتۆنۆمی بکات و دەست لە داواکردنی مافی سەربەستی گشتی (مەبەستی حکومەتی کوردستانە) هەڵگرێ و لەگەڵ حکومەتی تورکیاش هاوکاری بکات بۆ لێدانی ئینگلیز" (هەمان سەرچاوە، ل۱۲۲).

ئەوە بوو لە ۱۹ی کانوونی دووەمی ۱۹۲۳دا پاش گەڕانەوەی سێر برسی کوکس بۆ لەندەن و ڕاوێژ لەگەڵ دەوڵەتی بەریتانیا سەبارەت بە کورد و شێخ مەحموود،

ئینگلیزەکان بڕیاری لێدانی حکومەتی کوردستانیان بە نوێنەری خۆیان لە بەغداد "سێرهاندی دایس" ڕاگەیاند. وە لە ٢١ی شوباتی ١٩٢٣دا ئینزاری شێخ مەحموودیان کرد کە پێویستە خۆی و وەزارەتەکەی بڕۆن بۆ بەغداد بۆ وتووێژ، یان لە مەلیکی دەخرێت و حکومەتەکەشی هەڵدەوەشێنرێتەوە. دیارە پاش ڕەتکردنەوەی ئەو داوایە لەلایەن شێخ مەحموودەوە، لە ٢٢ی شوباتی هەمان ساڵدا ئینگلیز و عێراق هێرشیان کردە سەر کوردستان و سلێمانییان بۆردوومان کرد و حکومەتی کوردستانی تەمەن پێنج مانگیان هەڵتەکاند و شێخ و هێزە چەکدارەکان کەوتنە شەڕی پارتیزانی.
هەڵەی سیاسەتی شێخ لە قەبوڵنەکردنی وتووێژ لەگەڵ ئینگلیز و بەغدا و پشتبەستنی بە دەوڵەتی عوسمانی لەوەدا بوو کە هیچ حسابێکی بۆ لەگیانەڵادابوون و بەرەو لەناوچوونی حکومەتی عوسمانی نەکردبوو لە لایەک و لە لایەکی تریشەوە هیچ حسابێکی بۆ مەبەستی ئینگلیز لە دروستبوونی دەوڵەتی عێراقدا نەکردبوو، کە دەبوو ئەو ڕاستییانەی باش بزانیایە کە:

١. دەوڵەتی عوسمانی بڕیاری مەرگی حەتمیی لەسەر درابوو، لەناو خۆیشیدا لە هەموو ڕوویەکی سیاسی و ئابووری و سوپایی و کۆمەڵایەتییەوە داوەشاو و داهێزرابوو، کەڵکی پشتپێبەستنی نەمابوو، واتە ئەسپێکی دۆڕاو بوو لە مەیدانی ململانێی نێوان دەوڵەتاندا.

٢. هاوپەیمانەکان (ئینگلیز، فەرەنسا، ڕووسیا و یۆنان و ئەوانی تریش) لە بەهێزی و دەسەڵاتداریدا بوون و سەرکەوتنیان مسۆگەر بوو.

٣. سیاسەتی ئەوسای دەوڵەتان بریتی بوو لە پارچەپارچەکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دروستکردنی چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە عوسمانی و سەر بە سیاسەتی ئینگلیزی و فەرەنسی.

٤. تێکەڵکردنی مەسەلەی دین لەگەڵ سیاسەتدا هەڵەیەکی کوشندەیە، بۆ نموونە هەر لەبەر ئیسلامیبوونی عوسمانی و ئیسلامیبوونی کوردیش، ئیتر هاوپەیمانی ئیسلام و ئیسلام باشتر بێ لە هاوپەیمانیی کوردی ئیسلام و ئینگلیزی کافر.

## شۆڕشی مەهاباد

حاڵەتی سێهەم، شۆڕشی مەهاباد و کۆماری کوردستانە لە مەهاباد: کە لە ڕواڵەتەدا تەواو لەگەڵ دوو نموونەکەی پێشترمان جووتە، واتە لە هەرسێ حاڵەتەکەدا هەر ڕووخانی هیوا و ئاواتی دروستکردنی دەوڵەتی کوردستان و پێشێلکردنی خواستی سەدان ساڵەی گەلی کورد بووە، بەڵام لە جەوهەردا دوو نموونەی لە یەکتر جیاوازن. ئەمەیان گەرچی دوای ١١ مانگ و چەند ڕۆژێک کۆمار ڕووخا و لەناو چوو، بەڵام شوێندەستی خۆی بە مێژووی گەلی کورد و مێژووی گەلانی ترەوە بەجێ هێشت. سەلماندنی مافی کورد لە بەڕێوەبردنی کاروباری حکومڕانیی خۆیدا لەلایەن "قوام السلطنە"ی سەرەکوەزیرانی ئێران و شای ئێرانەوە، خۆی لە خۆیدا سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ گەلی کورد و مێژووی خەباتی نەتەوایەتییەکەی. هۆی سەرەکیی سەلماندنی حکومڕانیی کوردستانیش لەلایەن دەسەڵاتداریتیی وڵاتی سەردەستە و داگیرکەرەوە، بریتی بوو لە دیبلۆماسیەتیی سیاسەتی قازی محەممەد و ئامادەبوونی وتوویژ لەگەڵ ناوەند کە تاران بوو لە لایەک و لە لایەکی تریشەوە هەڵپەی پەیوەندیکردن بە سۆڤیەتی ئەوسا و ئینگلیز و ئەمەریکاوە، کە هەر ئەو پەیوەندییانە ڕاگەیاندنێکی جەوهەریی ئەو دەوڵەتە زلهێزانەی ئەوسا بوون بە مافی کورد. بۆ نموونە؛ پەیوەندیکردن بە مولحەقی عەسکەریی ئەمەریکی لە تاران (ئارچ ڕۆزۆیڵد) و بانگکردنی (دەعوەتکردنی) بۆ سەردانی کۆماری مەهاباد کە لە ئەیلوولی ١٩٤٦ سەردانی کۆماری مەهابادی کرد و کۆبوونەوەی لەگەڵ کۆماری کوردستاندا کرد. ئەو عەلاقاتەی کە لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەتیدا هەیبوو، دەتوانرێ بوترێ لەسەر ئاستی عەلاقاتی نێوان دوو دەوڵەت دەبینرا. "ئەسەدۆف" کە نوێنەری وەزارەتی بازرگانیی سۆڤیەتی بوو لە دروستبوونی کۆمارەوە لە پایتەختدا (مهاباد) تاکوو ١٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦ لەوێ مایەوە، واتە ئەو تا ئەو ڕۆژەی کە هێزی ئێران لە میاندواوە بەرەو مهاباد کەوتە ڕێ بۆ ڕووخاندنی کۆمار.

## شۆڕشی ئەیلوول و وتووێژ

١. یادنامەی پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ عەبدولکەریم قاسم، کە لە ئۆرگانی پارتیدا (خەبات) لە ١٩٦٢/٤/١٧دا بڵاو کرایەوە[٤٩].

پارتی دیموکراتی کوردستان لە هەڵگیرساندنی شۆڕشی ١٩٦١/٩/١١، واتە پاش سێ مانگی بەسەرچووی تێکشکاندنی ڕاپەڕینی عەشایەری کوردستان؛ دەستی بە شۆڕش کرد و وەک حزبێکی سیاسی سەرکردایەتیی شۆڕشەکەی گرتە دەست. لە ١٩٦٢/٤/١٧دا پاش حەوت مانگ شەڕ، یەکەم موزەکەرەی داواکارییەکانی لە حاڵەتی شەڕدا دا بە حکومەتی عێراق و داوای لامەرکەزیی کرد بۆ کوردستان بەم جۆرە:

١. چەککردنی جاشەکان.

٢. وەستاندنی شەڕ و بۆمبارانکردنی کوردستان.

٣. ئازادیی سیاسی و دیموکراتی لە ناوچەکە.

٤. گەڕاندنەوەی ئاسایش بۆ وڵات و دانانی حکومەتێکی دیموکراتی.

٥. ئیعتیرافکردن بە مافی نەتەوایەتیی گەلی کورد، کە خۆی لە لامەرکەزیدا بنوێنێ لە چوارچێوەی عێراقدا.

٦. باری تایبەتیی ناوچەی کوردستان لە دابەشکردنی زەویـوزاردا لەبەرچاو بگیرێت، بە جۆرێک کە سوودی جووتیاران و کرێکارانی کوردستانی تێدا بێت.

مەبەست لە لامەرکەزیەت ئەوە بوو کە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس و ئاسایش (ئەمن) و دادگا و بەڕێوەبەرایەتیی ناوخۆ و شارەوانی و پارێزگا و پەروەردە تایبەت بە کوردستان بێ و زمانی کوردی لە کوردستاندا ڕەسمی بێت وەک عەرەبی و... هتد.

ئەو داواکارییانە گەر لە ڕووکەشدا سەیری بکەی، بێشک داواکاریی کەمبایەخ و نەگونجاون لەگەڵ خواست و ئاواتی سەد ساڵەی گەلی کورددا، بەڵام لە جەوهەردا زۆر پرمانا و بەسوود و جێگر بوون، چونکە:

١. بۆ دوژمنانی گەلی کورد و شۆڤێنییە عەرەبەکانی ڕوون کردەوە کە گەلی کورد دەست لە مافی ڕەوای خۆی لە پاراستنی کولتوور و زمان و نەریتی کوردانەی خۆی هەڵناگرێ و سوورە لەسەر سەربەستی و سەرفرازیی خۆی و هەرگیز مل بۆ زۆر و

---

[٤٩] سەیری "شۆڕشی ئەیلول، بنیاتنان و هەڵتەکاندن" بکە.

ستەم و ڕەدووکەوتن نادات.

٢. ئۆپۆزسیۆنەکانی حکومەتی عەبدولکەریم قاسمی ئاگادار کردەوە کە کورد جیابوونەوەی ناوێ و حکومەتی کوردستانی ناوێ، کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئۆپۆزسیۆنەکانی ئەو کاتە کە (پارتی نەتەوەیی عەرەبی دیموکراتی (ناصری) و پارتی بەعسی و بزووتنەوەی قەومییەکانی عەرەبی بوون) ئەو مەترسییەیان لە شۆڕشی کوردستان نەبێ و بیر لە پەیوەندی و هاوکاریکردن لەگەڵیان بکەنەوە.

٣. وەک هەنگاوی یەکەم، داواکارییەکان گونجاو بوون لەگەڵ توانا و هێزی پێشمەرگانەی شۆڕشی کوردستان و توانا و هێزی بەڕێوەبەرایەتیی (ئیداری) خەڵکی کوردستان لە ڕووی شارەزایی و پسپۆڕیی ئیدارەکردنی کوردستانەوە.

٤. خۆشکردنی زەمینە بۆ پەروەردەکردنی جەماوەری کوردستان بە مەسەلەی لامەرکەزی و یەکخستنی ڕیزەکانی گەل بە لانی کەمەوە ٧٠٪ی زیاتری جەماوەر و هاندانیان بۆ یەک ڕا بوون لەسەر ئەو مەسەلەیە لە حاڵەتی ڕاپرسیکردندا، ئەمەش لەو ئەزموونەوە وەرگیرابوو کە لە سەردەمی شێخ مەحمووددا ڕووی دا.

٥. شکاندنی ئابڵوقەی سیاسی و ئیعلامی کە عێراق خستبوویە سەر کوردستان، کە بووە هۆی هاتوچۆی دەیان هەواڵدەر و ڕۆژنامەنووسی ئەورووپایی و ئەمەریکایی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ لای شۆڕش و بارزانی و گەیاندنەوەی هەواڵەکانی کوردستان بە ڕۆژنامەکانی دەرەوە.

بە ڕای من ئەم ئەنجامەی یەکەم وتووێژی کورد بەنهێنی لە ڕێگەی کەریم قەرەنییەوە لەگەڵ ڕژێمی قاسمدا، ڕۆڵێکی گەورەیان لە پەرەپێدانی شۆڕش و داواکارییەکانیش گێڕا.

٢. وتووێژی ١٩ی شوباتی ١٩٦٣، لەگەڵ حکومەتی عەبدولسەلام عارفدا.

ئەم وتووێژەش لە ئەنجامی ڕووخاندنی حوکمی عەبدولکەریم قاسم و هاتنی حکومەتی عەبدولسەلام عارف و بەعس لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣دا بوو کە پێش هاتنە سەر حوکمیان پەیوەندییان بە شۆڕشی کوردەوە کردبوو لە ڕێگەی تاهیر یەحیاوە.

لە دانیشتنی یەکەم لە ١٠ی شوبات لە بەغداد و لە دانیشتنی دووەم لە ٣ی مارتی ١٩٦٣ لە کانی ماران لە ڕانیە، شۆڕشی کوردستان ئەم داخوازییانەی هەبوو:

١. سەلماندنی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان کە ئەنجوومەنی یاسادانان و ئەنجوومەنی بەڕێوەبەرایەتیی ئەو ئۆتۆنۆمییە لە کوردستاندا بەڕێوە بەرێ، کە هەڵبژاردنی خەڵکی کوردستان بکرێ.

٢. جێگری سەرۆککۆماری عێراق، کورد بێ.

٣. ئۆتۆنۆمیی کوردستان لەو سنوورەدا بێت: سلێمانی، کەرکووک، هەولێر و ناوچە کوردنشینەکانی لیوای موسڵ.

٤. بوونی سوپایەکی کوردی لە هێزی پێشمەرگە و ئەو سوپایە لەژێر فەرماندەی بەغداد بێت.

٥. بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسی کوردستان لە کورد بێت.

٦. کورد بەشدار بێت لە سوودی نەوتدا.

ئەم وتووێژە کە پێچەوانەی خواستی مەکتەبی سیاسی و لیژنەی مەرکەزیی پارتی بوو، لەسەر خواست و داوای مستەفا بارزانی بوو کە پێی وا بوو ئەم حکومەتە تازەیە هەم دۆستە بە میسر و عەبدولناسر و هەم دۆستە بە جەزائیر و بن بێلا، لەو کاتەشدا هەم ڕای عەبدولناسر و هەم ڕای بن بێلاش لەسەر مەسەلەی کورد باش بوو.

ئەم وتووێژە گەرچی وەک ئەوانەی تری پێش خۆی ئەو ئەنجامەی نەدا بەدەستەوە وەک شۆڕشی کوردستان و گەلی کورد دەیانویست، بەڵام دیسانەوە ئەم ئەنجامانەی خوارەوەی دایەوە بەدەستەوە:

١. ئیعتیرافکردنی حکومەتی عێراق بە دانی "لامەرکەزی" بە کوردستان، واتە ئەوەی کە لە سەردەمی حکومی قاسم داوا کرابوو.

کریس کۆچێرا دەڵێ: "لە ١٢ی مارتی ١٩٦٣، حکومەتی عێراقی بێ ڕەزامەندیی بارزانی، بڕیاری دانی لامەرکەزیی بە کوردەکان ڕاگەیاند" (کریس کۆچێرا، ل٣٦١).

٢. ئەم وتووێژە بووە هۆی دروستبوونی ناکۆکی و دووبەرەکی لەنێوان ئەندامانی حکومەتی بەعسدا کە بەشێکیان (عەلی سالح سەعدی؛ جێگری سەرەکوەزیر و وەزیری ناوخۆ، تالیب شەبیب؛ وەزیری دەرەوە، سالح مەهدی عماش؛ وەزیری بەرگری)، لایەنگری چارەسەری مەسەلەی کورد بوون بە ئاشتی و دانی ئۆتۆنۆمی، بەشەکەی تریان لایەنگری چاوڕاو و وەخت بەسەربردن بوون بۆ بەهێزکردنی خۆیان و لێدانی

شۆڕشی کورد.

٣. بەلای کەمەوە ڕای دوو دەوڵەتی عەرەبییان بەلای ڕەوایی مەسەلەی کورددا ڕاکێشا کە میسر و جەزائیر بوون.

٤. ئیعتیرافکردن بە لامەرکەزی، مانای ئیعتیراف بە مافی نەتەوەیەکە لە چوارچێوەی عێراقدا کە حقووقی جیاوازیان لە نەتەوەکانی تر هەبێت.

٥. مەسەلەی کورد یەکێک بوو لە هۆیەکانی هەڵتەکاندنی پڕۆژەی یەکگرتنی عێراق و میسر و سوریا کە ڕای گشتییان لەسەری جیاجیا بوو.

٦. مەسەلەی کورد یەکێک لە سێ مەسەلەی سەرەکیی تێکچوونی نێوان عێراق و سۆڤیەت بوو.

ا. لە ١٩٦٣/٥/٦ جەریدەی پراڤدا مەقالێکی دووروودرێژی لەسەر مەسەلەی کورد و مافی ڕەوای کورد سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی بڵاو کردەوە.

ب. لە ١٩٦٣/٦/٣دا، مەنغۆلیای شەعبی بەڕەسمی داوای لە نەتەوە یەکگرتووەکان کرد کە مەسەلەی کورد وەک مەسەلەی کات و ڕۆژ باس بکرێت.

ج. لە مانگی ٥ی ١٩٦٣دا، لیژنەی مەرکەزیی حزبی شیوعی سۆڤیەتی بەڕەسمی ناڕەزایی سەبارەت بە کوشتاری بەکۆمەڵی گەلی عێراق و کورد دەربڕی لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە.

د. یاداشتی حکومەتی سۆڤیەت لە ١٩٦٣/٥/٩دا کە لە ڕێگەی کۆمیکۆی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت درا بە عێراق کە دەڵێ: "پێویستە دەوڵەتی عێراق باش ئەوە بزانێت کە کاولکردنی کوردستانی عێراق دەبێتە هۆی دەستتێوەردانی دەوڵەتانی تری دونیا لە کاروباری ناوخۆی عێراق" (کریس کۆچێرا، ل٣٧٤).

تێبینی: تکایە بۆ درێژەی بەندەکانی ئۆتۆنۆمی، سەیری (العراق في عهد قاسم، جرجيس فتح الله، ل٨٤٤) بکە.

٣. وتووێژی ١٩٦٤/٢/١ لەنێوان بارزانی و حکومەتی عەبدولسەلام عارف و ئینشیقاق (دابڕان).

وتووێژی مانگی ٤ی ١٩٦٦ لەنێوان باڵی "م. س"ی پارتی و حکومەتی بەزاز.

وتووێژی ١٩٦٦/٧/٦ لەنێوان بارزانی و حکومەتی بەزازدا.

وتوویژی ١٩٦٨/٨/٥ لەنێوان بارزانی و حکومەتی بەعسدا.

ئەم پێنج وتووێژە کە لە کاتی جیاجیادا لەگەڵ ڕژێمە یەک بەدوای یەکەکانی عێراقیدا کران، لە ڕاستیدا هیچ هەلومەرجێکی مێژوویی و سیاسی و نەتەوەیی و ناوخۆیی بۆ شۆڕشی کوردستان و خەباتی گەلی کورد ڕەخسا و لەبار نەبوو کە سوود و بەرژەوەندیی گەلی کوردستانی تێدا بێت، بەڵکوو هەمووی سەرەنجامی ناکۆکیی نێوان مەکتەبی سیاسی و خوا لێی خۆش بێ بارزانی بوو کە هەردوولایان مەبەستیان وتوویژ لەگەڵ ڕژێمەکان بۆ خۆتەرخانکردن بوو بۆ لەناوبردن و پاکسازیکردنی لایەنەکەی تر، کە بەلای منەوە گەورەترین زیان بەر شۆڕشی کوردستان کەوت و گەورەترین هەڵەی کوشندە بوو کە لە مێژووی کورددا کرا و ڕەگ و بنەماکانیشی کاریگەرانە تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٦ درێژەی کێشا و گەلێ هەلی هەڵکەوتووی لەباری لەدەست شۆڕشی کوردستان دا تا ئێستا.

٤. وتوویژی ١٩٧٠/٣/١١

دیارە گرنگترین تویژی کورد لەگەڵ ڕژێمەکانی عێراقی تا ئەو مێژووە، ئەمەیان بووە کە دەتوانین بڵێین سەرەتای سەلماندنی مافی بەڕێوەبەرایەتیی ئیداری و سیاسی و فەرهەنگیی گەلی کوردستان بووە لەلایەن خۆیەوە کە داگیرکەرانی کوردستان سەلماندوویانە ئەوەی لەم وتووێژەدا کورد بەدەستی هێنا:

١. لە ڕووی سیاسییەوە

ا. دوای داننان بە مافی گەلی کورد لە چوارچێوەی حکومڕانێکی ئۆتۆنۆمیدا کە ئەمە بەبەر گوێ و بەر چاوی هەموو دونیاوە لەلایەن ڕژێمی عێراقییەوە بڵاو کرایەوە و هەر ئەو ناوەڕۆکەش بووە بڕیارێکی داڕێژراو و نەگۆڕ لە سیاسەتی گەلی کورددا سەبارەت بە مەسەلەی کورد تا ساڵی ١٩٩١.

ب. بەربوون و سەرفرازبوونی ژمارەیەکی زۆری کادری سیاسی و پێشمەرگایەتیی پارتی و هەندێ لایەنی تریش، کە بەشێکی زۆریان لە پاشان بوون بە کەسانی لێهاتوو لە هەڵسووڕاندنی کاری سیاسی و پێشمەرگایەتی، هەم لەناو پارتی و هەم لەناو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان.

ج. سووک و سەلیم کردنی دەوڵەتی بەعس لەلای یەکێتیی سۆڤیەتی ئەو کاتە، لە دوو ڕووەوە:

١. خیانەتی بەعس بە داوای چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد بە شێوەی ئاشتی و دیموکراتیانە و پاشان پاشگەزبوونەوەی لەو بڕیارە.

٢. نزیکبوونەوەی حزبی شیوعی و پارتی لە ماوەی وتووێژدا و تێکچوونی نێوانی بەعس و حزبی شیوعی کە لە یەک بەرەدا بوون و سەرەنجام بڕیاری قەدەغەکردنی حزبەکە لەلای بەعسەوە.

د. بەرەوپێشەوەچوونی شۆڕشەکە لە ڕووی سیاسییەوە لە قاڵبی تەسکی ناوچەیی هەولێر و سلێمانی و بوون بە شۆڕشێکی سەرتاسەری کوردستان لە زاخۆوە تا خانەقین.

هـ. نەمانی دووبەرەکیی ناو بزووتنەوەی کوردستان و یەکبوونی هەردوو پارتی شۆڕشگێڕ و پارتی دیموکرات و ئاشتبوونەوەی گشتی.

و. ئیعتیرافکردنی بەعس بە مافی بەشداریکردنی ڕەوای کورد لە حکومەتی مەرکەزیدا.

٢. لە ڕووی ئیدارییەوە:

بەڕێوەبردنی ئیدارەی کوردستان لەلایەن کورد خۆیەوە، گەرچی خۆی لە چوارچێوەی نوێنەرانی پارتیدا دەنواند.

٣. لە ڕووی فەرهەنگییەوە:

ا. گرینگیدان بە زمانی کوردی و کەلەپووری کوردی و فەرهەنگی کوردی لە دانشگای سلێمانی و بەغدا و قوتابخانەکانی کوردستاندا، تەنانەت لە کەرکووک و خانەقینیش.

ب. گەشەسەندن و دامەزراندنی گرووپی زانیاریی کوردی و لەچاپدانی چەندین کتێبی سیاسی و مێژوویی و هونەری و کولتووری.

ج. پەیدابوونی چەندین قوتابخانەی نوێی هونەری مۆسیقا و نواندن و هەڵبەست.

٤. لە ڕووی ئاوەدانکردنەوە:

گەلێ ناوچەی کوردستان ئاوەدان کرانەوە.

٥. لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە:

ناساندنی پێشمەرگە و شەهیدانی کوردستان بەڕەسمی بە شەهید و پێشمەرگە و تێکۆشەر و دانانی یاسایەکی تایبەت سەبارەت بە ژیانی خێزان و کەسوکاری شەهیدان بە ناوی یاسای "خانەنشینی شەهیدانی ڕووداوی ژووروو".

٥. وتووێژی مانگی ٤ی ١٩٨٤ لەنێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و ڕژێمی بەعس.

ئەم وتووێژەش وەک ئەوانی تر، سەرەنجامی هەندێ بارودۆخی تایبەتی کوردستان و ڕژێمی عێراقی دروست بوو کە هەموو هەلومەرجەکانی وتووێژ لە پاشکۆی ئەم سمینارەدا باس دەکەین، گەر ئارەزووی موناقەشەکردنی هەبێ.

لەم وتووێژەدا هیچ گۆڕانێکی بنەڕەتیی ئەوتۆی تیا ڕەچاو نەدەکرا کە جیاوازیی لەگەڵ وتووێژی ساڵی ١٩٧٠دا هەبێ، جگە لە جیاوازیی بارودۆخەکان، واتە داخوازییەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و هەڵوێستی ڕژێمی بەعس لەسەر ئەو داخوازییانە، هەمان دووبارەکردنەوەی ساڵی ١٩٧٠ بوو جگە لە سێ خاڵی گرنگ:

ا. سووربوونی گەلی کورد لەسەر داخوازییە ڕەواکانی، پاش تێکشکانەکەی ساڵی ١٩٧٥ کە ڕژێمی بەعس لای وا بوو دوای ئەو تێکشکانە، جارێکی تر گەلی کورد پێ لەسەر ئەو مافانەی خۆی داناگرێ کە لە ساڵی ١٩٧٠ داوای کردبوو.

ب. خۆڕاگریی هێزی پێشمەرگە و بەرگریی گەلی کورد بەرامبەر پلانی عێراقی و ئێرانی کە جارێکی تریش ئیتیفاقییەکی تری جەزائیری شا و سەدام دروست کرایەوە، بەڵام ئەم جارە خومەینی و سەدام بە پێچەوانەی ساڵی ١٩٧٥.

ج. خۆبەدرۆخستنەوەی ڕژێمی عێراقی کە لە پێشدا هەموو دونیای پڕ کردبوو، گوایە حوکمی ئۆتۆنۆمی لە کوردستاندا هەیە و ڕژێم دیموکراتە، بەڵام ئامادەبوونی بۆ وتووێژ؛ بەڵگەی نەبوونی دیموکراتیەت و ئۆتۆنۆمیی کوردستان بوو.

٦. وتووێژی ساڵی ١٩٩١ی بەرەی کوردستانی و ڕژێمی بەعس.

گرنگیی ئەم وتووێژە و جیاوازیی لە هەموو وتووێژەکانی تر، خۆی لەوەدا دەنوێنێ

کە پاش ئەو ڕاپەڕینە مەزنە بێوێنەیە لە مێژووی خەباتی گەلی باشووری کوردستان کرا و لەسەر خواست و ویستی سەرجەم حزب و ڕێکخراوە کوردی و کوردستانی و تەنانەت حزبی شیوعیی عێراقیشدا کرا، وە لە هەلومەرجێکی زۆر تایبەتی کوردستان و عێراق و ناوچەیی و جیهانیدا کرا، بۆیە لە باسەکەماندا گرینگییەکی زۆر تایبەتی دەدەینێ.

ڕاپەڕینی کوردستان لە ١٩٩١/٣/٥ دەستی پێ کرد کە شەش ڕۆژ دوای ڕاپەڕینی خوارووی عێراق بوو، سەرەتا لە شاری ڕانیە دەستی پێ کرد و پاشان بەو جۆرە تەنییەوە، چوارقورنە، کۆیە، دوکان، ئۆردووگای پیرەمەگروون، باینجان، ئەلایی، تاسلوجە، دەربەندیخان، هەڵەبجەی تازە، باریکە، زەڕایەن، عەربەت، سلێمانی، هەولێر، چەمچەماڵ، خانەقین، کەلار، کفری، جەلەولا، دووزخورماتوو، پردێ، زاخۆ، سومێل، دهۆک، ئامێدی، ئاکرێ، ئاسکی کەڵەک، حەریر، دیانە، شەقڵاوە، کەرکووک، قەرەهەنجیر، حەویجە، شەنگال.

## هۆکاری بەرپابوونی ڕاپەڕین:

١. پڕبوونی جامی تووڕەیی خەڵک لە زۆر و ستەم و دکتاتۆری و فاشیەتی ڕژێم و دەستە و دایەرەکەی.

٢. تێکشکاندنی سەختی دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێم لە شەڕی هاوپەیمانەکانی ئەمەریکی و ئەورووپی و عەرەبی لە گرتنی کوێتدا.

٣. ئاڵۆزیی باری ئابووریی عێراق بە هۆی ئەو ئابڵووقە ئابوورییەوە کە خرایە سەر عێراق.

٤. هاندانی گەلانی عێراقی و کوردستانی بۆ ڕاپەڕین دژی ڕژێم لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە.

٥. ڕۆڵی پارت و ڕێکخراوە کوردی و کوردستانییەکان لە ڕاپەڕاندنی جەماوەر و ڕابەرایەتیکردنیان.

## دەستکەوتەکانی ڕاپەڕین:

١. گرتن و سووتاندن و هەڵتەکاندنی بنکەکانی دامودەزگا سیخوڕییەکانی ڕژێم (ئیستیخباراتی عەسکەری، ئەمن، موخابەرات، بنکە حزبییەکانی بەعس، ڕێکخراوە ناجەماوەرییەکانی بەعس).

٢. هەڵتەکاندن و گرتنی سەربازگە و ڕەبایەکانی ڕژێم، لەبەریەکهەڵوەشاندنی سوپای داگیرکەر لە کوردستاندا و گرتنی پتر لە ١٥٠٠٠٠ سەربازی ڕژێم و پلەدار و ئەفسەر.

٣. گرتنی هەموو بەڵگەنامە و فایل و سەرجەم هێڵەکانی سیخوڕی و بەکرێگیراوەکانی ڕژێمی بەعس لە ناوخۆدا، کە دەتوانرێ بوترێ هەڵتەکاندنی کار و هیلاکیی پتر لە ٢٣ ساڵەی ڕژێم لە کوردستاندا بووە.

٤. نەمان و هەڵتەکاندنی تابووری شەشەمی ڕژێمی بەعس لە کوردستاندا، کە فەوجەکانی سووک و جاشی ڕەسمی، جاشی شەعبی، جاسووس و چاوساغەکانی ناوخۆی کوردستان بوو، بە چوونیان بۆ پاڵ ڕاپەڕینی جەماوەر و پشتگیریی ڕاپەڕین و پشتکردنە ڕژێم.

٥. ڕابەرایەتیی خەبات و شۆڕش، ئازادی و تێکۆشان، پێشمەرگایەتی و قوربانیدان، هەڵمەتبردن و پەلاماردان، سەندنەوەی تۆڵەی شەهیدان، دەربڕینی دەنگی نارەزایی و بەرگری لە کوردستان، ئەمانە هەمووی لە چوارچێوەی تەسکی سنوور و هێز و توانا و جەماوەری چەند حزب و ڕێکخراوێکی کوردستانی چووە دەرەوە و هەموو جەماوەری سەرتاسەری کوردستانی گرتەوە بە کورد و ئاشوور و ئەرمەنی و تورکمانەوە، کە بوونە گەورەترین هێز و پاڵپشتیی حزبەکان و بەرەی کوردستانی بۆ بەرگری لە کوردستان.

٦. هەڵتەکاندن و تەفروتوناکردنی بەشێکی زۆر ئۆردووگا زۆرەملێکان (مستوطنات) ی دوژمن.

٧. پایەداربوونی ئازادی و دیموکراسی و سەربەستی و بەکارهێنانیان لەلایەن جەماوەرەوە و دەربڕینی چەندین بیروبۆچوونی جیاجیا و چەندین داخوازیی جیاجیا و گەشاندنەوەی چەندین خونچەی تازە دروستبووی ئایدۆلۆجیای جیاجیا و کردنەوەی

چەندین قوتابخانەی گرووپ و تاقمی جیاجیا.

نیوە تێکشکاندنی ڕاپەڕین لە هێرش و پەلاماری کوردستان لەلایەن ڕژێمەوە لە ١٩٩١/٤/٥دا کە دەڵێن نیوە تێکشکانە، نەک تێکشکاندنی یەکجارەکی، لەبەر ئەم هۆیانە:

١. ڕژێم نەیتوانی ئەم جارە دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی بە نیوەی چڕیی پێش ڕاپەڕین دامەزرێنێتەوە.

٢. نەیتوانی جارێکی تر ئەو هێڵ و تەنە جاڵجاڵۆکەییەی جارانی لە بەکرێگیراوی ناوخۆی دروست بکاتەوە.

٣. نەیتوانی ئەو سەربازگە و ڕەبایانە و مۆڵگە سوپاییە توندوتۆڵەی جارانی لە کوردستاندا دابنێتەوە.

٤. نەیتوانی جەماوەری کوردستان بە ڕێژەی لە ١٠٪ قەناعەت پێ بکات کە حکومڕانییەکەی قبوڵ بکەن و لەژێر سایە و سێبەر و ڕابەرایەتیدا بمێننەوە لە شارەکاندا.

ئاوارەبوونی جەماوەری کوردستان بە ڕێژەی لە ٩٠٪ پاش هێرش و پەلاماری ڕژێم، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەک:

١. بەکارهێنانی دڕندانەترین شێوەی هێرش و پەلامار لەلایەن ڕژێمی داگیرکەرەوە بۆ سەر کوردستان.

٢. ئەوپەڕی فاشیستی و دڕندایەتیی ڕژێم لە ڕەفتاریدا بەرامبەر جەماوەری کوردستان لە ماوەی ٢٣ ساڵی حکومڕانیدا لە کوردستاندا دەگەیەنێ، کە جەماوەر نەیویست پاش ئەو چەند هەفتەیەی ئازادی و سەربەستییەی؛ جارێکی تر بگەڕێتەوە ژێر زوڵم و زۆری ڕژێم.

٣. گەلی کوردستان وڵاتەکەیان بە ئازادی و سەرفرازی ئەوێ، ئەگەرنا مەرگی بەکۆمەڵ ژیانی سەختی ناو دۆڵ و کێوەکانی کوردستان و ڕەقبوونەوە لە سەرما و مەرگ لە برسا هەڵدەبژێرێ.

٤. پاشگەزبوونەوەی هاوپەیمانەکان لەو بەڵێنەی بە گەلی کوردستان و عێراقیان دا، کە ڕاپەڕن و ئەوانیش هێزی عێراق و توانا سەرکوتکەرانەکەی لە زەوی و ئاسمانیشەوە تێک دەشکێنن.

٥. ڕێگەدان بە سوپای عێراقی ئابڵووقەدراو لەلایەن هێزی هاوپەیمانەکانەوە بۆ دەربازبوون و خۆسازدانەوەیان بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی خواروو و ناوەندی عێراق و کوردستان لەبەر ترسی ڕووخانی ڕژێم و دروستبوونی ڕژێمێکی ئیسلامی لە عێراق و جیابوونەوەی کوردستان لە عێراق و گەڕانەوەی عێراق بۆ پێش پەیمانی سایکس بیکۆ لە ساڵی ١٩١٦.

٦. هەڵەکانی دەستپێکردنی ڕاپەڕین و کاتی ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕین، کە خۆیان لەم خاڵانەدا دەنوێنن:

أ. لە هەلومەرجی لەباری دۆخی ڕاپەڕیندا، حزب و ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکانی کوردستان بە تاکی و بەرەی کوردستانی بەگشتی ڕۆڵێکی گەورەیان لە ڕابەرایەتی و ڕاپەڕاندندا گێڕا، بەڵام پلان و نەخشەیەکی توندوتۆڵ و جەماوەرییانەیان دانەنا بۆ پاش ڕاپەڕین و بەرگری لە ڕاپەڕین و دەستکەوتەکانی.

ب. کەمیی توانا و دەسەڵاتی بەرەی کوردستانی لە لەباوەشکردن و ئیستیعابکردن و ڕێکخستنی ئەو سێڵاوە گەورەیەی جەماوەر لەناو خۆیاندا و لەناو ڕێکخراوی پیشەیی و چینایەتیی وەک نەقابەی کرێکاران و ڕێکخراوی جووتیاران و قوتابیان و کاسبکاران و ژنان و... هتد.

ج. پێکنەهێنانی میلیشیای گەلی جەماوەر بۆ بەرگری لە ڕاپەڕین شانبەشانی پێشمەرگە.

د. دانەنانی دادگایەکی گەلی ناوچەیی لە هەر ناوچەیەکدا بۆ دادگاییکردنی تاوانباران.

هـ. ڕاگرتنی ڕاپەڕین و نیشتنەوەی کەفوکوڵی ڕق و تۆڵەی جەماوەر لە سنوورێکی دیاریکراودا و بەردەوامنەبوون لە ڕاپەڕینی جەماوەری تا ڕزگارکردنی هەموو سەرزەمینی کوردستان هەر لە زاخۆوە تاکوو شاخەکانی حەمرین و قرتاندنی باڵی ڕاستی دەسەڵاتی ڕژێم لە شاری موسڵدا.

بەڵگەشمان بۆ ئەو ڕاستییانەی سەرەوە، وتەکەی مارکسە سەبارەت بە ڕاپەڕین کە دەڵێ: "ڕاپەڕینی جەماوەریی چەکداری، هونەرێکی گەورەی خەباتە و پێویستی بە پسپۆڕییەکی تەواو هەیە کە لە پرۆسەی خەباتی شۆڕشگێڕانەی ڕەوادا ئەو هونەرە

دروست دەبێ و ئەم پرەنسیپانەشی هەیە:

١. هەرگیز یاری بە ڕاپەڕین ناکرێ، ئەگەر بڕیاریش لەسەر ڕاپەڕین درا، دەبێ زۆر بەلێبڕاوییەوە بەردەوامیی پێ بدرێت تاکوو کۆتایی.

٢. کۆکردنەوەی هێزی تەواو پێویست لە کات و شوێنی ڕاپەڕیندا، ئەگینا دوژمن بەئاسانی تێکی دەشکێنێ.

٣. لە دەستپێکردنی ڕاپەڕیندا دەبێ بڕینەرەوانە بێ (حاسم).

لە قۆناغی هەڵسان و بەرگرییەوە بگوێزرێتەوە بۆ قۆناغی هێرش و پەلاماردان و تێکشکاندنی دەسەلاتی دژ هەنگاو بە هەنگاو، بێ وەستان تا کۆتایی.

٤. هونەری ڕاپەڕین خۆی لە ڕاوکردن و هەل قۆستنەوە و کتوپڕ لێدانی دوژمندا دەنوێنێ.

٥. دەبێ ڕاپەڕین بەردەوام دەستکەوتی ڕۆژانە ئەگەر نەڵێین ساتانەی هەبێ، لەگەڵ پاراستنی ورە و توانای بەهێزی جەماوەردا.

گەر ئەو پێداویستییانە لەبەرچاو نەگرێ و کاریان پێ نەکا، ئەوا بێشک مەرگەسات چاوەڕوانی ڕاپەڕینە" (مارکس، مجلد ٣٤، ل٤٣٥).

ڕەنگە ئەو ڕایەش ڕاست بێ کە بڵێ عێراق لە ١٩٩١/٢/٢٨ ئیعتیرافی بە شکاندنی خۆی کرد لەگەڵ هاوپەیمانەکاندا و هەموو مەرجەکانی پەسەند کرد و سەرشۆڕانە بڕیاری لەسەر هەمووی دا، وە لە ٢/٢٩ ڕاپەڕین لە خواروو و ناوەڕاستی عێراق دەستی پێ کرد و لە ٣/٥ لە کوردستاندا، وە لە ٤/٥دا هێرشی ڕژێم پاش تێکشکاندنی ڕاپەڕینی خواروو و ناوەڕاست بۆ سەر کوردستان دەستی پێ کرد. کە ئەم هەموو ڕووداوانــە لە ماوەیەکی کورت و دەتوانین بە ڕەچاوکردنی خەباتی جەماوەری کوردستان بە چاوترووکانێکی دابنێین و ئەو هەوڵانەی لە سەرەوە باس کران، لەو ماوە کورتەدا نەدەکرا چارەسەریان بکردایە. بەڵام ئەوەش ڕاستە کە سەرکردایەتیی سیاسی، شۆڕشێکی جەماوەریی ڕزگاریخواز و ڕابەرایەتییەکی خاوەن پسپۆڕی ١٠ ساڵ خەباتی جەماوەری دەبێ و دەبووایە ئەو پێشبینییانەی هەبووایە. بەو جۆرە لەپاش تێپەڕبوونی ٢٥ ڕۆژ بەسەر ڕزگارکردنی ٤/٣ی کوردستان لەلایەن هێزی جەماوەر و پێشمەرگەوە، جارێکی تر دامودەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێم و سوپای

سەرکوتکەری جەماوەر و داگیرکەر گەڕایەوە کوردستانی چۆڵوهۆڵ و نزیکەی سێ ملیۆن پیر و لاو و ژن و پیاو و منداڵی کوردستان ڕەویان کرد و ئاوارەی دۆڵ و نشێو و شاخەکانی کوردستان و سەر سنوورەکانی نێوان ڕۆژهەڵات و باشوور و باکووری کوردستان بوون کە لە سەختترین هەلومەرجی ژیاندا دەژیان، کۆچ و بار و ڕەوی بەو جۆرە تا ئەو کاتە مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە نەیدیوە. لە زەمینەی هێرش و پەلاماری فاشییانەی سوپای ڕژێم بە تانک و تۆپ قومپارەوە لە ئاسمانەوە بە جۆراوجۆر فڕۆکەی جەنگی لە ڕۆژانی زستانێکی زۆر سەخت و سەرما و سۆڵەیەتی کوشندەدا، کۆچ و ڕەوێک کە یا دەبووایە لە سنووری باشووری کوردستاندا ڕەشەکوژی بکرایە و یا دەبووایە ڕوویان بکردایەتە ژێر سایە و سێبەر و ڕەحمەتی ئێران و تورکیا. دیسانەوە دەیڵێمەوە کە ئەو کۆچ و ڕەوە مەرگەساتە تراژیدییە پڕ لە ناسۆرە، نەک هەر ویژدانی دۆستانی کوردی هەژاند، بەڵکوو ویژدان و بەزەیی سەرتاسەری مرۆڤایەتیی هێنایە جووڵان و دۆست و لایەنگری مەسەلە ڕەواکەی لە هەموو دونیادا بۆ پەیدا بوو و کەوتنە هاوکاری و هاریکاریکردنی، بەڵام تەنیا لە ڕووی مرۆڤایەتییەوە، نەک پاڵپشتیی سیاسییانە لە سەرەتاوە.

ئەو کۆچ و ڕەوە، جەماوەری کوردستانی ڕووبەڕووی چوار مەترسیی گەورەی مەرگبەخش کردەوە:

ا. مەترسیی پەلاماردان و کاولکردن و لە فڕۆکەوە سەرباز دابەزاندن و بۆمبارانکردن لەلایەن دوژمنەوە.

ب. مەترسیی سەرماوسۆڵە و بەفر و ڕەقبوونەوە.

ج. مەترسیی نەخۆشییەکانی سکچوون و وشکهەڵاتوویی و کۆلێرا و گانگرین لە بریندارەکان.

د. مەترسیی برسێتی.

هـ. مەترسیی لوغمە چێنراوەکان کە بە سەرژمێریی پسپۆڕان، پتر لە دوو ملیۆن لوغم لە کوردستاندا لەسەر هەموو ڕێگاوبان و شاڕێ و ڕێچکە و دۆڵ و سەر کانیاوەکان و دێهاتە چۆڵکراوەکان و سووتاوەکان و کێڵگە و ڕەز و باخە وێرانکراوەکاندا چێنرابوون.

هەلومەرجەکانی ڕژێمی بەعس بۆ داواکردنی گفتوگۆ لە بەرەی کوردستانی، پاش گرتنەوەی ٣/٤ی کوردستانی چۆڵوهۆڵکراو:

١. حکومڕانیکردنی کوردستانێکی چۆڵوهۆڵ و بێ جەماوەر و بێ پێگە و بێ مۆڵگای جاسووسی.

٢. فشار و پاڵەپەستۆی جەماوەری عێراقی و کوردستانی لەسەر ڕژێم.

٣. لاوازی و لەرزۆکیی سوپای داپڵۆسێنەری فاشیی بەعس کە بەرگەی سێ چوار بەرەی شەڕی نەدەگرت لە مەیدانەکانی خواروو و ناوەڕاست و ناو بەغدا و کوردستاندا.

٤. داڕزاوی و لاوازیی باری ئابووریی عێراقی کە توانای مانەوە و درێژەدانی ئەو هێزە زۆر و زەبەندەی نەبوو لە ڕووی خۆراک و پێویستیی بژێوی و بودجەی مانگانە و ئیمتیازاتیانەوە.

٥. کەمیی خۆراک و پێویستییەکانی بژێوی بە هۆی ئەو ئابڵووقەیەی کە لەلایەن وڵاتانی دەرەوە و دراوسێکانیەوە خرابووە سەری.

٦. فشار و پاڵەپەستۆی دەوڵەتانی هاوپەیمان و گەلانی جیهانی لەسەری.

٧. مەترسی لە تەماحی ئێران و سووریا و تورکیا لە کەلاکی عێراق.

٨. خۆڕاگریی هێزی پێشمەرگە لە دەوروبەری شارەکانی هەولێر و سلێمانی و لێدانی زیانی کوشندە لە هێزەکانی ڕژێم.

٩. مەترسی لە گەشەسەندن و پەرەسەندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی شیعی لە خوارووی عێراق.

١٠. بەهیوای لابردنی ئابڵوقەی ئابووری لەسەری لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە و پاشان پۆشینی پەچەی دیموکراتیەت لە ئایندەی حوکمیدا.

## هەلومەرجەکانی کوردستان و بەرەی کوردستانی لە قبوڵکردنی گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێم:

١. جەماوەری کوردستان و بەرەی کوردستانی، بۆ گرتنەوەی کوردستان و دەرس وەرگرتن لە هەڵەکانی پێشوویان، دوو ڕێگەیان لە بەردەمدا بوو کە یا دەبووایە

ڕێگەی ڕاپەڕینێکی تر و هێرش و پەلاماری دوژمن بگرنە بەر، یا بە ڕێگەی ئاشتی؛ کوردستان لە هێزەکانی دوژمن چۆڵ بکەن، کە ڕێگەی یەکەمیان بە هۆی تەنیایی بەرەنگاربوونەوەی کوردستان لەگەڵ ڕژێم لە سەرتاسەری عێراقدا شەڕی خۆترێن و بێئەنجام دەبوو، جگە لەوەش کە ڕاپەڕین و شەڕ بە جەماوەر دەکرێ لە شارەکاندا و شاریش چۆڵوهۆڵ بوو لە جەماوەر.

٢. یا دەبووایە ئەو سێ ملیۆن ئاوارەیە لەژێر ڕەحمەتی ئەو ٤-٥ مەترسییەی لە پێشوودا باسمان کرد؛ بمێننەوە، یان ڕێگەچارەیەک بۆ گەڕانەوەیان و ڕزگارکردنیان لە ئاوارەیی پەیدا بکەن.

٣. پاش تێکشکاندنی ڕاپەڕینی شیعە و جەماوەری عەرەبی لە خواروو و ناوەڕاستی عێراق، هیوای ڕووخانی ڕژێم بەتەنیا بە جەماوەری کوردستان؛ زۆر کەم و کز و بێ ئەنجام بوو، جگە لەوەش لە ستراتیژی بزووتنەوەی کوردستاندا هەرگیز گرتنی بەغدا و ڕووخانی ڕژێم بە تەنیا و حکومڕانیکردنی عێراق لەلایەن کورد یا کوردستانەوە نەبووە.

٤. لە هەلومەرجێکی دەولیی وادا کە هەموو وڵاتانی هاوپەیمان و وڵاتەکانی تر و گەلانی جیهانیدا ڕژێمی عێراقیان سەبارەت بە کۆچ و ڕەوی سێ ملیۆن کورد تاوانبار دەکرد و لە بارودۆخێکی وا دەگەڕان کە هەر نەبێ کارێک بکرێ بۆ نیشتەجێکردنیان لەسەر سنوورەکان یا دابینکردنی لانی کەمی پێویستییەکانیان لەناو ئێران و تورکیادا، ڕژێمی عێراقی بەرگی دیموکراتی بکاتە بەری خۆی و داوای گفتوگۆ بکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد بەئاشتی دەبێ هەڵوێستی بەرەی کوردستانی چی بێت، هەڵبژاردنی ڕێبازی ئاشتی و دیموکراتییانە یان وەستان دژی ئاشتی و تەقەللای دیموکراتییانە.

٥. کورد و بەرەی کوردستانییش باش لەوە گەیشتوون و خاترجەم بوون کە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان و دراوسێکانیش هەرگیز بە دروستکردنی دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆ و جیابوونەوە لە عێراق ڕازی نابن و ڕێگەشی لێ دەگرن.

٦. لە هەموویان گرنگتر ئەو بارودۆخە لەبارە بوو کە بۆ گەلی کوردستان و بەرەی کوردستانی هەڵکەوتبوو بۆ وتوویژ و خاترجەمی لە سەرکەوتنیش تیایدا:

ا. بە درێژایی خەباتی گەلی کوردستان، ڕیزەکانی گەل پارچە پارچە و جیا جیا و دژ بە یەک بوون، لە بەرامبەریدا داگیرکەرانی کوردستان یەکگرتوو و هاوکار بوون، ئەم جارە ڕیزەکانی گەلی کوردستان یەکگرتوو و هاوکار، لە بەرامبەریدا داگیرکەرانی کوردستان دژ بە یەک و خۆ لە بۆسە ناو بۆ یەکتری و چاوی تەماح برینە یەکتری.

ب. بوونی پاڵپشتێکی دەولی گەر لە ڕووی ئینسانییشەوە بێ کە پشتگیریی گەڕانەوەی جەماوەری کوردستان بکات بۆ ناوچەکانی خۆیان و پاراستنیشیان لە دەربەدەری و هێرش و پەلاماری ڕژێمی عێراقی جارێکی تر.

٧. هەلومەرجی بەخۆداچوونەوە و کۆکردنەوەی هێزەکان و توندوتۆڵکردنیان و ڕێکخستنیان و سازدان و ئامادەکردنیان وەک هێزێکی ڕزگاریکەر و یەکگرتوو بە دیسپلین، تەنیا لە ئاشتی و کاتێکی هێمندا دەکرا گەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ نەک لەو هەڵات هەڵات و پاشاگەردانی و پەرشوبڵاوییەدا.

## ئامانجی ڕژێمی فاشیی سەدامی لە وتووێژ لەگەڵ شۆڕشی کوردستاندا:

١. وەتەقخستنی جەماوەری کوردستان و بەرەی کوردستانی و دابڕینی لە جەماوەری عێراقی و ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، دابڕینی لە تورکیا و ئێران، دابڕینی لە مەیدانی نێودەوڵەتان، دابڕینی لە هێزە دیموکراتخوازەکان و گەلانی ئەورووپا و دەوڵەتانی ئەورووپا.

٢. گەڕانەوەی دامودەزگا ئیداری و ئابووری و سیاسی و حزبی و سوپایی سیخوڕییەکانی لە هەلێکی ئاشتی و لەبار و بێ گرێوگۆڵدا و سەپاندنەوەی دەسەڵاتی خۆی لە کوردستاندا.

٣. سازدانەوەی هێزە داڕزاوەکەی لە هەلومەرجی ئاشتیدا لەگەڵ کوردستان و خۆئامادەکردنەوەی بۆ هێرش و پەلامارێکی تر بە مەبەستی بنەبڕکردنی خەباتی جەماوەری و شۆڕشی کوردستان و سەرکوتکردنیان و سەر پێ دانەواندنیان.

٤. دابڕینی بەرەی کوردستانی و سەرکردایەتیی شۆڕش و پێشمەرگە لە جەماوەر و دروستکردنی تووی ناکۆکی لەنێوان جەماوەر و بەرەی کوردستانی، واتە

دابەشکردنی هێز و توانای جەماوەر بە چەند پارچەیەک لە هەلومەرجی ئاشتیدا.

٥. هەوڵدان بۆ چاندنی تۆوی ناکۆکی لەنێوان لایەنەکانی بەرەی کوردستانی و هەڵتەکاندنی ئەو یەکگرتن و بەرەیە لە هەلومەرجی ئاشتیدا بە ڕێگەی هەوڵدان بۆ کڕینی لایەک و ڕازیکردنی لایەکی تر و دژایەتیکردنی لای سێیەم و سەوداکاری لەگەڵ لای چوارەم و... هتد.

٦. لە هەلومەرجی ئاشتیدا هەوڵدان بۆ کڕین و لەخشتەبردنی ئەم لێپرسراو و ئەو ڕابەری سیاسی و ئەو مەسئولی پێشمەرگایەتی و ئەم سەرەکتیرە و ئەو سەرۆکهۆز.

٧. کەمکردنەوە و لەناوبردنی بڕوای جەماوەر بە سەرکردایەتیی سیاسی و بەرەی کوردستانی و شۆڕش لە وتوویژکردنیان لەگەڵ دوژمن، پاش ئەو هەموو ماڵوێرانی و سەرگەردانییەی کە لەلایەن ئەو ڕژێمەوە بەسەریاندا هات.

٨. تەرخانکردنی بەشێکی زۆری هێزەکانی لە هەلومەرجی ئاشتی لە کوردستاندا بۆ پاراستنی کورسییەکەی خۆی لە بەغداد و بۆ دامرکاندنەوەی جموجووڵی شیعە و ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە ناوەند و خوارووی عێراقدا.

٩. قەناعەتکردن بە دەوڵەتان لە دانی مافی نەتەوەیی و دیموکراتی بە کوردەکان، بۆ کەمکردنەوەی فشاریان لەسەری.

## ئامانجی بەرەی کوردستانی لە وتوویژدا لەگەڵ ڕژێمی فاشیی سەدامی:

١. لەدەستنەدانی سەرچاوەی لەبڕاننەهاتووی شۆڕشی کوردستان و پشتوپەنا و تاکە هۆی گەشەکردنی شۆڕش و مەسەلە نەتەوایەتییەکەی کە جەماوەری کوردستانە و گەڕانەوەیان بۆ ناوچەرگەی کوردستان وەک قەڵایەکی سەختی خۆڕاگر بەرامبەر بە داگیرکەر.

٢. ڕێگەنەدان بە دروستبوونی فەڵەستینێکی تری چۆڵکراو لە گەلەکەی و پەرتوبڵاوبوونیان لە وڵاتانی دراوسێ و ئەورووپا و هەندەران و بەعەرەبکردنی کوردستان.

٣. گرتنەوەی کوردستان بە ئاشتی و خۆتیاقایمکردن و سازدانەوەی هێزەکانی بەرگری.

٤. تەقەللادان بۆ دارشتن و سەپاندنی مافی چارەی خۆنووسین لە چوارچێوەی حوکمی فیدراڵیدا لەباتیی ئۆتۆنۆمی و بەمەش هەنگاوێک دەچنە پێشەوە لە داخوازییە ڕەواکانی گەلی کورد.

٥. بەپیرەوەچوونی ڕێگای چارەسەر بە ئاشتی و دیموکراتیانەی مەسەلەی کورد و بڕینی بڕوبیانووی دوژمن لە هێرش و پەلامار لە لایەک و لە لایەکی تریشەوە بۆ سەلماندن بە ڕای گشتیی جیهانی کە گەلی کورد لە بەدیهێنانی مافەکانی؛ هەرگیز خواستاری هەڵبژاردنی ڕێگای توندوتیژ و شەڕ نییە، بەڵکوو هەمیشە خواستاری ڕێگای ئاشتی و دیموکراتی و گفتوگۆیە.

٦. پەیدابوونی قەناعەتی تەواو لەلای بەرەی کوردستانی، کە ئەم جارەش ڕژێم وەک هەموو جارەکانی تری ڕژێمەکانی عێراقی کە وتووێژ وەک تاکتیک وەردەگرێ و پاش ماوەیەک لە بەڵێنەکانی پاشگەز دەبێتەوە، بەمەش ئەوەندەی تر عەتفی دەوڵەتان لەسەر مەسەلەی کورد و توندکردنی لغاوی هاوپەیمانەکانیش لە دەمولەوسی ڕژێمی عێراقیدا پتر و توندتر دەبێ.

٧. بەدەستهێنانی هەلێک بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و دروستکردنەوەی شار و شارۆچکە و دێهاتە کاولکراو و سووتاوەکان و گەڕانەوەی جووتیاران بۆ سەر زەویی خۆیان و باشکردنی باری ئابووریی کوردستان، هەر نەبێ لە ڕووی بژێوییەکانی ڕۆژانەوە کە لە ڕێگەی پشتبەستن بە کشتوکاڵی ناوخۆییەوە ببەسترێ و پاشان بە پشتبەستن بەو یارمەتییەی دەرەوە و قەرەبووکردنەوەی بەشێکی زەرەر و زیانەکان لەلایەن ڕژێمەوە.

دوایین بەشی ئەم سمینارە بە هەڵسەنگاندنی سیاسەتی گشتیی حزب و ڕێکخراوە کوردی و کوردستانییەکان لەمەڕ وتووێژ و هەڵە و کەموکورتییەکانیان دێنین:

١. هەمیشە ڕێگای وتووێژ باشترین ڕێگەی چارەسەری کێشەیەکی دیاریکراوە لە هەلومەرج و بارودۆخی لەباری خۆیدا و لە کات و شوێنی لەباری خۆیدا.

٢. هەموو وتووێژێک لایەنی باشە و لایەنی خراپەی خۆی هەیە، واتە هیچ وتووێژێک

نییە لە دنیادا کە بۆ لایەک هەمووی هەر خراپە و خەڵەتاندن و تیاچوون بێت و بۆ لایەکەی تریش هەمووی باشە و سوود و سەرکەوتن و دەستکەوت بەدەستهێنان بێ.

دیارە لە باسەکەماندا لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەر باسی لایەنە باشەکانی وتووێژمان کردووە سەبارەت بە لایەنی کورد یان کوردستان، کە ڕەنگە گەر ئەو وتووێژانە نەکرانایە؛ مەسەلەی کورد لە باشووری کوردستاندا وەک مەسەلەی کوردی لێ بهاتایە لە پارچەکانی تری کوردستاندا کە پاش پتر لە سەد ساڵ خەباتی پچڕ پچڕ و پانزە ساڵ خەباتی توندوتیژیی بێ پسان و بێوچان هەنگاوێکی نەنایە بۆ پێشەوە لە ڕووی ناچارکردنی داگیرکەر بە داننانی بە لانی کەمی مافەکانی کورد یا کوردستان. ئەمە لە لایەک و لە لایەکەی تریشەوە پێویستە لایەنە خراپەکانی وتووێژ دیاری بکەین، کە ئەمیش گەر ئەو هەوڵانە و لەدەستدانی هەندێ هەلومەرجی باش نەبووایە، ڕەنگە مەسەلەی کورد لەم پارچەیەی کوردستاندا ئێستاکە لە قۆناغی گەلێ لەوە لەپێشتر بووایە و دەستکەوتەکانی ئەمڕۆی کوردستان زۆر زووتر بەدەست بهاتایە.

## لایەنە خراپەکانی وتووێژ:

١. حزبەکان هەمیشە وتووێژیان وەک ستراتیژ وەرگرتووە و بڕوای پێ بووە و لە وتووێژدا پشتێنی لێ کردۆتەوە، بەڵام ڕژێمەکان وتووێژیان وەک تاکتیک وەرگرتووە فرسەتیان بەدەست هێناوە و سوودیان بۆ خۆسازدانەوە وەرگرتووە.

٢. لە وتووێژدا هەمیشە حزبەکان خۆیان بە کۆمەڵێک کۆتوبەندی ئیلتیزامات بەستوتەوە و هەموو پەیوەندییەکی خۆیان لەگەڵ هەموو لایەنێکی تری دۆست یا دوژمنی دوژمن پچڕیوە و مسداقیەتی خۆیان لای یارمەتیدەرەکانیان لە تەنگانەدا لەدەست داوە.

٣. حزبەکان بەردەوام لە وتووێژدا ڕێگای پشتبەستنی تەواوی خۆیان بە ڕژێمەکە گرتۆتە بەر و هەموو ڕێگایەکی تری خەبات و هەوڵ و تەقەللای تری وەک دیبلۆماسییانەیان لە هەموو دەوڵەتان و گەلان لەدەست داوە، بەمەش خۆیان وەتەقی خستووە و کێشەی کوردیشیان لە چوارچێوەی کێشەی ناوخۆیی عێراقدا قەتیس کردووە.

٤. هەموو حزبەکان لە وتوویژدا بەردەوام چاوەڕوانی دەستی ڕەحمەتی ڕژێم بوون هەنگاو بۆ بەدەستهێنانی لامەرکەزی-ئۆتۆنۆمی بنێ، هەرگیز خۆیان هەستیان بەوە نەکردووە کە وتوویژ خۆی لە خۆیدا مانای ئیعتیرافی دوژمنە بە بەرامبەرەکەی و دەبێ ئیتر خۆیان دەستبەکار بن بۆ خولقاندنی دەستکەوتەکان، واتە توانای مبادەرە و داهێنانیان کەم بووە.

٥. هەموو حزبەکان لە کات و قۆناغی وتوویژدا مەسەلەی کوردیان لە جوغزی بەڕێوەبەرایەتیی ئیداری و مەسەلە کۆمەڵایەتییەکاندا قەتیس کردووە و هیچ گرنگییەکیان بە مەسەلەی جەماوەری و سیاسی و دیبلۆماسی نەداوە.

٦. هەموو حزبەکان لە وتوویژدا زۆرتر گرنگییان بە بەرژەوەندیی تەسکی حزبایەتیی خۆیان و بەهێزکردنی حزبەکانی خۆیان داوە و هەوڵی ئەوەیان داوە کە هەیمەنەت و دەسەڵاتی تەسکی حزبیی خۆیان بەسەر جەماوەردا بسەپێنن و دەستکەوتە حزبییەکانیش لە ڕژێم بەدی بهێنن.

٧. زۆربەی وتوویژەکان (مەبەستمان لە وتوویژی ١٩ی شوباتی ١٩٦٣ تاکوو وتوویژی مانگی ٥ی ١٩٦٨)ە، بە هۆی ناکۆکیی نێوان کورد و دووبەرەکیی ناو پارتی دیموکراتی کوردستان و پارتی شۆڕشگێڕییەوە بۆ لێدانی یەکتری و قەڵاچۆکردنی یەکتری، بەمەش توانایەکی نەتەوەیی و جەماوەریی زۆریان بێهوودە لەدەست دا و بوونە هۆی دروستکردنی برینێکی قووڵ لە جەستەی خەبات و تێکۆشانی گەلی کوردستان.

٨. کە ئەمەیان گرنگترین هەڵە و کەموکورییە لەلایەن شۆڕش و حزب و سەرکردەکانی کوردەوە کراوە، ئەویش تێنەگەیشتنیان بووە لەم ڕاستییانەی خوارەوە جگە لەم جارە:

ا. کێشەی باشووری کوردستان، کێشەی تەنیا سێ ملیۆن یان پێنج ملیۆن کوردی باشووری کوردستان نییە، بەڵکوو کێشەی گەلی کوردستانە بە کورد و ئاشووری و ئەرمەنی و تورکمانەوە، کە هەرگیز بایەخیان بە ڕاکێشانی ئەو کەمایەتییە نەتەوایەتییانە نەداوە بۆ پاڵ شۆڕش. گرنگیی ئەو کەمایەتییە نەتەواتییانە لە ژمارەی سەرژمێرییەکانیاندا نییە، بەڵکوو لە پشتیوانی و پشتگیریلێکردنیان دایە لە سۆڤیەت و ئەورووپا و ڤاتیکان و تورکیاوە، بە هۆی پەیوەندیی ڕەگەزی و دینی و مەزهەبییەوە پێیانەوە.

ب. کێشەی باشووری کوردستان کێشەی وڵاتێکی چکۆلە و ناوخۆی چوارچێوەی عێراق نییە، بەڵکوو کێشەیەکی زۆر لەوە قووڵتر و فراوانترە، کێشەی گەلێکی سی چل ملیۆنییە لە کوردستاندا بە هەموو پارچەکانییەوە، کە دەبێ هەمیشە هەموو پارچەیەکی کوردستان قووڵایی ستراتیژی خەباتی خۆی لە پارچەکانی تری کوردستاندا ببینێ و پێشبینیی ئەوە بکات کە لەپێش هەموو لایەن و کەسێکەوە گەلی کوردن لە پارچەکانی تری کوردستاندا پشتوپەنا و یارمەتیدەری پارچەکەی ترن، کە بەداخەوە زۆر جار لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستاندا ئەو قووڵاییە ستراتیژییە نەک هەر فەرامۆش کراوە، بەڵکوو لەدەست دراوە، بە هۆی دژایەتیکردنی پارتی ڕابەری ئەم پارچە بۆ پارتی ڕابەری ئەو پارچەی تر بە سوود و قازانجی داگیرکەرە.

ج. کێشەی کوردستان، ئەڵقەیەکی دانەبڕاوی زنجیرەی خەبات و تێکۆشانی سەرجەم بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانە و ئاشتیخوازانە و دیموکراتخوازانەی دونیایە و بە چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە، هەنگاوێکی زۆر گەورە بۆ دابینکردنی ئاشتی و ئازادی و دیموکراسی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەنرێت، بۆیە دەبووایە و دەبێت لەم ڕوانگەیەوە بزووتنەوەی کوردستان و حزب و ڕێکخراوە ڕابەرەکانی پەیوەندیی توندوتۆڵیان بە گەلان و وڵاتانی دیموکراتخواز و ئاشتیخواز بووایە و خەباتی دیبلۆماسییانەیان بە کەمتر لە خەباتی چەکداری وەرنەگرتایە، بەڵکوو گرنگییەکی زۆر تایبەتیان پێ بدایە.

د. کێشەی کوردستان؛ کێشەی یەک چینوتوێژ و تاقم نییە، واتە تەنیا کێشەی بۆرژوای کوردی، کرێکاری کوردی، پیاوی کوردی، ژنی کوردی نییە بەتەنیا، بەڵکە کێشەی سەرجەمی هەموویان و لەگەڵیاندا کەمایەتیی نەتەوایەتییەکانی تری وەک ئەرمەن و ئاشوور و تورکمانیشە لە کوردستاندا. هەر بۆیەش کێشەکە نابێتە کێشەی یەک تاکە حزبی تاقانە و خۆسەپێنەر کە هەرگیز ناتوانێ لە نوێنەرایەتیی یەک یان دوو چین یان توێژی چینێک زیاتر بکات. بۆیە هەڵەی هەموو حزبەکان لەوەدا بووە کە چارەسەری کێشەکەی بە یەکگرتنی هەموو ڕیزەکانی گەلی کوردستان دەکرێ بە هەموو چینەکانیانەوە، وە بە هەموو حزب و ڕێکخراوەکانی نوێنەرەوەی سوود و بەرژەوەندیی ئەو چینوتوێژ و کەمایەتییە نەتەوەییانەشەوە بەهەند وەرنەگرتووە.

هـ کێشەی کوردستان؛ کێشەیەکی ناوخۆی عێراقی یان ئێرانی یان تورکی یا سووری نییە، سەرەنجامی ململانێ و پێشبڕکێی نێوان توێژە جیاجیاکانی بۆرژوای عێراقی بۆ حوکم گرتنە دەست بەرپا بووبێ، یان ململانێی کرێکارانی عێراقی و بۆرژوای حوکمبەدەست بێت لە چوارچێوەیەکی یەک نەتەوەی یەک زمانی یەک کولتووری و یەک خاکی. کە هەمیشە لە وتووێژەکاندا ئاماژە بۆ یەکێتیی خاکی عێراق و سنووری عێراق و ئیدارەی عێراق و سەربەخۆیی عێراق کراوە، ئەم هەڵە کوشندەیە هەر تەنیا حزبە کوردییە یان کوردستانییەکانی تێ نەکەوتوون، بەڵکوو هەم ڕژێمی عێراقی و هەم ئۆپۆزسیۆنەکانی عێراقی و هەم کوردە نیشتمانپەروەرە عێراقییەکانیشی تێ کەوتووە، هەمان شت بۆ پارچەکانی تریش.

ئازادی و سەربەستیی کوردستان، تاکە هۆی یارمەتیدەری ئازادی و سەرفرازیی گەلی عەرەبییە لە عێراقدا. ئۆپۆزسیۆنەکانی ڕژێمی عێراق خۆیان دەخەڵەتێنن گەر وا بزانن بە ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس و سەدام و چوونە سەر حوکمی ئەوان بێ چارەسەری کێشەی کوردستان، دەتوانن بە ئاشتی و دیموکراتی حوکم بکەن. عێراقچییەکان و "م. ل"کان بەهەڵەدا دەچن گەر وا بزانن بێ چارەسەری کێشەی کوردستان بە بەدەستهێنانی مافی چارەی خۆنووسین، بتوانن لە مێژووی هەموو عێراقدا دەوڵەتێکی سۆسیالیستی بەرپا بکەن و ئاشتی و ئازادی و سەرفرازییش پایەدار بکەن. حزبە کوردستانییەکانیش تا بەڕوونی ئاشکرا و بێ پەردە و پەروا دان بە ڕاستیی پێویستیی سەربەخۆیی کوردستاندا نەنێن و خەبات بۆ ئەو ڕاستییە نەکەن و هەر لە جوغزی دیموکراتیەت بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لە چوارچێوەی عێراقدا بخولێنەوە، دەبێ گەلی کوردستان تا ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر خڕۆکی زەوی بەردەوام بێ، ئەوانیش لە شەڕ و وتووێژ و شەڕ و وتووێژ و شەڕ و وتووێژ بەردەوام بن. دیارە لەم سمینارەدا هیچ ئاماژەم بۆ حوکمی فیدڕاڵ نەکردووە کە درووشمی ئێستای بەرەی کوردستانی و جەماوەری خەڵکیشە و هەڵیشنەساوم بە شیکردنەوەی، چونکە ئەو بەتەنیا بابەتێکە و پێویستی بە سمینارێکی تایبەتی هەیە هەم لەسەر فیدڕاڵ و هەم لەسەر هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نیشتمانی.

هەلومەرجەکانی لەبار بۆ داواکردنی وتوویژ لەلایەن ڕژێمەوە لە ساڵی ١٩٨٤دا:

١. ڕژێمی عێراقی لە شەڕێکی درێژخایەن و خوێنڕێژی بێ ئەنجامدا بوو لەگەڵ ڕژێمی ئیسلامیی ئێرانی، کە پێویستی بە بێلایەنکردنی بەرەیەکی جەنگ هەبوو کە کوردستان بوو بەلانی کەمەوە.

٢. لە سنوورەکانی نێوان ئێران و عێراق لە کوردستانەوە، عێراق بە هۆی شەڕی کوردستان تواناى هیچ جووڵانەوەیەکی بۆ لێدان و پەلاماری ئێران نەبوو، کە دەیویست لە ڕێگەی وتوویژەوە لەگەڵ کورددا ئەو جەبهەیەش بکاتەوە.

٣. عێراق زۆر لەوە دەترسا لە درێژەکێشانی شەڕەکەی لەگەڵ کوردستان و لەگەڵ ئێراندا، ئێران هەوڵی نزیکبوونەوەی خۆی بدا لەگەڵ شۆڕشی کوردستان و کەلێنێکی گەورە بە هاوکاریی هەردوو لایان بکەنە بەرەکانی جەنگی لەناو کوردستانی عێراق و لە خوارووی عێراقیشدا دژی عێراق.

٤. ڕاوێژکەرەکانی ڕژێمی عێراق لە وڵاتانی دەرەوە، لە سۆڤیەتەوە تاکوو ئینگلیز و ئەمەریکاش، زۆر لە تەشەنەکردنی سێڵاوی ئیسلامیەت لە ئێرانەوە بەرەو کوردستان و پاشان عێراقیش دەترسان، بۆیە وتوویژیان لەگەڵ شۆڕشی کوردستان بە لەمپەرێکی بەرگریی ئەو سێڵاوە دەزانی.

٥. ڕاوێژکەر و یارمەتیدەرەکانی عێراق لە وڵاتانی عەرەبی هەر لە میسر و ئەردەن و کوێتەوە تاکوو سعودیە و ئیمارات و یاسر عەرەفاتیش، تەنیا ڕێگەی دەربازبوونی عێراقیان لەو شەڕە خۆترپێنە لەگەڵ ئێراندا، بە گرتنی ڕێگەی وتوویژ لەگەڵ کوردستان دەزانی و زۆر لە هاوپەیمانی ئایندەی کورد و ئێران و سەرکەوتنی ئێران لە شەڕەکە و پاشان پەلهاویشتنی بۆ سعودیە و ئیمارات و کوێت و عێراق دەترسان.

٦. ڕژێمی عێراقی داڵدەی ئۆپۆزسیۆنی کوردی کوردستانی ئێران و ئێرانیشی دابوو کە زۆربەی هەرە زۆریان بنکە و بارەگا و ناوەندی چالاکییەکانیان لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتیی نیشتمانیدا بوون و سوودیشیان لە یارمەتیی ڕژێمی عێراقی لە چەک و تەقەمەنی و ئازووقە وەرگرتن دەکرد بۆ شەڕی پارتیزانییان لەگەڵ ڕژێمی ئێران. ڕژێمی عێراق مەبەستی لەو وتوویژە، کردنەوەی بەرەیەکی جەنگیی فراوان بوو لە کوردستاندا دژی ڕژێمی ئیسلامی کە بە پشتیوانیی کوردی

هەردوو پارچەی کوردستانی ئێران و عێراق و ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی بیکات.

هەلومەرجەکانی پەسەندکردنی وتوویژ لەلایەن یەکێتیی نیشتمانییەوە لە ساڵی ١٩٨٤دا:

١. پێی وا بوو کە ڕژێمی عێراقی لەپاش ٤ ساڵ شەڕی بەردەوام و بێ پسانەوەی لەگەڵ ئێراندا، تووشی لاوازی و کەم توانایی بەرگریی شۆڕشی کوردستان بووە، کە ئەوەش هەلێکی باشە بۆ کردنی وتوویژ و سەپاندنی لانی زۆری داخوازییەکان لەو کاتەدا.

٢. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان سەبارەت بە پشتگیریکردنی داخوازییەکانی گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا، هەر لە ساڵی (١٩٧٩)وە هاوکاری و یارمەتیی ماددی و مەعنەویی شۆڕشی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی دابوو بە کۆمەڵە و حزبی دیموکراتەوە تاکوو ساڵی ١٩٨٣ کە لە کۆتایی ئەو ساڵەدا پاش شکان و پاشەکشەکردنی پێشمەرگەکانی کوردستانی ئێران، یەکێتیی نیشتمانی شەڕی ١٩ ڕۆژەی لەگەڵ ڕژێمی ئێراندا کرد و هێزەکەی خۆی ئاڕاستەی دوو بەرەی شەڕ کرد لە عێراق و لە ئێران، کە بە ئیعتیرافی ڕەفسەنجانی؛ بە درێژایی شەڕی لەگەڵ عێراقدا لە سنووری کوردستانەوە ئەوەندەی زیانی لە گیان و ماڵ لێ نەکەوتبوو کە لە شەڕی یەکێتیدا لێی کەوتبوو. پاش ئەو شەڕە و گرتنەوەی سەرجەم سنوورەکانی ئێران و عێراق لەلایەن ڕژێمی ئێرانەوە، بووە مایەی دروستبوونی نیمچە ئابڵووقەیەکی سوپایی لەسەر باشووری کوردستان و یەکێتییش بۆ دەربازکردنی خۆی و شۆڕش و جەماوەریش لەو ئابڵووقەیە؛ ئەو هەلی داواکارییەی ڕژێمی عێراقی قۆزتەوە.

٣. لەسەر ڕاوبۆچوونی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و زۆربەی زۆری ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی کە لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستانی عێراقدا خۆیان گرتبووەوە، ڕێگەی وتوویژیان بە هەڵخستنی هەلێکی باش دەزانی بۆ مانەوەیان و لەناونەچوونیان و پەلامارنەدانیان لەلایەن ڕژێمی ئێرانەوە.

٤. لای یەکێتی ئەو وتوویژەی بە وەرەقەیەکی فشار و پاڵەپەستۆ دەزانی بۆ سەر ڕژێمی ئێرانیش بۆ ڕاگرتنی لەو سنوورەدا و تێکدانی پلانە سوپاییەکەی کە بریتی

بوو لە ڕامالّینی تەواوی هێز و توانای سیاسی و پێشمەرگانەی ئۆپۆزسیۆنە کوردی و ئێرانییەکان لە کوردستانی ئێرانیش و قوولایی سنووری کوردستانی عێراقیشدا.

## ئەنجامەکانی وتووێژی ١٩٩١:

١. سەبارەت بەو کۆڕەوە گەورەیە و هاتنەدەنگی ولاتان، بڕیارێکی نێونەتەوەیی بۆ سنووردارکردنی فڕینی فڕۆکە جەنگییەکانی عێراق کە بریتی بوو لە دیاریکردنی هێڵی ٣٦ کە عێراق بۆی نەبوو فڕۆکەی جەنگی لەو سنوورە بەکار بێنێ، بەپێی ئەو بڕیارە جگە لە کەرکووک، سلێمانی، هەولێر، دهۆک، دەکەوتە ئەو سنوورەی هێڵی (٣٦)ەوە.

٢. قەدەغەکردنی سوپای عێراقی بۆ گەڕانەوە بۆ ناوچەی حوکمی زاتی جگە لە کەرکووک. دوای ئەم بڕیارانەی نێودەوڵەتیی حکومەتی عێراقیش، بڕیاری کێشانەوەی هەموو دامودەزگا بەڕێوەبەرایەتی و سەربازی و پۆلیسی و ئاسایشی و خزمەتگوزاری و بانکی دا. واتە بە هیچ شێوەیەک سیمای حوکم و دەسەلاتی حزبی بەعس بەسەر کوردستانەوە نەما. ڕژێمی عێراقی بایکۆتی تەواوی خستە سەر باشوور و هەموو جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ باشووردا بڕی.

بەرامبەر بەو هەڵویستەی ڕژێمی بەعس، بەرەی کوردستانییش چەندین بڕیاری خۆجێییان دا کە بووە هۆی لەدایکبوونی جۆرێک لە حوکمڕانی خۆجێیی.

١. دەستپێکردنی هەڵبژاردن لە سەرتاسەری باشووری کوردستان، جگە لە کەرکووک و ناوچە ناکۆکی لەسەرەکان وەک کەرکووک و دەوروبەری کە سەر بە کەرکووک بوون.

٢. دوای هەڵبژاردن، حوکمڕانی خۆجێیی دامەزرا کە لە وەزارەتەکان پێک هاتبوو.

٣. پەرلەمانی کوردستان لە یەکەم دانیشتنیدا سەرۆکی پەرلەمان و دەستەی سەرۆکایەتی هەڵبژێردرا و بڕیاری دانی متمانە بە حکومەت و وەزیرەکانی درا.

٤. سەرۆکی هەرێم خرایە ناو هەڵبژاردن و دەنگدانەوە، بەلام لەبەر ئەوەی کە هیچ کام لە کاندیدەکان (جەلال تاڵەبانی، مەسعوود بارزانی) دەنگی یاسایی تەواویان نەهێنا، بۆیە کێشەی سەرۆک و سەرۆکایەتی هەڵپەسێرا بۆ کاتێکی دیارینەکراو.

بۆ مێژوو زۆر پێویستە کە یەکەم بەیانی لەدایکبوونی پەرلەمانی کوردستان و یەکەم بەیانی دامـەزراوەی حکومەتی هەرێمی کوردستان بنووسمەوە کە پاش حکومەتەکەی قازی محەممەد و شێخ مەحموود، یەکەم دۆکومێنتی حوکمڕانی کوردە لە پارچەیەکی کوردستانی پارچەپارچەکراو و دابەش و داگیرکراودا.

## بەیانی لەدایکبوونی پەرلەمانی کوردستان و حکومەتی هەرێمی کوردستان[50]

هەڵبژاردن و لەدایکبوونی پەرلەمانی کوردستان و حکومەتی هەرێمی کوردستان، سەری بەرەی کوردستانی خوارد و دوو حزبە زلهێزەکە برابەش بوونە خاوەنی پەرلەمان و حکومەت، هەموو هەرێم بە سیستمی هەوێساریی ٥٠ بە ٥٠ کەوتنە حوکمڕانیکردنی هەرێمی کوردستان. بەڵام ئەم برابەشییە تا سەر سەری نەگرت و چاوچنۆکی و گەندەڵی و دزی لە یەک کردن بوو بە ماکی دروستبوونی پشێوی و ناکۆکی تا ئەنجام سەری دووبارە و دە بارە بە شەڕی ناوخۆ گەیاند، کە لە شوێنێکی تردا بەدرێژی دێمە سەر باسکردنی.

## کۆنگرەی یەکی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

لە ١/٢٧ تا ١٩٩٢/٢/٥ کۆنگرەی یەکەمی یەکێتیی نیشتمانی بەسترا، پاش ڕۆیشتنی ١٧ ساڵ لە تەمەنی لەدایکبوونیەوە. ئەم کۆنگرەیە لە بنەڕەتدا بۆ دوو مەبەست بەسترا:

١. هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخراوی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و یەکێتیی شۆڕشگێڕانی کوردستان، کە سەرکردایەتیی هەردوو لایان بێ گوێدان بە گەڕانەوەیان بۆ ڕای گشتی، بڕیاریان دابوو کە خۆیان لەناو یەکێتیدا بتوێننەوە و هەڵوەشاندنەوەی خۆیان ڕاگەیەنن، کە ئەویش بەفەرمی دەبوو لە کۆنگرەی یەکێتیدا ڕابگەیەنن.

٢. بۆ ئەوەی لە یەکەم کۆنگرەدا ڕایگەیەنین کە یەکێتی لە ڕێکخراوێکی نیمچەبەرەییە و گەشەی کرد و بە هەڵوەشاندنەوەی هەردوو ڕێکخراوەکەی لە ناویدا، بوو بە حزبی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

[50] لە پاشکۆی کتێبەکەدا، بەیانی لەدایکبوونی... هتد.

ئەم نەخشە و پلانە بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەردوو ڕێکخراوەکە و ڕاگەیاندنی یەکێتی وەک حزبێکی یەکگرتوو لە مەیدانی باشووری کوردستان دوای ڕاپەڕین، چەندین مەبەستی خوازراوی دا بەدەستەوە:

١. ڕزگاربوونی مام جەلال وەک سکرتێری گشتی لە کۆتوبەندی ئەو دوو ڕێکخراوەی کە نەیدەتوانی چۆن تەرازووی یەکسانیان لە نێواندا ڕاگرێ و دەشبووایە بۆ هەر کارێکی بگەڕایەتەوە بۆ سەرکردایەتیی ئەو دووانە، بەتایبەت ناوەندی کۆمەڵە و خودی سکرتێری کۆمەڵە؛ نەوشیروان مستەفا.

٢. ڕزگاربوونی یەکێتی لە سێ سکرتاریەتی و بوونی بە یەک سکرتاریەت و هەروەها ڕزگاربوونی هەموو باشوور لە سێ هەوێساری هەر لە سەرکردایەتییانەوە، تا لق و مەڵبەند و ڕێکخراوەکان.

٣. نەشیروان مستەفا نەک هەر باوەڕی بە فکری کۆمەڵە نەمابوو، بەڵکوو لە باڵ باڵێن و کتلە و کتلەکارییەکانی ناو کۆمەڵەش بێزار بووبوو[٥١].

٤. دکتۆر فوئاد و سەرکردایەتیی شۆڕشگێڕانیش ئەمەیان باشتر بوو کە لەناو یەکێتیدا زیاتر دەبوونە خاوەنی ناوەندی بڕیار و بەرپرسیارێتییەکانیان فراوانتر دەبوو.

یەکەم ڕۆژی کۆنگرە پاش خوێندنەوەی ڕاپۆرتی سکرتێری گشتی و ڕاگەیاندنی هەڵوەشاندنەوەی دوو ڕێکخراوەکەی تر، کۆنگرە هەڵسا بە هەڵبژاردنی ئەندامانی دەستەی سەرپەرشتیکاری کۆنگرە. دەستەی سەرپەرشتیکار پێک هات لە شازاد صائب، سەعدی پیرە، سەیوان محەممەد زڕگوێزی، پەروین کاکە حەمە و خوشکێکی تر و بەندە. سەرەتا کۆنگرە لە سلێمانی لە هۆڵی ڕۆشنبیری بەسترا، سەرەتای کۆنگرە کێشە کەوتە نێوان مام جەلال و نەوشیروانەوە لەسەر ڕەشنووسی ئەو پرۆژەپەیڕەوەی کە بە سەرپەرشتیی د. کەمال فوئاد و ئەندامێتیی چەند هەڤاڵێکی تر ئامادە کرابوو کە هەموو دەسەڵاتەکانی حزبی یەکێتی لە دەستی سکرتێری گشتیدا کۆ

---

[٥١] من لە یەکەم ساتی بڕیاردانی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە، کە نەوشیروان هەڵسا لەبەردەم کۆنگرەدا وتی: "ئەوا بڕیارمان دا کۆمەڵەمان کرد بە یەکێتی و یەکێتییشمان کرد بە کۆمەڵە". دووبەدوو پێم وت کە "سەرچاوەی هێزی تۆ؛ کۆمەڵە بوو، نەدەبووایە ئەمە بکەی"، وەڵامی دامەوە وتی: "برایم، کۆمەڵە گەڕوگوڵ بووبوو بەدەست فرعەونەکانی ناویەوە، نەمانی باشترە."

کردبۆوە، وە ئەو ڕەشنووسی پەیڕەوەی تری کە لەلایەن شازاد صائب و محەممەد تۆفیق و بەندەوە ئامادە کرابوو، کە زۆرترین دەسەڵاتمان لە دەستی سەرکردایەتییەکی بەکۆمەڵدا کۆ کردبۆوە، تا ئەو ڕادەی کە ڕەشنووسی ئەو پرۆژەی پەیڕەوە خوێنرایەوە، مام بەتووڕەبوونەوە وتی: "وەڵا باشە، دەسەڵاتی سکرتێری فەرمانگەیەکیشتان بۆ سکرتێری گشتی نەهێشتۆتەوە؟![52]" بەو هۆیەوە و بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە بە بەشداریی خێرخوازان لەنێوان مام جەلال و نەوشیرواندا، کۆنگرە ٢ ڕۆژ دوا خرا و شوێنەکەشی لە سلێمانییەوە برایە هەولێر، گوایە لەبەر باری ئاسایشی کۆنگرە. بەندە لە بێخەبەران کەشکەک صلاوات و بێئاگا لەو هەموو فێڵ و تەڵەکەبازییەی کۆنگرە، وام دەزانی بەڕاستی کۆنگرەی حزبێکی شۆڕشگێڕ و نیشتمانپەروەر و دیموکراتی دەبێت، نەمدەزانی کە تەکەتولی عەشایەری، ناوچەگەری، شارچێتی و دەستەگەری لە کاردان هەر عەشایەرە و هەر ناوچەیە و هەر شارەی بە ئارەزووی خۆیان لەناو خۆیاندا پێشوەخت نوێنەرانی خۆیان بۆ سەرکردایەتیی یەکێتی دەستنیشان کردووە و مام جەلالیشیان وا لێ کردووە کە پشیتوانی لە نوێنەری تەکەتولچییەکان بکات. منیش بێئاگا لەو هەموو پیلانانە لە دوارۆژدا ناوی خۆم نووسی بۆ سەرکردایەتی، وام دەزانی ڕێزگرتن لەو هەموو خەبات و ماندووبوون و شەهیددان و بێوەپیاوکوشییەم دەگیرێ و بە عەدالەت و دیموکراتییانە دەنگ دەدرێ. دوای ئەنجامی هەڵبژاردن، من بە ئەندامی یەدەگ (احتیاط) بۆ سەرکردایەتی دەرچووم، بەڵام دەبووایە ژمارەی ئەندامانی یەدەگ ٥ کەس بن، ئێمە ٦ کەس دەرچووین، دەبووایە دیسان هەڵبژاردن بۆ ئەو شەش کەسە کرابووایەتەوە تا ٥ پێنجیان هەڵبژێردرێن. لە ڕاستیدا من زۆر ناقایل و بێزار بووم لەو ئەنجامە، بۆیە من ناوی خۆم کێشایەوە و هەڵبژاردنیش نەکرا. لەناو کۆنگرەدا، ڕۆژێک هەڤاڵێک هەڵسا و داوای لە من کرد کە ڕوونکردنەوەیەک بدەم لەسەر ئەو هاوکارییانەی کە من بۆ بنکەی پێشمەرگەی "بلەکێ" و بۆ چوونەدەرەوەی هەندێ هاوڕێ بۆ دەرەوەی وڵات کردوومە، ئایا ئەوە لە کیسە و گیرفانی خۆم کردوومە یان پارەی یەکێتی بووە لە دەرەوەی وڵات و من بە ئارەزووی حەزی خۆم کێم ویستبێ؛ بۆم ناردوون. بەر لەوەی من وەڵام بدەمەوە، کافیە سلێمان وەڵامی

[52] سەیری بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆی یەکێتیی پەسەندکراوی کۆنگرەی یەک بکە.

دایەوە کە بە ئاگاداری و شایەتیی عومەر فەتاح ئەو پارانە یەک مەنقری یەکێتیی تێدا نەبووە و هەمووی پارەی ئیشکردنی پاککردنەوەی خۆی و خاتوو شوکریی هاوسەری بووە کە ناردوویانە.

## گەڕانەوەم بۆ ئەڵمانیا و کارکردنم

هەندێ لەو هەڤاڵانەی کە ئەندامی کۆنگرە بوون و بە هۆی دواکەوتنی کۆنگرەوە نەمانەوە تا دوارۆژی کۆنگرە و پێشتر گەڕابوونەوە کە لە هەڵبژاردنی لیژنەی ئامادەکاریی کۆنگرەدا ژمارەی دەنگەکانی منیان دیبوو کە دووهەم دەنگم هێنابوو لەپاش کاک شازاد، وتبوویان کە برایم بۆ سەرکردایەتی دەردەچێ و ناگەڕێتەوە ئەڵمانیا. کە گەڕامەوە، هاوسەرم زۆری لا سەیر بوو، وای زانیبوو دەرچووم و ناگەڕێمەوە، زۆر دڵخۆش بوو بە گەڕانەوەم، پتر لەبەر منداڵەکان و خوێندنەکانیان. گەڕامەوە سەر بەرپرسیارێتییەکەی پێشووم کە ئەندامێتیی مەڵبەندی دەرەوەی وڵات و لێپرسراوی ڕێکخستنی ئەڵمانیا بووم. لەو ماوەیە پەیوەندیی نێوان یەکێتی و پارتی لە دەرەوەی وڵات کە ڕەنگدانەوەی پەیوەندیی ناو وڵات بوو، زۆر باش بوو. بیرۆی کوردی لە بۆن بەفەرمی کرابۆوە کە نوێنەرایەتیی حکومەتی هەرێمی دەکرد لەگەڵ بەرپرسانی حکومەتی ئەڵمانی. دڵشاد مستەفا بارزانی بەرپرسی بیرۆکە بوو، سەلاح ڕەشیدیش جێگری بوو، هەر لە ئەڵمانیا لیژنەیەکمان وەک نوێنەری "بەرەی کوردستانی" پێک هێنا کە پێک هاتبوو لە ٥ ئەندام، زیاتر بۆ پەیوەندییە کوردستانییەکان کاریان دەکرد، بەندە نوێنەری یەکێتی بووم لەو لیژنە باڵایە، نوێنەری پارتییش؛ طارق عەقراوی بوو. نە بیرۆ و نە لیژنەی بەرەی کوردستانی ئەوەندەیان تەمەن نەبوو، تەنانەت تا سەرپێش بکەون، هەر بەشیرەخۆرەیی بوونە قوربانیی دێوەڵووکەی شەڕی نەگریسی ناوخۆ. هەر لەدوای ڕاپەڕین و هەڵبژاردن و بنیاتنانی حکومەتی هەرێم و پەرلەمان، بروبیانوو بە یەک گرتن و شەڕەدەنووک و پاشان ململانێی دەسەلات سەری هەڵدا، ئێمە مەڵبەندی دەرەوەی وڵات داوامان لە سەرکردایەتی کرد بۆ ئەوەی حکومەتێک و پەرلەمانێکی خاوەن دەسەلات و بڕیار بێت، پێویستە هەردووکیان واتە مەسعوود بارزانی و جەلال تاڵەبانی، سەرۆکایەتیی پەرلەمان و حکومەت بگرنە دەست، یەکێتی

بۆ مێژوو ئەو پێشنیارەی خستە بەردەم پارتی و قایلیش بوو بە وەرگرتنی یەکێک لەو دوو سەرۆکایەتییە و بوونی مام جەلال بە سەرۆکی یەکێتیان، بەڵام پارتی لە زاری "فرانسۆ حەریری" وەڵامی دایەوە کە ئەوان ئامادە نین "جەنابی سەرۆک" بهێننە ئەو "مستەوا" نزمەوە و لە "هەیبەتی" کەم کەنەوە. واتە سەرۆکی پەرلەمان و سەرۆکی حکومەتی کوردیان بە سووک و نزم دەزانی لەچاو گەورەیی و "قودسیەت"ی مەسعوود بارزانیدا. پاشان دیسان وەک مەڵبەند پێشنیارمان بۆ سەرکردایەتی کرد کە واز لە سستمی حوکمی ٥٠ بە ٥٠ بهێنن و لێ گەڕێن با گەڕی یەکەمی حوکم پارتی حوکم بکات و یەکێتی ببێتە ئۆپۆزسیۆن، کە بەڕاستی ئەزموون و سیستمێکی حوکمڕانیی دیموکراتی دەهاتە بوون و ڕێگریش دەبوو لەبەردەم هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ و پاشان دوو (ادارەیی) بەڕێوەبەرایەتی. پارتی و یەکێتی لەسەر دەسەڵات بەتایبەتی دەسەڵاتی پارە و سەرچاوەکەی لە یەکتری لە بیانوو بوون، دەسەڵاتی یەکێتی لە ڕووی پانتایی زەوییەوە زۆر لە پارتی پتر بوو، هەموو پارێزگای سلێمانی بە گەرمیان و ڕاپەڕینیشەوە لەگەڵ کۆیە و پتر لە ٢/٣ هەولێریشی لەژێر دەسەڵاتدا بوو، بەڵام سەرچاوەی داهاتەکەی کەم بوو. ڕێگای سەرەکیی بازرگانیی عێراق و تورکیا و دەرەوە کەوتبووە "ئیبراهیم خەلیل" و زاخۆ، داهاتێکی بێشومار و زۆری هەبوو، دهۆک و زاخۆ و ١/٣ی هەولێر لەژێر دەسەڵاتی پارتیدا بوو. پارتی داهاتی "ئیبراهیم خەلیل"ی بەڕوونی ئاشکرا (شفافانە) نەدەخستە بەردەم وەزارەتی دارایی و حکومەتی هەرێم. پارتی کەوتە تەقەللای بیانوو دروستکردن بۆ لێدانی یەکێتی و لاوازکردنی، لەو کاتەدا لە بەرلین مانگنامەیەکی کوردی دەردەچوو بە ناوی "سەکۆ"، خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەر و سەرپەرشتیاری سەکۆ؛ بەڕێز "حاکم پێشڕەو سەیید برایم"، "عەبدولموئمن دەشتی" بوو، گەرچی خاوەنەکەی یەکێتی بوو، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆر نووسەران ئازاد بوون لە نووسینی و دەربڕینی بیروڕایان. من لەو مانگنامەیدا، ٨ ئەڵقە وتارم تێدا نووسی و بڵاو کرایەوە لەسەر شەڕی ناوخۆ و هۆکارەکانی.

وتارەکانی سەکۆ کە نووسیومە لەسەر شەڕی ناوخۆ، بە هەشت ئەڵقە نووسیومە.

## بەشی یازدەیەم
## سەرەتای هەڵکردنی گێژەڵووکەی شەڕ و لەشکری ئیسلامی

پارتی دیموکراتی کوردستان کەوتە پلانگێڕان لە یەکێتی، هەوڵی دا دەستی خۆی نەسووتێنێ بە ئاگری شەڕ، مقاشی لەشکری ئیسلامیی بەکار هێنا. لەشکری ئیسلامی کەوتنە شەڕفرۆشتن بە یەکێتی، کەوتنە دانانی بازگە لەسەر ڕێگای کۆیە-ڕانیە، کۆیە-سلێمانی، ڕانیە-قەڵادزە و سلێمانی -هەڵەبجە، کەوتنە ڕەبایە دروستکردن لەسەر بەرزایی شاخەکانی، چنارۆک، هەیبەت سوڵتان، دۆڵی شاوریێ، کێوەڕەش و دەربەندی ڕانیە و ناوچەی شارەزوور و هەڵەبجە و هەورامان.

یەکێتی هەوڵی زۆری دا کە لەگەڵ ئیسلامییەکاندا نەکەوێتە شەڕەوە، چەند جار نوێنەری خۆی دەنارد بۆ لای مەلا عوسمان عەبدولعەزیز و عەلی عەبدولعەزیزی برای کە باڵادەست و خاوەن بڕیاری ناو ئیسلامییەکان بوون. یەکێتی هەر هەوڵی دەدا لە شەڕفرۆشییەکانی ئەوان خۆی لا دا تا لە ڕۆژی ١٩٩٣/١٢/١٩ بە هێرشی لەشکری ئیسلامی بۆ سەر بارەگای لیژنەی ناوچەی یەکێتی لە شاری ڕانیە و غافڵگیرکردنیان بێ هیچ ئاگادارییەکی ئەندامانی یەکێتی لەناو بارەگاکە و لێدانیان بە کلاشینکۆف و دەسترێژیی گوللە کە ئەنجام (٥) هەڤاڵی تێکۆشەر و ئاشتیخوازی یەکێتییان شەهید کرد، یەک لەوان هەڤاڵ "محەممەد سوڵتان" بوو کە وەک کۆتری ئاشتی بەردەوام لەنێوان هەردوو لادا بوو بۆ ڕێککەوتن و پاراستنی ئاشتیی ناوچەکە. شەڕ گەورە بوو، یەکێتی کەوتە سەندنەوەی تۆڵەی بە ناحەق شەهیدکردنی هاوڕێکانی. هەر لە کۆیەوە و لە قەڵادزەوە کەوتە ڕاماڵینی لەشکری ئیسلامی تا هەموویانی لە دۆڵی ئاکۆیەتی و دۆڵی شاورێدا مۆڵ کرد و پاشان گەورەترین شکستی بەسەر هێنان بە گرتنی مەلا عوسمان عەبدولعەزیز و بەدیلگرتنی و دەستبەسەرداگرتنی هەموو بەڵگەنامەکان و

دیکۆمێنتەکانی بارەگا سەرەکییەکانیان. بەندە لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە لە هەڵێکدا بگەڕێمەوە سلێمانی و بکەومە لێکۆڵینەوە لەو شەڕانە، بەڵام برای نەمر و هەرگیز لەیادنەچووم کاکە جەبار فەرمان کە خۆی ڕاستەوخۆ سەرکردایەتیی ئەو شەڕانەی لەگەڵ لەشکری ئیسلامیدا کرد، هاتە ئەڵمانیا و هەموو بەڵگە و دیکۆمێنتە گیراوەکانی بۆ هێنام و پێی وتم: "دەزانم تۆ کارقایم و دیکۆمێنت خۆشەویستی و لەلاشت ون نابێت و نافەوتێت، بۆیە بۆ تۆم هێناوە." منیش بە سوپاسم و پێزانینم بۆ گڵکۆکەی ئەو زاتە، لێرەدا وەک بەڵگەنامەیەک بڵاوی دەکەمەوە.

## دیکۆمێنتەکانی لەشکری ئیسلامی لە شەڕیدا لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

بەڵگەنامەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی هێندە زۆرە کە لە ١١٧ لاپەڕە پێک هاتووە، دەکرێ هەر خۆی بەتەنیا وەک کتێبێکی دیکۆمێنتاری بڵاو بکرێتەوە کە چەندین بەڵگەی گوماناویی پەیوەندیی بزووتنەوەکەی بە حوکمبەدەستانی سعودیە و وەهابییەکانی میسری تێدایە جگە لە چەندین بەڵگەی ئاشکرای هاندان و پشتیوانیکردنی شەڕفرۆشییەکانی بزووتنەوە کە لەگەڵ یەکێتی لەلایەن پارتی دیمۆکراتی کوردستانەوە، من لێرەدا تەنیا چەند لاپەڕەیەکی کەم لەو بەڵگانە دەخەمە ڕوو.[٥٣]

### ئەڵقەی یەکەم

### ئاوڕێک بۆ ڕابردوو، تێڕوانینێک لە ئێستا و بیرێک لە داهاتوو

### (ا)

کێشە و شەڕی ئێستای ناوخۆی کوردستانی خواروو، کە ماوەی پتر لە چوار ساڵە بە شێوەی جیاوازی لە بیروڕا و سیاسەت و ستراتیژی قۆناغی نێوان دوو زلهێزی سەر گۆڕەپانی کوردستانی خوارووەدا دیار و ئاشکرایە و نزیکەی دوو ساڵیشە بە گەیشتنی ناکۆکیی نێوانیان بۆ پلەی سەرەکی و فەرامۆشکردنی ناکۆکیی سەرەکیی هەردوو لایان لەگەڵ ڕژێمی بەعسی "سەدام حسین"دا، کە لە ڕاستیدا ناکۆکیی نێوان

٥٣ لە پاشکۆی کتێبەکەدا.

جەماوەری گەلی ئازادی و سەرفرازیخواز و نێوان داگیرکەر و چەوسێنەرە، هەردوو لایەنی گەیاندۆتە رادەی سەنگەرلێکگرتن و قەلاچۆکردنی یەکتری و هەوڵ و تەقەللای سەپاندنی دەسەلاتی تاکی و تاکرەویی لایەک بەسەر لاکەی تردا، کە سوودوەرگری یەکەم و تەنیا داگیرکەری بەزۆر دەرپەڕێنراوە لە کوردستان و دەوڵەتە ئیقلیمییەکانی ناوچەکەیە، وە زیانلێدراوی یەکەمیش؛ جەماوەری راپەڕیوی کوردستانی خواروو و بزووتنەوەی کوردایەتیی سەرتاسەری کوردستانە، لەناو دەوڵەتە ئیقلیمییەکانیشدا پێویستی حەتمییەتێکی مێژوویی پڕ لە گیانی بەرپرسیاری، راستییەک دەخاتە بەردەم هەموو گەلی کورد لە کوردستانی خواروو و پارچەکانی تری کوردستان و بەردەم هەموو پارت و رێکخراوە سیاسی و مرۆڤایەتی و ئەدەبی و هونەری و جەماوەرییەکانی کوردستان، کە ئەویش دەربڕین و دەستنیشانکردنی سیاسەتی هەڵە و دیاریکردنی دۆست و دوژمن بە کوردایەتی و ئامادەکردنی نەترسانە و واقیعانەیە بۆ پلان کێشەکان و پلان جێبەجێکەرەکانی زیندەبەچاڵکردنی بزووتنەوەی کوردایەتی و دەستکەوتە مێژووییەکانی.

بۆ گەیشتن بەو ئەنجامەش؛ پێویست بە ئاوڕدانەوەیەک دەکات بۆ رابردوو، پاشان تێڕوانینێکی رەخنەگرانەی بەپەرۆش بۆ باری ئێستای جەماوەری راپەڕیو و ئابڵووقەدراو و بیرکردنەوەیەکی واقعیانە لە داهاتووی پڕ لە مەترسی و تەمومژاوی چارەنووسی پتر لە ٣ ملیۆن مرۆڤی کورد و رەنگدانەوەی ئەو ئایندە تەمومژاوییەش لەسەر چارەنووسی هەموو بزووتنەوەی کوردایەتیی ناوچەکە و مافی مرۆڤ و دیموکراتیەت بەگشتی.

## (٣)

نامەوێ لە ئاوڕێک لە رابردوودا بگەڕێمەوە سەر مێژوو و ئەزموونی ڕووناک و تاریکی تا رادەیـەک دووریـی رەوتـی مێژووی ژیانی گەلی کورد لە سەردەمی مەروانییەکان، حەسنەوییەکان، لوڕی گەورە و بچووک و ئەیوبییەکان، یان ئەمارەتەکانی ئەردەڵان، هەکاری، ئامێدی، جزیر، سۆران، بابان، بدلیسان... هتد، چونکە گەرچی ئاوڕدانەوە لەوانیش و کورتە باسێکیان بێسوود و کەڵک نییە بۆ دەوڵەمەندکردنی

ئەزموون و خەباتی دوانیوەی ئەم سەدەیەی گەلی کورد، بەڵام لەبەر ئەوەی هەم کەم و زۆر بە وتار و نامیلکە و کتێبی مێژوویی بەنرخ و دەوڵەمەند لەلایەن چەندین کەڵەنووسەری زانا و سەردەرکردووی بواری مێژووزانی لەسەریان نووسراوە و هەم تا ڕادەیەکیش لە ڕووی بارودۆخی سیاسی و نەتەوەیی و ناوچەیی و پێداویستیی سەلماندنی مافی سەربەخۆیی و سەرفرازی و سەقامگیرکردنی بوونی نەتەوەییەوە لە چوارچێوەی دەسەڵاتێکی سیاسیی بەڕێوەبەرایەتیی نیمچەسەربەخۆ یا سەربەخۆدا جیاوازییەکی ئێجگار زۆریان لەگەڵ بارودۆخ یا زەمانە و زەمینی پێداویستیی ئێستای خەبات و بزووتنەوەی کوردایەتیدا هەیە، بۆیە بە پێویستم زانی کە ئاوڕدانەوە لە ڕابردوویەکی زۆر نزیک بێ لە ڕەوتی مێژوویی خەباتی گەلی کورددا کە دەتوانم بڵێم وەک هەڵسەنگاندنی سیاسی و ئایدیۆلۆژی، بەڵام هەڵسەنگاندنێکی چڕوپڕ و هەمەلایەنە و زۆر کەم لەسەر ئەو ڕابردووە نزیکە نووسراوە و لێکۆڵینەوەی کەمیشی لەسەر کراوە، ڕابردووی نزیک گەڕانەوەیە بۆ کورتەباسێکی شۆڕشی ئەیلوول لە کوردستانی خواروو لە (١٩٦١)ەوە تاوەکوو ١٩٧٥، پاشان ئەزموونی شۆڕش لە ١٩٧٦ تاوەکوو ١٩٨٤ و دواتریش بەهۆشداهاتنەوەی حزب و کۆمەڵە کوردی و کوردستانییەکان و لەدایکبوونی بەرەی کوردستانی کە یەکەم تاقیکردنەوەی سەرکەوتووانەی ڕیزەکانی کوردایەتی بوو، لە هەلومەرجی هەڵکەوتوو و لەباردا توانیی بۆ یەکەم جار کاروانی خەباتی جەماوەریی کوردستانی باشوور بە قۆناغی حکومەتی فیدڕاڵیی کوردستان بگەیەنێ.

## (٣)

## ئاوڕێک بۆ ڕابردوو

یەکێتیی ڕیزەکانی گەل لە عێراقی پێش شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ بە هەموو چینوتوێژە جیاجیاکانیەوە، بە جیاوازیی خواست و ئامانج و ئایدیۆلۆجییایانەوە، کە خۆیان لەناو چوارچێوەی حزب و ڕێکخراوە سیاسییەکانی ئەوکاتدا دەنواند، ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆش گەورەترین هۆی سەرکەوتن و پاشان تا ماوەیەکی کورتیش پاراستنی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ بوو لە مەترسیی تێکشکان و لەباربردنی.

کەرتوپەرتبوونی ئەو یەکێتییەش پاش شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ بە ماوەیەکی زۆر کەم، هەم بووە هۆی بەخۆداڕاپەرموونی عەبدولکەریم قاسم بۆ پاشگەزبوونەوە لە سەرەتا پیرۆزەکانی شۆڕش، هەم لێدان و لاوازکردنی یەک لەدوای یەکی حزب و ڕێکخراوە نەتەوەیی و دیموکراتی و سۆشیالیستییەکانی عەرەبی و کوردی و عێراقیی ئەوکات.

١. ڕووداوە شوومەکەی ١٤-١٦ی تەمموزی ١٩٥٩ کە لە مێژووی عێراقدا ناسراوە بە ڕووداوەکـەی کـەرکووک، یەکەم گـورزی ئاڕاستەکراو بوو بۆ سەر یەکێتیی ڕیزەکانی گەل و دروستکردنی یەکەم درزی هەڵتەکاندنی ئەو یەکێتییەش بوو. ئەو ڕووداوە لە لایەکەوە بووە لێکترازانی ئەڵقەی زنجیری یەکێتییەکە و لە لایەکی تریشەوە دروستکردنی برینێکی قووڵ لە جەستەی برایەتی و تەبایی و متمانەی نێوان کورد و تورکمان. گەرچی زۆربەی بەڵگە جەماوەرییەکان و بەڕێوەبەرایەتییەکانی ئەوسای دامودەزگاکانی عەبدولکەریم قاسمیش "حزبی شیوعیی عێراق"یان تاوانبار دەکرد بەرامبەر بەو ڕووداوە شوومە، بەڵام زۆربەی بەڵگە مێژووییەکان هۆکانی ئەو ڕووداوە دەگەڕێننەوە بۆ خودی پلانێک کە بە بڕیار و سەرپەرشتیی عەبدولکەریم قاسم داڕێژرابوو لەژێر پەردەی گوایە "پووچەڵکردنەوەی پیلانەکانی کۆنەپەرستی و ئیمپریالیزم دژ بە کۆماری پێشکەوتووخوازی عێراق".

٢. لێدانی حزبی شیوعیی عێراقی لەلایەن عەبدولکەریم قاسمەوە بە بیانووی بەرپرسیاری لە ڕووداوەکەی کەرکووک، کە سەرەتاکەی لە ٢٥-١٩٥٩/٧/٢٩وە دەستی پێ کرد بە هەڵوەشاندنەوەی "اللجنه الدفاع عن الجمهوريه" و "المقاومه الشعبيه" و پاشان داخستنی بارەگاکانی حزبی شیوعی لە شاری کەرکووک و دەوروبەری، دووەم خۆتاقیکردنەوەی عەبدولکەریم قاسم و دامودەزگاکەی بوو لە وەشاندنی گورزی دووەمی بۆ سەر یەکیەتیی حزب و ڕێکخراوەکان. بێدەنگیی هەم حزبی شیوعی خۆی لە حەنای ئەو گورزە و هەم حزبەکانی تریش، بووە هۆی ئەوەی کە لە لایەکەوە قاسم و دەزگاکەی هێندەی تری پشتئەستوور بن بە توانای خۆیان و بە بێدەنگیی حزبەکان، وە لە لایەکی تریشەوە دووەم کوڵەگەی کەپری یەکیەتیی ڕیزەکانی گەل لە بن و بێخ هەڵکەنرێ.

٣. ڕووداوەکەی "شەواف" لە موسڵ و سەرنەکەوتنی تەقەللاکە، پارتی بەعسییانیشی خستە بەردەم شالاوی ڕژێم هەر لە (١٩٥٨/٩/٣٠)ەوە بەدواوە، عەبدولکەریم قاسم ئەو تەقەللا تێشکاوەی بەعسییانی لە موسڵ کردە بیانوویەکی گەورە نەک هەر بۆ لێدانی بەعسییان، بەڵکە بۆ لەباربردنی بیری یەکگرتنی نەتەوەیی عەرەبیش.

ئەو هەڵوێستەی عەبدولکەریم قاسم گەرچی لە لایەکەوە بە زیانی هەموو خاوەن ئایدیۆلۆژیای یەکیەتیی نەتەوەی عەرەبی و یەکگرتنەوەی وڵاتانی عەرەبی بوو، بەڵام بەپێی بۆچوونی ئەوسای حزبی شیوعیی عێراقی، بە سوودی ستراتیژیی ئەوان بوو و لە لایەکی تریشەوە بەپێی بۆچوونی ئەوسای پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانیش، دیسانەوە لە بەرژەوەندیی ستراتیژییە کوردییەکەیدا بوو. بۆیە هەردوو لا نەک هەر دژی ئەو هەڵوێستەی قاسم نەوەستان، بەڵکە بە هەموو توانا و جەماوەری سیاسیی خۆیشیانەوە هاوکارییان لە لێدان و سەرکوتکردنەوەی بەعسییاندا کرد.

٤. کشانەوە و خۆسڕکردنی پارتی دیموکراتی نیشتمانی (حزب الوطنی الدیمقراطی) لە ١٩٦١/٩/٢٣دا هەم لە پشتگیریی کۆمار و هەم لە کار و چالاکیی سیاسیی ئاشکرا، وەک دەربڕینی ناڕەزاییەکی توندی حزبەکەیان دژی قاسم و لایەنگرینەکردنیان لەلایەن حزبەکانی ترەوە، جگە لە (پارتی نیشتمانی پێشکەوتووخواز - حزب الوطنی التقدمی) و "پارتی دیموکراتی کوردستان"، ئەوەندەی تر قاسم و ڕژێمەکەی قاسمی لە ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی بێمنەت کرد.

٥. پارتی نیشتمانیی پێشکەوتووخوازیش پاش بێهیواییان بە قاسم و ڕژێمەکەی و دوای هەڵوێستی پارتی دیموکراتی نیشتمانی، پاشان توندبوون و ئاڵۆزبوونی کێشەی کورد لە مانگی تەممووزی ١٩٦٢دا، هەمان هەڵوێستی پارتی دیموکراتی نیشتمانیی عێراقییان وەرگرت و خۆیان لە هەموو دامودەزگاکانی ڕژێمەکەی قاسم کێشایەوە.

ئەم پانۆرامایەی کە تا ئێستا زۆر بەکورتی لەسەر بارودۆخی عێراقی دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووزم باس کردووە، تەنیا بۆ وەبیرهێنانەوەیەکە سەبارەت بە بۆچوونی ئەوسای حزب و ڕێکخراوە سیاسییەکان لەمەڕ ڕژێمەکەی قاسم و قاسم خۆی. ڕێکنەکەوتن و یەکانگیرنەبوونیان لەسەر لانی کەمی خاڵە یەکانگیرە هاوبەشەکانی ئەوکات، بۆ نموونە؛ پاراستنی سەرەتا و ناوەرۆکی شۆڕشی ١٤ی

تەممووز، بەتایبەتی لایەنە پێشکەوتووخوازی و دیموکراتخوازییەکەی.

- ڕێککەوتن و یەکگرتنیان لەسەر ڕێگەنەدان بە لادانی قاسم لە سەرەتاکانی شۆڕش و پاشگەزبوونەوە لە جێبەجێکردنی بنەماکانی شۆڕش.

- ڕێگەنەدان بە دەسەڵاتی قاسم بۆ لێدانی حزبەکان و ڕێکخراوە جەماوەرییەکان و بەتاڵکردنەوەیان لە هەموو ناوەرۆکێکی نیشتمانپەروەری و دیموکراسی و پێشکەوتووخوازی.

- ڕێگەنەدان بە قاسم بە لادان لە ناوەرۆکی دەستووری کاتی و پاشانیش پاشگەزبوونەوەی لە سەرەتای هەڵبژاردن و دانانی دەستووری هەمیشەیی.

- پاڵەپەستۆ خستنەسەر قاسم بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵات بۆ دەسەڵاتی گەل و کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی تاکی و تاکڕەوی.

ڕێکنەکەوتنی حزبەکان و یەکانگیرنەبوونیان لانی کەم لەسەر ئەو خاڵە هاوبەشانەی سەرەوە، بوو بە هۆی ئەوەی کە:

ا. شۆڕشی ١٤ی تەممووز لە تەواوی ناوەرۆک و سەرەتا شۆڕشگێڕییەکەی ڕووت بکرێتەوە.

ب. خودی هەموو حزبەکان بەناچاری ئاراستەی گێژەڵووکەی سیاسی و پاشان لاوازی و لەرزۆکیی سیاسی بکات و ئەوان لە جەماوەر و جەماوەریش لەوان بپچڕێت.

ج. عێراق و کوردستانیش دوچاری گێژاوێکی سیاسیی بێ بنکە و ئاڵۆزی ئەوتۆ بکات، کە تا ئێستا و دواتریش بەئاسانی نەتوانێ خۆی بگرێتەوە.

د. کێشەی کوردیش دوچاری ئاڵۆزی و لەچارەسەرنەهاتوویەکی ئەوتۆ بکات کە نزیکەی نیوەسەدەیەک ئاسۆی ڕووناکی بەخۆیەوە نەبینێ.

## ئەڵقەی دووەم

هەر لە دامەزراندنی حکومەتی مەلەکیی عێراقییەوە تا ئێستا، ناکۆکیی سەرەکی بریتی بووە لە ناکۆکیی نێوان ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی و نێوان ڕژێمە یەک بەدوای یەکە دکتاتۆر و میلیتێر و بەزۆر خۆداسەپێنەرەکانی عێراقی، ئەمە ڕاستییەکە کە گەر لە هەر کام لە لایەنەکانی ئۆپۆزیسیۆنی ئەوسا و ئێستای عێراق بپرسرێت، بێ سێ و

دوو دانی پێدا دەنێن و هیچ کامیان نکوڵی لەو ڕاستییە ناکەن، بەڵام هەر لە سەردەمی پاشایەتیی عێراقەوە تا ئێستاش، هەموو حزب و ڕێکخراوە سیاسییە عەرەبی و عێراقی و کوردییەکانیش ئەو ڕاستییەیان فەرامۆش کردووە و دەرگای بیری خۆیان لە ئاستیدا داخستووە و دوچاری بیری پەرستنی بەرژەوەندیی تەسکی حزبیی خۆیان بوون و ناکۆکییە لاوەکییەکانی نێوان خۆیان هێندە زەق و توندوتیژ کردووەتەوە تا ڕادەی گەیاندنی بە ناکۆکیی پلە سەرەکی و فەرامۆشکردنی ناکۆکییە سەرەکییەکەی نێوان هەموویان و نێوان ڕژێمیش تا ڕادەی خستنی بۆ خانەی ناکۆکیی پلەی دوو یا لاوەکی. هەر بۆیەشە لەپاش شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ەوە تا ئێستاکە پتر لە پێنج جۆرە ڕژێمی جیاواز لە عێراقیدا هاتۆتە سەر کار، هیچیان نە بە خواست و نە بە توانا و نە بە نەخشەی ئۆپۆزیسیۆن و جەماوەری عێراقی نەبووە، بەڵکە هەموویان بە کودەتا و بەکارهێنانی دەسەڵاتی میلیتاری و ملهوڕیی ئەم یا ئەو سەرکردەی سوپایی و دوور لە دەسەڵات و خواستی گەلانی عێراق بووە و ئەنجامی هەمووشیان دژایەتیکردنی خواستەکانی جەماوەر و گەلانی عێراق بووە بەگشتی. بەشی ئەم جارەمان سەبارەت بە ڕابردووی ناکۆکیی نێوان کورد و کوردە، کە بە هۆی ئەوەوە چەندین هەلی لەباریان بۆ بەدەستهێنانی لانی کەمی خواستەکانی جەماوەر لەدەست داوە، بەرەی جەماوەر و شۆڕشی کوردیان لاواز و لەرزۆک کردووە و بەرەی دوژمنی سەرەکیی ملهوڕ و داگیرکەریشیان لە کوردستانی عێراقدا پتەو و داڕێژراو و دامەزراوتر کردووە.

نامەوێ لێرەدا دیسانەوە بگەڕێمەوە سەر هۆکاری ناوەکیی ناکۆکییەکانی نێوان پارتێک و پارتێکی تر یا نێوان بۆچوونی جیاوازی ئەم یا ئەو سەرکردە لەناو یەک پارتیشدا (حزب) لە ڕووی تیۆرییەوە، کە بریتییە لە جیاوازیی ئایدیۆلۆژی و خواستی چینایەتی و... هتد. دەمەوێ تەنیا لەسەر ئەو ئەزموونە تاڵە دووروودرێژە بەردەوام خۆدووپاتکەرەوەیە بدوێم کە هەر بەڵگە و هۆ و بروبیانوویەکی لەسەر بهێنرێتەوە، هەرگیز ئەو ڕاستییە ناشارێتەوە کە (خواستی جەماوەری گەل، سەربەستی، ئازادی، دیموکراتی، ژیانی سەرفرازی) هەرگیز بریتی نییە لە پاراستنی دەسەڵاتی تەسکی حزبایەتی، لە پاوانکردنی ئەم یا ئەو پارچە لە کوردستان، لە قەڵەوکردن و خوردکردن و دەوڵەمەندکردنی ئەم یا ئەو حزب لەسەر کیسە و خوێن و فرمێسک و ئارەقی جەماوەر.

## سەرەتای ناکۆکیی نێوان کورد و کورد لەدوای شۆڕشی ١٤ای گەلاوێژی (١٩٥٨)ەوە لەناو چوارچێوەی یەک حزبدا

پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان، هەر لە گەڕانەوەی مەلا مستەفای بارزانی لە سۆڤیەتەوە بۆ عێراق و کوردستان لەپاش شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨، ناکۆکییەکانی نێوان خودی سەرکردایەتی تووشی هەڵسان و تەقینەوە بوو، تا ئەو ڕادەیەی کە پارتیی دوچاری دووبەرەکی کرد لە مانگی ١٩٥٩/١٢ لە یەک کۆبوونەوەی تەسکی ٨ کەسیدا لەسەر خواستی عەبدولکەریم قاسم و بۆ ماستاوکردن بۆ سۆڤیەت و پارتی کۆمۆنیستی ئەوسای عێراقیش بە یەک بڕیاری تاکی، مەلا مستەفای سەرۆکی پارتی، سکرتێری پارتیی لە کۆبوونەوەکە کردە دەرەوە و لە سکرتێریشی خست کە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بوو، وە هەر لەوێ بە بڕیاری خۆی هەمزە عەبدوڵلای ناسراو بە باڵە چەپەکەی ئەوسای پارتیی کرد بە سکرتێر. بەڵام دوای شەش مانگ، دوای ئەوەی کە عەبدولکەریم قاسم کەوتە ڕووبیانووگرتن بە حزبی شیوعی و کەوتە لێدانی دەسەڵاتی حزبی شیوعی هەم لەناو دەزگا بەڕێوەبەرایەتییەکان و هەم لەناو سوپاشدا، وە دیسانەوە لەسەر خواستی قاسم بە هەمان شێوەی پێشوو وەک جووڵاندنی داشی دامە، سکرتێرە تازە دامەزراوەکە و دەستەودایەرەکەی لێ خران و سکرتێرە لێدراوە کۆنەکە هێنرایەوە سەر کار. ئەم کارە سەرەتای گرتنی ڕەچەی داسەپاندنی دەسەڵاتی تاکی و تاکڕەوی و بێنرخکردنی کاری بەکۆمەڵی و پرس و ڕا و دیموکراتییش بوو، کە تا ئێستا و ڕەنگە چەندین ساڵی تریش ئەم میراتە بەجێماوە بۆگەن و نەفرەتلێکراوە لەکۆڵ کورد و خەباتی سیاسی و جەماوەری نەبێتەوە.

پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩٦٠دا بوو بە یاسایی، کەوتە کاری سیاسیی پارتی و کارکردنی بەئاشکرا پرۆژەیەکی پەیڕەو و پرۆگرامی خۆی کە لە ٢٣ بڕگە پێک هاتبوو؛ پێشکەش بە دەستگای دەوڵەت کرد، کە گرنگترین بڕگەکانی ئەو کاتە بریتی بوو لە:

١. ناوی پارتی وەک "پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عێراق".

٢. داوای یەکسانیکردنی کورد و عەرەب لە هەموو مافێکدا لە بوارەکانی: بەڕێوەبەرایەتی و ئابووری، ڕۆشنبیری، سوپادا.

٣. سوودوەرگرتن لە تیۆری مارکسیزم-لینینیزم لە مەیدانی خەباتی سیاسی و هەڵسەنگاندنی کۆمەڵایەتیدا.

٤. پەیماندان بە پشتگیریکردنی خەباتی گەلی کورد لە هەموو بەشەکانی تری کوردستاندا لەپێناو ڕزگاربوون لە کۆتی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی و بەدەستهێنانی مافی چارەنووس.

بەڵام بەرپرسیاری یاسایی ئەنجوومەنەکان ئەوکات کە "تاهیر یەحیا" بوو، بە فەرمانی عەبدولکەریم قاسم، ئەو چوار خاڵە گرنگەی ناو پرۆژەکەی ڕەت کردەوە و لەگەڵ چەند خاڵێکی تریش، واتە بێناوەڕۆککردنی پرۆژەکە. لەسەر ئەوە مشتومڕێکی زۆر لەناو سەرکردایەتیی پارتی لەسەر ئاڵوگۆڕەکانی پرۆژەکە کرا، بەڵام بەتەنیا ڕازیبوونی سەرۆکی پارتی بە ئاڵوگۆڕەکانی ناو پرۆژەکە، لەسەر خواستی ڕژێم مشتومڕەکان زیندەبەچاڵ کران و پرۆژە ئاڵوگۆڕکراوە بێناوەرۆک و گەندەڵەکە لەلایەن ڕژێمی قاسمەوە پەسەند کرا و پارتی بە ناوی "پارتی دیموکراتی کورد"؛ مافی یاسایی کارکردنی وەرگرت، جارێکی تریش مافی کاری بەکۆمەڵ و دەنگدان و دیموکراتیەت و ڕێزلێنانی ڕای زۆربەی پێشێل کرا و بڕیاری تاکی و باوکسالاری سەپێنرایەوە.

بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێز لە گرنگیی خاڵە ئاڵوگۆڕکراوەکان ئاگادار بێت، کە سەرۆکی پارتی مەلا مستەفا پێی قایل بوو، هەندێ لە بڕگە گرنگەکان دەخەینە بەرچاو:

١. ناوی پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عێراق بکرێتە "پارتی دیموکراتی کورد"، ئەمەش مانای داننەنانبوو بە بوونی کوردستان لە عێراقدا.

٢. دەبێ ڕستەی "... بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمی" لا ببرێت، ئەویش مانای ڕەوانەبینینی مافی ئۆتۆنۆمییە بە گەلی کورد.

٣. ڕستەی "پشتگیریی خەباتی گەلی کورد لە پارچەکانی تری کوردستان... هتد" لا ببرێ، واتە ئەو مافەی کە درابوو بە گەلی عەرەب لە عێراقدا بۆ پشتگیریی خەباتی هەموو گەلانی عەرەبی؛ کوردی لێ بێبەری بکرێ.

٤. ڕستەی "پشتگیری مافی کەمایەتییە نەتەوەییەکانی تر دەکەین... هتد" لا ببرێ. ئەمەشیان ئەوە دەگەیەنێت کە ڕژێمەکەی قاسم سڵێکی زۆری لە یەکیەتی و هاوکاریی نێوان نەتەوەکانی عێراق کردۆتەوە.

٥. وشەی "گەلی کورد" لە هەر شوێنێکی بەرنامەکەدا هاتووە، بکرێ بە "کورد". دیارە دیدی قاسم بۆ گەلی کورد و لە ڕووی ڕەچەڵەکی نەتەوەییەوە ئەوە بووە کە کورد لە عێراقدا ڕەگەزێکی جیاواز لە عەرەب نییە.

٦. وشەی "کوردستان" لە هەر شوێنێکی بەرنامەکەدا هاتووە؛ لا ببرێ و لەبریی کوردستان، وشەیەکی تر بەکار بهێنرێت کە یەکێتی و یەکپارچەیی سەرزەمینی عێراقی تیا ڕەنگ بداتەوە.

تەنیا بۆ قایلکردنی عەبدولکەریم قاسم و نەڕەنجاندنی، ئەو پرۆژە بێمانا و بێ ناوەرۆکە پەسەند کرا، بەڵام ئەم ڕەفتارە هەر وا بەئاسانی و بەکپکراوی نەچووە سەر، بەڵکە بووە مایەی دروستبوونی ماکی ترسناکترین نەخۆشیی ناو دەروونی ڕێکخراوەیی پارتی، ئەوەش بە گرتنی هەڵوێستێکی هەست بە بەرپرسیارێتی و شۆڕشگێڕی و نیشتمانپەروەرانەی ڕەچاوکراوی سەرانی ئەوسای پارتی.

لەسەر داوای مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی و زۆربەی لق و لیژنە ناوچەکان، لە ٥-١٠ مانگی ١٩٦٠/٣دا کۆنگرەی پێنجەمی پارتی بەسترا و جارێکی تر لە کۆنگرەدا بڕیار درا کە کورد لە عێراقدا گەلە و نەتەوەشە لە ناوچەکەدا، وە بەشێکی خاکی کوردستانیش کە بەزۆر بە عێراقەوە لکێنراوە؛ بەشێکی لە جیابوونەوە نەهاتووی کوردستانە، بۆیە ناوی پارتی لە "پارتی دیموکراتی کورد"ەوە کرایەوە بە "پارتی دیموکراتی کوردستان". هەر لەو ماوەیەشدا سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان (ئیبراهیم ئەحمەد) لە ڕۆژنامەی خەباتدا وتارێکی بڵاو کردەوە لەژێر سەردێڕی "نەتەوەی کورد و بەندی دووی دەستووری کاتی عێراق"، ئەو وتارە نەک هەر لە کوردستاندا، بەڵکە لە سەرتاسەری عێراقدا هەڵایەکی (اعلامی) زۆر گەورەی نایەوە و بووە هۆی دەرچوونی بڕیاری گرتنی سکرتێری پارتی و دانی بە دادگا بە تاوانی چاندنی تووی ناکۆکی و دووبەرەکی لە عێراقدا. جارێکی تریش سەرۆکی پارتی نەک هەر لەو بڕیارەی ڕژێم بێدەنگ بوو، بەڵکە بە هەڕەشەوگوڕەشەیەکی زۆرەوە سەرکردایەتیی پارتیی بەرپرسیار کرد لە تێکدانی نێوان قاسم و پارتی و لە دڵڕەنجانی قاسم لە گەلی کورد.

## ئەڵقەی سێیەم

## یەکەم دووبەرەکی و شەڕی براکوژی لەسەر چی؟

نامەوێ لێرەدا ورد و درشتی هۆکار و بارودۆخەکانی سەرهەڵدانی دووبەرەکی و پاشان شەڕی کوردکوژی باس بکەم کە پێم وایە نە ئێرە و نە ئەم بابەتەش شوێنی ئەوەن، جگە لەوەی کە دەتوانم بڵێم زۆر گرنگ و پێویستە ئەو ڕاستییانەی مێژووی خەباتی پارتی پێ نەخشێنراوە، بەڕاشکاوی و بێ پێچوپەنا بخرێتە بەردەم خوێندەوار و نەوەی نوێی گەلەکەمان. مێژووی پەرەسەندن و ئاشکرابوونی ناکۆکیی نێوان سەرۆکی پارتی و نێوان سەرکردایەتیی پارتی دەگەڕێتەوە بۆ ١٩٦٣/٣/٢، ڕۆژی دانیشتنی ڕووبەڕووی مەلا مستەفا و عەبدولسەلام عارف و ئەندامانی نوێنەری هەردوو لایەن لە گوندی "کانی ماران"ی سەر بە ناوچەی ڕانیە. سەرئەنجامی کودەتای عەبدوسەلام و بەعسییان بەسەر ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم لە ١٩٦٣/٢/٨دا، بڕیاری ڕاگرتنی شەڕی نێوان کورد و ڕژێم بە یەک لایەنە لەلایەن خاوەن بڕیاری کوردەوە درا و وتووێژ پاش ماوەیەکی کورت لەنێوان هەردوو لادا دەستی پێ کرد تا گەیشتە بەیەکگەیشتنی بارزانی و عارف. ڕواڵەتە ئاشکراکەی نوێنەرانی هەردوو لا (کوردی و ڕژێمی عێراق)، بریتی بوو لە دەربڕینی نیازی هەردوو لایان لەمەڕ دیاریکردنی چوارچێوەیەکی چارەسەری کێشەی کورد کە وەک کورد گوتەنی "نە شیش بسووتێ، نە کەباب". پرۆژەی بارزانی و پارتی بریتی بوو لە سەقامگیرکردنی خواستەکانی ئەوسای شۆڕش لە چوارچێوەی "لامەرکەزیدا"، بەپێی بۆچوونی ئەوسای بارزانی و پارتی بۆ "لامەرکەزی". ڕواڵەتە نهێنییەکەی دانیشتنی بارزانی و عەبدولسەلام پێکەوە و بێ بەشداریی ئەندامانی وەفدی هەردوو لایان کە ئەوکات زۆر نهێنی و نەزانراو بوو، پاشان ڕووداوەکان پەردەیان لەسەر ئەو نهێنییەش هەڵدایەوە، بریتی بوو لە تەختکردنی هەردوو کۆسپەکەی بەردەم هەردووکیان (واتە کۆسپی بەعسی لەبەردەم عەبدولسەلام و کۆسپی سەرکردایەتیی پارتییش لەبەردەم بارزانیدا). پرۆژەکەی پارتی و بارزانی لەلایەن بەعسییەکانەوە پەسەند نەکرا و لەسەر زاری "طالب حەسەن شەبیب"ەوە لە ١٩٦٣/٣/٦دا بە پرۆژەیەکی جێگای گومان و ڕێگر لە ئاشتی و دژ بە یەکیەتیی عێراق و "ئوممەی عەرەبی" وەڵام درایەوە. دوابەدوای ڕاگەیاندنەکەی

"شەبیب"، سەرانی ڕژێم لە ١٩٦٣/٣/٩دا یەک لایەنە پرۆژەی لامەرکەزییەکی داتاشراوی بێناوەرۆکیان ڕاگەیاند، داواشیان لە بارزانی و پارتی کرد کە "لەو کاتە ناسکەدا" و بۆ "پووچەڵکردنەوەی پلانەکانی ئیمپریالیزم" و پشتگیری لە کۆماری بەدیهێنەری یەکیەتی (الأمة العربية)، چاو لە داخوازییەکانی خۆیان بپۆشن و واز لەو داخوازییە بیانوگرانەیە بهێنن، بە پێچەوانەوەی ئەوە ناچار دەبن کە بەتوندی دژی هەڵوێستی بارزانی و پارتی بوەستن و بۆ توانای سوپای عێراقییش؛ تێکشکاندنیان زۆر ئاسانە. لێرەوە ناکۆکیی نێوان بارزانی و سەرکردایەتیی پارتی ئاشکرا بوو، کە چیتر لە جەماوەر و لایەنگرانی پارتییش نەدەشاردرایەوە. ڕای سەرکردایەتی و زۆربەی دەزگاکانی پارتی ئەوە بوو کە ئەو ڕاگەیاندنەی "شەبیب"؛ تیشکی سەوزە بۆ شەڕبوونەوە و هێرش و پەلاماری سوپای عێراق، نابێ چیتر درێژە بەو وتووێژە بدرێ. ڕای بارزانییش ئەوە بوو کە ئەو ڕاگەیاندنە تەنیا بیروڕای توندڕەوەکانی بەعسییەکانە و پێویستە بەهەند وەرنەگیرێ و بەردەوام بن لەسەر وتووێژ. بۆ لابەلاکردنەوەی ئەو کێشەیەش، بارزانی بڕیاری دا کە کۆبوونەوەیەکی فراوان لەسەر ئاستی سەران و کادران و دەزگاکانی پارتی و پیاوماقوڵانی عەشایەر و شارەکان و ئەفسەرە کوردەکانی ناو شۆڕش بکرێ. کۆبوونەوەی فراوان لە شاری کۆیە (کۆیسنجەق) کرا و لەو کۆبوونەوەیەدا لەسەر داوای بارزانی؛ "ئەنجوومەنی تەنفیزی" تیا هەڵبژێردرا کە زۆربەی هەرە زۆریان سەرەکهۆزەکان و پیاوماقوڵانی شارەکان بوون و ڕێژەی ئەندامانی پارتی لەناویدا زۆر کەم بوو، "ئەنجوومەنی تەنفیزی" بڕیاری درێژەدان بەو وتووێژەی دا.

پێکهێنانی ئەنجوومەنی تەنفیزی، دوو مەبەستی سەرەکیی بۆ سەرۆکی پارتی بەدەست هێنا:

١. دروستکردنی مەرکەزێکی بڕیار و دەسەڵات بۆ خۆی، کە دەتوانێ بەوە سەرەتای زۆرایەتی و کەمایەتیی ناو سەرکردایەتیی پارت پێشێل بکات.

٢. وردە وردە کەمکردنەوەی دەسەڵاتی سەرکردایەتیی پارتی و سکرتێری پارتی و پاشان ڕووتکردنەوەیان لە هەموو دەسەڵاتەکان و دواجار لێدانیان گەر بەرهەڵستیی بکەن.

له ١٩٦٣/٦/١٠دا شەڕ بە کردەوە و یەک لایەنە لەلایەن ڕژێمەوە دەستی پێ کرد و کەوتنە هێرش و پەلاماری ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشی ئەیلوول.

## عەبدولسەلام عارف و «المؤمن مؤتمن»

هێزی پێشمەرگەی کوردستان کەوتبوونە بەردەم دووڕیانێک، لە لایەکەوە پەیتا پەیتا بڕیار لە سەرۆکی پارتییەوە دەردەچوو کە تەنیا پارێزگاریی خۆیان بکەن و هێرش و پەلامار نەبەنە سەر هێزەکانی ڕژێم، لە لایەکی تریشەوە بڕیار لە سەرکردایەتیی پارتییەوە دەردەچوو کە لە هەموو لایەکەوە پەلاماری هێزەکانی دوژمن بدەن.ماڵی دوژمن ئاوەدان بێ کە بە دڕندایەتیی هێرش و پەلامارەکانی خۆی، هێزی پێشمەرگەشی یەکلا کردەوە. شەڕ کەمتر لە ٤ مانگی خایاند کە عەبدولسەلام عارفیش بەڵێنەکەی پێشووی خۆی جێبەجێ کرد و لە ١٩٦٣/١١/١٨دا کودەتاکەی خۆی بەسەر توندڕەوانی بەعسییاندا کرد و دیسانەوە شەڕ ڕاگیرایەوە، بەڵام ئەم جارە بە کێشانی نەخشەی لێدانی سەرانی پارتی و لایەنگرانی. هاتوچۆکردنی نێوان بارزانی و عارف لە ناوەڕاستی مانگی (١٩٦٤/١)ەوە دەستی پێ کرد کە "متصرف"ی سلێمانی عەبدولڕەزاق مەحموود بوو بێ ئاگاداریکردنی "م. س" و سەرکردایەتیی پارتی، بە کردەوەش لەدوای کودەتاکەی عەبدولسەلام عارفەوە شەڕ وەستابوو، گەرچی بەئاشکرا ڕانەگەیەنرا تاکوو ١٩٦٤/٢/١٠ کە لەلایەن عارف و بارزانییەوە ڕاگەیەنران.

ڕاگرتنی شەڕ لەو کاتەدا بە سوودی ڕژێم و داروودەستە لاوازەکەی عارف و بە زیانی شۆڕشی ئەیلوولی خەمڵی و سەقامگیر بوو و خۆرت و بەهێز تەواو بوو. ڕاگەیاندنەکەی عارف ئەوەی پێی بڵێی ڕووناکی بۆ جێبەجێکردنی کەمترین داخوازیی شۆڕشی ئەیلوول؛ تێیدا نەبوو، بۆ سەلماندنی ئەوەش، دەقی خاڵەکانی ناو ڕاگەیاندنەکە ئەمانەی خوارەوە بوو:

١. پێویستە لە دەستووری کاتیدا مافی ڕەوای برا کوردەکان دەستنیشان بکرێ.

٢. لێبوردنی گشتیمان دەرکرد و بڕیاری بەردانی گیراوەکانی ڕووداوەکانی ژووروومان دا.

٣. گەڕانەوەی هەموو فەرمانبەر و مووچەخۆرەکان بۆ سەر شوێن و کارەکانی خۆیان.

٤. لابردنی ئابڵووقەی ئابووری لەسەر ژووروروی ولات.

٥. دەستکردن بە (اعمار الشمال) ئاوەدانکردنەوەی ژووروو کە بە هۆی ڕووداوەکانی ژووررووەوە کاول بوون.

٦. بژاردنی ئەو زیانانەی کە بە هۆی ڕووداوەکانی ژووررووەوە لە خەڵک کەوتووە.

ئەم خالانە ئەوە دەگەیەنن کە عەبدولسەلام عارف ویستوویەتی کێشەی کورد بە گەڕاندنەوەی بارودۆخی کوردستان بۆ پێش شۆڕش چارەسەر بکات، جگە لەو هەموو زیانە گیانییەی کە لە خەڵکی کوردستان و عێراق کەوتووە، ڕەنگە گەر بۆی بکرایە خاڵی حەوتەمیشی بە گێڕانەوەی ڕۆحی لەناوچووەکان خەتم بکردایە. ناوەرۆکی ڕاگەیاندنەکەی بارزانییش لە هەمان ڕۆژدا لەمەڕ ڕاگرتنی شەڕ، بەم جورە بوو: "بۆ بە ئاشتی چارەسەرکردنی داواکارییەکانمان، بڕیارمان دا بە ڕاگرتنی تەقە و شەڕ، بۆ ئەوەی ئاشتی لە عێراقدا دابین بکرێ و چیتر برای ئیسلام؛ برای ئیسلامی خۆی لەناو نەبات، داوا دەکەم هەر کەسە بڕواتەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆی و سەر ئیشوکاری پێشووی خۆی. ئێمە لەگەڵ سەرۆک عەبدولسەلام عارف ڕێک کەوتووین و پیاوی بەباوەڕ، باوەڕپێکراوە (المؤمن مؤتمن)." برووسکە و ڕاگەیاندنەکەی بارزانییش وای دەردەخات کە کورد شۆڕشی ئەیلوولی تەنیا دژی گاور و جوو و بێئیمان بەرپا کردووە و ئێستا کە پیاوێکی وەک حاجی عەبدولسەلامی خاوەن بڕوا لەسەر کارە، دەبێ پشتی پێ ببەسترێ و پشتگیری بکرێ و شەڕی بەرامبەر حەرام بکرێ، بۆیە دەبێ ئاشبەتاڵ بکرێ و هەموو کەس بگەڕێنەوە ئەو بارودۆخەی کە هێشتا شۆڕشی ئەیلوول بەرپا نەکرابوو. گەر کەمێک لە ناوەڕۆکی ڕاگەیاندنی هەردوو مەلا و حاجی ورد بینەوە، لە یەک خاڵی سەرەکیدا یەکانگیریان دەکەینەوە، ئەویش گێڕانەوەی کورد و بارودۆخی کوردستانی خواروو بۆ پێش بەرپابوونی شۆڕش. بەڵام گەر لە کودەتاکەی عارف بەسەر بەعسییەکاندا و ڕێککەوتنی مەلا مستەفاش بە "هیچ" لەگەڵ عارف ورد بینەوە، کۆبوونەوە دووقۆڵی نهێنییەکەی کانی مارانمان بیر دەخاتەوە و دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە مەلا و حاجی و هۆ دەرەکییەکانیش لەسەر لێدانی

سەرکردایەتیی پارتی ڕێک کەوتوون نەک چارەسەری کێشەی کورد. لێرەوە نەگبەتی و داهێنانی نەریتێکی نەفرەتلێکراو و کاولکەر دەستی پێ کرد و کە بوو بە شێرپەنجە و خوێن و مێشک و دەروون و گیان و یەخەی کوردی بەر نەدا، هەر بە کوردستانی خواروو شەوە نەوەستا و تەشەنەی بۆ هەموو پارچەکانی تری کوردستانیش کرد، ئا لێرەوە داهێنانی شەڕی کوردکوژی و خۆکوژی و کورد بە کورد بەکوشتدان دەستی پێ کرد و لەسەر چی؟

١. لەسەر لانی کەم و لانی زۆر بەدیهێنانی داخوازیی گەلی؟ نەء!

٢. لەسەر پێشبڕکێکردن بۆ ڕزگارکردنی کوردستانی خواروو؟ نەء!

٣. لەسەر لامەرکەزی و ئۆتۆنۆمی و فیدڕال و دەوڵەت دروستکردن؟ نەء!

٤. لەسەر سەپاندنی دەسەڵات و تاک سەرکردەیی و بڕیار سەپاندن؟ بەڵێ!

٥. لەسەر گوێنەدان بە بەرژەوەندیی گشتی و گەل و وڵات و بەرژەوەندیی تاک دەسەلاتی پەرستن؟ بەڵێ!

٦. لەسەر بەکارنەهێنانی (عەقڵ، منطق و ویژدان) و خۆبەستنەوە بە نەریتی باوکسالاری (پیاو ئەو پیاوەیە لەسەر بڕیاری خۆی سوور بێ، ڕاست یا هەڵە)؟ بەڵێ!

کۆبوونەوەی سەرکردایەتیی پارتی لە ١١ تا ١٩٦٤/٥/١٤، هەموو هەوڵ و تەقەللاکانی بۆ پەشیمانکردنەوەی بارزانی لەو بڕیارەی کە دابووی؛ بێسوود بوو و ئەنجامەکەشی بەوە شکایەوە کە هەردوو ئەندامی سەرکردایەتی (عومەر مستەفا (عومەر دەبابە) و عەلی عەسکری) لەلایەن مەلا مستەفاوە لە فەرماندەیی هێزی کاوە و خەبات لا بران و عەزیز عەقراوی و نووری مەلا مارفی لە شوێن دانان و زۆربەی فەرماندەی بەتالیۆن و لقەکانی پێشمەرگەشی ئالوگۆڕ کرد، واتە لە ڕووی عەسکەرییەوە بە کردەوە خۆی بۆ لێدانی سەرکردایەتی و دەزگاکانی پارتی ئامادە کرد.

پلنیۆمی پارتی لە ڕۆژی ٤-١٩٦٤/٤/٩ گیرا و بەیانی "اتفاقية المشير-بارزاني" (سلم ام استسلام) دەرچوو، بە مەبەستی ڕوونکردنەوە و ناردنی نوێنەریش بۆ لای بارزانی. کۆنگرەی بارزانییش ناسراو بە "کۆنگرەی سەنگەسەر" لە سەرەتای مانگی ١٩٦٤/٥دا بەسترا، بۆ مەبەستی دەرکردنی سکرتێر و زۆربەی ئەندامانی "م. س" و

سەرکردایەتیی پارتی کە ١٤ ئەندام بوون لە ١٩٦٤/٦/١٧ هێرش و پەلاماری بارزانی و عەشایەر و عەبدولسەلام عارف بۆ سەر سەرکردایەتی و بارەگای لق و لیژنە ناوچەکان دەستی پێ کرد و بڕیاری فەرهودکردنی هەر کەس گوێڕایەڵی بڕیارەکانی کۆنگرەی سەنگەسەر نەبوو؛ درا و داروودەستەی "م. س" تەفروتونا کران.

ئایا شۆڕشی کورد بەو هەنگاوە پەرەی سەند؟

ئایا بارزانی بەو هەنگاوە، خۆی و پارتە داتاشراوەکەی بەهێز کرد؟

ئایا سەرکردایەتی و "م. س" بە ملکەچنەبوونیان بۆ بڕیارەکانی ئەو گۆنگرەیە، بەهێزتر بوون؟

یان شۆڕشیان لە فەوتان ڕزگار کرد؟ یان دەستکەوتەکانی شۆڕشیان لە فەوتان ڕزگار کرد؟ یان پارتی و ڕێکخستن و پارتایەتییان لە گەندەڵبوون پاراست؟ یان تەنیا هەنگاوێک شۆڕشی کوردیان بۆ پێشەوە برد؟ با خوێنەر بڕیاری خۆی بدات...

## ئەڵقەی چوارەم

## شەست و شەش، لە منداڵدانی شەست و چواردا لەدایک بوو

لێدانی سەرکردایەتی و "م. س"ی پارتی لەلایەن بارزانییەوە بە هاوکاریی سوپا و چەک و تەقەمەنیی ڕژێمی عەبدولسەلام عارف و ئاوارەبوونی زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی و نزیکەی ٤٨٠ پێشمەرگە و کادر و ئەندام ناوچە لە سنووری ماوەتەوە بۆ دیوی ئێران و پاش تەقەللایەکی بێهوودەی گەڕانەوە بۆ کوردستانی خواروو لە مانگی ١٩٦٤/٨دا، بەچەککراوی ڕەهەندەی هەمەدان کران و نزیکەی ساڵێک لە ئێراندا مانەوە. ئەم ڕووداوە گەر لە ڕووی مێژووی خەباتی گەلی کورد لە شۆڕشی ئەیلوول و پاش شۆڕشی ئەیلوول و لە ڕووی ڕەوشتی کۆمەڵایەتییەوە هەڵسەنگێنرێ، دوو پرسیار و یەک ئەنجاممان دەدا بەدەستەوە:

١. جاشەتی، وشەی جاش لە چییەوە هاتووە و بە کێ دەوترا؟

٢. پەیوەندیی مەشرووع و نامەشرووعی پارت و لایەنەکانی گۆڕەپانی کوردستان لە شۆڕشی ئەیلوول و پاش شۆڕشی ئەیلوولیش سەرەتاکەی چۆن دەستی پێ کرد و پاشان بێشەرمانە بووە نەریت و بەشی هەرە گەورەی سیاسەتی سیاستمەدارانی

کوردستان؟ هەر لە شۆڕشی شێخ مەحموودی حەفیدەوە هەندێ کەس لە تایەفەکانی ناو عەشیرەتی هەمەوەند چەکی حکومەتیان وەرگرت و بوونە چەکداری کاتی دژی شۆڕشگێڕان و ناویان لێ نرا "غیر نظامی" و لەناو کوردیشدا بە جاش پۆلیس ناو بران، واتە جاشەتی لەوێوە هاتووە و بەو کەسانەشیان وتووە کە بە شێوەیەکی کاتی چەکیان بۆ دەوڵەت هەڵگرتووە دژی گەلەکەی خۆیان و بە پارەیەکی دیاریکراو. لەدوای بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلوول و بەتایبەت ساڵی ١٩٦٢دا، دیسانەوە سەرەتای دروستبوونی جاش لەناو هەمەوەندەوە سەری هەڵدا و مەحموودی فەقێ محەممەدی سەرەک عەشیرەتی هەمەوەند و بەشێکی زۆری تایەفەکەی چەکیان دژی شۆڕش هەڵگرت و ناوی جاشیان بەسەردا برا. بەڵام دوای ئەوە جاشەتی لە قاڵبی تاکی یا عەشرەتی دەرچوو، چووە قاڵبێکی زۆر فراوانتر و کاریگەرتر، چووە قاڵبی سیاسییەوە، چووە قاڵبی سەودا و سەوداکاری بە خواستی جەماوەری گەل و ئایندەی گەل و خوێنی شەهیدان و دەستکەوتەکانی گەل و شۆڕش لە پێناو سەپاندن و پاراستنی دەسەڵاتی تاک لایەنی و یا تاک حزبی.

جاشایەتی ناوێکی تری لەناو کورددا لە فەرهەنگی سیاسیدا بۆ داتاشرا و ناو نرا "ململانێ"، ململانێی بیروڕا، ململانێی بەرژەوەندی پاراستن، ململانێی سیاسی. ڕێوڕەسمی جاشەتییش لە قاڵبی تەسکیی ناوچەیی دەرچوو و خزایە ناو زەلکاوی بەکرێگیراوی دەوڵەتی، جێبەجێکردنی مەبەست و پاساوی گرتنەبەری هەموو ڕێگایەکی دایەوە. مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیی پارتی پێش هێرشی بارزانی و موشیر بۆ سەریان، هەنگاوی دروستکردنی پەیوەندیی خۆیان بە ئێرانەوە هەڵهێنا. "سەرهەنگ پژمان" سەرهەنگی ساواکیان بە خۆی و جیبێک و نەفەرێکی ترەوە بە ناوی "عەباس بێ سیم" هێنایە ماوەت و بەنهێنی بارەگایەکیان بۆ دانا و لە ڕێگەی پژمانەوە کەوتنە پەیوەندیکردن بە داموودەزگا دەوڵەتییەکانی ئێرانی شاوە. پاساوی ئەم کارەشیان بەوە دایەوە کە لانی کەم پەناگایەک مسۆگەر کەن لە کاتی هێرش و پەلاماری "موشیر-بارزانی"دا خۆیانی تیا بپارێزن. نامەوێ لێرەدا بکەومە درێژەی ئەو باسە کە لە کاتی هەڵاتن بۆ ئێران و چەککردنی ٤٨٠ چەکدار و شاربەدەرکردن تا هەمەدان و پاشان دەستبەسەرکردنی ئەو خەڵکە لە کارگەیەکی شقارتەی چۆڵکراودا، سەرکردایەتی

چۆن بەڵگە و پاساوی نابەجێیان بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری کادر و پێشمەرگەکان دەهێنایەوە، من خۆم یەکێک بووم لەوان، لەو کاتەوە سەرکردایەتیی پارتی باڵی "م. س" فێری سیاسەتی پشتبەستن بە دەوڵەتە داگیرکەرەکان بوون و بووش بە نەریتێکی سیاسی و ستراتیژێکی سیاسی بێکۆتایی. بارزانییش لەو کاتەوە کە ملی بۆ فەرمانی حاجی عەبدولسەلام دانەواند و داوای فڕێدانی چەک و چوونەوە سەر کار و کاسبی و پیشەی پێشوو و ناو ماڵ و منداڵی لە پێشمەرگە کرد، لە لایەکی تریشەوە خۆی بە هێزی عەشایەر و بە یارمەتیی ئەفسەرە کوردە هەڵاتووەکان؛ بەهێزتر و بەهێزتر دەکرد. لەو کاتەوە کە بێ بەدەستهێنانی هیچ دەستکەوتێکی نەتەوەیی یا گەلی یا جەماوەری، بێ جێبەجێکردنی بچووکترین داخوازی لە داخوازییەکانی شۆڕشی ئەیلوول لەلایەن موشیر عەبدولسەلامەوە، بڕوای بە خاوەن باوەڕ کرد و بووە هاوکار و پشتیوان و یارمەتیدەری حاجی عەبدولسەلام بۆ قایمکردنی پەلوپۆی دەوڵەتە لەرزۆکە تازە داسەپاوەکەی. لەو کاتەوە کە ئاڵای شەڕ و پەلاماردانی ئەندامانی سەرکردایەتی، ئەندام و پێشمەرگەکانی مەفرەزە سەرەتاییە دروستکەرەکانی شۆڕشی ئەیلوولی بەرز کردەوە، لەو کاتەوە کە خواستەکانی جەماوەر و شۆڕشی ئەیلوول و پاشان یەکیەتیی ڕیزەکانی گەل و پارتی کرایە قوربانیی پلانە دووقۆڵییەکەی موشیر-بارزانی. لەو کاتەوە کە بە زیلی عەسکەری حاجی موشیر بە سوپای دەوڵەتی عێراق و بە تۆپ و دەبابەی دەوڵەتی داگیرکەرەوە، هێرش و پەلاماری بردە سەر ئەوانەی تا دوێنێ پێشمەرگە و ئەندام و کادر و پشتوپەنا و فەرمان جێبەجێکەری بوون، لەو کاتەوە ئیتر بارزانی مستەفای سەرۆک و شێرپیاوی کورد و بەناو پارتی؛ ئاوێکی وای ڕژاند کە هەتا ئێستا و لەمەودواش دژەکانیش و پەیڕەوانیشی پێی لێ بخەن و بگرە پێشیشی بکەونەوە، لەو کاتەوە بارزانی مستەفا فتوای پەسەندکردنی جاشەتیی سیاسی و بەکرێگیراوی ئەم و ئەو دەوڵەتی دا. جاش هەموو دەستکەوتەکەی لەوە دا بوو کە مووچەیەکی دیاریکراوی مانگانەی بۆ دەبڕدرایەوە، یان لەگەڵیدا هەندێ دەستکەوتی ڕاووڕوتی خەڵکی بێدەسەڵاتیشی دەست دەکەوت، بەڵام جاشی سیاسی جگە لە دەستکەوتە ماددییەکەی کە بێسنوور و دیارینەکراوە، دەستکەوتی سیاسیی تەسک و پارت پەرستیشی هەیە. جاشی سادە زیانی تەنیا بە پێشمەرگەیەک یان

خەڵکی ناوچەیەکی تەسک و بچووک دەگەیاند، کەچی جاشی سیاسی نەک هەر زیانی بە گەل و چارەنووسی گەل و کەسایەتیی گەل گەیاند، بگرە دەستکەوت و خواست و ئارەزووەکانی ئەوسا و ئێستا و دواڕۆژی سەرجەم گەلی کوردستانی خستە ژێر پێ و مەترسیی لەناوچوون و لەباربردن. سەرگوزەشتەی هەمەدان و هەمەدانیان لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٦٥)ەوە بڕایەوە، مەبەستی ئێران لە داڵدەدانی سەرکردایەتی و لایەنگرانیان کە سەرنەگرتنی شەڕ وەستاندن و سەرقاڵکردنی دەوڵەتی عێراق بوو بە کێشەی ناوخۆییەوە بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوتەکانی خۆی هاتە دی و شەڕ لە کوردستان هەڵگیرسایەوە. ئێران دۆست یا داردەستێکی بەهێز و بەتواناتری لە سەرکردایەتی دەست کەوت، کە بارزانی بوو. پەیوەندی و دڵداریی نێوان بارزانی و ئێران توندوتۆڵتر و بەهێزتر و گەرمتر لە هیی سەرکردایەتی دروست بوو، مەلا مستەفا ناچار کرا بە لێخۆشبوون لە سەرکردایەتی و سەرکردەکانی و سەرکردەکانی کۆمەڵەکەش ناچار بە چۆڵکردنی ئێران و گەڕانەوە بۆ باوەشی باوکایەتیی بارزانی کرا.

بۆ بارزانییش دوو دەستکەوتی بەناو سیاسی مسۆگەر کرا:

١. بڕینی پەیوەندیی نێوان ئێران و سەرکردایەتی و پاشان بوونی خۆی بە تاکە باوەڕپێکراوی ئێران لە کوردستانی خوارووردا.

٢. گێڕانەوەی سەرکردایەتیی یاخیبوو بۆ ژێر باڵی خۆی و چاودێریی خۆی و پەڕوباڵکردنیان و مل پێ کەچکردنیان و پاشان لێدان و لەناوبردنی تاکە تاکەیان، هەروەک پێش گەڕانەوەی سەرکردایەتی کردی بەرامبەر بە کادر و ئەندامە پێشکەوتووەکانی لایەنگرانی سەرکردایەتی وەک عەلی حەمدی، مەحموود حاجی تۆفیق؛ لێپرسراو و ئەندامی لقی سلێمانی، فاتیح عەسکەری، عەباس، ئەمین ئەندامانی لیژنەی ناوچەی ڕانیە. ونکردن و لەناوبردنی چەندین ئەندامی لێوەشاوە و شۆڕشگێڕ لە ڕۆژە ڕەش و شووم و بەدناوەکانی "کانی ماسی"دا.

سەرکردایەتی گەڕانەوە، پەڕوباڵ کران و لایەنگرانیان پەرشوبڵاو کران و بەسەر بەرە جیاجیاکانی شەڕدا دابەش کران، خۆیشیان وەک دەستبەسەر لە دۆڵەڕەقەی ئاکۆیەتیدا لەژێر چاودێریی عەباس مامەند ئاغادا ناچار کران، بەڵام ئاو نەکرا بە

ئاگردا. ڕاونـان و پەلاماردانـی ئەندام و لایەنگرانی پارتی لەلایەن "پاراستن"ی بارزانییەوە، بێسەروبەری و بەرەڵایی ناو ڕیزەکانی پارتیی مەلا مستەفا، زۆر و ستەم و ڕاووڕوتیی فەرماندە و لێپرسراوانی بارزانی لە خەڵکی ناوچەکە، کارێکی وای کرد زەمینەی لەبار بۆ سەرکردایەتیی پەڕوباڵکراو دەسبەسەرکراو و ئیهمالکراو بێنێتە کایەوە و سوود لە نارەزایی ناو ڕیزەکانی پارتی و دانیشتووانی زۆر ناوچەی ستەملێکراویش وەربگرن و تۆڵەی تێکشکانی پێشوویان بە گرتنەبەری ڕێچکەی ئاوە ڕژاوەکەی بارزانی بکەنەوە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٥دا سەرکردایەتی بە یارمەتیی عەباس مامەند ئاغا لە دەستبەسەریی دۆڵە ڕەقە دەرباز بوون و ون بوون، خۆیان گەیاندە ناو شارەکان بەنهێنی و خۆیان شاردەوە. سەرەتای دووبارەبوونەوەی کارەساتی ١٩٦٤ لە مانگی ١٩٦٦/٢دا لە ناوچەی قەرەداغ و گەرمیان سەری هەڵدا، سێ لقی پێشمەرگە بە فەرمانی سەرکردایەتی خۆی حەشار دا و بە کارتێکەری لیژنەی ناوچەی قەزای سلێمانی سەر بە سەرکردایەتی لە دەسەڵاتی بارزانی هەڵگەڕانەوە و یەکەم بەتالیۆنی ٦٦ یان بە فەرماندەیەتیی (کەمال میران) ڕەئیس کەمال موفتی پێک هێنا. وردە وردە پەردە و تاریکایی لەسەر ڕاستیی مەسەلەکان هەڵدرایەوە. چیتر سەرکردایەتی نەیتوانی پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ ڕژێمەکەی عەبدولڕەحمان بەزاز بشارێتەوە، کار لە کار ترازا و ئەم جارە چەکدارەکانی سەرکردایەتی بە یارمەتی و پشتگیریی ڕژێمی عێراقی هێرشیان دەبردە سەر بنکە و بارەگاکانی بەرزانی لەگەڵ لەدایکبوونی شەست و شەش لە منداڵدانی شەست و چواردا زاراوەی شووم و نەفرەتی مێژوو لێ کراوی (جەلالی، مەلایی)یش خۆی خزاندە ناو فەرهەنگی سیاسیی کوردەوە. ڕووداوەکانی شەست و چوار لە شەست و شەشدا بە جۆرێکی تر دووپات بوونەوە، ئەم جارە جەلالی بوونە هاوکاری ڕژێمی عێراقی و مەلایی بوونە گرێدراوی ئێرانی، ڕۆژ بە ڕۆژ و مانگ بە مانگ جەلالی لەسەر کیسەی مەلایی بەهێزتر دەبوون و پەرەیان پتر دەسەند، تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی لە هێز و چەک و دەسەڵاتی ناوچەیی و جەماوەری خەڵکیدا وەک یەک و بەرامبەریان لێ هات. کورد بە کورد بەکوشتندان و ئاگری براکوژی پتر و پتر پەرەی سەند و برینەکان تا دەهات قووڵتر دەبوونەوە. کەرەستەی شەڕی نارەوا و ناڕاست و نەفرەتی مێژوو لێکراو کە ڕۆڵە دلێر و دڵساف و کوردپەروەرەکان بوون؛ زۆر

سەغبیانە لەناو دەبران، شۆڕشی ئەیلوول بەرەو لاوازی و لاوازتر دەچوو. ڕیزەکانی گەل پتر لێک دەترازان و قەبارەی بۆشاییان فراوانتر دەبوو، ئاسۆی بەدیهێنانی کەمترین خواستەکانی گەل و شۆڕش تاریکتر و نادیارتر دەبوو. دەوڵەتی داگیرکەر و دوژمنی سەرسەختی کورد تا دەهات خورتتر و بەهێزتر و چەسپاوتر و دامەزراوتر دەبوو. سوپای عێراقی تەماشاکەری گۆڕەپانی شەڕی براکوژی، حەساوەتر و بەهێزتر و بەتواناتر دەبوو. دەوڵەتە ئیقلیمییە داگیرکەرەکانی کوردستان و دژەکورد و کەیفیان سازتر و پلانەکانیان داڕێژراوتر و مەبەستە گڵاوەکانیان ئەنگێوتر دەبوو. زۆر زۆر ڕۆڵەی کورد کوژران، سەدان هەزاران لەناو چوون، سەدان و هەزاران هەتیو و پاشکەوتەی ئەو ڕووداوە بوون. دەیان و سەدان و هەزاران دوژمنایەتی خێزانی لەپاش بەجێ ما و چاوی دەیان و سەدان و هەزاران کەسی لاواز و بوودەڵە و نەفس نزمی کردەوە بۆ خۆفرۆشی. دەیان و سەدان بازرگانی شەڕی تیا دروست بوو لەسەر خوێنی هەردوو لا و لە هەردوو لاش، بەڵام نە جەلالی توانیی مەلایی لەناو بەرێ و نە مەلاییش توانیی جەلالی لەناو بەرێ، نە جەلالی توانیی شۆڕش بەهێزتر بکات و نە مەلایی، نە جەلالی توانیی لە پاداشتی ئەو کارەیدا بچووکترین دەستکەوت بۆ جەماوەری گەل بەدەست بێنێ و نە مەلایی. نە جەلالی توانیی ڕژێم ناچار بە ملدان بکات بۆ خواستەکانی شۆڕش و نە مەلایی، وە بە هەردووکیشیان نەک هەر نەیانتوانی پارتی و ڕیزەکانی پارتی بەهێز و داڕێژراوتر و پتەوتر بکەن، بەڵکە هێندەی تر جەستەی پارتییان داڕزاند، گەندەڵیان کرد، بێ ناوەڕۆکیان کرد، پارتییان لە حزبێکی سیاسیی دیموکراتیی شۆڕشگێڕ و نیشتمانپەروەرەوە کرد بە حزبێکی لەرزۆک و دکتاتۆر و دەزگایەکی جاسووسی بەسەر ئەندام و لایەنگر و دۆست و جەماوەری خۆیەوە. شێرپەنجەی مەلایی-جەلالی نەک هەر ڕەگوڕیشەی لە جەستەی کوردستانی خوارووددا داکوتا، بەڵکە تەشەنەی کردە جەستەی پارچەکانی تری کوردستان. کارەساتی جەلالی-مەلایی کوتەکی جەرگبڕی وەشاندە جەستەی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و لەژێر پاڵەپەستۆی ئەو کوردکوژییە دەستی مەلاییش چووە خوێنی بەناهەقی سەرکردایەتیی حزبی دیموکرات. هەر بە بیانووی جەلالی-مەلاییەوە، دەستی مەلایی چووە خوێنی شۆڕشگێڕەکانی کوردستانی تورکیا،

بەڵام ئایا ئەو هەموو ئەزموونە تاڵ تاوان ئامێزانە، ئەو هەموو کردارە نەفرەتلێکراوە بوو بە پەند و وانەیەکی ئەوتۆ کە جارێکی تر دووپات نەبنەوە؟

ئایا کورد و جەماوەری کورد و ڕۆڵەکانی کورد پەندیان لێ وەرگرت؟

ئایا سەران و سەرکردەکانی کورد وازیان لە بەقڕدانی کورد هێنا؟

ئایا عەقڵی عەشایەری شەستەکان زیندەبەچاڵ کرا؟

ئایا نەریتی ڕەدووکەوتن و حەقم چییە، وەل کرا؟

ئایا ویژدان و هەست و هۆشی کوردایەتی ڕاست جووڵا و ئازایانە و دوور لە بەرژەوەندیی خۆپەرستی، پەنجەی تاوان بۆ تاوانبار ئاماژە کرا؟

ئایا ڕۆشنبیران، نووسەران، مێژوونووسان، هونەرمەندان، ئەکتەران، شاعیرانی کورد؛ توانییان نواندنێکی (فلمێکی) ڕوون و ئاشکرای پڕ بە پێستی ئەو قۆناغە بۆ نەوەکانی داهاتووی کورد بێننە بەرهەم تا بۆ عیبرەت وەرگرتن و وەک وانەیەکی مێژوو؛ هەمیشە و هەمیشە لێبدرێتەوە، بخوێنرێتەوە، بەبیر بێتەوە؟

هیوادارم ئەڵقەکانی داهاتوو، وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە.

## ئەڵقەی پێنجەم

دوای ڕێککەوتنەکەی نێوان جەلالی و ڕژێم و شەڕوپێکدانەکەی نێوان مەلایی- جەلالی و شەڕەدەنووکێکی بێتامی نێوان ڕۆژنامەی "برایەتی" و "ڕووناکی" کە لە مانگی ٢ تاکوو مانگی ٧ی خایاند، لە ناوەڕاستی مانگی (١٩٦٦/٧)ەوە بەرەکانی شەڕی براکوژی بەرەو خاوبوونەوە و بارودۆخێکی نە شەڕ و نە ئاشتی ڕۆیشت. شەڕی هەندرێن کە لە ١٩٦٦/٤/٢٨ تاوەکوو ١٩٦٦/٥/١٨ بەردەوام بوو و بە گەورەترین شەڕی ڕووبەڕووی ئەیلوول تا ئەو کاتە بەناوبانگ بوو کە پتر لە ١٧٠٠ پێشمەرگە بەشدار بوو بەرامبەر بە گەورەترین هێز و سوپای ڕژێمی عێراقی کە تا ئەو کاتە بێوێنە بووە لە شەڕی کوردستانی خوارووردا، تێشکانی سوپای ڕژێم لەو شەڕەدا کەشوهەوای گفتوگۆی هێنایە کایەوە، بەڵام شەڕی هەندرێن یەکەم و دوا هۆی دەستپێکردنی گفتوگۆ نەبوو، بەڵکە خاڵی وەرچەرخانی کەڵەکەبوونی هۆکارەکانی ئەو گۆڕانە بوو.

١. ڕژێمی عەبدولسەلام و عەبدولڕەحمان عارف لەوە گەیشتن کە بە پشتیوانیی

جەلالی، نە دەتوانین مەلایی لەناو بەرن و نە لە کێشەی کوردیش دەرباز دەبن.

٢. ئەو بەرنامەی (٨) مادەیەی کە لەگەڵ جەلالی لەسەری ڕێک کەوتبوون بە زیادکردنی بۆ (١٢) مادە لەلایەن مەلاییەوە، خۆیان پێ لەو کێشە گەورەیە دەرباز دەکرد.

٣. مەلایی لەوە زیاتر توانای شەڕی دوولایان نەمابوو، هەم لە ڕووی کەرەستەی شەڕ و هەم لە ڕووی مەعنەوییشەوە.

٤. بۆ دەستبەتاڵبوون بۆ لێدانی جەلالی یان لانی کەم سووککردنی جەلالی، هەم لای ڕژێم کە بە مەلایی نەبێ کێشەی کورد چار ناکرێ و هەم لای جەماوەریش کە جەلالی توانای چارەسەرکردنی کێشەی کوردی نییە.

٥. بۆ لابەلاکردنی کێشەی نێوان سەرانی مەلایی لەمەڕ گفتوگۆ و دیسان کێشەی نێوان سەرانی ڕژێم لەسەر گفتوگۆ لە کەشوهەوایەکی ئارامدا. بۆ سەلماندنی ئەم خاڵەشیان:

ا. نموونەی دەربڕینەکەی عەبدولڕەحمان بەزازی سەرەکوەزیران کە لە ١٩٦٦/٧/١٣ بۆ نوێنەرانی مەلایی دەربڕیبوو: "ئێمە و سوپا ناکۆکیمان هەیە لەسەر چارەسەری کێشەی کورد و سوپا ئامادە نییە چارەسەری کێشەی کورد لە چوارچێوەی ئۆتۆنۆمیدا بکرێ."

ب. جیاوازیی بیروڕای سەرانی مەلایی کە لە لایەکەوە "حەبیب محەممەد کەریم بۆ کریس کۆچێرای دەربڕیبوو کە دەستپێکردنی گفتوگۆ بە قازانجیان بووە، لەبەر ئەوەی ١٤ی مانگ لە شەڕدا بوون و کەرەسەی شەڕیان لە تەواوبووندا بووە"، بەلام دکتۆر محەممەد لە ساڵی ١٩٧٥دا دەریبڕیبوو کە "ئەو گفتوگۆیە لەلایەن بارزانی خۆیەوە کرا و ئەو کاتە ڕاگرتنی شەڕ بە زیانی ئێمە بوو، چونکە دەمانتوانی لەوە زۆر زیاتر پێ لەسەر داواکارییەکانمان ڕاگرین". لە کۆتایی ئەڵقەی پێشوودا هەندێ پرسیارمان دانابوو کە ئەم ئەڵقەیە وەلامیان بداتەوە، لە گفتوگۆی نێوان جەلالی-ڕژێم و مەلایی-ڕژێم لە ساڵی ١٩٦٦دا دەبووایە هەردوو لای خۆ بە شۆڕشگێڕزانی کورد (جەلالی و مەلایی) ئەو هەلەیان لەدەست نەدایە و بە گیانی هەست بە لێپرسراوییەوە بۆ بەرژەوەندیی گشتی؛ هەردوو هێزە زلەکەی خۆیان یەک پێ بگرتایە و کێشەی

تایبەتی و ململانێی دەسەڵات پەرستییان تورِ هەڵدایە.

بە گرتنەبەری ئەو ڕاستییە، دەیانتوانی نە ١٢ مادەی گەندەڵ و نەسەلمێنراو داوا کەن، بەڵکە لانی زۆریی داواکارییەکانی شۆڕشی ئەیلوول و گەلی کوردیان بەدەست بهێنایە، لەبەر ئەو دوو هۆیە سەرەکییە:

١. بەرەی شۆڕش بە یەکگرتنەوەی ئەو دوو لایەنە زۆر بەهێز و یەکگرتوو دەبوو و توانای بەرگریکردنی زۆرتر دەبوو بۆ سەپاندنی خواستی زیاتر بەسەر ڕژێمدا.

٢. ڕژێم لە قەیرانێکی سیاسیی سەختدا بوو سەبارەت بە سووتان و نەمانی عەبدولسەلام عارف و هاتنی عەبدولڕەحمان عارف بۆ سەر حوکم کە پیاوێکی کەم توانا و دەسەڵات بوو لە مەیدانی بەڕێوەبردنی حوکمڕانیدا، وە ڕژێمی عێراقیش دوچاری ناکۆکیی ناوخۆ کردبوو. لایەنگرانی عەبدولڕەحمان عارف لە سەرکردە سوپاییە مەسلەکییەکانی کۆنی ناو سوپا بەرەیەک بوون، وە دژەکانی عەبدولڕەحمان عارفیش لە دەرەجەدارە لاوە تازەپێگەیشتووەکان لە بەرەیەکی تر، بەتایبەتی بەعسییەکان و لایەنگرانیان، بەڵام بە پێچەوانەی لۆجیک، لە ماوەی گفتوگۆی مەلایی-ڕژێمدا، جەلالییەکان هەموو توانای خۆیان تەرخان کردبوو بۆ پتر کۆکردنەوەی خەڵکی لەدەوری خۆیان و پڕوپاگەندەکردن دژی ڕێککەوتنەکەی نێوان ڕژێم-مەلایی. لەولاشەوە مەلاییەکان ڕاگرتنی شەڕیان لەگەڵ ڕژێمدا بەکار هێنا بۆ لێدانی جەلالییەکان و تەقەللادان بۆ لاوازکردنیان و پڕوپاگەندە بڵاو کردنەوە و ناو و ناتۆرەی سووک و دژیان بۆ دابڕانی لایەنگرانی جەلالی.

هەردوو لایان کێشەی سەرەکی و ململانێی سەرەکییان بەلاوە نابوو، جەلالییەکان ڕژێمیان بە ناکۆکیی لاوەکی و مەلاییان بە سەرەکی دەزانی، تا ئەو ڕادەیەی کە لە زۆر ناوچەدا لەبریی سوپای عێراقی؛ پاراستنی ناوچەکانیان بەئەستۆ گرتبوو، هاوپەیمانییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ ڕژێمدا هەبوو، دەتگوت ڕژێمی عێراقی؛ کوردستانی ئۆتۆنۆمیی بە جەلالییەکان داوە و مەلاییەکان دەیانەوێ هەڵیوەشێننەوە. مەلاییەکانیش ڕێباز و پلانی دوو سەرەیان بەکار دێنا، لە لایەکەوە دەستیان لە لامەرکەزی و ئۆتۆنۆمی هەڵگرتبوو و بە شێوەیەکی کاتی بۆ لەناوبردنی جەلالی بە کەمترین دەستکەوت قایل بوون کە ئەمانەی خوارەوە داواکانیان بوو:

ا. لێخۆشبوونی گشتی.

ب. زمانی کوردی ڕەسمی بێ لە قوتابخانە و ئیداراتی دەوڵەت لە شمالی عێراقدا.

ج. بژاردنەوەی زیانی خەڵکی.

د. بڕینەوەی تەقاعدی بۆ خێزانی شەهیدان.

هـ. یارمەتیدانی ئەو پێشمەرگانەی کە چەک دادەنێن تا دۆزینەوەی ئیشوکار بۆیان.

و. وەرگرتنەوەی خوێندکاران لەو پۆلانەی کە پێش چەکهەڵگرتن تیای بوون.

ز. دیاریکردنی ڕێژەی کورد لە بەشداریکردن لە حکومەتی ناوەندیدا.

ح. ئازادکردنی بەندەکان کە بە هۆی ڕووداوی ژووروووەوە گیران.

ت. یاساییکردنی کاری ئازادی پارتی دیموکراتی کوردستان.

ک. ژمارەیەک لە هێزی چەکدار کە هەم مەلایی و هەم ڕژێم لەسەری ڕێک بکەون، بکرێتە هێزێکی ڕەسمیی چەکدار و پاراستنی ناوچە سنوورییەکان بەوان بسپێردرێ بە ناوی "هێزی دەرەک"ەوە.

ل. لە دەستووری هەمیشەیی و یاسایی ئەساسیدا دان بە مافی کورددا بنرێ لە چوارچێوەی عێراقێکی یەک و یەکگرتوودا.

م. پارێزگایەکی تر پێک بهێنرێت بە ناوی پارێزگای دهۆک و بەشێکی ئەو گوند و ناحیە و قەزایانەی سەر بە پارێزگای موسڵی بخرێتە سەر، لە لایەکی تریشەوە خۆیان و بنکەکانیان بە چەک و تفاقی شەڕی یارمەتیی شای ئێران بەهێزتر دەکرد و تا دەهات دەسەڵاتی ساواکی ئێرانی زۆرتر و بڵاوتر و فراوانتر و بەهێزتر دەبوو لەناو مەلایی و ناوچەکانی مەلاییدا.

مەلاییەکان وا بۆ مەسەلەکە دەچوون کە بۆ لێدان و لەناوبردنی جەلالی، پێویستە هەموو شتێ بکەن و هەموو ڕێگایەک بگرنە بەر.

١. زۆر ڕاست و کوردایەتییشە گەر واز لە ڕژێم بێنن و بە ناکۆکی لاوەکیی بزانن بۆ لێدانی ناکۆکیی سەرەکییان کە جەلالییە.

٢. زۆر ڕەوا و ڕاستە خۆیان تەسلیمی شای ئێران بکەن لە پێناو خۆبەهێزکردندا. گەر ئەو خۆتەسلیمکردنە بە کوشتن و بڕینی سەری سەرکردە و کادرانی حزبی

دیموکراتی ئێرانیش تەواو ببێت، هەروەک لە مانگی مایسی ١٩٦٨دا هەندێک لە سەرانی حزبی دیموکراتی گرت و کوشت و تەسلیم بە شای ئێرانی کردنەوە.

قونەشەڕ و نیوەشەڕ و نە شەڕ و نە ئاشتیی نێوان ڕژێمی عارف و مەلایی تا شەڕی جوولەکە لە حوزەیرانی ١٩٦٧ کە بە شەڕی (٦) ڕۆژە ناسراوە درێژەی کێشا، بەڵام لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕی ئیسرائیل و عەرەب، دیسان شەڕی مەلایی و ڕژێمیش دەستی پێ کردەوە، لەبەر دوو هۆ:

١. مەلایی کە بەکرێگیراوی ئێران بوو و ئێرانیش ئەڵقەلەگوێی ئەمەریکا بوو، ئەمەریکاش دروستکەر و پاسەوان و پارێزەری ئیسرائیل بوو، پێیان باش بوو کە شەڕی مەلایی و ڕژێم دروست بێتەوە تا لانی کەم بەشێک لە هێزی عەرەبی کە عێراقە، لەو شەڕەدا بەشدار نەبێ و بە شەڕی ناوخۆوە خەریک بێت.

٢. ڕژێمی عێراقیش بۆ خۆدزینەوە لە "اجماعی عربی" و بەتووشەوەنەبوونی شەڕی ئیسرائیل لە هەموو بەڵێنەکانی خۆی بەرامبەر ١٢ بەندەکە؛ کەوتە پاشەکشە و شەڕفرۆشتن، تا بە بیانووی خەریکبوونی بە شەڕی ناوخۆیی عێراقەوە، خۆی هەم لە شەڕی جوولەکە و هەم لە سەرکۆنەکردن و ڕەخنە و پلاری دەوڵەتە عەرەبییەکانیش بپارێزێ.

شەڕی سێ قۆڵیی جەلالی-ڕژێم-مەلایی دەستی پێ کردەوە، دیسانەوە عارف و بەزاز کەوتنەوە پێشاندانی ڕووی خۆش بە جەلالی و درێژەپێدانی بەناو گفتوگۆ لەسەر جێبەجێکردنی ١٢ بەندەکە و لەگەڵیاندا کردنەوەی دانشگایەک لە کوردستان و دامەزراندنی "مجمع العلمی الکردی".

لە ڕاستیدا جەلالی لە زۆربەی هەرە زۆری شارە گەورە و بچووکەکانی کوردستانی خواروو بە پراکتیک دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوا بوون تا کودەتای بەعسییان لە ١٧ی تەممووزی ١٩٦٨ کە جارێکی تر کەشوهەواری گفتوگۆی نێوان مەلایی و بەعسییان هەڵیکردەوە، بەڵام ئەم جارەیان بە خۆدزینەوە لە شەڕی یەکتری کردن.

بارزانی لە دوو سەرەوە نەیدەویست لەگەڵ بەعسییاندا بەڕاستی ڕێک کەوێ:

١. پشتوپەنایەکی بەهێزی هەبوو کە دەوڵەتی ئێران بوو کە زۆر بەسەخاوەتەوە یارمەتیی بارزانی دەدا بە چەک و پارە تفاقی شەڕ و لۆجستیکی، ئەویش بەهیوای

ئەوەی کە بەهێزبوونی بارزانی ببێتە هۆی لاوازبوونی ڕژێمی عێراقی و سەر بۆ داخوازییەکانی ئێران لە کەنداوی عەرەبیدا شۆڕ بکات.

٢. پشتگوێخستنی گەورەترین داوای بارزانی کە چەککردنی جەلالییەکان بوو لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە.

بەڵام داوا و پاڵەپەستۆی دەرەوە بەتایبەتی دەوڵەتە عەرەبییەکان و یەکێتیی سۆڤیەت لەسەر بارزانی بۆ گفتوگۆ لەگەڵ بەعسییان جارێکی تر هەلێکی تری نە شەڕ و نە ئاشتی بۆ مەلایی ڕژێم ڕەخساندەوە، تاکوو مانگی ١٩٦٨/١٢ کە باڵی شەڕ لە هەردوو لا زاڵ بوو بەسەر نە شەڕ نە ئاشتیدا. دەستپێکردنەوەی شەڕی نێوان مەلایی-ڕژێم، ئەم جارە بە تینوتاوێکی ئێجگار توندتر لە پێشوو، بەتایبەتی بە هۆی دەسەڵات فراوانیی جەلالییەوە لە هەموو ڕوویەکەوە دەستی پێ کردەوە. لە لایەکەوە ڕژێمی بەعسییان و جەلالی بە هەموو توانایانەوە تەقەللای دەرپەڕاندنی مەلاییان دەدا و زۆربەی ناوچەکەیان پێ چۆڵ دەکردن، لە لایەکی تریشەوە مەلاییەکان شێوەی شەڕیان گۆری بە یارمەتیی لۆجستیکی زۆر فراوانی ئێرانی، لە شەڕی بەرەییەوە بۆ شەڕی پارتیزانی و زیانگەیاندن بە دەزگا ئابوورییەکانی عێراقی لە قووڵایی کوردستاندا، بەناوبانگترین شەڕی لێدانی ئابووریی عێراق؛ هێرشەکەی مانگی ١٩٦٩/٢بوو بۆ سەر کانە نەوتەکانی کەرکووک. بۆ مێژوو ڕاستییەک دەخەمە ڕوو کە ئەویش هەستکردنی بەشێک لە ڕۆشنبیرانی کورد بوو لە شارەکانی سلێمانی، هەولێر، کەرکووک کە زۆربەشیان ئەندام و لایەنگری جەلالی بوون لە ڕووکەشدا و بەڵام سەرەتای خۆپەروەردەکردنیان بوو بە بیربۆچوونی "چەپ" کە نامەوێ لێرەدا بەدرێژی باسی بکەم، بە بەرپرسییاریان بەرامبەر گەل و نەتەوە و کوردستان، وە هەستانیان بە تەقەللایەکی خێرخوازانە و نیشتمانپەروەرانە بۆ لێکنزیککردنەوە و یەکپێگرتنەوەی دوو زلهێزەکەی ئەوسای کورد (جەلالی، مەلایی)، ئەو تەقەللایەش بریتی بوو لە دانی ڕاپۆرتێکی دوورودرێژ لە شێوەی (ڕوونکردنەوە – سەرزەنشت – داواکاری - تکاکردن) بە هەردوو سەرکردایەتیی مەلایی و جەلالی، بەڵام کێ گوێ بۆ لۆجیک دەگرێ؟ سەرئەنجامەکەی ئەوە بوو کە لە هەردوو لاوە تاوانبار کران، لە جەلالییەوە بە چەپرەو (تکتل چی) و لە مەلاییشەوە بە دەمڕووت و پلانچییەکانی

(٦٦). برینەکانی شەڕ هێندە قووڵ و بەربڵاو بووبوون، بە هیچ ڕێگەیەک سارێژ نەدەکران. نیشتمانپەروەرە هەرە دڵسۆز و تێکۆشەرەکانی جەلالی و مەلایی هێندە بەقووڵی کەوتبوونە ناو سیاسەتی کورد بە کورد بەکوشتدان، هێز نەبوو پەشیمانیان کاتەوە، ئەو کاتەش جگە لە حزبی شیوعی؛ هیچ هێز و لایەن و پارتێکی تر نەبوو ببێتە ناوبژیکەر و حزبی شیوعییش خۆی بووبوو بە ژێردەستە ژێرچەپۆکەی مەلایی و چاوەڕوانی دەست و ڕەحمەتی ئەوان بوون پەنایان بدەن و بیانژیەنن، نقیەیان لێوە نەدەهات، تا شەقی زەمانە هات و یەکەم جار جەلالیی بۆ دواجار هەڵتەکاند و پاشانیش مەلایی وەک قەبارە و ناوبانگ هەڵوەشاند و بۆ ماوەی نزیکەی حەوت ساڵ کورد لە شێرپەنجەی براکوژی ڕزگار بوو. لە ناوەڕاستی مانگی (١٩٦٩/١٢)وە ڕژێمی بەعسییان هەستیان بەوە کرد کە بە ڕێگەی زەبروزەنگ و هێرش و پەلامار ناتوانن مەلایی لەناو بەرن و یارمەتی و پشتگیریی جەلالییش دادیان نادات و کێشەی نێوان عێراق و ئێرانیش قووڵتر و سەختتر و توندوتیژتر دەبێت کە ڕەنگە بگاتە ڕادەی هەڵگیرسانی شەڕی نێوانیان، بۆیە ملیان بۆ گفتوگۆ دا و لە ١٩٦٩/١٢/٢١دا نوێنەرانی ڕژێم و مەلایی پێکەوە کەوتنە گفتوگۆوە ململانێی دانوستاندن لە نێوانیاندا تا ١٩٧٠/٣/١١ درێژەی کێشا و ئەنجام بە بەیانێک لەلایەن ڕژێمەوە ڕۆژی ١١ی ئازار بووە ڕۆژی دانپێدانانی ڕژێمی عێراقی بە مافی ئۆتۆنۆمیی کوردستانی عێراق. وەستاندنی شەڕ ئەم جارە بۆ یەکەم جار ٤ ساڵی تەواوی خایاند، بەڵام چوار ساڵی هێمن ئارام و پڕ لە ڕووداوی گەورە و وەرچەرخانی مەسەلەی کورد لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر.

**لایەنە باشەکانی ئەمانە بوون:**

١. ئاو کرا بە ئاگری شەڕی جەلالی و مەلایی و کورد بە کورد بەکوشتدان.

٢. جارێکی تر ڕیزەکانی گەل یەکیان گرتەوە و یەکیەتیی گەل بووە باشترین ئامێری پێداگرتن لەسەر داواکارییەکان و ناوەرۆکی ئۆتۆنۆمی.

٣. ڕیفێژینستی عێراقی بەرەو وەتەقەکەوتن و پاشان بەرەی دژ بە گەل برد.

٤. ناوکی ڕێکخراوێکی نیمچەچەپ و پێشکەوتووخواز و شۆڕشگێڕی تیا لەدایک

بوو کە کۆمەڵەی مارکس-لینینی کوردستان و پاشان کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو، کە لە ئایندەدا بووە ناوکی شۆڕشی حوزەیرانی ١٩٧٦ی پاش ئاشبەتاڵ.

٥. کێشەی کورد لە قاڵبی تەسکی ناوچەیی و قۆزاغەی داخراوی عێراقی و قەپێلکی کێشەی ناوخۆیی دەرچوو کەوتە سەر ئاستی خۆتێوەردانی دەوڵەتانی دراوسێ و دەسەڵاتدارانی جیهانی.

٦. کولتووری کوردی لەو ماوەیەدا گەشەیەکی زۆری بەخۆیەوە بینی.

لایەنە خراپەکانی ئەو قۆناغە نوێیەش ئەمانە بوون:

١. دیسانەوە دەسەڵاتی تاک حزبی و تاک فەرماندەیی و دیکتاتۆری تاکی خاوەن بێ چۆن و بۆچی باڵی کێشایەوە بەسەر شۆڕشی کوردستان و مەسەلەی کورددا.

٢. کێشەی کورد لە چوارچێوەی دەسەڵات و ئیدارە و توانا و بڕوا و بەڕێوەبەرایەتیی خۆی دەرچوو و بەتەواوی کەوتە ناو جوغزی گەمەی دەوڵەتانی ئێران، تورکیا، ئیسرائیل، ئەمەریکا، سۆڤیەتەوە بە شێوەی سەرەکی و چەند دەوڵەتێکی عەرەبی و ئەورووپیی تریشەوە بە شێوەی لاوەکی.

٣. پارتی و بارزانی بوونە ئامێرێکی بێ چەندوچوونی دەستی ئەو دەوڵەتانە و بەکارهێنانیان بەپێی کات و سات و بەرژەوەندییان.

٤. چوار ساڵی شەڕ وەستاندن، چوار ساڵی پلانی درێژخایەنی بەعسییان بوو بۆ پێکهێنان و دانانی گەرای تابوری پێنجەم لەناو دەروونی شۆڕش و پارتی و هێزی پێشمەرگەدا لە لایەک، لە لایەکی تریشەوە دانانی گەرای بەعسیەتی لەناو جەماوەری شار و لادێی کوردستاندا و گێڕانی چەندین پلانی پێکەوەبەستراو بۆ هەڵتەکاندنی شۆڕش و یان لانی کەم گەندەڵکردنی لە ناوەڕۆکدا.

٥. درێژەکێشانی گفتوگۆ بۆ چوار ساڵ و بێ ئەوەی یەک هەنگاوی دامەزراندنی ئۆتۆنۆمیی تیا بنرێ، هەلێکی زۆری لەکیس کورد و شۆڕش دا بۆ سازدانی جەماوەر و ڕێکخستنی جەماوەر و چەسپاندنی بنچینەی ئۆتۆنۆمی لەناو جەماوەردا.

٦. چوار ساڵ بەرەڵایی و نەمانی دیسپلین و پاشاگەردانیی ناو هێزەکانی شۆڕش و پارتی و حوکمی نانیشتمانپەروەریانەی پاراستن و هەلپەرستیی بێئەندازە و

بێسنووری بەرپرس و فەرماندە و لێپرسراوانی سیاسی و عەسکەریی پارتی بۆ خۆدەوڵەمەندکردن و بوون بە بازرگانیی شەڕ و دەستبەسەرداگرتنی موڵک و ماڵ و سامانی زۆر کەسی بێتاوان، تۆوی نائومێدی و ڕەشبینی لە بیر و دەروون و بڕوای زۆربەی خەڵکی کوردستاندا چاند.

٧. چوار ساڵ پارتی، بەعسی خاووخەلێچک و بێتوانا و بێئەزموونی گەیاندە باشترین ڕادەی دەسەڵاتداری و بەخۆداچوونەوە و خۆبەهێزکردن و توندوتۆڵکردنی پەیوەندیی نێودەوڵەتی.

٨. بە بیانووی پاراستنی پیرۆزیی پەیمانی شەڕ ڕاگرتنەوە، لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا بەعس کەوتنە "بەعەرەبکردن"ی بەشێکی زۆری ناوچەکانی خانەقین و سەنگاو و کفری و دووز و تەنانەت دەورووبەر و ناو کەرکووکیش، شۆڕش بەرهەڵستییەکی نەکرد.

ئەنجامی چوار ساڵ چاوەڕێکردنی بەهیوای چارەسەری کێشەی کورد بە دەستپێکردنەوەی شەڕ کۆتایی هات کە لە ڕاستیدا گەلێ هۆکاری ناوەکی و دەرەکی هەبوون کە زۆر کاریگەر بوون لە دروستبوونەوەی شەڕدا و ئێرە جێگەی باسکردنیان نییە. شەڕبوونەوەکانی ساڵی ١٩٧٤ کە بۆ ماوەی یەک ساڵی خایاند، جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ هەموو شەڕبوونەوەکانی پێشوو و پاش ئەوەش تا کۆڕەوی بەکۆمەڵەی ساڵی ١٩٩١. ئەم جارە شەڕی نێوان پارتی و ڕژێم نەبوو! شەڕی نێوان هەموو جەماوەری کوردستان و ڕژێم بوو، جگە لەو جاشانەی کە بە ناوی حزبۆکە و میزبۆکەی لایەنگرانی ئۆتۆنۆمییە داتاشراوەکەی سەدام حسێنەوە لەگەڵ ڕژێمدا بوون وە تەحریفیەتی عێراقیش بەناو حزبی شیوعیی عێراقی کە ئالای لایەنگری ڕژێمی "بەعسی عەرەبی ئیشتراکی زۆر نیشتمانپەروەری هاوپەیمانیی یەکیەتیی سۆڤیەت"یان بەرز کردەوە و کەوتنە ناوچاڵی تاوان و زەلکاوی جاشایەتیی ڕژێمەوە. دەستپێکردنەوەی شەڕ ئەم جارە زۆربەی هەرە زۆری دانیشتووانی شار و شارۆچکەکانی کوردستان بەشدارییان تێدا کرد، سەدان هەزار چەکدار دروست بوون، سەرجەمی خوێندکارانی ناوەندی و دواناوەندی و پەیمانگاکان و زانکۆکان و پتر لە ڕێژەی ٩٠٪ی هەموو ڕۆشنبیران و خوێندەواران بەشدار بوون، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو شۆڕشگێڕە

زۆرەش، لەگەڵ بوونی سەدان هەزار چەکدار و سەدان هەزار چەک، سەدان چەکی قورسی و مەلایین دینار و سەدان هەزار تەن ئازووقە و مەلایین فیشەک؛ شەڕ تەنها یەک ساڵی خایاند. تەواوبوونی شەڕ ئەم جارە بەدەر لە هەموو جارەکانی پێشوو کە بە دەستپێکردنی گفتوگۆوە بوو، بێ گفتوگۆ، بێ تێشکانی پێشمەرگان، بێ ڕەزامەندیی هەموو هێزی چەکدار و جەماوەر، شەڕ بە یەک بانگەوازی سەرۆکی کورد؛ بارزانی "ئاشبەتاڵ" تەواو بوو. شۆڕشی ئەیلوول کە لە (١٩٦١)ەوە ئاڵاکەی بەرز بۆوە، لە ١٩٧٥دا ئاڵاکەی داگیرایە خوارەوە. ئەو شۆڕشەی کە لە ئەیلوولەوە کڵپەی سەند، لە مارتدا ژیلەمۆکەشی کوژایەوە و شۆڕشی ئەیلوول دوای تەمەنی ١٤ ساڵی پڕ لە خەبات و قوربانی و قارەمانێتی و گێرمەوکێشە و چاکە و خراپە و هەڵسانەوە و نوچدان و دوا لاپەڕەی مێژووی خۆی، نەک بە مۆری سەرکەوتن، بەڵکە بە مۆری ئاشبەتاڵ مۆر کرد و تەلیسمی شێرەپیاوی و سەرکردەیی و پاڵەوانێتیی بارزانییشی بۆ دواجار لەگەڵ خۆیدا هەڵدایەوە.

## ئەڵقەی شەشەم

به ئاشبەتاڵیش بەر بینگی شۆڕشی کوردستانی خواروو لە چنگی شێرپەنجەی شەڕی کورد و کورد دەرباز نەبوو. ئاشبەتاڵ کرا لە شۆڕشی ئەیلوول، دەیان هەزار چەکی جۆراوجۆری سووک و مامناوەندی وەک لیژنەدار لەبەردەم چەندین ڕەبایە و سەربازگەی بچووک و گەورەی ڕژێمی عێراقی داگیرکەردا هەڵدرایەوە و کەڵەکە کرا، دەیان هەزار پێشمەرگەی قارەمان و نەشکاوی مەیدانی شەڕ لە سایەی شکستی سیاسی و بێورەیی سەرکردەکانیان خۆیان تەسلیم بە ڕژێم کردەوە، بە جۆرێک کە سەدان لۆریی زیلی سەربازیی ئاخنراو لە پێشمەرگەی چەکدانەر بە یەک سەربازی بێئەزموونی شەڕەوە بەرەو شارەکان و سەربازگەکان دەبران و پاش ناونووسکردن و لێکۆڵینەوەیەکی ورد بەرەڵا دەکران و دەگەڕانەوە شوێن و جێگە و ڕێگەی ئاسایی خۆیان. هەر بابای دەروونپیس و نزم و سووک بوو پێشبڕکەیان لەسەر دزین و تاڵانکردنی کۆگا لیپاولیپ ئاخنراوەکانی شۆڕش دەکرد. دەیان و بگرە سەدان پێشمەرگەی دووربین و شۆڕشگێڕ و عاشقی کورد و کوردستان و شۆڕش

چەکەکانیان لە گەورە لاتەریکەکانی سەرەڕێی دەسەڵاتدارانی ڕژێم و لەناو کەڵەکە بەردەکانی گوندەکان و شوورەی باخ و ڕەزەکان و ئەشکەوتە لاچەپەکاندا دەشاردەوە (ماڵی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش). دەیان پێشمەرگەی قارەمان و تا تەوقی سەر عاشقی کوردایەتی خۆکوژییان کرد و بە شەرمەزارییەکی بێوێنەیان دەزانی تەسلیم بە ڕژێم ببنەوە. دەیان هەزار پێشمەرگە و کوردی بێچارە و ماڵ و مناڵ و ژن و پیاو ئاوارەی ئێران بوون و کەوتنە بەر ڕەحمەتی نامرۆڤانەی شاهەنشاهی و ناو ژیانی کولەمەرگی. هەر چی ناوچەی ڕزگارکراو بوو کە لە ماوەی ١٤ ساڵدا بە خوێنی هەزاران پێشمەرگە ئازاد کرابوون، بە بانگەوازێکی بێشەرمانە کەوتنەوە ژێر دەسەڵاتی ڕژێم. چەندین لێپرسراوی ترسنۆک و بێ بیروڕا و بێبار بە دەستی پێشمەرگەکانی مەفرەزەکانی خۆیان کوژران، کە داوای بەرگری و مانەوەیان لێ کردبوون و نەیانکردبوو.

دەیان سەرکردە و سیاسەتمەداری ئەوسای کورد بە سەری شۆڕ و بەڵام بە تەڕنەبوونی، بوونە میوانی خێر و نیعمەت پێبەخشراوی ساواکی ئێرانی و سەرانی حوکمبەدەستی ئێرانی. ١٤ ساڵ شۆڕشی کورد ژانی گرت، تەنیا دوو ڕۆڵەی لەپاش بەجێ ما:

١. مێژوویەکی پڕ لە سەروەری و شانازیی خەباتی گەلێکی سێ چوار ملیۆنی بەرامبەر دەوڵەتێکی دەسەڵاتداری دیکتاتۆر و عەسکەرتاری کە ئەمەیان ڕۆڵە ڕەسەنەکەی بوو.

٢. ئاشبەتاڵێکی کتوپڕی سەرکردایەتییەکی تێشکاوی سیاسیی خۆڕانەگر لەبەردەم گەردەلوولی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا، ئەمەشیان ڕۆڵە نارەسەنەکەی بوو. بەڵام دەبێ کێ خۆی بە بەرپرسی ئەو ڕووداوە بزانێ؟ دەبێ گەل و شۆڕش و مێژووی ئەو ١٤ ساڵە وەڵامەکەی لە کێ وەربگرێتەوە، وەک شاعیرێکی کورد لە ساڵی ١٩٦٤دا ئەو پێشبینییەی کرد و دوو دێڕی یەکەمی دەڵێ:

گریمان هەموو چەکمان داماڵی
دەنگی جاڕ هەڵسا بە ئاشبەتاڵی
داخۆ وەڵامی پرسیاری بۆچی
سەنگی چەندێ بێ بۆ کوڵی چەرچی؟

ڕژێمی عێراقی و بەتایبەتی سەدامی دیکتاتۆر وای زانی لانی کەم بۆ دە ساڵێکی تر، کورد دەستەمۆ دەبێ، تا دە ساڵی تر چەکداری کورد و پێشمەرگە پەیدا نابێتەوە، تا دە ساڵی تر دەتوانێ بێ گرێوگۆڵ سیاسەتی تەعریب و تەبعیس و تەهجیر لە کوردستاندا پیادە بکات و هەموو سیمای کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و سیاسی و نەتەوەیی کوردستان بگۆڕێ و بیشێوێنێ. دۆستەکانی ڕژێم، بەتایبەتی حزبی شیوعیی عێراقی و لایەنگرە عەرەبییەکان پێیان وا بوو لە ملۆزمی مەسەلەی کورد ڕزگار بوون. زۆربەی هەرە زۆری جەماوەری بێهیوا و کۆستکەوتوو و جەزرەبەخواردووی دەستی سیاسەتی تێشکاو، پێیان وا بوو لانی کەم تا چەند ساڵێکی تر بێ شۆڕش و پشتوپەنا و بێچارە دەمێننەوە لەبەردەم سیاسەتی تۆقێنەران و ڕاوەدووکەران و ئازار و ئەشکەنجەدەرانەی ڕژێمدا دەبن. سەرانی کوردی تێشکاو و ڕاکردووش لە مەیدانی سیاسەتدا، پێیان وا بوو کورد تەنیا و تەنیا بە بوونی ئەوان و بە عەقڵی ئەوان و بە هیممەتی ئەوان خاوەنی شۆڕش و بوونی خۆی دەبێ. بێ ئەوان، دوور لەوان، بە ئاشبەتاڵکردنی ئەوان، نە کورد هیچی پێ دەکرێ و نە شۆڕش دەبێ و نە خاوەنی کەسایەتیی خۆیشی دەبێ. پێیان وا بوو وەک چۆن لە ٤٥دا پەنایان بۆ بەرزان برد، لە ٦٢دا پەنایان بۆ بەرزان برد سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردیان بۆ بکەن، ئەم جارەش یا دەبێ پەنا بۆ کەرەج و تاران بەرن، یان پێی بەرزانی لە هەر کوێ بێ؛ کورد دەبێ سەری لەو شوێنە بێ و پەنا بۆ ئەو شوێنە بەرێ و دیسان شۆڕشیان بۆ ڕابەری بکات. بەڵام مێژوو سەلماندی کە نە ڕژێم و نە حزبی شیوعی و نە دەوڵەتانی دەوروبەر و دەرەوە و نە زۆربەی جەماوەری بێئاگا و نە سەرانی شۆڕشی تێشکاوی مەیدانی سیاسەتیش، لە کوردایەتی و بیری نەتەوەیی و ئایدیای ڕزگاریخوازی و دیموکراتیخوازیی گەلی کورد و ڕاستی و ڕەوایی خواستەکانی نەگەیشتبوون و درکیان بە گەوهەرەکەی نەدەکرد. یەک ساڵ پتر تێوەرنەسووڕایەوە، هەمان مۆتەکەی شۆڕشی کورد چنگی لەسەر سنگی ڕژێم داکوتایەوە. درێژەدان بە شۆڕشی ئەیلوول لە حوزەیرانی ١٩٧٦دا، جاڕی بەرپابوونەوەی شۆڕشی هەڵدا و ئاڵای شۆڕشگێڕی و سووربوونی لەسەر بەدیهێنانی خواستەکانی گەلی کورد بەدەست شۆڕشگێڕە

هەرە قارەمان و لەخۆبووردەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە چیا سەرکەشەکانی کوردستاندا هەڵکرایەوە. بە ژمارەیەکی زۆر کەم کە لە دەیان کەس پتر نەبوو و بە ژمارەی لە ژمارەی پێشمەرگەکان کەمتر لە چەکی سووک و بەڵام بە ورەیەکی ئێجگار بەرز و بە بڕوایەکی ئێجگار پتەو و بە پشتبەستن بە چەوساوە و ڕەنجدەر و سەرچاوەی لەبڕاننەهاتووی گەلەوە، بانگەوازی شۆڕش هەڵدرا، پەردەی بێدەنگی دڕا، ئەو سەدایە نەک هەر لە ئەشکەوت و دۆڵ و شاخەکانی کوردستان و شارەکانیدا دەنگی دایەوە، بەڵکە ڕژێمی عێراقی و دراوسێکان و دەوروبەر و سیاسەتمەدارە لێکەوتووە تێشکاوەکانی مەیدانی سیاسەت و دەربەدەرەکانی هەندەرانیشی داچڵەکاند. دۆستان لە هەموو لایەک کەوتنە خۆ بۆ پشتگیریی شۆڕش، نەیارەکان لە هەموو لایەکەوە کەوتنە خۆ بۆ تەگبیرکردن و پلانگێڕان و دەستتێکەڵکردن لەگەڵ یەکتری بۆ لێدانی شۆڕشی نوێ، بۆ تەنگوچەڵەمە دروستکردن، بۆ کۆسپ و تەگەرە خستنە بەردەمی شۆڕش و هەر لایەش بە جۆرێک:

عێراق بە هێرش و پەلاماری سوپایی و زیاتر بە پەنابردنە بەر بەکارهێنانی فرۆکەی جەنگی دژی پارتیزانی و ڕاگوێزانی سەرجەمی ناوچە سنوورییەکان بە قووڵایی ٢٠ کیلۆمەتر. ئێران کەوتە خۆبۆقایمکردنی سنوورەکانی و گوشار خستنەسەر کوردە ئاوارەکانی ناو ئێران و چاودێریکردنی جموجووڵیان. تورکیا کەوتە هاندانی عەشایەرە کوردەکانی سەر بە ڕژێمی تورکی لە ناوچەکانی سەرسنووردا بۆ چاودێریکردنی ناوچەکان و مەعلومات کۆکردنەوە. قیادەی موەقەتەی تازە لێکدراوی پاش هەڵوەشانی سەرکردایەتیی ئاشبەتاڵ کەوتنە جووڵە و خەڵک لە خۆ کۆکردنەوە و تەکبیر و ڕاکردن لەگەڵ ئێران و تورکیا. پەیوەندیکردن بە کۆنەپارتی و تازەجاشەکانی ڕژێمی عێراقی بۆ خۆخزاندنە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگە و وەشاندنی خەنجەری کۆنەقین لە ناوەوەدا، کە بۆ سەرپەرشتیکردنی ئەم کارەش هەندێ لە لێپرسراوانی خۆی ناردەوە ناوچەکانی سلێمانی، وە لە لایەکی تریشەوە خۆیان گەیاندە ناوچە عەشایەرییەکانی سەر سنوورەکانی تورکیا-عێراق و تورکیا-سوریا بۆ دوو مەبەستی سەرەکی:

١. گرتنی ڕێگەی هاتوچۆی کوردە شۆڕشگێڕەکان لە ئێرانەوە بۆ تورکیا و سوریا و لە سووریا و تورکیاشەوە بۆ ناو بادینانی باشووری کوردستان.

٢. بەرهەڵستیکردنێکی زۆر توند دژی دروستبوون و گەشەکردنی پێگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە بادیناندا، کە پێیان وا بوو بادینان ناوچەیەکی پاوانکراو و تاپۆکراوی بنەماڵەی بارزانییە.

مەفرەزە سەرەتاییەکان هەر لە سەرەتای مانگی (١٩٧٦/٤)ەوە بە ژمارەی کەم و لە ناوچەی جۆربەجۆردا ڕێک خران و کەوتنە جموجووڵی گەڕان و خۆپیشاندان و بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش. تا مانگی حوزەیران و تەمموزی ١٩٧٦، لە ناوچەی قەرەداغ و هەڵەبجە و دۆڵی جافەتی و ناوچەی ڕانیە و مەنگوڕایەتی و باڵەکایەتی بە دەستپێشکەریی کۆمەڵە؛ جموجووڵی پێشمەرگانە سەری هەڵدا، پەیوەندی کرا بە چەندین کەسی ناسراو و شۆڕشگێڕەوە بۆ پەیوەندیکردن بە شۆڕشەوە. بزووتنەوەی سۆسیالیست کە هێشتا تەمەنی لە ساڵێک تێپەڕ نەبوو، ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا لە کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆر لە عەشایەر لەدەوری شۆڕشی نوێ. قیادەی موەقەتەش لە سۆراندا کەوتە هاندانی کەسانی وەک تەحسین شاوەیس و هەباسی بایزی باڵو ئاغا و عەلی کۆ بۆ خۆخزاندنە ناو ڕیزەکانی بزووتنەوە و شۆڕشەوە و پاشان ڕاکێشانی کەسانی وەک عەبدولمەلیک عەلی عوسمان کە سەرەتا لەسەر داوای بزووتنەوە هاتبووە ناو پێشمەرگە، وە ستاری سەیید خەڵەف کە لەسەر داوای مەلا بەختیار هاتبووە ناو شۆڕشەوە بە تەماحی پارە و چەک و مەسئولیەت، لە لایەکی تریشەوە شێرکۆی شێخ عەلی و شێخ عەزیزی شێخ یوسف شەدەڵەیی لە ئێرانەوە ناردەوە ناوچەی دۆڵی جافەتی بۆ کۆکردنەوەی خەڵک و سەرپەرشتیکردنی ئەو چەکدارانەی کە لە ناوچەی سلێمانیدا هەیانبوو. هەنگاوی یەکەمی پیشاندانی دڵپاکی و هاوکاری و شۆڕشگێڕیی "ق. م" بەرامبەر شۆڕشی نوێی ١٩٧٦، گرتن و پاشان شەهیدکردنی چوار مەفرەزەی یەکێتی بوو کە ژمارەیان ٣٨ پێشمەرگە بوو بە فەرماندەیی شەهید ئیبراهیم عەزۆ لە کۆتایی مانگی تەمموزی (١٩٧٦)ەوە تا کۆتایی مانگی ئابی ١٩٧٦. ئەم هەنگاوە یەکەم زەنگی دەستپێکردنی شەڕی کوردی لێدا پاش ئاشبەتاڵ. یەکێتیی نیشتمانی لەو کاتەدا زۆر پێویستی بە ڕێگای سوریا-تورکیا-بادینانی باشووری کوردستان بوو، هەم بۆ ناردنەوەی بەرەبەرەی ئەو مەفەرەزە پێشمەرگانەی کە لە کوردە ئاوارەکانی ناو سووریا و ئەوانەی لە ئاشبەتاڵدا کەوتبوونە

ئێرانەوە و پاش بیستنی هەواڵی شۆڕشی نوێ خۆیان گەیاندبووە سووریا بۆ باشووری کوردستان، هەم بۆ گەیاندنەوەی ئەو چەکانەی کە لە سووریا و ڕێکخراوە فەڵەستینییەکانیان وەرگیرابوو. ئەو ڕێگایەش بێ ڕێککەوتن لەگەڵ قیادەی موەقەتە پارێزراو نەدەبوو. لە لایەکی تریشەوە هەم "تجمع الوطنی العراقی" و هەم سووریاش بۆ گەشەکردنی شۆڕشی عێراقی لە کوردستانەوە، پێیان وا بوو بێ قیادەی موەقەتە؛ کەموکوڕیی تێ دەکەوێ، بەتایبەتی کە قیادەی موەقەتە بە ئاگاداریی ڕژێمی تورکی، دەسەڵاتی زۆری لەناو عەشرەتەکانی باکووری کوردستان لەسەر سنووردا هەبوو و دەیانتوانی ببنە کۆسپ، بۆیە لە سەرەتای مانگی ئابی ١٩٧٧دا ڕێککەوتننامەیەکی سێ قۆڵیی نێوان قیادە موەقەتە و یەکێتی و پارتی بەعسی عێراقی باڵی چەپ مۆر کرا. ئەم هەواڵە هیوایەکی زۆر گەورەی خستە دڵی شۆڕشگێڕان و خەڵکی کوردستان، بەڵام ڕێککەوتننامەکە هێندەی بڕ نەکرد و تا بچووکترین هەنگاو بۆ جێبەجێکردنی هەڵبهێنرێت کە مەسعوود بارزانی هەواڵەکە بە مەلا مستەفا دەگەیەنێ لە واشنتۆن بە ئاگاداریی د. نەجمەددین بارزانی، نەک هەر دژی هەواڵەکە دەبێ، بەڵکە فەرمان بە مەسعوود دەکات کە هەموو ڕێککەوتنێک لەگەڵ جەلال تاڵەبانی خیانەتە. قیادەی موەقتە لەسەر فەرموودەی بارزانی بەڵام بە کۆمەڵێ بروبیانووەوە، بێ ئیلتیزامیی خۆیان بە ڕێککەوتننامەکە لە کۆتایی مانگی ئابی ١٩٧٧دا ڕاگەیاند. دیسانەوە شەڕی کورد و کورد سەری هەڵدایەوە، لە بادیناندا قیادەی موەقتە کەوتنە بڵاو کردنەوەی پروپاگەندە دژی یەکێتی و لەناو عەشرەتەکانی سەر سنوور لە کوردستانی باکووریشدا بە هەمان شێوە بڵاویان دەکردەوە کە دیسانەوە جاشەکانی جەلالی بە فیتی سەدام حسێن و یارمەتیی حکومەتی عێراقی چەکدار کراون و دژی شۆڕش و قیادەی موەقەتەی پارتی هان دراون و لە سۆران و بادیناندا بەربەرەکانیی شۆڕش بە سەرکردایەتیی پارتی و بارزانی بکەن. لە بادیناندا کەوتنە گەمارۆدانی بنکەکانی یەکێتی و پروپاگەندەی خراپ بۆ کردن و پاشان ڕێگەگرتن و کەمیندانانەوە لە پێشمەرگەکانی یەکێتی و ڕاونان و کوشتنی هەر پێشمەرگەیەک تاکوتەرا دەستیان بکەوتایە. لە سۆراندا کە ئەو توانایەیان نەبوو، هانی لێپرسراوەکانی خۆیان دەدا کە بە فێڵ و تەڵەکەبازی فەرماندەکانی یەکێتی لەناو بەرن و بە پلانی نەشیاو و ناجوامێرانە مەفرەزەکانی

یەکێتی کۆمەڵکوژ کەن، بەتایبەتی لە کاتی پێکەوە دانیشتن و حەسانەوە و لە خەودا و پاشان خۆیان تەسلیم بە ڕژێمی بەعس بکەن و بە جاشەتی شەڕی پێشمەرگە بکەن. زۆر پێشمەرگە و فەرماندەی مەفرەزەی یەکێتی بەو جۆرە پلانە قینلەدڵانەی قیادەی موەقەتە شەهید کران و کەسانی وەک قالە فەرەج، تەحسین شاوەیس، خلەی ڕەشە بەحری و سابیری مینەرەندان، حەمەخانی حاجی دارا، هەباسی بایزی باڵو ئاغا و پاشانیش عەبدولمەلیک عەلی عوسمان جەلالی کوێخا عەبدوڵڵا چوخماخ و چەندانی تری لەو جۆرانە بە دەستی سووربوویانەوە بە خوێنی پێشمەرگە بوونە کەوڵسووری پێش لەشکری سەدام و جاشی هەردوو پێشمەرگەی شانازی پێوەکراوی قیادەی موقەتەش. لە مانگی ١٠ی ١٩٧٧، پۆلێکی تری پێشمەرگەی یەکیەتییان بە فەرماندەیی حەسەن خۆشناو شەهید کرد و هەموو ئەو چەک و تەقەمەنییانەش کە لە سووریاوە گەیشتبووە گوندەکانی ناو تورکیا و ئەمان چووبوون بیانهێنن، هەموویان تاڵان کرد و ئاگاداریی یەکێتییشیان کرد لە ڕێگەی هەندێ لە پێشمەرگە بریندارەکانەوە کە بەریان دابوون کە ئەوان ئەو کارەیان کردووە بۆ چاوترسێنیی یەکێتی. ئەم ڕەفتارانەی قیادەی موەقەتە ڕەنگدانەوەیەکی خراپی کردە سەر پێشمەرگە و کادر و لێپرسراوانی یەکێتی و بەشێکی زۆری جەماوەریش، کە هەم ڕقوکینەی زۆر بەرامبەریان پەیدا بوو و هەم دەنگی نارەزایی و تۆڵە لە زۆر لاوە بەرز بۆوە. لەبەرامبەر ئەوەدا، یەکێتییش لە کۆتایی مانگی ١٢ی ١٩٧٧ و سەرەتای مانگی ١ی ١٩٧٨دا کەوتە ڕاونان و دەرپەڕاندنی مەفرەزەکانی قیادە موەقەتە لە ناوچەکانی سەر بە پارێزگای سلێمانی، بێ ئەوەی کەسی تێدا بکوژرێ، مەفرەزەکانی قیادە موەقەتە ناوچەکانیان پێ چۆڵ کرا و خۆیان کردەوە بە دیوی ئێراندا.

بەکورتی: هەر لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی (١٩٧٦)ەوە کە بڕیاری شۆڕشی نوێ دەنگی دایەوە، قیادە موەقەتەی پارتی دیموکراتی کوردستان تا کارەساتی هەکاری پتر لە ٦٠ پێشمەرگە و فەرماندەی مەفرەزە و کادری سیاسی و پێشمەرگانەی شەهید کرد، بێ ئەوەی تەنیا یەک چەکداری ڕژێمی عێراقی برینداریش کردبێ یا بچووکترین چالاکیی دژی هێزەکانی ڕژێمی عێراقی کردبێ.

کارەساتی هەکاری، گەورەترین شانۆی شەڕی کورد و کورد بوو لەدوای

ئاشبەتاڵەوە تا ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٨. بۆ بەرهەڵستیکردن و ڕیبڕین لە گەشەکردن و قەبەبوونی شۆڕشی حوزەیران، ڕژێمی عێراقی بڕیاریان دابوو لە ١٩٧٨/٦/١دا دەست بکەن بە جێبەجێکردنی نەخشەی چۆڵکردنی ناوچە سنوورییەکان بە قووڵایی ٢٠ کیلۆمەتر و ڕاگواستنیان بۆ ئۆردووگای زۆرەملێ دروستکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی ڕژێم و هێڵە سەربازییەکانی. ئەو نەخشەیە مەترسییەکی زۆر گەورەی لەسەر ئایندەی شۆڕشی کورد و کۆمەڵگای کوردی پەیدا دەکرد لە ڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەوە:

١. سەدان هەزار کورد ڕاپێچەک دەکرایە ئۆردووگای زۆرەملێکان و لە ئایندەدا دەکرانە کەرەستەیەکی خاوی جێبەجێکردنی سیاسەتی تەبعیس و دانانی گەرای دروستکردنی تابووری پێنجەم.

٢. بە دەیان هەزار پیاو و ژن بێ کار دەکران و ناچار بە هەڵبژاردنی دوو ڕێگە دەکران:

ا. یان مانەوەیان لە ئۆردووگاکان و چەکهەڵگرتن بۆ ڕژێم و بوون بە جاش و جاش شەعبی و فەوجی سووک.

ب. یان دەبوایە بڕۆشتنایە بۆ خوارووی عێراق بۆ کارکردن و پەیداکردنی بژێوی کە ئەمەشیان قۆناغ بە قۆناغ بەرەو سیاسەتی سێیەم دەبران کە تەعریبکردن بوو.

٣. پێکەوە نیشتەجێکردنی چەندین تیرە و عەشیرەتی جیاجیا لە ئۆردووگایەکدا کە پێشتر کۆمەڵێ گیروگرفتی کۆمەڵایەتییان لەگەڵ یەکدا هەبووە لەسەر زەوی و ئاو و دێبەر و کشتوکاڵ یا لەسەر ژن و ژنخوازی و دەسەڵاتی عەشیرەتی، بەم کارەش جۆرە ناتەباییەک و پێکداهەڵپرژان و دژایەتییەکی لە نێوانیاندا پەیدا دەکرد بۆ خۆبردنە پێشەوە لە ڕژێم و تۆڵە لە یەک کردنەوە پێشبڕکەی نزیکبوونەوە لە دەزگا سەربازی و جاسووسی و ئیستخباراتەکانی ڕژێم بکەن و هیچ لایەک لە ترسی ئەوی تر نەتوانێ هاوکاریی شۆڕش بکات، جگە لە چەند مەسەلەی تری کۆمەڵایەتی کە دەبووە هۆی شێواندنی قەبارەی ڕەسەنی کۆمەڵایەتیی کوردی و ئێرە جێگەی باس نییە.

٤. لەقاڵبدانی هەموو جۆرە جموجۆڵێکی ڕۆشنبیریی کوردی لە سەرجەم ئەو قەزا

و ناحیانەی ئۆردووگای زۆرەملێکان لە ناوچەکەیاندا پێکی دەهێنا.

٥. لەناوبردنی نوا و شوێنی حەوانەوەی پێشمەرگە و دالدەدانی پێشمەرگە.

٦. لەبارکردنی مەودایەکی زۆر فراوان لە کوردستانی باشووردا بە درێژایی سنووری عێراق ئێران و عێراق تورکیا و بە قووڵیی ٢٠ کیلۆمەتر بۆ لێدانی هێزی پێشمەرگە بە فڕۆکە و تۆپی قورس و بەکارهێنانی کەمترین ژمارەی سەربازی لەو بوارەدا، ناشتنی پا چاندنی زۆرترین ژمارەی ئەڵغام لە هەموو ڕێگاوبان و باریکەڕێگە و تووڵەڕێگە و سەرکانی و ئاوەکان و شوێنەکانی حەسانەوە.

٧. دابڕینی شۆرش لە جەماوەر و جەماوەر لە پێشمەرگە و بەکارهێنانی شەڕی "دەروونی" لەگەڵ پێشمەرگەدا، بە دابڕاندنی لە هەموو نیشانەیەکی ئاوەدانی و شارستانێتی بۆ رووخاندنی ورەیان و خۆڕانەگرتنیان لەبەرامبەر ئەو گوشارە نەفسییەدا. ئەمانە و کۆمەڵێ دەرئەنجامی تری لێکدانەوەی پلانەکەی ڕژێم، لە لایەکی تریشەوە گوشاری ئێران لەسەر سنوورەوە لەسەر سەرکردایەتی کە ئەوکات لە گوندی نۆکانی سەر بە سنووری ئێراندا بوون، یەکێتی هێنایە سەر ئەو ڕایەی کە دەبێ بەر لەوەی ڕژێم بتوانێ نەخشەکەی جێبەجێ بکات، کارێ بکەن بتوانن چەندی بکرێ و بلوێ چەک و تەقەمەنیی جۆراوجۆر بگەیەننە کوردستان بۆ بەرگریکردن و سەرنەکەوتنی پلانەکەی ڕژێم.

دیسانەوە لایەنەکانی ناو یەکیەتی بڕیاری ئەوەیان دا داوا لە قیادەی موەقەتە بکەن بۆ تەبایی و هاوکاری و ئاشتی و پێکەوە بەشدار بوون لە تێکشکاندنی پلانی ڕژێمدا، بۆیە بەر لە بەڕێکەوتنی هێزەکانی یەکێتی بەرەو ناوچەی برادۆست و پاشان بەرەو سەر سێ سنووری عێراق-تورکیا-ئێران و دواتریش ناردنی بەشی هەر زۆری هێزە هەڵبژاردە و چەکدار و بێچەکەکان بەرەو سووریا بۆ هێنانی چەک، نامەیان بۆ ئیدریس بارزانی و شێخ محەممەد خالید و چەندانێکی تری دەسەڵاتداری ناو "ق. م" نووسی و گرنگیی بارودۆخەکەیان بۆ ڕوون کردبوونەوە و داوای یەکگرتنی هەموو کوردیان لێ کردبوون لەو هەلومەرجە سەخت و ترسناکەدا. دوای بەڕێکەوتنی سەرکردایەتیی هێزەکەی یەکێتی کە ژمارەیان نزیک بە هەزار پێشمەرگەی چەکدار و بێچەک دەبوو لە کۆتایی مانگی ٤ی ١٩٧٨دا، بەشی هەرە زۆری هێزەکە و ئەندامانی سەرکردایەتی

و فەرماندەکانی سیاسی و پێشمەرگەکان کە نزیک بە ٨٠٠ کەس دەبوون لە ناوەڕاست و ئاخری مانگی ٥ی ١٩٧٨ گەیشتنە ناو تورکیا و وەڵامەکەی ئیدریس بارزانییان پێ گەیشتەوە کە لەوە دڵنیا بوون "ق. م" شەڕیان ناکات. بەڵام لە ڕۆژی ١٩٧٨/٦/١دا بە پێچەوانەی بەڵێنەکەی ئیدریس، هێزەکانی "ق. م" و عەشیرەتە کوردە هاندراوەکانی ناوچەی "ژێرکێ" و یارمەتیی زۆری میتی تورکی پەلاماری هێزەکانی یەکێتییان دا لە پەنا گوندی "بازێ"دا.

شەڕ لە (١٩٧٨/٦/١)ەوە بەپچڕپچڕی و لە شوێنی جیاجیادا تاکوو ١٩٧٨/٦/١٩ی خایاند کە سەرئەنجامەکەی بە تێکوپێکشکانی هێزەکەی یەکێتی کۆتایی هات. لە نزیکەی ٨٠٠ پێشمەرگە، تەنها ٧ یا ٨ پێشمەرگە بە چەکەکانیانەوە گەیشتەوە بارەگاکانی سەرکردایەتی لە قەندیل. گەرچی ئەم کارەساتە بێوێنەیە لە شۆڕشی نوێدا، گەلێ هۆی تری هەبوو وەک:

ا. قایمکردنی ناوچە سنوورییەکانی نێوان عێراق-تورکیا لەلایەن هێزەکانی ڕژێمی عێراقەوە و پاشان لە کاتی شەڕەکاندا چەند جار سنووریان بەزاندەوە بۆ لێدانی هێزەکانی یەکێتی.

ب. قایمکردن و بەستن و گرتنی تەواوی ناوچە سنوورییەکانی عێراق-ئێران لەلایەن هێزە چەکدارەکانی ڕژێمی شاهی ئێرانییەوە بۆ گوشار خستنەسەر هێزەکانی یەکێتی و بڕینی ڕێگەی هاتوچۆ و خواردن و پێویستی تر لێیان.

ج. بێدەنگیی ڕژێم تورکی لە تەواوی ڕووداوەکان لەناو تورکیادا و هاوکاریی میتی تورکیا بۆ عەشیرەتە کوردە هەڵخەڵەتاوەکانی ناو کوردستانی تورکیا بە پروپاگەندەی قیادەی موەقەتە.

د. کۆمەڵێ هەڵەی پێشمەرگانە لەلایەن فەرماندەکانی هێزەکەی یەکێتییەوە و گەلێ هۆی تریش کە زۆر بە وردی و درێژی لە کتێبەکەی کاک نەوشیروان مستەفادا لە ئەڵقەی "لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ" باس کراوە، بەڵام ئەم کارەساتە و ڕەفتاری قیادەی موەقەتە دەریخست کە شەڕی کورد کردن و میراتیی براکوژی نە بە ڕێککەوتنی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ و نە بە ئاشبەتاڵیی ئازاری ساڵی ١٩٧٥ کۆتایی نەهات و بنەماڵەی بارزانی بە میرات لە بابوباپیرانیانەوە تا سەر مەلا مستەفا و کوڕانی و

ڕەنگە گەر شەقی زەمانە نەیەتە پێشەوە، کوڕی کوڕیشیان بۆیان مابێتەوە و پێیان سپێردراوە کە تەنیا و تەنیا شۆڕش سەرکەوتنی و تێکشاندنی بەس بە هیی خۆیان بزانن، دەمڕاستی و کوێخایەتی و میر محێ و سەرکردایەتیی هەموو کورد بە جاشی و بە باشی هەر بە موڵکی پاوانکراوی خۆیان بزانن، وە هێڵێکی ئاشکرا و ڕوون و بێ پەردەیان لەنێوان خۆیان و هەر تاقم و حزب و کەسێکی تری کورد کە گوێڕایەڵ و ملکەچی بڕیار و فەرمانی ئەوان نەبێ؛ کێشاوە، ئەویش بە دوژمنی سەرەکی زانینی هەموو حزب و لایەنێکی تری کوردی کە ملکەچیان نەبێ.

## ئەڵقەی حەوتەم

## تراثی بارزانی یا نەفرەتی فیرعەون

دەگێڕنەوە کە لە سەردەمی فیرعەوندا هەر کەسێ یا هەر ناوچەیەک فیرعەون لێی ڕازی نەبووایە و بە یەک دوو وشە نەفرەتی لێ بکردایە، ئیتر ئەو کەسە یا ئەو ناوچەیە بەگشتی بە هیچ جۆرێ گفتوگۆ و لێدوانی لەسەر نەدەکرا و دەبووایە بێ چۆن و چیی لەناو ببرایە. مەسعوود بارزانییش لە بەشێکی وتاری "سیاسی و عەسکەری و تەنزیمی" کە لە کۆنگرەی نۆیەمی پارتیدا خوێندبوویەوە، ڕوو دەکاتە هەموو بەشداربووانی کۆنگرە کە لە ٣٠٠ کەس پتر بوون و دەڵێ: "هەر یەکێک لە ئێوە مەسئولە لە پاراستنی تراثی بارزانی... و ئێمەش وەک یەکێک لە ئێوە مەسئولین لە تراثی بارزانی و ڕۆیشتن لەسەر ئەو ڕێگەی بۆی داناوین..." «تراثی بارزانی» بەپێی مێژووی سیاسیی بارزانی لەگەڵ حزبی هیوا و پاشان ڕێکخراوی «هەیئەتی ئازادی» و دواتر پارتی دیموکراتی کوردستان، بریتی بووە لە:

١. سەرکردایەتی و ڕابەرایەتی و فەرماندەیی بێبەرهەڵست، تەنیا شیاوی بارزانی و بنەماڵەی بارزانییە.

٢. کورد هەمووی و کوردستان بەگشتی موڵکی بارزانی و بنەماڵەی بارزانی و جێبەجێکەری فەرمانەکانیان بن.

٣. پارتی دیموکراتی کوردستان پارتی تاقانە و پیرۆز و نەمری کوردە و سەرکردایەتییەکەشی تاپۆکراوی بارزانی و بنەماڵەکەیە.

٤. لە کورددا هیچ کەس و هیچ پارت و ڕێکخراوێکی تری سیاسی و شۆڕشگێڕی نە هەڵدەکەوێ و نە دەبێ هەڵیشکەوێ، وە گەر هەڵیشکەوت کە پێچەوانەی تراثی بارزانییە؛ دەبێ لەناو ببرێ.

واتە تراثی بارزانی ئەم تیۆرەیە کە تیۆریستی کورد، بارزانی دایناوە: "پێشڕەوی کورد پارتییە و پێشڕەوی پارتییش سەرکردایەتییەکەیەتی و پێشڕەوی سەرکردایەتییش یەکێکە لە بنەماڵەی بارزانی و لە بنەماڵەی بارزانییشدا تەنیا لە نەوەکانی مەلا مستەفا."

بەکورتی: "تراثی بارزانی" دەقاودەق نەفرەتەکەی فیرعەونە لە هەموو پارت و ڕێکخراو و کەسایەتییەکی سیاسی و شۆڕشگێڕ و پێشکەوتووخواز لە هەر چوار پارچەکەی کوردستاندا سەری هەڵدابێ و سەر هەڵدا.

پاش ئاشبەتاڵ و لەگەڵ بیستنی بەرپابوونی شۆڕشی حوزەیرانی ١٩٧٦ کە تا ئەو کاتەش سەرانی پارتی و سەرۆکی پارتی هێشتا مەستی و سڕی ئاشبەتاڵ بوون، سامی عەبدولڕەحمان بە ڕەزامەندیی مەلا مستەفا کەوتە خۆی و بەپەلەپروزە سەرکردایەتییەکی کاتیی بۆ پارتی دروست کرد، بەڵام زۆربەیان لەو کەسانە بوون کە ملکەچی و گوێڕایەڵییان بۆ بنەماڵەی بارزانی سەد دەر سەد نەبوو. لە کۆنگرەی نۆیەمی پارتیدا، مەسعوود بارزانی داوای جێبەجێکردنی تراثی بارزانیی کرد، واتە لێدانی قیادەی موەقەتە و پێکهێنانی سەرکردایەتییەکی لە سەددا سەد ملکەچ و گوێڕایەڵی تراثی بارزانی و ئەنجامەکەشی دەرنەچوون و لێدانی سەرانی قیادەی موەقەتە بوو کە لە کاتی میحنەتدا دەستیان دابووە ژێر باڵی شکاوی پارتی ڕاستی کەنەوە. سەرئەنجامی قیادەی موەقەتیش بە جیابوونەوەی سامی و دروستکردنی پارتی گەل و تەرەبوونی هەندێ لە ئەندامانی تر و پاشان چوونە ناو حسک و یا وازهێنان و یان مانەوە لەناو ڕیزەکانی پارتی کۆتایی هات. تراثی بارزانی و پەیڕەوکردنی تا کۆنگرەی نۆیەم، بیردۆزێکی شاردراوەی ناو دەروونی مەلا مستەفا بوو کە بە میرات لە برا گەورەکەیەوە بۆی جێ مابۆوە (شێخ ئەحمەد). تا پەیدانەبوونی بنەماڵەی بارزانی لە ناوچەی بادینانی کوردستانی باشووردا، ئاماری ناکۆکی و پێکدادانەکانی نێوان عەشیرەتەکانی بادینان لە مێژووی عەشایەری کورددا هێندە کەم بووە کە نەگەیشتووەتە ئەژنۆی باڵای ئاماری ناکۆکی و دژایەتی و پێکدادانەکانی

نێوان عەشیرەتی بارزان و عەشیرەتەکان تر پاش دروستبوونی ئەو ڕچە دینییەی کە پاشان ناوی عەشیرەتی بارزانیان بەسەردا بڕی، ئەوە لەسەر ئاستی ناوچەیی و عەشایەری. لەسەر ئاستی سیاسی و شۆڕش و سەرکردایەتی و پارتایەتییشدا، هەر لە مێژووی دەستبەسەرداگرتنی سەرکردایەتیی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە لەلایەن مەلا مستەفاوە ئەو میراتە جگە لە سەپاندنی دکتاتۆریەتی تاکی و لێدانی بیری ئازاد و پێشێلکردنی دیموکراسی و دیسپلینی پارتایەتی و شەقوپەقکردنی ڕیزەکانی گەل و داهێنانی سەرەتای خیانەتی گەورە و خۆفرۆشی بە دوژمنان و پاشان شەڕی خۆکوژیی کورد بەولاوە، هیچ بەرهەمێکی چاک و دەستکەوتێکی مرۆڤایەتی و نەتەوایەتیی بۆ گەلی کورد و ئاوەدانبوونەوەیەکیشی بۆ کوردستان تیا بەدی نەکراوە. لێدان و دەرکردن و سووکایەتیپێکردنی سکرتێری پارتی (برایم ئەحمەد) و پاش ئەو، "هەمزە عەبدوڵڵا" و جارێکی تر ئیبراهیم ئەحمەد و مەکتەبی سیاسیی پارتی و پاشان لێدانی هەموو پارتی وەک ڕێکخستن و دیسپلین و سەرەتاکانی و ڕەوت و پەیڕەو و پرۆگرامەکەی و گەوهەری ناوەرۆکی پارتی و کردنی بە حزبێکی کارتۆنی و بێناوەڕۆک، باشترین بەڵگەی ئەو ڕاستییەن. ڕێککەوتنە نهێنییەکەی مەلا مستەفا لەگەڵ عەبدولسەلام عارفدا لە ساڵی ١٩٦٣دا بۆ لێدانی پارتی و لێدانی بەعسییەکانیش لەلایەن عەبدولسەلام عارفەوە، گرنگترین خاڵی یەکانگیربوونی هەردووکیان بوو. لەسەر ئاستی کوردستانی گەورەش، دەستوەردانی مەلا مستەفا لە کاروباری کۆماری مهاباد و پاشان گرتن و کوشتن و بەدەستەوەدانی سەرانی حزبی دیموکراتی ئێران لە ساڵی ١٩٦٨دا کە شەهیدان سلێمانی موعینی و هاوڕێکانی بوون، دوابەدوای ئەوە پاش ئاشبەتاڵ و ڕووخانی ڕژێمی شا و بەرپابوونی شۆڕش لە کوردستانی ئێراندا بوونە کەوڵسووری پێش لەشکری خومەینی و کەوتنە لێدانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی زەحمەتکێشان. لە کوردستانی تورکیادا گرتن و کوشتنی دکتۆر شڤان و دروستکردنی ناکۆکیی دووبەرەکی لەناو ڕێکخراو و حزبە کوردییەکاندا و دواتریش دژایەتیکردن و لێدانی پارتی کرێکارانی کوردستان. وە لە کوردستانی خوارووشدا ئەو مێژووە دووروودرێژ و تاڵەی کە گەلی کوردی تیا پێوەی دانالێنێ، ئەمانە هەمووی بەرهەمی ئەو بیردۆزەن کە بە ناوی "تراثی بارزانی"یەوە ناو براون.

لەدوای کۆچی دوایی مەلا مستەفا لە نەخۆشخانەیەکی واشنتۆن لە ١٩٧٩/٣/١دا، زۆربەی هەرە زۆری ڕۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی کورد لە کوردستانی خواروو و لە هەندەرانیش پێیان وا بوو کە تیۆر و بیروبۆچوون و تێڕوانینی بارزانییش لەسەر عەقڵی عەشایەری و تاکڕەوی و تاک حزبی نەما یان لانی کەم لەوەدوا گۆڕانکارییەک بەسەر ڕەوتی پارتیدا دێت، بەو بۆچوونەی کە هەم سەرانی پارتی و ڕێکخستنی پارتی لە کارتێکەری و پاڵپەستۆی مەلا مستەفا ڕزگاریان بوو و هەم کوڕانی بارزانییش لە جیلێکی نوێ و لە کەشوهەوایەکی جیاوازدا پێگەیشتوون و ئاستی بیرکردنەوەشیان فراوانتر و بیروبۆچوونیان پێشکەوتووترە لەسەر مەسەلەی سیاسی و پارتایەتی و کۆمەڵایەتی و هەڵسەنگاندنی بارودۆخی کوردستان پاش ئاشبەتاڵ، بەڵام دوای تێپەڕبوونی ٨ مانگ و چەند ڕۆژێ بەسەر مردنی مەلا مستەفادا، پارتی کۆنگرەی نۆیەمی خۆیان لە ئۆردووگای زێوێ سەر بە ڕەزایە (ورمێ) گرت و مەسعوود بارزانی وتاری سیاسی و ڕێکخراوەیی خوێندەوە. لە وتارەکەیدا هەوڵی دا بە تکاندنی ئابڕووی زۆربەی سەرکردایەتییەکەی پارتی و مەسئولیەت خستنە ئەستۆی ئەوان لەسەر هەڵەکان و ئاشبەتاڵ، مەلا مستەفا و خۆیشیان وەک کەسە نزیکەکانی دەوری مەلا مستەفا لە هەموو کەموکوڕی و هەڵەکان و تاوانەکان بێخەتا و بێبەری بکات، ئەم کارەشی بۆ جێبەجێکردنی دوو مەبەستی سەرەکی بوو:

١. بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری حزب و پاکتاوکردنی ڕیزەکانی لە لابردنی ئەوانەی بەدڵیان نەبوون و دانانی ئەوانەی جێگەی متمانەی خۆیانن ڕاستەوخۆ لەلایەن خۆیانەوە، کە تا ئەو کاتە بە هۆی پەرشوبڵاوییان لە ئێراندا و دووریی بنەماڵەکەش لە کوردستانەوە نەیانپەرژابووە سەر ئەو کارانە.

پێش گرتنی کۆنگرە لەدوای ئاشبەتاڵەوە تا ئەو کاتە، پشێوییەکی ئەوتۆ کەوتبووە ناو پارتییەوە وەک ئاردی ناو دڕکیان لێ هاتبوو، زۆربەی سەرکردایەتییەکەیان پاش ئاشبەتاڵ یا لە پارتی دوور کەوتبوونەوە و لە ئێران دانیشتبوون یا ڕەهەندەی وڵاتانی ئەورووپا بووبوون یان تەسلیم بە عێراق بووبوونەوە و کەوتبوونە دژایەتیکردنی بنەماڵەی بارزانی. زۆربەی هەرە زۆری فەرماندە سیاسی و عەسکەرییەکان پاش ئاشبەتاڵ دەستیان لە پارتی و بنەماڵەی بارزانی بەر دابوو و تووشی سەرلێشێواوی

و ئاوارەیی بووبوون.

٢. مەبەستی دووەم لە گرتنی کۆنگرە، کۆکردنەوەی خەڵکی بوو لـەدەوری بنەماڵەی بارزانی و وەبیرهێنانەوەی سەرانی قیادەی موەقەتە و بەشداربووانی کۆنگرە و ڕیزەکانی پارتی لەوەی کە پارتی لەدوای ئەو کۆنگرەیەوە پەیڕەوی تراثی بارزانی دەکات، واتە:

ا. قیادە موەقەتە کە بە سکرتێری سامی و ئەندامێتیی ١١ کەسی تر پێک هاتبوو و تا کۆنگرە سەرپەرشتیی پارتی دەرکرد و هیچ کامیان لە بنەماڵەی بارزانی نەبوون، دەبێ خۆیان حەل بکەن و جگە لە سامییش؛ کەسی تریان نەچنەوە سەرکردایەتی.

ب. لـەوەش تێبگەن کە کورد واتـای پارتی و پارتییش واتـای تاک دەسەڵاتی بنەماڵەی بارزانی و بەتایبەت سەرۆکی هەڵبژێردراوی کۆنگرە؛ مەسعوود بارزانی دەگەیەنێ. تراثی بارزانی لەباتیی ئـەوەی بە چاوێکی سیاسییانە و بەرپرسانە و پسپۆڕانەی ناو مەیدانی سیاسی و لە بەرژەوەندیی ئەو گەلەی کە بە موڵکی تایبەتیی خۆی دەزانـێ بۆ سـەرخستنی ئەو کوردستانەی کە بە پاوانکراوی خۆی دەزانی، بارودۆخی دوای ئاشبەتاڵ و شۆڕشی ١٩٧٦ و هەڵسانەوەی مەسەلەی کورد و کڕینەوەی ئابڕووی تکاوی ئاشبەتاڵ هەڵسەنگێنێ و لە دیدی خۆ بە خاوەن درێژترین مێژووی شۆڕشگێڕییەوە وەک ڕیشسپی و برا گەورە سەیری حزب و ڕێکخراو و هێزەکانی ناو گۆڕەپانی خەبات ڕەفتار بکات و هەوڵی یەکبوون و هاوکاری و کاری "بەرەیی" بدات، بەپێچەوانەوە کەللەڕەقی و لووتبەرزی و خۆبەزلزانینی زۆر زیاتر لە قەبارەی حەقیقی خۆیان کە بەشێکن لە تراثی بارزانی، وەک هەموو جارێکی تری لەمەوبەر ڕێی ڕاستی لێ ون کردن و جارێکی تر کورد و مەسەلەی کورد و کوردستانی خواروویان ڕاپێچەکی زەلکاوی شەڕی کورد و کورد کردەوە.

کەوتنە پیادەکردنی سیاسەتی جیاکەرەوە و سوود دەبینی (فرق تسد) لەنێوان حزبەکانی ئەوسای مەیدانەکە. هاندانی حسک بۆ قووڵترکردنەوەی ناکۆکییەکەی لەگەڵ یەکێتی، هاندانی حزبی شیوعی بۆ پاشگەزبوونەوە لە هەموو ڕێککەوتنێک کە لەگەڵ یەکێتیدا دەیکرد و هاندانی پاسۆک بۆ پتر دوورکەوتنەوە لە یەکێتی و ترنجانە ناو جوغزی دوژمنایەتیی توندی یەکێتی. بۆ پارتی و تراثی بارزانی، نە حسک و

نە پاسۆک و نە حزبی شیوعییش ئەو هێز و قەبارە و مەترسییەیان نەبوو کە لە ئایندەدا پێشڕەوایەتی لەدەست بنەماڵەی بارزانی دەربهێنن یان لانی کەم هاوسەنگی دەسەڵاتیان بن.

مەبەست و نیشانی سەرەکیی پارتی تەنیا یەکێتیی نیشتمانی کوردستان بوو، لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١. پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرکردایەتیی بارزانی بەو هەموو پەیوەندییە دەرەکییانەی کە هەیانبوو بە ئێران و تورکیا و ئیسرائیل و ئەمەریکا و سۆڤیەتەوە، بەو هەموو پشتیوانییە گەورەیەی کە دەتوانم بڵێم بە ڕێژەی پتر لە ٨٠ دەرسەدی جەماوەری خوارووی کوردستان بوو و بەو هەموو چەک و تفاقی شەڕەی کە پەزمەنەی ١٨ ساڵی شۆڕشی ئەیلوول بوو، ئەنجامەکەی بە ئاشبەتاڵ کۆتایی هات، بەڵام یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە تێپەڕبوونی تەنیا یەک ساڵ بەسەر لەدایکبوونیدا بە ژمارەیەکی زۆر کەم لە کەسانی شۆڕشگێڕ و نیشتمانپەروەرەوە و ژمارەیەکی تێپەڕنەبوو لە چەند سەد چەکێکی سووک، ئابڕووی شۆڕشی ئەیلوولی ئاشبەتاڵپێکراوی کڕییەوە و ئاڵای شۆڕشی کەوتووی بەرز کردەوە.

٢. پارتی سەبارەت بە ڕابردووی خەباتی دووررودرێژی، تووشی چەندین هەڵەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و پێشمەرگانە بووبوو لەبەر چاوی حزب و ڕێکخراوە سیاسییە کوردستانییەکان، چ لە کوردستانی ئێران و چ لە کوردستانی تورکیا و چ لەناو جەماوەری کوردستان خوارووا کەوتبوو، بەتایبەتی ئاشبەتاڵکردن لە شۆڕش و پشتکردنە جەماوەر و ڕاکردن بۆ هەندەران.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەگەڵ ئەوەی کە جەلال تاڵەبانی سکرتێری بوو و ڕابردوویەکی تەمومژاویی لەگەڵ سەرکردایەتیی بارزانیدا هەبوو، بەڵام لە ڕێکخراوێکی نیمچەبەرەیی پێک هاتوو لە سێ ڕێکخراوی جیاواز پێک هاتبوو کە یەک لەو ڕێکخراوانە کۆمەڵە بوو، تەمەنی ٥ ساڵ گەورەتر بوو لە یەکێتی، کە ئەمە یەکەم تاقیکردنەوەی سیاسی بوو لە مێژووی خەباتی گەلی کورددا بتوانرێ کاری بەرەیی لە قەبارەیەکی داڕێژراودا ئەنجام بدرێ و یەکەم هەنگاوی دیموکراتیانەی کاری سیاسی و پێشمەرگانە و ڕێکخراوەیی بوو لە مەیدانی خەباتی سیاسیدا هەڵهێنجرا.

٣. پارتی لە کوردستانی ئێراندا خاوەنی ناو و ناوبانگێکی زۆر خراپ بوو لەناو کورد و ڕێکخراوە سیاسییەکاندا، چ لە سەردەمی شا و چ لە سەردەمی خومەینیدا، ناسراو بوون بە دوژمنی شۆڕشی کوردستانی ئێران، بەڵام یەکێتی وەک ڕێکخراوێکی بەرەیی کوردستانی لە کوردستانی ئێراندا قووڵاییەکی ستراتیژیی هاوکاری و پشتیوانیی هەبوو، بەتایبەتی چاوی هیوا و پشتیوانیی تێ بڕابوو، تەنانەت بە هێزی پشتیوان لەناو جەماوەر و حزبە سیاسییە کوردییەکاندا ناو دەبرا.

٤. پارتی و سەرکردایەتیی بارزانی پاش ئاشبەتاڵ و کۆچی دوایی مەلا مستەفاش نەیانتوانی خۆیان لە دابونەریت و کولتوور و تیۆری "تراثی بارزانی" دەرباز بکەن و پارتی بە شێوەیەکی مۆدێرن و پێشکەوتووانەتر و بە بیر و ئایدۆلۆژیایەکی کوردستانی و کوردایەتییەکی ڕەسەن و دوور لە بەکرێگیراوی و سەربەخۆ کار بکەن و لەسەر سەرەتاکانی بڕوابوون بە ئازادیی سیاسی و ڕێکخراوەیی و فیکر و نووسین بێنە مەیدانی خەباتەوە.

تەنانەت گۆڕانیان لە دەموچاوە سیاسییەکانیشدا نەکرد، وەک میراتی لە باوکەوە بۆ کوڕ و لە خزمەوە بۆ خزم مایەوە، مەلا مستەفا نەما، بەڵام ئیدریس، مەسعوود، پاشان نێچیر، دڵشاد، نهاد... دەستیان بەسەردا گرت، نووری شاوەیس نەما، کوڕەکەی خرایە جێگەی. عەلی عەبدوڵڵا وەک ڕەمزی خەبات لە چلەکانەوە بە سەرکردایەتییەوە نووساو لە نیوقەڕن پتر هەر ماوە. خاڵ و خاڵۆزا و پوورزا و کەسوکاری بارزانی لەسەر سەرەتایی تراثی بارزانی بوونە فەرمانڕەوا و دەسەڵاتی پاش کۆنگرە. بەپێچەوانەوە سەرکردایەتیی یەکێتی و دەزگاکانی سیاسی و ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەیی و ڕاگەیاندنەکەی و تەنانەت نوێنەرەکانیشی لە دەرەوەی وڵات لە کەسانی لاو و بیر پێشکەوتوو و تازەپێشکەیشتووی مەیدانی سیاسەت و خەباتی چەکداری بوون و هیچ پەڵە و لەکەیەکی سیاسییان پێوە نەبوو.

٥. سەبارەت بەو هۆیانەی سەرەوە، پارتی لە قەبارەیەکی تەسک و گەشەنەکردوودا بوو لە ڕووی ڕێکخراوەیی و پێشمەرگانەوە، بەڵام یەکێتی لەگەڵ ئەو نوچدانە گەورەیەی کە لە کارەساتی هەکاری بەسەریدا هات، هێشتا بەردەوام لە گەشەکردن و خورتبوون و بەهێزبووندا بوو، سەبارەت بەو متمانە بەهێزەی کە لەناو جەماوەری کوردستاندا

بەدەستی هێنابوو، ئەویش لە ڕوانگەی بڕوابوون بە سەرچاوەی لەبڕاننەهاتووی جەماوەر.

٦. پارتی لە خاکی ئێراندا و زۆر دوور لە جەماوەری کوردستانی خوارووددا سیاسەت و پارتایەتیی دەکرد کە بەتەواوی لە بارودۆخی ئەوسای کوردستان دابڕابوون. یەکێتییش لەناو جەماوەر و لەسەر خاکی کوردستان و هاوبەشیکردنی ژان و ئازار و خۆزگە و ئاواتەکانی خەڵکی باشووری کوردستان خەباتی سیاسی و چەکداریی دەکرد.

٧. خەباتی سیاسی و پێشمەرگانەی پارتی لەناو ئێراندا دژی دەوڵەتی داگیرکەری ئێران و پشتیوانیی شۆڕشی کوردستانی ئێران نەبوو، بەڵکە لێدانی شۆڕش و پێشقەرەوڵی ئێران بوو. بەڵام یەکێتی خەباتی دژی داگیرکەری کوردستانی خواروو بوو، دژی ئەو داروودەستە و ڕژێمە بوو کە ئەندازیاری داڕشتنی پلانی جەزائیر و هۆی گەورەی ئاشبەتاڵ بوو.

ئەمانە و چەندین هۆی تر هەبوون کە هەندێکیان کۆنەقین بووە، کورد گوتەنی شەڕ بە کۆنەقین دەکرێ، وایان لە سەرانی پارتی و بەتایبەتی مەسعوود بارزانی کردبوو کە گرتنەبەری هەموو ڕێگەیەک بە جەلال بزانن بۆ تەختکردنی ئەو کۆسپە گەورەیەی بەردەمیان، ئەگەر نرخەکەی خوێن و فرمێسکی هەزاران ڕۆڵەی کوردی بێتاوانیش بێت. دەرئەنجامی ئەو هەموو ڕقوکینەیەی بنەماڵەی بارزانی و پاشان بەرهەمی تراژی بارزانی ئەوە بوو هەر لە سەرەتای ساڵی (١٩٨٣)ەوە تاوەکوو کۆتایی ساڵی ١٩٨٣، هەموو هێزە کوردستانی و کوردییەکان بە شەڕی ناوخۆوە خەریک بن، لە کاتێکدا باشترین هەلومەرج لەبەردەم دابوو بۆ لێدانی دوژمنی سەرەکی؛ بەعسی داگیرکەر، بە هۆی تێوەگلانی سوپا و هێزە چەکدارەکەیەوە لە شەڕی ئێراندا. تاڵترین بەرهەمی ئەو شەڕانە، ڕووداوی قرناقەو و پشتئاشان بوو کە چەندین فەرماندەی پێشمەرگانە و پێشمەرگەی زۆر ئازا و لێوەشاوە و خاوەن ئەزموونی پێشمەرگانەی لە هەموو لایەک تیا لەناو چوو، لە هەمان کاتیشدا سەلماندنێکی باش بوو کە بە گەلەکۆمەکی و شەڕی ناوخۆ خوێنڕێژی یەکتری، هیچ لایەنێک لەناو ناچێت و دەرناپەڕێنرێ. شەڕی قرناقە و پشتئاشان بنبەست و لەمپەڕێکی سیاسییانە و پێشمەرگانە بوو لەبەردەم شەڕی

ناوخۆ و خۆبەخۆدا کە دوای ئەو شەڕە ئیتر هەم حزبی شیوعی و هەم پاسۆک هاتنە سەر ئەو ڕایەی کە هەوڵی پێکهاتن و لێکنزیکبوونەوە بدرێت، بەڵام نەیانتوانی لەژێر پاڵەپەستۆی ئێراندا هەنگاوێکی بۆ بنێن، تا ڕادەیەک ئارامی کەوتەوە ناوچە ڕزگارکراوەکان، یەکێتی دەستبەتاڵ بوو بۆ لێدانی زەبری توند لە مۆڵگاکانی ڕژێم و یەکەم چالاکیی پێشمەرگانەی گەورەی؛ لێدانی ناوچەی خۆشناوەتیی ژێر دەسەڵاتی "ئەنوەر بەگی میران" و مۆڵگای بێتواتە و هەڵتەکاندنی تەخت و تاراجی ئەو ئیمارەتە بچکۆلەیە بەکرێگیراوە بوو. نەمانی مۆڵگای بێتواتە، ناوچەیەکی زۆر فراوانی لەژێر دەسەڵاتی ڕژێم ئازاد کرد کە لە چوارقوڕنەی بتوێنەوە تا نزیک بالیسانی خۆشناوەتیی دەگرتەوە. ئەگەر سەیری هەندێ دیکۆمێنت بکرێت، دەردەکەوێ کە پارتی دیموکراتی کوردستان لە کاری بەرەییەکەشیاندا لەگەڵ "جود" (بەرەی نیشتمانیی دیموکراتی)، واتە شیوعی و حسک و پاسۆکدا هەر پەیڕەوی تراثی بارزانییان کردووە، لەناو جودیشدا سەپاندوویانە کە دەبێت ئیدریس بارزانی؛ فەرماندەی گشتیی هێزی چەکداریی بەرە بێت و مەسعوود بارزانییش فەرماندەی گشتیی شۆڕشی کورد. لە ڕۆژی چوارشەممە، ١٩٨٣/٦/٨دا، "حەسۆ ژاژۆکی" لە ئەجەندەنامەکەیدا نووسیویەتی و دەڵێ: "بەرەی نیشتمانی (جود) یانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق، حزبی شیوعیی عێراق و حزبی سۆسیالیستی کوردستانی عێراق و پارتی سۆسیالیستی کورد قەراریان دا شەڕی مان و نەمان لەگەڵ جەلال و تاقمەکەی بکەن و کاک ئیدریس بارزانییان کردە قائیدی حرکە (مەسئولی سوپا)، کاک مەسعوود بارزانی کرا بە قائیدی عام بزووتنەوەی کورد." دیسان لە هەمان ڕۆژدا نووسیویەتی دەڵێ: "بەیانی زوو هەستامەوە چوومە لای برادەرێکی، پێم گوت: ئێوە کەی لە نەغەدە هاتوونەتەوە؟ جوابی دامەوە دوێنێ، پێم گوت: دەنگوباس چ هەنە؟ جوابی دامەوە گوتی: بەیانی قوەتەک ئەگاتە جێ و دووبەیانیش قوەتەک دێت لە ڕێگەی ناودەشت و ناوچەی باڵەکیش هەر خەریکی کۆکردنەوی قوەتن کە ڕەوانەی عێراقی بکەن، وا کاک مەسعوود و کاک ئیدریس خەریکی خۆئامادەکردنن کە بێن بۆ ئێرە. پێم گوت: وەکوو دەزانن خەریکی شەڕن یان نا؟ جوابی دامەوە گوتی کاکە گیان، ئەوەی ئێمە دەڵێین کاک مەسعوود و کاک ئیدریس عەینی قسەی دەکەن و قەراریان وایە ئەگەر جەلال لەناو نەبەن، ناتوانن

شۆڕش بکەن." وتووێژی کۆتایی ساڵی ١٩٨٣ و ١٩٨٤ی نێوان یەکێتی و ڕژێمی بەعس کرا و بێ ئەنجام لە ڕووی بەدەستهێنانی خواستەکانی شۆڕشی حوزەیران کە دیارە مەبەستی هەردوو لای گفتوگۆ پتر بۆ لابردنی ئەو گوشارە بوو کە کەوتبووە سەریان، یان لانی کەم سووککردن و خاوکردنەوەی. ڕژێمی بەعس کەوتبووە ژێر گوشاری هێرش و پەلاماری ئێران لە لایەک و گوشاری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە لایەکی ترەوە کە دەیویست لانی کەم خۆی لە شەڕی لایەکیان دەباز بکات، کە لەو کاتەدا پێی باشتر بوو شەڕی لەگەڵ یەکێتی ڕابگرێت بە هۆی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە داوای گفتوگۆ لە یەکێتی بکات. یەکێتیی نیشتمانییش کەوتبووە ژێر گوشاری حکومەتی ئێران و حکومەتی عێراق و بەرەی جودەوە و ناوبژیکەرییەکەی حزبی دیموکراتی لا پەسەند بوو بۆ نەهێشتنی لایەنێکی گوشارەکە. کەشوهەوای ماوەی گفتوگۆ؛ بارودۆخێکی نوێی بۆ یەکێتی لەناو کوردستان و لەگەڵ ئێرانیشدا هێنایە کایەوە دوای دەستپێکردنەوەی شەڕی یەکێتی لەگەڵ ڕژێمی بەعسییان، ئێران وردە وردە کەوتە پاشەکشەکردن لە دژایەتیی یەکێتی. بەرەی جود کە بە یارمەتی و هەڵنانی ئێران تەقەللای لەناوبردنی یەکێتییان دەدا، کەوتنە بەر شەقی زەمانە و ناچار بە خاوکردنەوەی دوژمنایەتییەکەیان کران. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان پاش سەرکەوتنەکانی لە شەڕی یەکەم و دووەمی جود، لەوە گەیشتن کە تەنیا بە ئاشتی و بە کاری بەرەیی دەتوانن هێزەکانی گۆڕەپانی شۆڕش یەک بخەن و لەو هەلە لەبارەی شەڕی ئێران-عێراقدا ڕژێم ناچار بە داننان بە مافەکانی کورد بکەن. ئێران بۆ سەرخستنی نەخشەکانی لە پەلاماردانی عێراق لە کوردستانەوە و کەمکردنەوەی گوشاری سوپای عێراقی لە بەرەی فاو لە خوارووی عێراق، پێویستی بە هێزێکی ناوخۆیی کوردی هەبوو کە ڕۆڵی کاریگەریان هەبێت لە لێدانی هێزەکانی ڕژێمی عێراقی. ئەمانە و گەلێ هۆی تری ناوەکی و دەرەکی بوونە هەوێنی دروستکردنی تەقەللایەکی هەمەلایەنەی درێژخایەن بۆ ئاشتبوونەوەی گشتی و پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی و سڕکردنی یا ڕاگرتنی پەیڕەوکردنی تراثی بارزانی. پرۆسێسی پێکهاتنی بەرەی کوردستانی بە دەستپێشکەریی یەکێتیی نیشتمانی؛ نزیکەی دوو ساڵی خایاند، بۆ یەکەم جار بوو لە مێژووی خەباتی چەکداریی گەلی کورددا بەرەیەکی یەکگرتووی

کوردستانی پێک بێت، هێز و توانای شۆڕش و جەماوەر و یەکێتی ڕێک بخرێ و یەک هێز و یەک توانا و یەک بڕیار ڕووبەڕووی دوژمنی سەرەکیی هەموو لایەنەکان ببنەوە.

بەرەی کوردستانی تینوتاو هیوایەکی زۆری لە دڵ و دەروون و بیری سەرجەمی کورددا پەیدا کرد، بەرەی کوردستانی هەوێنی هەرە کاریگەری خۆڕاگری شۆڕشی کورد و حزب و ڕێکخراوە کوردستانییەکان بوو، لەبەرامبەری پلانە گەورەکەی ڕاگرتنی شەڕی عێراق-ئێران و هێرش و پەلاماری ئەنفالە بەدناوەکانی ڕژێمی عێراقی. بەرەی کوردستانی ئەو ئامێرە گەورەیە بوو کە توانیی هێز و توانای جەماوەری ڕاپەڕیو یەک بخاتەوە و سوود لەو هەلومەرجە وەربگرێت کە بە هۆی شەڕی عێراق-کوێت و شکانی عێراق لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە هاتە کایەوە. دەتوانم زۆر بەڕاشکاوی بڵێم گەر بەرەی کوردستانی نەبووایە، لەو پاشاگەردانییەدا لەو هەلومەرجی ڕاپەڕینەدا، شەڕێکی ناوخۆی ئەوتۆ بەرپا دەبوو کە هەتاهەتایە پەڵەی ڕەش بووایە بە مێژووی گەلی کوردەوە. ئاشتی و تەبایی و کاری بەکۆمەڵ و هەڵبژاردن و پەرلەمان و حکومەتی فیدڕالیی کوردستان، هەمووی بە هۆی بەرەی کوردستانی و بەرهەمی بەرەی کوردستانی بوون.

تا ئێرە ئەڵقەکانمان لەسەر ئاوڕێک بۆ ڕابردوو بوو، لە ئەڵقەکانی داهاتوودا با پێکەوە تێڕوانینێک لە ئێستای کوردستان بکەین و پاشان بیرێکیش لە داهاتوو بکەینەوە.

## ئەڵقەی هەشتەم

## ستراتیژی داگیرکەران و ستراتیژی پارتی لەسەر کێشەی کورد یەک دەگرنەوە

هەر لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتیی دەوڵەتی سەفەویی فارسی و دەوڵەتی عوسمانیی تورکییەوە تا ئەمڕۆ، داگیرکەرانی کوردستان لەگەڵ ئەو هەموو ناکۆکی و ململانێیانەی نێوان خۆیان، لەگەڵ ئەو هەموو گیروگرفت و ئاڵۆزییەی نێوان خۆیان، لەگەڵ ئەو هەموو ڕقوکینە و بڕوبیانووگرتنەی نێوان خۆیان، کە چەندین جار گەیشتۆتە

ڕادەی هێرش و پەلامار بۆ سەر یەکتری و شەڕ و پێکدادانی قورس لە نێوانیاندا، بەڵام لەسەر یەک شت، لە یەک خاڵدا و بەرامبەر یەک مەسەلە لە ڕووی ستراتیجی سیاسییانەوە یەکگرتوو بوون، یەک بڕیار بوون و یەک بیر بوون، ئەویش کێشەی کوردە. داگیرکەرانی کوردستان گەلێ جار کارتی کێشەی کوردیان لە پارچەیەکی دژی بەرژەوەندیی یەکتری بەکار هێناوە، بەڵام کە کێشەی کورد لەو پارچەیە قەبە بووە و گەشەی کردووە، گەیشتۆتە ڕادەی دەنگدانەوەی لە دەرەوەی سنووری داگیرکەران، خێرا داگیرکەران یەکیان گرتۆتەوە و دەنگ و ڕەنگی کێشەی کوردیان جارێکی تر کردۆتەوە بە ژێر تەمومژی سیاسەتی نێودەوڵەتیی خۆیانەوە. باری مەسەلەی کورد لە ئاخروئۆخری ئەم سەدەیەدا لە هەموو کاتێکی تری لەوەوبەر، بۆ لێدوان و تاووتوێکردن و لێکۆڵینەوە، چ لەسەر ئاستی جیهانی و چ لەسەر ئاستی وڵاتانی دەوروبەرە، چ لە ئاستی ناوخۆشدا پتر لەبار بووە، بەڵام داگیرکەرانی کوردستان، سەرەڕای ململانێی پلە یەکی ناوخۆیان، سەرەڕای پەلاماردانی یەکتری و تێبڕینی چاوی تەماحکاریی داگیرکەرانە بۆ یەکتری، هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ نەهێشتنی ئەو بارە لەبارەی هەڵکەوتووە بۆ مەسەلەی کورد.

## بارودۆخێکی ڕەخساو

بۆ یەکەم جار و ناوازەش بووە کە گەلی کورد لە پارچەیەکی کوردستاندا سوودی لە شەڕوشۆڕی نێوان دەوڵەتە داگیرکەرەکەی و نێوان لایەنێکی تر وەرگرتبێ، ئەویش شەڕی عێراق و کوێت بوو. لە ڕووی نێونەتەوەییەوە کەشوهەوایەکی لەبار ڕەخسابوو بە هۆی نەمانی شەڕی سارد و ڕووخانی دەوڵەتانی بەناو سۆسیالیستی و سەرهەڵدانی پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی و تەنانەت مەزهەبییش. لە ڕووی سیاسەتی دەوڵەتانی دەوروبەرەوە بەرامبەر بە عێراقی داگیرکەری پارچەیەکی کوردستان، گەرچی لەگەڵ پێکهێنانی دەوڵەتێکی نەتەوەیی کوردی نەبوون، بەڵام بڕیاری نێونەتەوەیی دا بۆ سزادانی عێراق. زۆر لەبار بوو بۆ ڕەنگدانەوەی مەسەلەی کورد لەسەر مێزی لێدوانی نێونەتەوەییدا و پاشان پشتگرتنیشی لە بەکارهێنانی مافی خۆی لە بەڕێوەبردنی خۆیدا لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا. لە ڕووی باری ناوخۆوە، بوونی بەرەی کوردستانی

ئەو هەلومەرجەی قۆستەوە بۆ بەپیرەوەچوونی سیاسەتی نێونەتەوەیی و دەوڵەتانی دەوروبەر و پاشان ڕاپەڕینی جەماوەر.

## هەلێکی مێژوویی

ئەم هەلە مێژووییەی ئەم جارە بە جۆرێک هەڵکەوتبوو کە نە لە دەسەڵاتی ئێران و نە عێراق و نە تورکیادا نەبوو ڕاستەوخۆ بتوانن لەباری بەرن، ئەویش سەبارەت بەو بارە ڕەخساوە بۆ کێشەی کورد لەسەر ئاستی نێونەتەوەیی جیهانیدا بوو. بەبەر چاوی دەوڵەتە داگیرکەرەکانەوە ڕاپەڕین کرا و سوپا و دامودەزگای خۆسەپێنەری عێراق لە باشووری کوردستاندا شاربەدەر و کوردستان بەدەر کرا، داگیرکەران هیچیان بۆ نەکرا و پێ نەکرا بۆ لێدانی ئەو بەرخۆدانە. هەڵبژاردن کرا و ئەنجوومەنی پەرلەمان و حکومەتی فیدراڵ پێک هات و داگیرکەران دیسانەوە بە هەوڵ و تەقەللایەکی بێوێنەوە نەیانتوانی ڕێی لێ بگرن. پشتیوانیی ئەمەریکا و وڵاتانی ئەورووپا بەئاشکرا و بێ پەردە بۆ حکومەتی فیدڕالیی کوردستان لە باشووری کوردستاندا بە جۆرێک کە تا ئەمڕۆ بێوێنە بووە لە مێژووی کورددا. دیسانەوە داگیرکەرانی عێراق و تورکیا و ئێران بۆیان نەکرا ئەو پشتیوانییە نەیەڵن -وەک داواکەی مەنگۆلیای شەعبی بۆ باسی کێشەی کورد لە کۆبوونەوەی نێونەتەوەییدا لە ساڵی ١٩٦٣دا کە پاش یەک هەفتە داواکارییەکەیان پێ کێشایەوە- ئەمیش لەبار بەرن.

بۆ یەکەم جار بووە ڕای گشتیی جیهانی و عەرەبی و ناوخۆیی عێراقیش گەیشتبێتە ئەو ڕادەیەی کە لە کوردستانی فیدڕالی ئازاد کراوە، وە هەوڵ و تەقەللای ڕووخاندنی ڕژێمی دەوڵەتێکی داگیرکەر بدرێ و پلان و نەخشەی بۆ بکێشرێ، کە هەمیشە لەوەوپێش، هەر لە ڕێگەی داگیرکەری عێراقییەوە، دەوڵەتانی دەرەوە و دراوسێ نەخشەی لەباربردنی مەسەلەی کوردیان کێشاوە، بەڵام ئەوەی داگیرکەران بۆیان جێبەجێ نەکرا، پارتی بارزانی بە پلان و نەخشەیەکی هاوبەش لەگەڵ عێراق و تورکیادا جێبەجێی کرد. لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٣دا، بۆ عێراق و تورکیا و ئێرانیش دەرکەوت کە هەموو هەوڵەکانی لەوەوبەریان بۆ دابڕینی کێشەی کورد لە جوغزی پشتگیریی نێونەتەوەییدا، بێهوودە و بێئەنجام بوو، بۆیە بەلایانەوە باشترین نەخشە ئەوە بوو کە

ڕا و هەوڵ و پشتیوانیی نێونەتەوەیی بۆ گەلی کورد لە قوزاخەی ناوبژیکەری شەڕی ناوخۆدا قەتیس بکەن و نەیانپەرژێتە سەر سەقامگیرکردنی پەرلەمانی کوردستان و حکومەتی فیدراڵیی کوردستان و یارمەتیدان بۆ بووژاندنەوە و بەرەوپێشبردنی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و شارستانیەتی باشووری کوردستان و لە ڕێگەی حکومەتی فیدڕالی کوردستانەوە، نموونەی دیموکراتی سەردەم لەو ناوچەیەدا ڕەنگ پێ بدرێتەوە و هەر لەوێشەوە کار بکاتە سەرباری ناوخۆی عێراق.

## هەنگاوی یەکەم

پارتی بارزانی لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٩٢)ەوە کەوتە جێبەجێکردنی ئەو نەخشە چەند قۆڵییە، یەکەم گورزی ئاراستەی بەرەی کوردستانی کرد و بەرەی هەڵوەشاندەوە بە پێشێلکردنی سەرەتا سەرەکییەکەی بەرە کە هاوکاری و هاوخەباتی و هاوبەشی کارکردنی ئازاد و دیموکراتییانە بوو لە سەرتاسەری باشووری کوردستاندا. کەوتە بەکارهێنانی پلانە کۆنەکەی ساڵانی ڕابردووی (تاک دەسەڵاتی و خۆداسەپێنەری و گەلەکۆمەکە)، بەڵام ئەم جارەیان بە فشار خستنە سەر حزب و ڕێکخراوەکانی ناوبەرە لە ناوچەی بادینانا بۆ جێبەجێکردنی یەک لەم دوو مەبەستە:

- تواندنەوە و خۆهەڵوەشاندنەوە و تێکەڵبوونەوەیان بە پارتیی بارزانی.
- گەر ئەوە نەکرا، دەرپەڕاندنیان لە بادینانا و پاوانکردنی ئەو ناوچەیە لە قۆناغی یەکەمدا.

## هەنگاوی دووەم

پاش هەڵێنانی ئەم هەنگاوە و تا ڕادەی سەرکەوتنیان لەو مەیدانەدا، کەوتنە هاویشتنی هەنگاوی دووەم کە ئەویش دروستکردن و قووڵکردنەوەی کێشە و ئاژاوە و پشێوی بوو لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیدا، بۆ گەیاندنی بە توندترین پلەی کە بەرپاکردنی شەڕی ناوخۆ و کوردکوژی بوو.

بە جێبەجێکردنی ئەو پلانە، پارتیی بارزانی توانیی باری سەرنجی نێودەوڵەتی و نێونەتەوەیی لەسەر کێشەی کورد، لە یارمەتیدان و پشتگیریکردنەوە بگۆڕێ بۆ

خەریک بوون بە ناوبژیکردن. ئەمە لە لایەک و لە لایەکی تریشەوە بۆشاییەکی ئەوتۆ پێک بێنێ کە هەم ڕژێمی سەدام و هەم تورکیا و ئێرانیش مەودای دەستدرێژی و دەستتێوەردانیان بۆ بڕەخسێ.

## لەباربردنی هەلە مێژووییەکە

وا سێ ساڵ پترە پارتیی بارزانی ئەندازیاری هەڵتەکاندن و لەباربردن و لەناوبردنی ئەو هەلە مێژوویی ناوازەیەیە کە بۆ باشووری کوردستان هەڵکەوت، بە شێوەیەکی بەرنامەڕێژی هەنگاوەکانی بۆ هەڵهێناوە و بۆشی هەڵدێنێ، بەم شێوەی خوارەوە:

١. لێدانی بەرەی کوردستانی و پێشێلکردنی سەرەتاکانی کاری بەرەیی.

٢. پووچەڵکردنی سەرەتای کاری پەرلەمانتاری و پێشێلکردنی دیموکراتی بە داسەپاندنی بڕیاری پەنجا بە پەنجا.

٣. داتاشینی بڕوبیانوو و کێشەی نابەجێ لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا و پاشان تەقاندنەوەی و گەیاندنی بە پلەی شەڕهەڵگیرساندن و کوردکوژی و خۆکوژی.

٤. لەباربردنی ئەو هەوڵ و تەقەللایەی کە درا بۆ یەکخستنی خەباتی گەلانی عێراقی بە پێکهێنانی کۆنگرەی نیشتمانیی عێراقی و سەنگ و قورسایی ئەو ئۆپۆزسیۆنە نیمچەیەکگرتووە لە تای تەرازووی هاوکاریی نێودەوڵەتاندا، بۆ مەبەستی لاوازکردنی دەسەڵاتی سەدام و بەعس و پاشان ڕووخاندنی و بنیاتنانی دەوڵەتێکی دیموکراتی.

٥. ئابڵوقەی ئابووریی خستنە سەر ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی یەکێتیی نیشتمانی بە جۆرێ کە گەلی توندوتیژتر و کاریگەرتر بوو لە ئابڵوقە ئابوورییەکەی ڕژێمی سەدام و دەوڵەتان لەسەر عێراق و باشووری کوردستان.

٦. بەکارهێنانی سیاسەتی برسیکردنی جەماوەر، بێورەییکردنی جەماوەر، پاشان کۆچ و ڕەوپێکردنی جەماوەر لەسەر خاکی دایک.

٧. زەمینەسازکردن بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی و داگیرکەری عێراقی بۆ سەر باشووری کوردستان و جێبەجێکردنی ئەو نەخشەیەش لە ٣١ی ئابی ١٩٩٦.

٨. لە کاتی سەرکەوتنی نەخشەی سەپاندنی تاوانباری و بەدناوەکەی ٣١ی

ئاب، بڕیاری دابوو بە قۆناغ نەخشەی سەپاندنی دەسەڵاتی عەشرەتی و خێڵەکیەتیی هەڵقولاوی توراسی بارزانی جێبەجێ بکات لە سەرتاسەری باشووری کوردستان.

٩. پاش سەرنەکەوتنی لە گێڕانەوەی دەسەڵاتی سەدام بارزانیدا بۆ سەر سەرتاسەری باشووری کوردستان، کەوتە جێبەجێکردنی نەخشە داڕێژراوەکەی دووهەمی کە بریتی بوو لە "گێڕانەوەی عێراقی دابڕاو بۆ نێو باوەشی بەزەیی هەندێ لە دەوڵەتانی عەرەبی و دەوروبەر، پاشان ڕێخۆشکردن بۆ دەربازکردن لە سزای نێونەتەوەیی"، ئەوەش بە هێنانی سوپای تورک بۆ سەر باشووری کوردستان لە ١٩٩٧/٥/١٤.

١٠. دوا تەقەللای پارتیی بارزانی، دووبارە هێنانەوەی سوپای تورکە بۆ سەر باشووری کوردستان کە لە ١٩٩٧/٩/٢٦دا دەستی پێ کرد.

١١. بێ پشوودان و بێ ماندووبوون، بێ سڵ لەگەڵ جەماوەر کردن، بێ گوێدانە هیچ پێوانەیەکی نەتەوەیی و مرۆڤایەتی و دیموکراتی و تەنانەت نەریتەکانی کوردەواری لە حەیا و شەرەف و ئابڕوودا، پارتیی بارزانی لە خولیای جێبەجێکردنی فەلسەفە بێبایەخەکەی تراسی بارزانیدان. "هیی خۆم دەخۆم، هیی تۆش دەخۆم، گەر بۆم نەکرا هەڵدێم دەڕۆم"، کە بریتییە لە دەستبەسەرداگرتنی هەموو باشووری کوردستان و گێڕانەوەی بۆ سەردەمی ئۆتۆنۆمییە داتاشراوەکەی سەدام، کە بەم کارە دەتوانن باشووری کوردستان بگێڕنەوە دۆخی سەرەتای حەفتاکان و ئەم ئاواتەیان بێتە دی:

- دەیسەلمێنن کە ئەوەی بارزانی مستەفا داوای کرد و بڕوای پێ بوو و بەدیی هێنابوو، هەر ئەوە دەگونجێ وەک چارەسەر بۆ مەسەلەی کورد.
- دڵنیاکردنی عێراق کە پارتیی بارزانی باشترین پارێزەری سنووری پیرۆزی عێراقە و باشترین پشتیوانی پاراستنی دەسەڵاتی سەدام و بەعسییە.
- دڵنیاکردنی تورکیا کە پارتیی بارزانی دڵسۆزترین و گەورەترین هێزی چەکداری بەکرێگیراوییە بۆ پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی تورکیا لەسەرووی کوردستاندا.
- دڵنیاکردنی سووریا و ئێرانیش کە پارتیی بارزانی دوژمنی سەرسەخت و کۆسپی هەرە گەورەی بەردەم هەموو بیروبۆچوون و هێز و تاقم و ڕێکخراوێکی کوردی و کوردستانییە، کە بیانەوێ هێندەی تۆزقاڵێک لە ئارامی و ئاسایشی عێراق و

ئێران بشێوێنن، گەر بە زیانی هەموو نەتەوەی کورد و ئایندەی هەموو کوردستانیش تەواو ببێ.

## بەرەی کوردستانی، چۆن و بۆچی پێک هات؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لە ڕووە سادەکەیەوە و بێ شۆڕبوونەوە بەناو ناخی هەموو شادەمارەکانیدا، لەلای زۆربەی هەرە زۆری جەماوەری کوردستان هەیە، بەڵام بەقووڵی و بە هەموو نهێنییە شاردراوەکانیەوە تەنیا لەلای سەرانی حزب و ڕێکخراوە بەشداربووەکانی بەرەی کوردستانی پەیدا دەبێ، کە لەدایکبوونی بەرە چەند ساڵ و چەند ژان و چەند دانوستاندنی خواست و پاشان چەند پێ لە جەرگ خشاندنیشی ویست لەلایەن زۆربەی لایەنەکانی بەرەوە بۆ دڵنەواییکردنی لایەک یا دوو لای بەرە، تەنیا بۆ پێکهاتن و لەدایکبوونی ئەو بەرەیەی کە بە داخێکی زۆرەوە زۆر تەمەن کورت بوو.

## جاڕدانی ئاشتبوونەوەی گشتی

دوای سەرنەکەوتنی گفتوگۆی نێوان ڕژێمەکەی سەدام بەعسی و یەکێتیی نیشتمانی ساڵی ١٩٨٥دا و سەبارەت بەو بارودۆخەی کە هەموو لایەنە سیاسییەکانی کوردی تێدا دەژیان و بە زۆر و زۆر و دەگەنەکی لاوەکییش و پێداویستیی ئەو کاتەیش، هەموو لایەنەکان ئەوەیان سەلماند کە ئاشتبوونەوەیەکی گشتی بکرێ. ئاشتبوونەوەی گشتییش ڕێگە بۆ گەشەکردنی بیری نیمچە یەکگرتنی هەموو حزب و هێزە سیاسییەکان خۆش کرد و یەکێتیی نیشتمانی پێشدەستی هەڵدانی بانگەوازی، هەوڵی پێکهێنانی بەرەی کوردستانیی کرد بە ناردنی نامەیەکی جەلال تاڵەبانی بۆ سەرانی پارتی، حسک، پاسۆک، پارتی گەل. لە ڕۆژی ١٩٨٧/٤/٢٢دا، بڕیاری داڕشتنی بەرنامەی بەرە درا.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، پرۆژەی "میثاق الجبهة الكردستانية"ی ئامادەکراوی لەو کۆبوونەوەیەدا دا بە هەموو لایەنەکان. پرۆژەکەی یەکێتی ئەو کاتە بەلای زۆربەی لایەنەکانەوە تێروپڕ و چڕ بوو، بەڵام بەلای حزبی شیوعی و پارتییشەوە، پێویستی بە

دەستکاری و گۆڕانکاری بوو، بەتایبەت لەو مەسەلانەی کە پەیوەندیی بە:

- ئایندەی عێراق و کوردستان
- هاوخەباتیی گەلی کورد و نەتەوەی عەرەبی
- کێشەی فەڵەستین
- پەیڕەوی ناوخۆی بەرە
- پێشەکیی پرۆژەکەی یەکێتی کە (٨) لاپەڕە بوو، لەسەر مێژووی کورد و بزووتنەوە سیاسییەکەی.

بەکورتی پرۆژەکەی یەکێتی لە ٢٦ لاپەڕەیەک پێک هاتبوو، پاش هێنان و بردنێکی زۆر و قرتاندن و قارسکردنێکی زۆرتر، لە مانگی ١٩٨٨/٣دا پرۆژەی بەرەی کوردستانی عێراق لەلایەن پاسۆک، حسک، یەکێتی، پارتی، شیوعی و پارتی گەلەوە پەسەند کرا و پاشان بە ناوی "میثاق الجبهة الكردستانية العيراقية" بڵاو کرایەوە لە ١٥ لاپەڕەی فۆلسکابدا، دواییش لە نامیلکەیەکی مامناوەندیدا چاپ کرا.

بەرەی کوردستانی کە لە ١٩٨٨ لەدایک بوو، لە چوار ساڵ پتر تەمەنی درێژەی نەکێشا و بە کردەوە لە ساڵی ١٩٩٢ بەدواوە لە پەلوپۆ خرا. میثاقی بەرە کە لە ١٢ بەش (فەسڵ) پێک هاتبوو، پتر پەیوەندیی بە ئایندەی عێراق پاش ڕووخانی ڕژێمی سەدامی بەعسی و پێکهێنانی بەرەیەکی سەرتاسەریی عێراقی و بنیاتنانی دەوڵەتێکی هەمەلایەنەی نیشتمانیی دیموکراسی (ائتلافي وطني ديمقراطي)یەوە هەبوو، کە ئەم بەشەیان جێبەجێکردن و نەکردنی پەیوەست بوو بە بارودۆخی ئەوسا و ئایندەی ئۆپۆزسیۆنی عەرەبی و کەمایەتیی نەتەوەیی عێراقییەوە و ڕەنگە پرۆسەیەکی درێژخایەنی بویستایە بۆ پێکهێنانی ئەو بەرەیە و پاشان ڕەدەڵ و بەدەڵێکی زۆریشی لەسەر بکرایە، هەر چەندە شەڕی عێراق و کوێت و تێکشکانی عێراق و ئابڵووقەی نێونەتەوەیی لەسەر عێراق، زەمانە و زەمینێکی زۆر لەباری بۆ کورتکردنەوەی ئەو پرۆسەیەش هێنایە کایەوە. گەر بەرەی کوردستانی لەبار نەبرایە و گەشەی پێ بدرایە و بەپێی پەیڕەوی ناوخۆکەی کاری پێ بکرایە، کەشوهەوایەکی زۆر لەباری بۆ دروستبوون و سەرکەوتنی بەرە عێراقییەکەش دەڕەخساند. بەڵام خۆ پەیڕەوە ناوخۆکەی بەرە بە جۆرێکی وا داڕێژرابوو کە گەورەترین لەمپەڕی لەبەردەم

دروستبوونی ناتەبایی و ناکۆکی و پێکداهەڵپرژانی لایەنە کوردستانییەکان دروست کردبوو. یەکسانی و ئازادی و دیموکراتی بۆ هەموو لایەنەکانی بەرە و لەناو هەموو دەزگاکانی بەرەدا بە جۆرێک فەراهەم کرابوو کە هیچ گوێ نەدرابووە بچووکی و گەورەیی چەندایەتیی ئەم یا ئەو لایەن، گەر بهاتبایە و کار لەسەر چوار بەندەکەی پەیڕەوی نێوخۆی بەرە بکرایە لەناو دەزگاکانی بەرەدا، پێش ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕین و هەڵبژاردنیش لەناو پەرلەمان و وەزارەتی حکومەتی فیدڕالدا، گومان لەوەدا نییە کە تەباییترین و ڕێکوپێکترین پەرلەمان و وەزارەتمان دەبوو، حکومەتێکی فیدڕالیی یەک و یەکگرتوو، کوردستانێکی ئازاد و دیموکرات و ئارام لەگۆڕێدا دەبوو.

## دەزگاکانی بەرە

بەندی چوارەمی پەیڕەوی ناوخۆی بەرە تایبەت بوو بە دەزگاکانی بەرەوە، کە ئەمانەی خوارەوە بوون:

١. سەرکردایەتییەکی سیاسیی بەرەیی پێک هاتبوو لە نوێنەرانی هەموو لایەنەکانی بەرە بۆ ڕابەرایەتیکردنی بەرە و داموودەزگاکانی تری.

٢. دەزگای بەڕێوەبەرایەتیی بەرەیی، کە هەمان ئەرکی وەزارەتی حکومەتی فیدڕالیی پاش هەڵبژاردنی لەئەستۆ بوو.

٣. ئەنجوومەنی نیشتمانیی کوردستان، هەمان ئەرکی پەرلەمانی پاش هەڵبژاردنی لەئەستۆ بوو.

٤. دەزگای پەیوەندییە گشتییەکان

٥. دەزگای ڕاگەیاندن

٦. دەزگای کاروباری کارگوزاری و کۆمەڵایەتی و دادوەری

٧. دەزگای کاروباری ئایینی

٨. دەزگای دارایی

٩. دەزگای ڕێکخراوە پیشەیی و دیموکراتییەکان

## لادان لە ڕێبازی بەرە

ئەگەر ناوەڕۆک و گەوهەری ئەرک و فەرمان و مافەکانی دەزگاکانی بەرە وەک لە پەیڕەوی ناوخۆدا داڕێژرابوو، لەناو پەرلەمان و وەزارەت و دامودەزگاکانی حکومەتی فیدراڵدا ڕەنگی بدایەتەوە، بێگومان لە پێنج ساڵ لەمەوبەر و ئێستا و ئایندەش ئەو مێژووە پڕ شەرمەزارییە لە باشووری کوردستاندا تۆمار نەدەکرا و ئەو دیاردە دزێو و نەفرەتلێکراوانەی خوارەوەش سەری هەڵنەدەدا.

١. بەزۆر داسەپاندنی پەسەندکردن و پەیڕەوکردنی ڕێچکەی ڕێژەیی لە هەڵبژاردندا و پەسەندنەکردنی ڕێچکەی بازنەیی لەلایەن پارتی دیموکراتەوە و لایەنگریکردنیشی لە هەندێ لای ترەوە، کە ئەمەش ڕێخۆشکەر بوو بۆ لێدانی سەرەتای کاری بەرەیی لە پەرلەماندا و هاتنەکایەی هەوێسارییەکەی پەنجا بە پەنجا. ئەم هەنگاوە بووە هۆی بێبەریکردنی لایەنەکانی تری ناو بەرە و کەسایەتیی نیشتمانپەروەری ناسراوی کوردی و خاوەن توانا و ئەزموون و پسپۆڕەکانی کوردی لە کاری پەرلەمانتاریدا لە لایەک و لە لایەکی تریشەوە تێخزانی زۆر کەسی بێتوانا و بێئەزموون و هیچ لە یاسا تێنەگەیشتوو و تەنانەت نەخوێندەواریش بۆ ناو پەرلەمان.

٢. زیندووبوونەوەی گیانی داسەپاندنی تاک دەسەڵاتی و شەڕە کورسی و بەربەرەکانیکردنی یەکتری و لادان لە هەموو عورف و یاسایەکی پەرلەمانتاری لەناو پەرلەماندا لەنێوان دوو لایەنەکەی پەرلەمان.

٣. ڕەنگدانەوەی هەمان دیاردەی نانیشتمانپەروەری و نادەوڵەتی و ناسیاسی و نایاسایی لەناو وەزارەتی حکومەتی فیدڕاڵ و هەموو دامودەزگاکانی حکومەتی فیدڕاڵدا، کە حاڵ و باری ئەمیشیان لە هیی پەرلەمان باشتر نەبوو، لە سەرەکوەزیرانەوە هەوێساری بوو تا دەگاتە بچووکترین مووچەخۆر لە سەرجەم دەزگاکانی حکومەتی فیدڕاڵدا. ئەم کارە هێندەی تر بارودۆخی نائارامی و پشێوی و ئاڵۆزی و توندوتیژکردنی ناکۆکییەکانی لەبار کرد و بۆشاییەکی ئەوتۆی هێنایە گۆڕێ کە شوێنی لایەنەکانی بەرە و کەسانی شایستە و لێهاتوو و خاوەن ئەزموون نیشتمانپەروەرەکان، بە بەکرێگیراوەکان و گومانلێکراوان و تابوورە ڕستکراو و پەروەردەکراوەکەی ٢٠

ساڵەی قوتابخانەکەی بەعسیان پڕ بکرێتەوە.

٤. بوونی دوو دەسەڵات لە حکومەتی فیدڕاڵ ڕێگەی بۆ پێشبڕکەی ناشەریفانە خۆش کرد، لە خۆبەهێزکردن و خۆپڕچەککردن و خودەوڵەمەندکردن و قەبەکردنی دەسەڵاتی چەکداری، بێ گوێدانە چۆنایەتی و ئایندەی ترسناکی ئەو سیاسەتە: کە هەر لەم سەروچاوەیەشەوە دزی و ڕاووڕووت و ئاودیوکردن و بەرەڵایی جۆگەی خۆیان هەڵبەست.

٥. سەرهەڵدانی سیاسەتی پاوانکردن و ناوچەگەرێتی و لەوێشەوە هەڵگیرساندنی ئاگری شەڕی کوردکوژی و دەستبەسەرداگرتنی سامانی نەتەوەیی. دیارە چەندین و چەندین دیاردەی تری دزێو و ناشرین لە ئەنجامی سەرنەکەوتنی بەرە و پاشان هەڵوەشاندنەوەی؛ سەری هەڵدا، کە هەمووی تفی سەربەرەوژوورە و چۆنی هەڵدەین؛ سەرووی خۆمان دەگرێتەوە.

## لێرەدا پرسیارێک دێتە پێش: کێ بەرپرسیارە لە نەمانی بەرە و هەڵوەشاندنەوەی؟ چۆن هەنگاو نرا بۆ هەڵوەشاندنەوەی بەرە؟

پاش ڕاپەڕین و دیسان کۆچ و ڕەوی بەکۆمەڵی ٣ ملیۆن کەسی کورد و دانانی هێڵی ٣٦ بە ناوەندی ئاسایش و ئارامیی خەڵکی کورد و گەڕانەوەی ئاوارەکان، ڕژێمی سەدام لە ١٩٩١/١٠/٢٤دا هەموو دامودەزگا دەوڵەتییەکەی خۆی لە باشووری کوردستان کێشایەوە و بۆشاییەکی ترسناکی ئیداری و سیاسی و ئابووریی بەجێ هێشت. بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو هەنگاوە دڕندانەیەی ڕژێمی سەدام، بەرەی کوردستانی بڕیاری دەستپێکردنی هەڵبژاردن و دانانی پەرلەمان و حکومەتی فیدڕاڵی کوردستانیان دا بە مەبەستی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە و کەڵکوەرگرتن لەو هەلومەرجی ڕەخساوەش.

پێش هەڵبژاردن کە داوای پارتی دیموکراتی کوردستان سەر کەوت بۆ ڕێچکەی هەڵبژاردنی ڕێژەیی، حزبی سۆسیالیست و پارتی سەربەخۆیی واتە حسک و پاسۆک بڕیاریان دا یەک بگرنەوە و یەک سەرکردایەتیی هاوبەش پێک بێنن و یەک لیستی هەڵبژاردنیان هەبێ. ئەمە وەک هەنگاوی یەکەم، دوو لایەنی ناو بەرە بۆ بە یەک لایەن، هەروەک لە بەیانی ڕۆژی ١٩٩٢/٥/٢٤یاندا هاتبوو کە سەبارەت بە ئەنجامی

هەڵبژاردنی ڕۆژی ١٩٩٢/٥/١٩ دەریانکرد. هەر دوو مانگ دوای ئەوە، بە هاندانی پارتی؛ سەرکردایەتیی هاوبەش و پارتی گەلیش کەوتنە ڕەدەڵ و بەدەڵی یەکگرتنەوە، تا لە ١٩٩٢/٨/٢٧دا کۆنگرەیەکی هاوبەشیان گرت و هەرسێ لایەنەکە، واتە حسک و پاسۆک و پارتی گەل، یەک حزبیان پێک هێنا بە ناوی حزبی یەکگرتنی کوردستان. بەو جۆرە پاش هەڵبژاردن بە ماوەیەکی کەم، لایەنەکانی بەرەی کوردستانی لە ٦ لایەنەوە بوونە چوار لایەن: شیوعی، پارتی، یەکێتی و یەکگرتن. بارودۆخی کوردستانی فیدڕاڵ و ژێر سایەی پەرلەمانی ٥٠ بە ٥٠، گۆڕانکاریی زۆر کتوپڕی بەسەر حزبە سیاسییەکاندا هێنا کە زۆر بەشێنەیی و بێ چەند و چون زۆربەیان ئامادەی لەدەستدانی سەربەخۆیی سیاسی و ڕێکخراوەی تەمەن ١٥ ساڵ و ١٨ ساڵ و ١٤ ساڵ و پتریش بوون. کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و یەکێتیی شۆڕشگێڕان کە دوو باڵی سەرەکیی ناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوون، لە کۆنگرەی یەکەمی یەکێتیدا لە مانگی ١٩٩٢/١دا خۆیان لەناو یەکێتیی نیشتمانیدا هەڵوەشاندەوە. حزبی یەکگرتن لە کۆنگرەی دەهەمی پارتی دیموکراتی کوردستاندا خۆیان هەڵوەشاندەوە و تێکەڵ بە پارتی دیموکرات بوون، کە لە دواییدا لەسەر شێوەی دابەشکردنی کاری لێپرسراوێتی؛ هەندێکیان لە پارتی هاتنە دەرەوە، دیسان خۆیان بە دروستکردنەوەی حزبەکەیانەوە خەریک کردەوە. لە ماوەیەکی زۆر کورتدا، ئاڵای شۆڕش و باڵێکی حزبی زەحمەتکێشانیش خۆیان تێکەڵ بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کرد. دیارە ئەم هەموو ڕووداوانەی کە لە ماوەیەکی یەکجار کورتدا، گەر بە پێوانەی تەمەنی ئەو لایەنانە و جیاوازیی بیر و ئایدۆلۆجی و درووشمی سیاسییان هەڵیانسەنگێنی، لە کاری "موعجیزە"یی دەچوون، زیاتر وەک لە هەستکردن بە لێپرساوی بەرامبەر بەرژەوەندیی گەل و خاک و ئایندەی بزووتنەوەی کوردایەتی. واتە تا سەرهەڵدانی کێشەی نێوان دوو زلهێزە حوکمبەدەستەکە، جگە لە حزبی شیوعی، هیچ لایەنێکی تری بەرەی کوردستانی نەمایەوە تا بتوانن هاوکێشەیەکی شۆڕشگێڕانە لەمەڕ چارەسەری کێشەی نێوان ئەو دوو لایەنە پێک بێنن.

بەو جۆرە بەرەی کوردستانی پاش نزیکەی ٤ ساڵ تەمەن، لەپەلوپۆ کەوت و بە کردەوە پووکایەوە. جگە لە بەرپرسیاریی لایەنەکانی بەرە خۆیان لە هەڵوەشاندنەوەی

خۆیان، دوو لایەنەکەی تریش واتە پارتی و یەکێتی تا ڕادەیەک بەرپرسیارن، بەڵام لە هەموو لایەک زیاتر؛ پارتی بەرپرسیارە، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

١. لە پەیڕەوی ناوخۆی بەرە، بەندی (٣)، خاڵی (٢) دەڵێ: "پەیوەندیی هاوپەیمانیی نێوان ئەندامانی بەرە لەسەر بناغەی گونجان و ڕێزگرتنی هاوتایی دەبەسترێ بۆ سەربەخۆیی کاری ڕێکخراوەیی و ئایدۆلۆژی و سیاسیی هەر ئەندامێک و پاراستنی چالاکی لە سەرتاسەری باشووری کوردستاندا بە جۆرێک کە دژ بە (میثاقی) ی بەرە نەبێ." بەو پێیە بۆ هەموو لایەنەکانی بەرە هەبوو کە بارەگای خۆیان لە هەموو ناوچەیەک لە کوردستانی عێراقدا دابنێن و چالاکیی سیاسی و ئایدۆلۆجی و ڕێکخراوەیی خۆیان بکەن، بەڵام یەکەم لایەن لە بەرەدا کە ئەو سەرەتایەی پێشێل کرد، پارتی بوو لە بادینان کەوتە کۆسپ دروستکردن لەبەردەم حسک و یەکێتی و پاسۆک و حزبی شیوعی و پاشان لێدان و کوشتن و سەرنگومکردنی خەڵکی چالاک و لێپرسراو و کادیرانی ئەو لایەنانە، کەوتە ترساندن و تۆقاندنی دانیشتووانی بادینان بۆ کارنەکردن لەگەڵ ئەو لایەنانە و خۆکشاندنەوەیان، لەوەش خراپتر کڕینی ئەم و ئەو پیاوی ناسراو و سەرەکعەشیرەت و تیرە بە پارە و بەرتیل بۆ وازهێنان لەم یا لەو لایەنی بەرەو چوونە ناو پارتییەوە، هیوادارم لە بوارێکی تردا ئەو پێشێلکردنانە هەمووی بە بەڵگە و ناو و بەرواری ڕووداوەکان بڵاو بکەمەوە.

٢. بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی بەرە و پاش ڕاپەڕین و چۆڵکردنی کوردستان لەلایەن ڕژێمی "سەدام"ەوە و بەر لە دامەزراندنی حکومەتی فیدڕاڵ، چەندین لیژنەی بەرە بۆ هەموو شارۆچکە و شارەکانی کوردستان دانران بۆ بەڕێوەبردنی کاری سیاسی، بەڕێوەبەرایەتی، کارگوزاری، پێشمەرگانە، ڕاگەیاندن، پەیوەندی، دارایی و ئاسایشی وڵات، کە پاش هەڵبژاردن و دامەزراندنی حکومەتی فیدڕاڵ، دامودەزگاکانی دەوڵەتی؛ شوێنی ئەو لیژنانەی گرتەوە. پارتی هەر لە سەرەتاوە لە ناوچەکانی بادینان و ژێر دەسەڵاتی خۆیدا کەوتە تەنگپێهەڵچنینی ئەو لیژنانە و نوێنەران و پێشمەرگەکانی لایەنەکانی تر و زۆر جار سووکایەتیپێکردن و هاندانی مەفرەزە و چەکدارەکانی خۆی کە بەشێکیان لەوانە بوون هێشتا تۆز و خۆڵی خۆفرۆشییان بە بەعس لێ نەتەکابوو، بۆ بێ فەرمانکردنی بڕیارەکانی لیژنەکانی بەرە و زۆر جاریش کەند و کۆسپ دروستکردن

لەبەردەم جێبەجێکردنی بڕیارەکانیان و جاروباریش سووکایەتیپێکردنیان.

٣. بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی بەرە، پێش دامەزراندنی حکومەتی فیدراڵ دەبووایە جگە لە کاری سیاسی و ڕێکخراوەیی؛ بۆ هەموو کاروبارێکی ڕۆژانە جەماوەر ڕووبەڕووی لیژنەکانی بەرە ببوونایەتەوە، پاش دامەزراندنی دامودەزگاکانی حکومەتی فیدراڵییش؛ ڕووبەڕووی ئەو دامودەزگایانە ببوونایەتەوە. پارتی لە بادیناندا کارێکی وای کرد کە لیژنەکانی بەرەی ئابلۆوقە دا و پاشانیش ئەو دەزگا دەوڵەتییانەی کە خۆی تیا باڵادەست نەبوو یا لێپرسراوی یەکەم لە لایەنێکی تر بوو، کار گەیشتبووە ئەو ڕادەیەی لیژنەکانی بەرە لە بادیناندا هیچ کارە و بێدەسەڵات بارەگاکانیان لە خۆیان و چەند پێشمەرگەیەکی خۆیان؛ کەس ڕووی تێ نەدەکرد. بەپێچەوانەوە بارەگا ڕێکخراوییەکانی پارتی شوێنی دەزگاکانی بەرەی گرتبووەوە، تا ڕادەی کاری دادگایی و دادوەرییش. لەدوای دامەزراندنی دامودەزگاکانی حکومەتی فیدراڵیش، لە هەر دەزگایەکدا کەسی دووهەم یا جێگر پارتی بووایە؛ لە بادیناندا خاوەن دەسەڵاتی یەکەم بوو، لێپرسراوی یەکەمیش وەتەق خرابوو، وای لێ هاتبوو هیچ ئەندام و لێپرسراوی یەکێتی یا بێلایەن یا لایەنێکی تر بە کاری فەرمانگوزاری بنێردرایەتە بادینان؛ نەدەچوو.

٤. سەبارەت بەوەی کە زاخۆ تەنیا دەرگا و شادەماری سەرچاوەی داهاتی بەرەی کوردستانی و پاشان حکومەتی فیدراڵ بوو، ئەو دەرگایەش لە ناوچەی بادینان لەژێر باڵادەستیی پارتیدا بوو، پارتی بە جۆرێک دەستی بەسەردا گرتبوو، هەر چی سەرەتای کاری بەرەیی هەیە تیا بەدی نەدەکرا. لایەنەکانی بەرە لە بریتیی ئەوەی هاوسەنگی پارتی بن لە بەرەدا و توانای لێپرسینەوە و پشکنین و چاودێریان هەبێ، پارتی وەک دەزگایەکی بچووک سەیری دەکردن و مانگانەی دەدانێ، کە هەر لە سەرەتاوە گرتنەبەری ئەو ڕێچکەیە لەلایەن پارتییەوە هەلی بۆ دروستبوونی چەندین و چەندین دز و جەردە و قاچاغچی و بازرگانی شەڕ و چاوچنۆک و دزانی قووتی گەل هەڵخست و پاشانیش گۆلمەزێکی وای نایەوە کە شەڕی کوردکوژیی تێدا سەری هەڵدا.

## قەڵادزە و لێدانی چەخماخەی شەڕی ناوخۆ

دوای تێشکانی ئیسلامییەکان لە شەڕیان لەگەڵ یەکێتی، کە دیکۆمێنتە گیراوەکانی لەشکری ئیسلامی سەلماندنی کە پارتی هانی ئیسلامییەکانی دابوو و پشتیوانی و هاوکاریی لۆجستییشی کردبوون بۆ لاوازکردنی یەکێتی و تەسککردنەوەی سنووری دەسەڵاتی، پارتی کەوتە بڕوبیانووگرتن بە یەکێتی، تا لە ١٩٩٤/٥/١٥ چەخماخەی ئاگری شەڕ لە قەڵادزە بڵێسەی سەند. کوڕی "حەسۆ میرخان"ی پارتی لەو ڕۆژە دەچێتە قەڵادزە و بیانوو بە ڕیزە دوکانێک دەگرێ کە گوایە لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتیی باوکیدا لە پشدەر لە ساڵی ١٩٦٤، ئەو ڕیزە دووکانەی کڕیوە و دەیەوێ دووکاندارەکان کە موڵکی خۆیان بووە؛ دەریانبکات، لە ئەنجامی شەڕەقسە دەبێتە شەڕەتەقە و چەند کەسێک لە دووکاندارەکان بە دەستی پیاوەکانی کوڕەکەی حەسۆ؛ کوژراو و بریندار دەبن، ئاگری شەڕ دەتەنێتەوە لە قەڵادزە و ڕانیە دەست پێ دەکات و پاشان هەموو هەرێم دەگرێتەوە. ئەم بابەتە زۆری لەسەر نووسراوە، بەیان و بڵاوکراوەی زۆریشی لەسەر دەرچووە بە ڕاست و ناڕاست لە هەردوو لاوە، پێویست بە باسکردنی ناکات، جگە لەو تاوانە نەتەوەییە گەورەیەی کە پارتی دیموکراتی کوردستان لە ٣١ی ئابدا بەرامبەر خاک و نیشتمان کردی کە دەبێ چەند بتوانرێ لە ڕووە نەتەوەییەکەیەوە بەڕوونی باس بکرێ.

## تەواوکەری ڕۆژنامەی سەکۆ

٣١ی ئاب/١٩٩٦

هەر لە مانگی (١٩٩٢/٥)ەوە شەڕ و نیوەشەڕ و نە ئاشتی و نە شەڕ لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان درێژەی کێشا تا شەڕ پتر لە دوو ساڵی خایاند، تا ئەنجام بەرهەمەکەی بە دوو (ادارە) بەڕێوەبەرێتی کۆتایی هات. دوو ساڵی شەڕی ناوخۆ کە ئەو پارەیەی دەدرا بە چەک و زەخیرەی شەڕ و جبەخانە و ئەوانەشی لەپەنای شەڕدا بازرگانەکانی شەڕ و عملاقەکانی شەڕکەران خەرجیان دەکرد یان دەدزران و لوول دەدران، لە ئاوەدانکردنەوەی کوردستاندا خەرج بکرایە، هەر چی دێهاتی کاولکراو و ڕاگوازراو هەیە ئاوەدان و نۆژەن و لە نوێ دروست

دەکرایەوە. ئەو هەموو شەهیدانەی کە لەو شەڕەدا شەهید کران و بێسەروشوێن کران لە کادری سیاسی و سەربازی و ڕاگەیاندن، لە پەروەردەکردن و خزمەتکردنی گەل و نیشتماندا ئەرکیان بکێشایە، بێشک گەلێکی وشیار و هەرێمێکی سەرفرازیان دەهێنایە بوون. پەرلەمانی کوردستان تەقەللایەکی زۆری بەخەرج دا تا شەڕ کۆتایی پێ بێ و ئاشتی بەرقەرار بێت. تەقەللای خێرخوازانە و مرۆڤدۆستانە و کورد و کوردستان دۆستانەی سەرۆکی ئەوسای فەرەنسا؛ فرانسوا متێران و کۆکردنەوەی مەسعوود بارزانی و جەلال تاڵەبانی لە "دبلن" لە ١٩ی ئاب/١٩٩٥، ئەمانە و چەندین تەقەللای تری خێرخوازانە بۆ ڕاگرتنی شەڕ بێسوود بوو. لە هاوینی ١٩٩٦دا شەڕ هەموو هەولێری گرتەوە، یەکێتی هەولێری لەدەست پارتی هێنایە دەرەوە و دەستی بەسەر ٢/٣ی زەویی ژێر دەسەڵاتی پارتیدا گرت، فراکسیۆنی پارتی بەشێکیان کۆشکی پەرلەمانیان جێ هێشت.

### ٣١ی ئاب/١٩٩٦

زۆر جار شەڕی ناوخۆ ڕووی داوە، بەداخەوە هەموو جارێک لایەنی لاواز پەنای بردۆتە بەر دوژمنانی کورد بۆ سەرکەوتنی و گرتنەوەی دەسەڵات، ئەم جارەش پاش ئەو تێکشکانە گەورەیەی پارتی؛ پارتی دیموکراتی کوردستان و خودی مەسعوود بارزانی بەسەرشۆڕییەوە چوونەوە بەر دەرگاکەی سەدام حسێن و کلیلی پەرلەمانی پیرۆزی کوردستان و شاری هەولێر و هەموو هەرێمیان دایە سەدام، تا بە چەک و سەربازە پۆستاڵ ڕەشەکانیەوە خۆیان و پارتی بێنەوە هەولێر و خاکی پیرۆزی هەرێم و حەرەمی پەرلەمان بەو پۆستاڵی خیانەت و داگیرکەرانەیە پیس کەنەوە. لەشکری سەدام ئاڵای پیرۆزی هەرێمی کوردستانیان لەسەر پەرلەمان داگرت و پۆستاڵەکانیان پێ سڕی بەبەر چاوی چەکدارەکانی پارتییەوە، ئاڵا خوێناوییە بە خوێنی کورد سوورەکەی عێراقیان لەسەر هەڵواسی. سوپای عێراقی هەر پەلاماری شار و پەرلەمان و یەکێتییان نەدا، بەڵکە لەژێر دەسەڵات و چەتری پارتیدا چەندین کەسیان لە ئۆپۆزسیۆنی شیعەی عێراقی و سوننە و لە کوردانی باکوور و لایەنگرانی پ. ک. ک گرت و بیسەروشوێنیان کردن. پارتی بەوەوە نەوەستا کە هەر هەولێر و

پەرلەمان بە سوپای سەدام بگرێ، بگرە پڕکێشیی کرد، هێرشیان کردە سەر هەموو شار و شارۆچکەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی، یەکێتییان لە خاکی هەرێم دەرپەڕاند. یەکێتی جارێکی تر بەخۆیدا چووەوە و خۆی کۆ کردەوە و نەیهێشت پارتی چل ڕۆژ حوکمڕانی بکات و چلەی نەچوو لە سلێمانی و شارەکانی تر، بە هێرشێکی چەواشەوە هەر لە سنووری دەستکردی ئێرانەوە هەڵەبجە و بەمۆ و چوارتا و گەرمیان و قەڵادزە و ڕانیە و دووکان و کۆیەوە تا سەفین و قەرەچۆغ و نزیک هەولێر و شەقڵاوە و سەری ڕەشیان گرتەوە کە قەڵا سەختەکەی مەسعوود بوو، دیسانەوە مەسعوود پەنای بردەوە بۆ تورکیا و عێراق کە بەهانایەوە بچن، تورکیاش و عێراقیش ئۆلتیماتۆم (هەڕەشە)یان دا بە یەکێتی کە لە سەری ڕەش و هەولێر نزیک نەبنەوە لە شەقڵاوە و دەرگەڵە ڕاوەستن، وە گەر پڕکێشی بکەنە سەر سەری ڕەش و هەولێر، تورکیا و عێراق بە هێزی سەربازی لە یەکێتی دەدەن. تەنانەت "دەیڤید ویلش" یاریدەدەری ئەوسای وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بە تەلەفۆن ئاگاداری مام جەلالی کردبوو کە لە سەفین بوەستن و هیچی تر پێشڕەوی نەکەن. تورکیا بە کردەوە بەشداریی لێدانی یەکێتیی کرد و بە سوپا و تۆپ و دەبابە و سەربازەوە کەوتە شەڕەوە لەگەڵ یەکێتی و شارۆچکەی هیران، دۆڵی "سماقوڵی" و ڕەواندزیشی لە یەکێتی گرتەوە. دوای ئەو هەموو زیانی ماڵی و گیانییە، دوای ئەو هەموو ماڵوێرانییەی کە هەردوو لا بەسەر باشوور و حکومەتە ساواکەیاندا هێنا، دوای ئەوەی هەردوو لا هیلاک و ماندوو بوون لە شەڕی بێسوود و بێهوودە، دوای ئەوەی کە هەردوو لا لەوە گەیشتن کە هیچ لایەکیان ناتوانن لایەکەی تر لەسەر خاکی باشوور بسڕنەوە و ئەو ڕاستییەیان زانی کە هیچ لایەکیان لایەکەی تریان پێ لەناو ناچێ، ئینجا ملیان دا بۆ خێرخوازانی ئاشتیخواز و بەرژەوەندیخواز کە لێکتر نزیک ببنەوە.

## دوو بەڕێوەبەرایەتی لە یەک هەرێم

شەڕی ناوخۆ جگە لە کوشتن و کاولکردن و ماڵوێرانی، سیستمی دوو (ادارە) بەڕێوەبەرایەتییشی بەدوای خۆیدا هێنا. هەولێر و سلێمانی بوونە دوو پایتەختی یەک هەرێمی بچکۆلەی ٣ ملیۆنی سێ پارچەییش، پارچەیەکی کەرکووک و قەزا و ناحیە

کێشەلەسەرەکانی سەر بە دەسەڵاتی ڕژێمی عێراقی، پارچەی دووەم؛ سلێمانی و بەڕێوەبەرایەتییەکانی گەرمیان و ڕاپەڕین لەگەڵ کۆیە و هەڵەبجە، پارچەی سێیەم؛ هەولێر و دهۆک و زاخۆ. دوو حکومەت، دوو بەڕێوەبەرایەتی، دوو ئەنجوومەنی وەزیران، دوو پەرلەمان و دوو سوپا و هێزی پێشمەرگە، بەکورتی لە کارگوزارێکەوە، لە فەرمانگەیەکەوە، لە ئاسایشێکەوە هەتا سەرۆکپەرلەمان و سەرۆکوەزیران، هەمووی بوو بە دوو حکومڕان، دوو هەرێم، دوو بەڕێوەبەرایەتی. ئەم سیستمە بواری دیبلۆماسییشی تووشی شەلەل و ئیفلجبوون کرد، تەنانەت کاری خراپی کردە سەر باری ئابووری و بازرگانی، بە ڕادەیەک کە ئەو کەلوپەلانەی پۆشاکی و بژێوی و بیناسازییەش کە لە ڕێگەی تورکیا و برایم خەلیل بهاتایەتە هەرێم، دوو جار باجی لێ دەسەندرا، جارێک لە زاخۆ و جارێکیش یا لە "پردێ" یا لە دەرگەڵەی گوایە سنووری ئەو دوو بەڕێوەبەرایەتییە.

## ڕێککەوتننامەکانی نێوان پارتی و یەکێتی

من نامەوێ خودی نامەکانی ڕێککەوتنەکان یان هەوڵی ڕێککەوتنەکان وەک خۆی و بێ کەم و زیاد لێرەدا بنووسم، چونکە ئەوە کاری ئەم کتێبە نییە، بەڵکە هەر کورتەیەکی زۆر کورت لەسەر هەوڵەکانی ناوخۆ و دەرەوە دەنووسم تەنیا بۆ وەبیرهێنانەوە و بەرچاوڕوونیی خوێنەری ئازیز. هەوڵە ناوخۆییەکان، لە هەوڵی پەرلەمانەوە بۆ ئاشتبوونەوە تا هەوڵی جەماوەری و ڕێکخراوە شارستانییەکان و تەنانەت ڕێپێوانی جەماوەر لە سلێمانییەوە بۆ هەولێر بۆ ئاشتبوونەوەی گشتی و پاشان یەکخستنەوەی دوو ئیدارەکە، بەڵام بێسوود بوو، هەوڵەکانی ئێران و فەرەنسا و ئەمەریکا و تورکیاش کەوتنە کار. تورکیا لە ١٩٩٦/١٠/٣١ کەوتە ناوەندگیرییەوە، ڕێکەوتننامەیەک لەنێوان سامی عەبدولڕەحمان؛ نوێنەری پارتی و نوێنەری یەکێتی لە ئەنکەرە بە نێوەندگیریی تورکیا کە لە چەند خاڵێک پێک هاتبوو، بەتایبەتی ئاشتبوونەوە و یەکگرتنەوە و چارەکردنی کێشەی زاخۆ و برایم خەلیل، بەڵام ئەم ڕێککەوتنە سەری نەگرت بە هۆی قایلنەبوونی مەسعوود بارزانی بە واژۆی نوێنەرەکەیان لەسەر ڕێککەوتننامەکە و خاڵەکانیشی، ئەمەش بە دنەدانی مەسعوود لەلایەن ڕژێمی

سەدامەوە کە دەیویست هەرێم هەر وا سێ پارچە بێت و دەسەڵاتی ڕژێمی بەعسی لە بەشی پارتی بەرقەرار بێت. ئەمەریکا لای ڕوون بوو کە پارتی کەوتوتە ناو جوغزی ڕژێمی سەدام حسێنەوە، بۆیە هەر لە هەوڵی بەردەوامدا بوو بۆ هێنانەدەرەوەی لەو جوغزە و ئاشتکردنەوەی لەگەڵ یەکێتیدا. ئەمەریکا مام جەلال و مەسعوود بارزانیی بانگهێشت کرد بۆ واشنتۆن و لەوێ بە ئامادەبوون و ناوبژیوانیی "مادلین ئولبرایت"؛ وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا، ڕێککەوتننامەیەکی چوار خاڵییان مۆر کرد، هەردوو لایان واتە جەلال تاڵەبانی و مەسعوود بارزانی لەو دانیشتنەدا قایلبوونی خۆیان لەسەر ئەو چوار خاڵە دەربڕی:

١. هەردوو ئیدارەکە یەک بگرێتەوە.

٢. داهات و دەرامەتی کوردستان وەک یەک بەسەر هەردوو ئیدارەکە دابەش بکرێ، تا یەکگرتنەوە.

٣. دوای یەکگرتنەوە، هەڵبژاردنی گشتی بکرێت.

٤. مەیدانی کار و چالاکیی هەردوو حزبەکە هەموو هەرێمی کوردستان بێت، واتە نە سنووری ناوچەی سەوز قەدەغە بێ لە پارتی و نە سنووری ناوچەی زەردیش قەدەغە بێ لە یەکێتی. بەڵام پاش ئەم ڕێککەوتنەش، پاش گەڕانەوەی مەسعوود بارزانی و جەلال تاڵەبانی، مەسعوود پاشگەز بۆوە و لە داهاتی برایم خەلیل پشکی یەکێتیی نەدا وەک پێویست، جگە لەمەش پارتی ئامادەی پێکهێنانەوەی یەک ئیدارەیی نەبوو، تەنانەت یەکێتی لەسەر زاری مام جەلال لە حکومەتەکەی ساڵی ١٩٩٨ کە نێچیر سەرۆکوەزیرانی ئەوسا بوو، یەکێتی قایل بوو بە مانەوەی نێچیر بارزانی وەک سەرۆکوەزیرانی ئیدارە یەکگرتووەکە، پارتی بەوەش قایل نەبوو.

بارودۆخی دوو بەڕێوەبەرایەتی و دووانەی دەسەڵاتەکانی تەنفیزی، تەشریعی و قەزائی بە هەموو دامودەزگاکانیانەوە بەردەوام بوون، تا ئەنجام شەقی زەمانە یەکی پێ گرتنەوە.

## دەستلەکارکێشانەوەم لە کاری مەڵبەندی دەرەوەی وڵات، ١٩٩٨

لە کۆنفرانسی مەڵبەندی دەرەوەی وڵات، هەندێ مشتومڕ لەسەر کاری مەڵبەند و دەستوەردانە بێهۆکانی لێپرسراوی مەڵبەند لە کاری ئەندامانی مەڵبەند، بەندە بڕیارم دا دەست لە کاری مەڵبەند وەک ئەندامی مەڵبەند بکێشمەوە. دەستەی ئەندامانی مەڵبەند پێک هاتبوون لە:

١. د. بەرهەم ساڵح، لێپرسراوی مەڵبەند بە بڕیاری مام جەلال.
٢. د. خدر هەورامی، ئەندامی مەڵبەند و لێپرسراوی ڕێکخستن.
٣. شۆڕش حاجی، ئەندامی مەڵبەند و لێپرسراوی بەریتانیا و پەیوەندییەکان.
٤. کاک ئەمین، ئەندامی مەڵبەند و لێپرسراوی وەرگێڕان و مەعلومات.
٥. ئیبراهیم جەلال، ئەندامی مەڵبەند و لێپرسراوی ئەڵمانیا و دارایی مەڵبەند.
٦. سەربەست بامەڕنی، ئەندامی مەڵبەند و ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەی مانگی.

لەو کۆنفرانسەدا شۆڕش حاجی ئامادە نەبوو، بەڵام ڕاپۆرتێکی بۆ کۆنفرانس نووسیبوو، ناقابلیی خۆی و ڕەخنەکانی لە شێوەکاری مەڵبەند نووسیبوو بۆ منی ناردبوو کە لە کۆنفرانس بیخوێنمەوە و بیدەمە دەستەی بەڕێوەبەری کۆنفرانس، ئەویش لە کۆتایی ڕاپۆرتەکەی دەستی لە کاری ئەندامێتیی مەڵبەند کێشابۆوە. هۆکاری دەستلەکارکێشانەوەی هەردووکمان، دەستتێوەردان و تاکڕەویی د. بەرهەم بوو لە بەڕێوەبردنی مەڵبەندەکەدا.

## هەڤاڵانی کۆنفرانسی مەڵبەندی دەرەوەی "ی. ن. ک"
## سڵاوێکی گەرم

پێشەکی هیوای سەرکەوتن بۆ کۆنفرانسەکەمان دەخوازم و دڵنیاشم کە ئەم کۆنفرانسە؛ کۆنفرانسی نوێکردنەوەی کاری ڕێکخراوەیی و ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکان دەبێ و بریتی دەبێ لە داهێنانێکی نوێ لە ڕەوتی گرتنی کۆنفرانس بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی ئەرک و فەرمانەکانی مەڵبەندی دەرەوە و کۆمیتە و کەرتەکان و بەشی ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکانی دەرەوە لە کۆنفرانسی لەندەنەوە تا ئەم کۆنفرانسە بۆ بەرەوپێشەوەبردن و دەوڵەمەندکردنی لایەنە باش و گەشەکانی لەلایەن ئێوەی

دڵسۆزانی گەل و حکومەتی فیدراڵ و یەکێتییەوە، وە ڕەخنەگرتن لە لایەنە ڕەش و خراپەکانیان و دانانی سنوورێکی چەسپاویش بۆ دووبارەنەبوونەوەیان.

من دڵنیام لەوەی کە هەموو ئەو بەڕێزانەی لێرەدا بەشداریی کۆنفرانس دەکەن، کەسانی تێکۆشەر و دڵسۆز و لێبڕاو و لەخۆبوردوو بوون بۆ بەرەوپێشەوەچوون و گەشەکردنی یەکێتیی نیشتمانی و سەرکەوتنی یەکێتییشیان بەتەنیا زامنکەری بەدەستهێنانی ویست و خواست و ئامانجەکانی خەباتی گەلی کوردیان لە کوردستانی خوارووداا زانیوە، بۆیە بە خۆم ڕەوا دەبینم وەک ئەندامێکی مەڵبەند بەڕاشکاوییەوە هەندێ ڕاستی بخەمە بەردەم بەڕێزتان کە پێم وایە لایەنە خراپ و کەموکوڕییەکانی کاری مەڵبەندن لە کۆنفرانسی لەندەنەوە تا  ئەم کۆنفرانسە، بەهیوای ئەوەی باری سەرنجی خۆتانی بدەنێ و ڕێگەی دووپاتبوونەوەی نەدەن.

داوای لێبوردنیش دەکەم کە وەک ئەندامی مەڵبەند (لێپرسراوی دارایی) ڕاپۆرتێکی تایبەتی خۆمتان پێشکەش دەکەم، هەروەک هەڤاڵ "شۆڕش حاجی"یش ناچار بووە کە بە ڕاپۆرتی تایبەتی خۆی وەک ئەندامی مەڵبەند بەشداریی کۆنفرانس بکات، لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١. نەبوونی پەیوەندیی نێوان ئەندامانی مەڵبەند و بێئاگاییان لە یەکتری کە باشترین نموونەی ئەم ڕاستییەش؛ ڕاپۆرتی مەڵبەندە کە هیچ کام لە ئەندامانی مەڵبەند جگە لە هەڤاڵ سەربەست و هەڤاڵ بەرهەم، کەسی تریان ئاگاداری نووسینی ڕاپۆرتی مەڵبەند نین و هاوبەشییان لە نووسینیدا نەکردووە سەبارەت بەوەی هیچ پرس و ڕایەکیان لەسەری پێ نەکراوە، کە دیارە من لە لایەنی خۆیشمەوە خۆم بەرپرسیار نازانم لە ئاستی ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکەدا بەرامبەر ئێوەی بەڕێز.

لە یەکەم کۆبوونەوەی ڕۆژی دوای کۆنفرانسی لەندەن کە هەڤالانی کۆمیتەی مەڵبەند گرتیان بۆ دابەشکردنی کارەکانی مەڵبەند بەسەر ئەندامانداا، بەم جۆرە بوو کە لە پێشەکیی ئەم بابەتەدا هاتووە:

پاش گفتوگۆیەکی زۆر لەسەر کارەکەی من، بڕیار درا کە سەرپەرشتیی کۆنفرانسی کۆمیتەکانی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاواش بکەم، ئەوانەی کە سنووریان بە ئەڵمانەوەیە. پاش ماوەیەکی زۆر کورت کە لە چەند مانگێک تێپەڕی نەکرد، کۆمیتە

دیسان وەک هەموو کۆمیتەکانی پێشووی یەکێتی لە دەرەوە کە جارێک بە ناوی من و جارێک بە ناوێکی ترەوە تووشی گێروگرفت و ناتەبایی و نەخوێندنەوەی یەکتری کەوتە نێوان ئەندامانەوە، هەڤالان د. خدر و کاکەمین ئیستقالەیان کرد. بەر لەوەش بە بڕیاری تاک هەڤاڵ بەرهەم و بێ ئاگادارکردنی ئەندامانی مەڵبەند، کاری هەڤاڵ سەربەست بامەڕنی بە کاک سامی شۆڕش درا و کاک سەربەست بێکار مایەوە لە مەڵبەنددا. دوای ماوەیەکی تر هەڤاڵ شۆڕش حاجی بۆ کارکردنی لەگەڵ میدل ئیست ووچ چوو بۆ ئەمەریکا، ئەویش وەک لە ڕاپۆرتەکەی خۆیدا دەردەکەوێت قەواڵەی نەخوێنرایەوە. منیش پاش کۆنفرانسی لەندەن و لەبەر ڕۆشنایی دابەشکردنی کاروبارەکان، هەڵسام بە ئەرکی سەرشانی خۆم بەنیوەناچڵی. بڵاوکراوەیەکی بەشی داراییم بەسەر هەموو کۆمیتەکانی دەرەوەدا بڵاو کردەوە و پاشان لەسەر داوای کۆمیتەکانی نەرویج و دانیمارک و ئیتاڵیا، سەرپەرشتیی کونفرانسی کۆمیتەکانیانم کرد.

## خوێندنم لە ئەڵمانیا

من لە ١٩٨٧/٥/١ گەیشتمە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و لە ٥/٤ گەیشتمە بەرلینی ڕۆژئاوا، تاکوو مانگی ١٩٨٩/١٢ هیچ مافێکی پەنابەرییان نەداینێ تەنها وەک ئاوارە و پەنابەرێک لەو وڵاتەدا جێگەیان کردینەوە، نەماندەتوانی خولی زمان فێربوون و بخوێنین یان لە هیچ بوارێکی تردا هەوڵی خوێندن بدەین، بەڵام بۆ مناڵ لە ١٨ ساڵ کەمتر نەبوو بیانخوێندایە. لە ئەڵمانیا قۆناغەکانی خوێندن زۆر جیاواز بوو لە هی عێراق، خوێندن لە پۆلی یەکەوە تا پۆلی ٤ پێیان دەوت سەرەتایی (grundschule)، ئەگەر منداڵەکە هەموو پلەکای لە وانەکاندا یەک بووایە یان ٢،٥، ئەوا ساڵی نوێ دەخرایە پۆلی پێنج (گومنازیۆم)، واتە هەر لەو پۆلەوە ئامادە دەکرا بۆ خوێندنی بەشی زانستی. ئەگەر نمرەکانی لە کۆتایی پۆلی چوار لە ٢،٥ یان پتر بووایە، ئەوا دەچووە قوتابخانەی هاوپت شولە کە ئامادە دەکران بۆ خوێندنی کاری پیشەیی وەک بەشی پیشەسازی و یا کشتوکاڵی. وە ئەگەر لە کۆتایی خوێندنی پۆلی ٧ نمرەکانی باش ببووایەتەوە، ئەوا دەچووە "ریال شولە" واتە بەشی وێژەیی. لە گمنازیۆم پاش تەواوکردنی پۆلی ١٢ دەتوانی بچێتە دانیشتگا و سەرپشک دەبێ لە هەڵبژاردنی کۆلێژەکان. لە ڕیال

شولەوە پاش تەواوکردنی پۆلی ١٢ و پاشان دوو ساڵی تر خوێندنی شتودیوم کولیج دەتوانی بچیتە فاخهۆخ شولە کە هەر زانکۆیە، بەڵام وانەکانیان زیاتر کردەوەییە، نەک تیۆری. بۆ کەسانێک کە لە تەمەندا گەورە بن و تا پۆلی ٩یان خوێندبێ و دەیانەوێ کۆتایی بە خوێندنی ئامادەکاری بۆ دانیشتگا بهێنن، دەتوانن بە سێ جۆر لە پیشەیەک لە پیشەکانی ژیان کە خۆیان هەڵیببژێرن، بە سێ قۆناغی جیاجیا بخوێنن. قۆناغی یەکەم (فوربیلدونگ) کە لە ١٢ مانگ تا ١٨ مانگ دەخایەنێ و پاشان بە پلەی خەلفە دەردەرچی و کار دەکات، قۆناغی دووەم (ئوم شولونگ) کە ١٨ مانگ تا ٢٤ مانگ دەخوێنێ و پاشان بە پلەی وەستا کار دەکات. قۆناغی سێیەم لە ٢ ساڵەوە تا پێنج ساڵ دەخوێنێ و پێی دەڵێن "ئاوس بیلدونگ"، دەبێتە شارەزا لە کارەکە و ئامادە دەبێت بۆ مایستەری و دەبێتە سەرکار.

من لە مانگی ١٩٩٠/١ کۆرسی فێربوونی زمانی ئەڵمانییان دامێ بۆ ماوەی ٦ شەش مانگ و پاش ئەوە خۆم داوای خوێندنی دوو ساڵیم کرد لە مەیدانی کۆمپیوتەر یا مەساجی پزیشکیدا، بەڵام هیچیان نەدامێ و سەرپشکیان کردم لە خوێندنی دارتاشی یا سەرتاشی. دارتاشیم هیچ نەدەزانی، ئەگەر بزمارێکم بە دیوار یا تەختەیەک دا دابکوتایە تا جارێک چەکوشەکەم لە بزمارەکە دەدا، دوو جار لە پەنجەی خۆمم دەدا. لەو دوو هەڵبژاردەیەی کە دایانمێ، من دارتاشییەکەم هەڵبژارد، چونکە بەڕاستی لەلام ئەوەندەی ڕێگەی بۆ کارکردن و بژێوی پەیداکردن، ئەوەندەش بەلامەوە حەز و ئارەزوو بوو. ماوەی ١٨ مانگ خوێندنی "ئومشولونگ"یان دامێ بە سێ قۆناغ، شەش مانگ مێز و کورسی و قەنەفە، شەش مانگ دەرگا و پەنجەرە، شەش مانگ پلیکانەی تەختەی خانوو لەگەڵ دروستکردنی "داخ"، واتە بنمیچی ژمارە ٨ی خانوو.

خوێندنم تەواو کرد، بەڵام بێسوود بۆ من، لەبەر دوو هۆ:

١. خۆم لە ئیشکردن و ئیش دۆزینەوە دەدزییەوە بە بیانووی سەیر سەیری نابەجێ، تا بەردەوام بم لەسەر کاری حزبیم.

٢. لە ڕاستیدا لە هیچ فابریکێکی کارەکەی خۆم کە دارتاشی بوو، وەرنەدەگیرام بە ئیش و کاری هەمیشەیی، سەبارەت بە تەمەنم کە نزیک بووبووم لە ٥٠ ساڵ، ئەو کارگە و کارخانانە پتر دوو جۆرە کەسیان وەردەگرت.

ا. ئەوانەی کە شارەزاییان بە ئەزموونێکی چەند ساڵییەوە هەبووایە لەو کارەدا کە پێویستیان بوو.

ب. یان لە تەمەنی ۱۸ ساڵی و بەرەوژوور تا تەمەنی ۲٥ ساڵی خۆیان پێیان بخوێندیتایە و هەر لای خۆیشیان بە ڕۆژانەیەکی کەم دەستت بە کار بکردایە.

من لە مانگی ۱۹۹۸/۸ کەوتمە کارکردنی ڕۆژی تەواو، واتە ۸ کاتژمێری، سەرەتا لە کارگەی "Dehl" دامەزرام بە سەعاتی ۱۲ مارک و پاشان وردە وردە پتر بوو، ئیشەکەم هیچ پەیوەندیی بە ئەزموونەکەی خۆمەوە نەبوو لە بواری دارتاشیدا، لە سەرەتاوە نەمزانی ئێمە شەو و ڕۆژ ئەو "سندووقە" تەختانە بۆ دروست دەکەین، پاش ماوەیەک زانیم کە ئەو سندووقانە بەپێی گەورەیی و بچووکی بۆ فیشەک و گوللە هاوەن و گوللە تۆپ دروست دەکەین و کارگەکەش بۆ ئەمەریکییەکان کار دەکات. دوو ساڵ لەوێ کارم کرد، دوای ئەوە وەک پەشتەماڵی گەرماو هەرسێ مانگ و شەش مانگ و کەمتر و زیاتر بە بەر کارگە و کارخانەیەکەوە بووم تا ناوەڕاستی ساڵی ۲۰۰۳ کە بە هۆی نەخۆشییەوە خانەنیشینی پێش یاسایی خانەنیشین کرام، من دەبووایە لە تەمەنی ٦۳ ساڵی خانەنشین بکرامایە، بەڵام لە تەمەنی ٦۰ ساڵی خانەنشین کرام بە مانگانەی ۱۷۰ یۆرۆ.

## یەکەم کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان

۵/۲۳ هەتا ۱۹۹۹/۵/۲۷

یەکەم کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان لە ۱۹۹۹/۵/۲۳ هەتا ۱۹۹۹/۵/۲۷، لە شارۆچکەی «ئەفیناو لویس»ی سەر بە «بروکسل»ی پایتەختی بەلجیکا بەسترا. دەستپێکی کۆنگرە بە خوێندنەوەی «ڕاگەیاندنێک بۆ ڕای گشتیی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان، لە گەلی کوردستان پیرۆز بێ» دەستی پێ کرد. بەشداربووانی کۆنگرە بریتی بوون لە (۲٦) پارت و ڕێکخراوی هەر چوار پارچەی کوردستان و دەرەوەی وڵات، وە (۹٥) کەسایەتیی بێلایەن، ژمارەی ئەندامانی کۆنگرە (۱۷٤) بەڕێز لەگەڵ (۱۳) ئەندامی شەرەف، لەو ژمارەیە (۲٤) ژن و (۱٥۰) پیاو. پاشان کۆنگرە بەردەوام بوو لە کارەکەی کە بەپێی پرۆژەیەک کە کۆمسیۆنی ئامادەکاریی کۆنگرە ئامادەی

کردبوو، پاش پەسەندکردنی لەلایەن ئەندامانی کۆنگرە بە دەنگدانی ئاشکرا و ئازاد، پاش پەسەندکردنی بەرنامەی کۆنگرە، سوێندی دەستووری بۆ ئەندامانی کۆنگرە دەستی پێ کرد، بەو شێوەیە: «بە شەرەفم سوێند دەخۆم کە هەموو دەم نیشتمان و بەرژەوەندیی خەڵکی کوردستان بپارێزم، خەبات بکەم بۆ پێشخستنی و پابەند بم بە پەیمانی کۆنگرەی نەتەوەی کوردستان». دوای سوێندخواردن، کۆنگرە دەستی کرد بە پێکهێنانی کۆنسەکانی کۆنگرە بەم شێوەی خوارەوە:

١. کۆنسەی سەرۆکایەتیی کۆنگرە
٢. کۆنسەی داد و مافی مرۆڤ
٣. کۆنسەی کاری ناوخۆ
٤. کۆنسەی کاری دەرەوەی وڵات
٥. کۆنسەی دارایی
٦. کۆنسەی کولتوور و زانست و هونەر
٧. کۆنسەی ڕاگەیاندن و بەڵگەپارێزی
٨. کۆنسەی ژنان
٩. کۆنسەی ئیکولۆجی و تەندروستی
١٠.کۆنسەی جیۆپۆلۆتیکی و ستراتیژی
١١.کۆنسەی ئاسایشی نەتەوەیی
١٢.کۆنسەی ئاوارەکان
١٣.کۆنسەی دیوانی کۆنگرە
١٤.کۆنسەی ڕاوێژکاری
١٥.کۆنسەی یاسا
١٦.کۆنسەی دیسپلین
١٧.کۆنسەی ئاشتی و دیالۆگ
١٨.کۆنسەی ژینگە

دوای تەواوکردنی ناوزەدی کۆنسەکان، کۆنگرە هەستا بە دابەشکردنی نوێنەرانی پارچەکانی کوردستان بەسەر کۆنسەکاندا، من لێرەدا تەنیا ناوی ئەو بەڕێزانە دەنووسمەوە کە لە باشووری کوردستانەوە بەشدار بوون:

١. ئیبراهیم جەلال (ئەندامی کۆنسەی سەرۆکایەتی)

٢. عیدو بابە شێخ (ئەندامی کۆنسەی یاسای باڵا)

٣. حاجی حاجی ئیبراهیم (سەرۆکی کۆنسەی ناوخۆ)

٤. هەڵۆ ئەحمەد (ئەندامی کۆنسەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتی)

٥. مام ڕۆستەم (ئەندامی کۆنسەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتی)

٦. مەحموود ڕەزا (ئەندامی کۆمسیۆنی ڕاگەیاندن)

٧. ئازاد بامەڕنی (ئەندامی کۆمسیۆنی ژینگە)

هەموو حزبە کوردییەکانی باشوور بەشداری کۆنگرە بوون، جگە لە نوێنەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان و ڕێکخراوە پیشەییەکانی سەر بە پارتی، کە نەک هەر ئامادە نەبوون، بەڵکوو زۆر هەوڵی سەرنەکەوتنی کۆنگرەشیان دا.

هەر لە کاتی گفتوگۆ لەسەر چۆنیەتیی دابەشکردنی ئەندامانی بەشداربووی کۆنگرە بەسەر کۆنسەکاندا بەپێی شارەزایی ئارەزوومەندانە، دوو کێشە بۆ گۆنگرە هاتە بەردەم:

١. سەرۆکی کۆنگرە کە بەشداربووانی «پ. ک. ک» لە کۆنگرە داوای «عەبدوڵڵا ئۆجەلان»یان دەکرد بۆ سەرۆکایەتیی کۆنگرە، لە کاتێکدا کە ئەو لە زیندانی ئیمراڵی بوو و هێشتا بڕیار لەسەر جۆری سزاکەی نەدرابوو، نوێنەرانی باشوور جگە لە حزبی «سۆسیالیست دیموکراتی کوردستان»، ناقایل بوون لەسەر دانانی عەبدوڵڵا ئۆجەلان.

ئەنجام: لەسەر داوای (٧) حزب و دەنگدانی ئەندامانی پەکەکە کە زۆرترین ژمارە بوون، «عەبدوڵڵا ئۆجەلان دەرچوو بە سەرۆکی کۆنگرە».

٢. سکرتێری کۆنگرە کە دەشبێتە سەرۆکی کۆنسەی سەرۆکایەتی، دوو کەس کاندید بوون بۆ ئەو پۆستە (م. ئیبراهیم ئەحمەد و د. عصمەت شەریف وانلی». نوێنەرانی باشوور کۆبوونەوەیەکی تەنیای خۆمان کرد، لەبەر ڕۆشنایی یەکێک لە بڕیارەکانی کۆنگرە، پێمان باش نەبوو «م. ئیبراهیم ئەحمەد» خۆی کاندید بکات،

چونکە دەمانزانی بە زۆربەی دەنگ دەردەچێت، لەبەر ئەوەی کاندیدی یەکەکە بوو.

بڕیارەکەی کۆنگرە بریتی بوو لە:

دوای تەواوبوونی کۆنگرە، دەبێت بارەگای سەرەکیی کۆنگرە بچێتەوە یەکێک لە پارچەکانی کوردستان و لە شارێکی کوردستان دابنرێت.

لەو کاتەدا جگە لە باشوور، هیچ پارچەیەکی تری کوردستان گونجاو نەبوو بۆ بارەگای سەرەکیی کۆنگرە.

باکوور لەژێر ئیرهاب و چەوساندنەوەی تورکیای ڕەگەزپەرستدا بوو.

ڕۆژهەڵات لەژێر دەسەڵات و چەوساندنەوەی دەسەڵاتی ئێرانیدا بوو.

ڕۆژئاواش هیچی لەو پارچانەی تر کەمتر نەبوو لە چەوساندنەوەیاندا.

تەنیا باشووری کوردستان بوو کە جۆرێک لە سەربەخۆیی هەبووە، بەڵام ئەمیش لە بارودۆخێکی زۆر ناهەمواردا بوو.

ا. دوو ئیدارەیی بوو، سلێمانی هەولێر یان سەوز و زەرد.

ب. ناکۆکییەکی توند لەنێوان ئەو دوو ئیدارەیەدا هەیە.

ج. تورکیا لایەنگری زۆنی زەرد بوو، جۆرێک لە بیانووش بوو لە زۆنی سەوز.

د. مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد گەر بیووایە بە سکرتێری کۆنگرە و سەرۆکی کۆنسەی سەرۆکایەتی، دەبوو بارەگای کۆنگرە بهێنێتە باشوور و شاری سلێمانی.

لەبەر ئەم هۆکارانە، بەندە ڕەچاو کرام کە داوا لە مامۆستا بکەم خۆی کاندید نەکات. منیش چوومە لای و داواکارییەکەم پێ وت، بەڵام ئەو وتی هەر دەیکەم، پاشان خوا لێی خۆش بێت خالید دلێر کە زۆر دۆستی بوو، ناردمانە لای، دوای ئەو ڕەوانشاد د. شێرکۆ بێکەسمان نارده لای، هەر بێسوود بوو، ناچار بارودۆخەکەمان بۆ نوێنەرانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و هەندێ لە کەسایەتیی تری سەربەخۆی بەشداربوو لە کۆنگرە باس کرد کە یان مامۆستا قایل بکەن خۆی بکشێتەوە یان دەنگی نەدەنێ. دواجار زۆربەی دەنگ لەسەر هەڵبژاردنی عصمەت شەریف وانلی درا و باشوور لەو کێشەیەش دەرباز بوو.

## فیتنەی دوای کۆنگرە

دوای تەواوبوونی کۆنگرە و گەڕانەوەی نوێنەرەکان بۆ شوێنی خۆیان، بە ماوەیەک ڕەوانشاد جەبار فەرمان هاتە ئەڵمانیا و سەردانی کردم، پاشان پێی وتم «برایم» تۆ چیت کردووە؟ بۆ هەوڵت داوە مامۆستا برایم لە کۆنگرە دەرنەچێت؟ منیش سەرلەبەری ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە و وتیشم «مێرووله چۆن دەچێت بەگژ قوللەی قافا»، ئەویش پێی وتم کە مام جەلال و هێرۆ خانیش لێت نیگەرانن، چونکە حەمەی حاجی محموود بۆی باس کردوون کە برایم جەلال نەی‌هێشتووە مامۆستا برایم ئەحمەد دەربچێ. ئەم فیتنەیە بووە هۆی عاجزبوونی مام جەلال لێم تاکوو پاش دوو ساڵ خۆم بەوردی بابەتەکم بۆ باس کرد و دڵی ئاشت بووە و حەقیشی دایە من. بەو شێوەیە هەموو بەرنامەکانی کۆنگرە و گفتوگۆکان لەسەر بابەتەکانی هەڵبژاردنی ئەندامانی کۆنسەکان لە ڕۆژی (١٩٩٩/٥/٢٧) کۆتایی هات و بە ڕاگەیاندنێکی تێروپڕ، بەندەش خۆم لە کۆنسەی سەرۆکایەتیی کۆنگرە کشاندەوە لەبەر زۆریی لاپەڕەکانی ڕاگەیاندن و پرۆژەی پەیمانی کۆنگرە، بە پێویستم نەزانی لێرەدا دووبارەیان بکەمەوە، دامنابوو لە پاشکۆی کتێبەکەم وەک دۆکیۆمێنت دابنرێت.

## کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی و دەوڵەتە هاوپەیمانەکان

لە لەندەن هەتا پێش لێدانی تاوەرەکەی واشنتۆن، نە ئەمەریکا و نە هیچ وڵاتێکی تر ئەو بەپەرۆشییە گەورەیەیان نەبوو بۆ لێدانی حوکمی عێراق و دەستپێکردنی گۆڕانکارییەکان لە عێراق و ناوچەکە و گۆڕینی سیستمی حوکم لە زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکانی وەک مەغریب و لیبیا و یەمەن و عێراق و سووریا و لوبنان... هتد، بەڵام پاش ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١، ئەمەریکا و هاوپەیمانانی لە وڵاتە ئەورووپییەکان و عەرەبییەکان و ئۆپۆزسیۆنی ئەو وڵاتانە دەکەوتنە خۆ، کە یەکەم دەسکە گوڵیان لە عێراق لێدا، ئەو کاتە وتارێکم نووسی و لە چەندین کۆڕدا لە شارەکانی هانۆڤەر، نورنبێرگ، دوسلدۆرف، پێشکەشی بەشداربووانم کرد بە ناونیشانی «هەڵتەکاندنی دکتاتۆریەت یان پلانێکی نوێی ئەمەریکا»، بەم شێوەیەی خوارەوە کە بە پێویستم زانی لە دووتوێی ئەم کتێبەدا یاداشتی بکەم.

## هەڵتەکاندنی دکتاتۆریەت یان پلانێکی نوێی ئەمەریکا

گەر بمانەوێت باسێک لە بارەی ئێستای عێراق و خوارووی کوردستان بکەین، بمانەوێت و نەمانەوێت دەبێت ئاوڕێک لە ڕابردووی دوور و نزیکی جیهان و ناوچەکە و ناوخۆ بدەینەوە کە دەڵێین ڕابردوویەکی دوور، لێرەدا هەرگیز مەبەستمان لە ئاوڕدانەوە نییە بۆ سەدەکانی ڕابردوو یان سەرەتای سەدەی بیستەم، بەسووتماککردنی کوردستان، جینۆسایدی کورد، شەڕی دووەمی کەنداو و کۆڕەو، مەبەستیشمان لە ئاوڕدانەوە بۆ ڕابردووی نزیکی جیهانی و ناوچەکە و ناوخۆ، مەبەستمان ساڵی لە یەکەم دەیەی سەدەی بیست و یەکەمە، واتە ڕووداوی ١١ی ئەیلوولی (٢٠٠١)ە، کە تاکە ڕووداوی بەرپەرچدانەوەی جیهانگیری بوو، تاکە شێوەکاری جێبەجێکەری یاسا و ڕێسایەکی دواکەوتوو بوو بەرامبەر بە نوێترین تەکنەلۆژیای سەردەم.

با ئاوڕێکی سەرپێیی لە سۆز و خۆشەویستی و بەزەیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای حەفتاکانی سەدەی پێشوو بۆ کورد بدەینەوە و بزانین ئەو جێگۆڕکە کتوپڕەی ئەمەریکا و سۆڤیەت لە ئێران و عێراق و خوارووی کوردستاندا بۆ ڕووی دا و چۆنیش بەسەر ئێران و کورد و عێراقیشدا شکایەوە. هاندەر و نەخشەکێشەر و پشتگیریکەری ڕێککەوتنەکەی ئازاری ١٩٧٠ی نێوان کورد و عێراق، یەکێتیی سۆڤیەت بوو، لەبەر ئەوەی بناغەی ڕێککەوتنەکە لەسەر بنەمای بەرژەوەندیی دەوڵەتان داڕێژرا (نەک بەرژەوەندیی کورد)، بە لەبارچووش لەدایک بوو. یەکێتیی سۆڤیەت سڵێکی زۆری لەو پەیوەندییە توندوتۆڵەی نێوان ئێران و بەرزانی دەکردەوە، کە ببێتە مایەی بەهێزبوونی کوردەکان و گەیشتنی دەستیان بە بیرە نەوتەکانی کەرکووک. یەکێتیی سۆڤیەت، پاش هاتنە سەر حوکمی جاری دووەمی بەعسییان و چاوخشاندنەوەی بەعسییان بە سیاسەتی دەرەوەی خۆیان لە ساڵی ١٩٦٣ و دەستنیشانکردنی هەڵەکانیان بەتایبەت لە مەیدانی پەیوەندیی دەرەوەدا، دەیویست بە ڕێککەوتنی نێوان کورد و بەعسییان، حزبی شیوعیی عێراقیش لە جوغزی بەرهەڵستکاریی کوردی عێراق دەربهاوێتە دەرەوە. یەکێتیی سۆڤیەت دەیویست بەو کارەی کە خزمەتێکی گەورە بوو بە عێراقی دەکرد، ڕێگە بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیی ئابووری و سوپایی لەگەڵ عێراقدا خۆش بکات کە ئەنجامەکەی بە مۆرکردنی پەیمانی «هاوکاری و برایەتی

و دۆستایەتی» لە ١٩٧٢/٤/٩ بۆ ماوەی ١٥ ساڵ بوو شکایەوە، سۆڤیەت بەو کارەی هەم باشترین بازاڕی بۆ فرۆشتنی چەکە کەڵەکەبووەکان دۆزییەوە و هەم باشترین سەرچاوەی یەدەگی نەوتی بۆ خۆی مسۆگەر کرد. تا ئەو کاتە کورد و کێشەی کورد، جینۆسایدکردنی کورد لەلایەن حکومەتەکانی عێراق و ئێران و تورکیشەوە، ناوی لە بچووکترین کولەکەی تەڕی سیاسەتی ئەمەریکادا نەبوو. دوای ڕێککەوتنی ئازار و بەتایبەت دوای نیسانی ١٩٧٢، هەم ئێران و هەم ئیسرائیل و هەم ئەمەریکاش کێچ کەوتە کەوڵیانەوە.

ئێران کە دوژمنی لەمێژینەی عێراق بوو، ئاسایشی وڵاتەکەی لە مەترسیدا بوو لەلایەن عێراقەوە، چاوی چاوچنۆکانەی بڕیبووە کەنداوی فارس و هەمیشە بەهیوای بەدیهاتنی خەونە کۆنەکانی گێڕانەوەی باشووری کوردستان بوو بۆ باوەشی خۆی. ئێران هەر لەدوای ڕووخانی ڕژێمی شایەتیی عێراقەوە، لە هەوڵی تێکدانی ئارامی و ئاسایشی عێراقدا بوو. کەم و زۆر پشتیوانیی شۆڕشی ئەیلوولیان دەکرد، لە ساڵەکانی ١٩٦٨دا بە هەوڵی ئێران؛ ئیسرائیلیش کێشرایە ناو جوغزی پشتیوانیی بارزانییەوە، بەڵام ئەمەریکای پشتیوانی مافی مرۆڤ و مرۆڤدۆست و دیموکراتخواز، تا پاش مۆرکردنی پەیمانی نێوان عێراق و سۆڤیەت، جووڵەی لە ئاست ئەو هەموو جینۆسایدکردنەی کورد لە ساڵەکانی ١٩٦١-١٩٦٩دا کرا، لێوە نەهات. بەڵام مۆرکردنی بەیانی ١١ی ئازار و داننان بە مافی ئۆتۆنۆمیی کورد، ئەمەریکای داچڵەکاند و هەستی بە جۆرێک لە مەترسیی کورد بۆ سەر ئاسایشی ئێران و تورکیای هاوپەیمانی کرد. هەر چەندە بەر لە مۆرکردنی پەیمانی نێوان عێراق و سۆڤیەت، زۆر جار بە زۆر شێوە، ئێرانیش و ئیسرائیلیش هەوڵی ئەوەیان دا کە سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا وا لێ بکەن ئاوڕێک لە شۆڕشی کورد بداتەوە، کە باشترین بەڵگەش «بۆ نامەکەی سیناتۆری شاری نیویۆرکی ئەمەریکی؛ ئۆتس-جی-پایک کە ناسراوە بە ‹ئۆتس پایک› و بەڵگەنامەکانی ئەفسەری ئیسرائیلیی ‹دیڤد کەمحی›یە». بەڵام ئەمەریکا هێشتا هەر بچووکترین ئاوڕی لەو مەسەلەیە نەدایەوە، کەچی لەپاش تێپەڕبوونی ٢٣ ڕۆژ بەسەر ڕێککەوتنەکەی عێراق و سۆڤیەتدا، لە سەرەتای مانگی ٥ی ١٩٧٢دا، نیکسۆنی سەرۆکی ئەمەریکا، کیسنجەری ڕاوێژکاری گەیاندە تاران و لەگەڵ شای ئێران گەیشتنە بڕیاردان

لەسەر یارمەتیدانی بارزانی بە چەک و پارە و لۆجستیکیش، تا بتوانن ڕێکەوتننامەکەی پێ هەڵوەشێننەوە.

ڕێککەوتننامەکەی جەزائیریش سەلماندی کە یارمەتیدانی کوردەکان لەلایەن ئێران و ئەمەریکاشەوە، بۆ دەستبەسەرداگرتنی شۆڕشی کورد و هەڵتەکاندنی ئەو مەترسییە گەورەیە بوو لەسەر ئاسایشی ناوچەکە بە عێراق و ئێران و تورکیاشەوە، ئینجا ئەمەریکا خۆیشی. تاکە بەرهەمی ئەو تاوانە گەورەیەی کە سۆڤیەت و ئەمەریکا و ئێران و ئیسرائیل و وڵاتە ئەورووپییەکان لە ساڵی ١٩٧٥دا بەرامبەر کورد کردیان، بریتی بوو لە: دانپێدانانی کیسنجەر پاش بیست ساڵ، واتە ساڵی ١٩٩٥ دان بەو تاوانە و پەشیمانییش لەو کارە کە وتی «ستراتیژمان ڕوون و ئاشکرا بوو، ئەویش هەر وڵاتێک پەیوەندیی لەگەڵ سۆڤیەتدا باش بێت، دەبێت لاواز بکرێت، کە سۆڤیەت پەیوەندیی لەگەڵ عێراقدا بەست، ئیتر یارمەتیدانی بارزانییش بۆ ئێمە لە جێی خۆیدا بوو». کەواتە:

١. سۆڤیەت کە چنگی لە عێراق و نەوت و بازاڕ گیر بوو، دەستیشی لە جێبەجێکردنی ئۆتۆنۆمی و پشتیوانیی کورد کێشایەوە و بەوەشەوە نەوەستا، حزبی شیوعیی هاوپەیمانی پارتییشی کردە هاوپەیمانیی ڕژێمی بەعس دژی کێشەی کورد.

٢. ئێرانێک کە خۆی لەسەر پشتیوانیکردنی کورد کردبووە سووری بەر لەشکر و هەوڵی مسۆگەرکردنی پشتیوانیی ئیسرائیل و ئەمەریکای بۆ کورد دەدا لە پەیمانی جەزائیردا بێ تکاندنی دڵۆپە ئارەقەیەکی شەرمەزاری، کوردی ترۆ کرد و خواستەکانی خۆشی لە ڕێگەی کوردەکانەوە هێنایە دی.

٣. ئەمەریکا پاش نەمان و هەڵتەکانی بیرۆکەی ئۆتۆنۆمیی کورد و تێکشکاندنی شۆڕشی کورد و نەمانی ئەو مەترسییە بۆ سەر ئاسایشی ئێران و تورکیا و هاوکێشە بۆ سەر بەرژەوەندیی ئەمەریکا لە ناوچەکە و دەستکەوتە مەزنەکانی ئێران، بێ سێ و دوو کردن پشتیان کردە بەڵێنەکانیان.

بارزانی بە «هۆکلان»ی پەیامنێری «واشەنتۆن پۆست»ی ڕاگەیاند کە «حکومەتی ئەمەریکا هیچ زەمانەتێکی ڕەسمیی پێ نەداین، بەڵام ئێمە لەو بڕوایەدا بووین کە هەرگیز دەستمان لێ بەر نادات.» گەر ئاوڕێک لە هەشتاکانی سەدەی پێشوو بدەینەوە

و بارودۆخی ئەوسای کورد و عێراق و ناوچەکە و ئەمەریکا هەڵسەنگێنین، یەکسەر ڕووخانی شا و ئێرانی ئیسلامی و لاوازیی ئابووریی سۆڤیەت و شەڕی یەکەمی کەنداو و جینۆسایدکردنی کورد بە کیمیایی و ئەنفال و سیاسەتی سووتماککردنی کوردستانمان دێتەوە یاد و بالادەستیی ئەمەریکا لە سەرجەمی ڕووداوەکان. لێرەدا و هەر لە لەدەستدانی هاوکێشەکانی حەفتاکانی ناوچەکە، لە هەشتاکاندا تەواو پێچەوانە بوونەوە. شای ئێران، پاسەوانی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا لە ناوچەکە ڕووخا و دەوڵەتێکی ئیسلامی بۆ یەکەم جار لە چەندین سەدە لەمەوبەرەوە لە جیهاندا، لە ئێرانی شارستانی و عیلمانیی کارتێکراوی نەریتی فەرەنسی و ئەڵمانی و ئەمەریکیدا دامەزرا. جێپێی ئەمەریکا لەو وڵاتە پان و سنوور درێژە بە سۆڤیەت و ئەفغانستانەوە نەما، بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا کەوتنە مەترسییەوە. ئەمەریکاش شانبەشانی سۆڤیەت، ترسی لافاو و شالاوی تەشەنەکردنی ئیسلامییان لە ناوچەکە لێ نیشت. ئەو دوو جەمسەرە دژبەیەکە لەم خاڵەدا یەکیان گرتەوە (یەکێتیی دژەکان). عێراق بە هەلی زانی کە دەوڵەتێکی ئیسلامیی لاوازی پاش هەرەسی سوپای بەهێزی ئێران و گەرەلاوژەی پاسداران و کەم ئەزموونیی حوکمڕانیی وەک ئێران کە لە پەیمانی جەزائیردا عێراقی شکاند و چۆکی پێ دادا، تۆڵەی لێ بکاتەوە و لە هەموو خاڵەکانی ڕێککەوتننامەکەی جەزائیر پاشگەز بێتەوە و بکەوێتە بیانووگرتن و تۆڵەکردنەوەی شکستەکەی. کورد بۆ یەکەم جار لە مێژووی نوێدا لە سێ پارچەی کوردستاندا خەباتی چەکداریی دەست پێ کرد، بێ بیرکردنەوە لە ئەنجامەکەی و بە قۆستنەوەی فاکتەری ناکۆکیی نێوان سێ دەوڵەتە داگیرکەرەکەی کوردستان. هەرسێ دەوڵەتەکە: عێراق، ئێران، تورکیاش کەوتنە چاککردنی پەیوەندی و یارمەتیدانی ڕاپەڕینی کوردەکان، هەریەکە بە مەبەستی بەکارهێنانیان بۆ بەرژەوەندییە دوور و ناوچەکەی خۆیان و سووریاش بۆ فشار خستنەسەر دەسەلاتەکانی تورکیا بۆ بەرژەوەندیی ناوی خۆیان. بە مانایەکی تر: کۆنترۆڵکردن و لغاوکردنی بزووتنەوەکانی کورد لە ئێران، تورکیا، عێراقدا لەلایەن ئێران، تورکیا، عێراق، سووریاوە بۆ جێگۆڕکەیی. لە لایەکی ترەوە هەرسێ وڵاتەکە بێ درێغیکردن، کەوتنە جینۆسایدکردنی کورد و سوتماککردنی کوردستان و کاولکردن و چۆڵکردنی لە دانیشتووانی. ئەمەریکای چەقی عەولەمە و شارستانی و ناردەی

کالای دیموکراتی بۆ دەرەوەی ئەمەریکا، پشتیوانیی لە ڕژێمێک دەکرد کە فاشیەت و نازیەت و پۆلپۆتیەتی خستبووە گیرفانەوە و لە هەموویانی تێپەڕاندبوو بە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و بایۆلۆژی و کۆکوژی بەرامبەر بە کورد کە یەکەم دەوڵەت بوو دژی بڕیاری جنێف وەستابۆوە.

لەو کاتەی کە کورد لە کوردستاندا کیمیاباران دەکرا، ئەمەریکا پەیتا پەیتا چەک و قەرز و زانیاریی لەسەر بەرەکانی شەڕ دەدا بە عێراق بۆ پشتڕاستکردنەوەی لەبەرامبەر گورزە پشتشکێنەکانی ئێران. سۆڤیەت درێغیی نەکرد لە هاوکاریی عێراق بە چەک و پارە و زانیاریی سەربازی تا ڕادەی ٤٠ بلیۆن دۆلار. تا خومەینیان ناچار بە ڕاگرتنی شەڕ کرد لە ١٩٨٨/٨/٢٠ دا و عێراقیان لە کەوتنێکی حەتمی دەرباز کرد و سنووریشیان لەسەر تەشەنەکردنی لافاوی ئیسلامە ئوسوڵییەکەی خومەینی داخست.

دوای ئەوەش ئەمەریکا بێدەنگ بوو لەبەرامبەر بە جینۆسایدکردنی کورد لەلایەن ڕژێمی بەعس و سەدامەوە. کیمیاباران و ئەنفال و پیشاندانی ئەو دیمەنانە و هاوار و بانگەوازی کوردانی هەندەران لە مانگی ١٩٩٨/٧دا، کەمێک ویژدانی هەندێ لە کەسانی ناو ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکای هەژاند و ڕێککەوتننامەی ١٩٢٥ی جنێفیان بیر حکومەتی ئەمەریکا هێنایەوە، کە بەکارهێنانی چەکی کمیایی قەدەغە کراوە و داوایان کرد کە عێراق بە گەمارۆی ئابووریی سزا بدرێت، بەڵام ئەو داوایە لە کۆنگرێسی ئەمەریکادا ڕووبەڕووی تووڕەیی و هەڕەشەی لۆبییە بازرگانەکان و دەسەڵاتدارە چاوچنۆکەکانی ئەمەریکییەکان بووەوە و کپ کرا و بەوەشەوە نەوەستان، بەڵکوو لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی دادوەریدا شەرعیەتیان دا بە عێراق لە بەکارهێنانی ئەو چەکە بە بیانووی ئەوەی کە وا ڕێککەوتننامەی جنێف باسی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە ڕووداوی ناوخۆییدا نەکردووە و ئەو مەسەلەی عێراقیش ڕووداوێکی ناوخۆییە.

## هەشتاکان و سیاسەتی ئەمەریکا بەکورتی

بەکورتی سیاسەتی ئەمەریکا لە هەشتاکانی سەدەی پێشوو بەرامبەر عێراق و ناوچەکە بریتی بوو لە: پاراستنی ڕژێمی سەدام وەک لەمپەڕێک لەبەرامبەر ئێران و پاراستنی کوێت و سعودیە و وڵاتە لاوازەکانی تری میرنشینەکانی خاوەن نەوت.

گوێنەدانی ئەمەریکا بە کێشەی کورد لە هەشتاکاندا، ئەوەی هێنامەوە یاد کە پاش کیمیابارانەکەی هەڵەبجە و ناوچەکانی تری کوردستان، لە سەفەرێکی مام جەلال بۆ دەرەوە بە مەبەستی گەیاندنی بارودۆخی کورد و کوردستان بەدەست ڕژێمی بەعسەوە لە مانگی گەلاوێژی ١٩٨٨، چاوی بە فەرمانبەرێکی مامناوەندی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا دەکەوێت و هەر چی پێی دەبێت بۆی باس دەکات، بەو هیوایەی شتێکی لێ بگاتە جێی خۆی، بەڵام فەرمانبەرە دیبلۆماتە ئەمەریکییەکە نەک هەر سەرکەوتوو نابێت لە گەیاندنی دەنگی مام جەلال بە کەناڵێکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا یان مەڵبەندێکی خاوەن قەراری ئەمەریکی، بگرە بۆ هۆی دەرچوونی بڕیارێکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا کە ڤیزەی ئەمریکی بۆ هەموو لێپرسراوە کوردەکان قەدەغە بکرێت، داواکەی مام جەلالیش پشتگوێ دەخرێت. گەر ئاوڕێک لە نەوەدەکانی سەدەی پێشوو بدەینەوە، شلکردنی لغاوی ئەمەریکی بۆ سەدام و پشتگیریکردنی لە شەڕی عێراق-ئێران و بێدەنگیی لە ئاستی پێشێلکردنی پەیمانی جنێف لە جینۆسایدکردنی نەتەوەیەک و تەنانەت پشتگیریکردنیشی، وای لە سەدام حسێن کرد کە لە نەوەدەکاندا پرکێشییەکی ئەوتۆ بکات کە تەرازووی هێز لە ناوچەکەدا بگۆڕێت.

## هێما سەرەکییەکانی نەوەدەکانی سەدەی بیستەم

ڕووخانی ئۆردووگای بەناو سۆسیالیستی و هەیکەلی قەبەی یەکێتیی سۆڤیەت لە لایەک و جەنگی دووەمی کەنداو و دەستبەسەرداگرتنەوەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لەلایەن ئەمەریکاوە بوو. لەپاڵ ئەم دوو ڕووداوە گرنگ و گەورەیەدا، گەلێک ڕووداوی بچووکیشی بەخۆیەوە ئاڵاند کە بوونە فاکتەری وەرچەرخانێکی گەورە لە سیاسەت و ئابووری و جوگرافی و نەخشەیی کە بەگشتی سەرەتای دەستپێکردنی تۆفانی ڕووخانی ئۆردووگای بەناو سۆسیالیستی بوو، بە هەڵکردنی گێژەڵووکەی پرۆسترۆیکا و گلاسنۆس دەستی پێ کرد. گوربا تشۆف بە داهێنانی بیرۆکەی پرۆسترۆیکا، نەک هەر گەورەترین تاوانی بەرامبەر بە ئۆردووگای بەناو سۆسیالیستی کرد، بەڵکوو باشترین خزمەتیشی بە ئۆردووگای ئیمپریالیزم و سەرمایەداریی جیهانی کرد. من نامەوێت لێرەدا لەسەر پرۆسترۆیکا و گلاسنۆس بدوێم، بەڵام دەبێت لێرەدا ئاماژەیەک بە

دەستوالآکردنەوەی ڕۆژئاوا بدەم لەلایەن گورباتشۆفەوە کە بتوانن بازاڕی خۆیان لە ئەورووپای ڕۆژهەلات و ولاتانی ئاسیا و ئەمەریکای لاتینیی سەر بە ئۆردووگای بەناو سۆسیالیستیدا بدۆزنەوە بۆ ساغکردنەوەی کالاکانیان لە لایەک و لە لایەکی تریشەوە دلنیاکردنی ولاتانی سەرمایەداریی داگیرکەر لەوەی کە کێشەی نێوان سۆڤیەت و ئەمەریکا لە جەنگی ساردا لەوە بەدواوە بریتی نییە لە پشتیوانیی گەلانی ژێردەستە و ولاتانی داگیرکراو و ڕاپەڕینی کرێکاران، بەلکوو بریتییە لە دانانی سنوورێک بۆ پەرەپێدانی چەکە ستراتیژی و کۆکوژەکان. بەوەش هەم دەستی ئەورووپای ڕۆژئاوا و ئەمەریکای والا کرد لەدەست خستنە ناو بازاڕ و ئابووریی ولاتە بەناو سۆسیالیستە لەبرسامردووەکان و هەم بە گوێی گەلانی ئەو ولاتە بەناو سۆسیتالیستییانەشی دا کە لە ڕژێمەکانیان ڕاپەڕن و هەلیانتەکێنن. ئەوە بوو بە تەسلیمبوونی گورباتشۆف بە بۆریس یەلتسن و ڕووخانی یەک بەدوای یەکی دەولەتە بەناو سۆسیالیستەکان لە سالی ١٩٩٠دا، لە ماوەیەکی کەمدا کۆتایی بە جەنگی سارد بە ڕووکەش هات، بەلام لە ناوەڕۆکدا ئەم جەنگە بەردەوامە لە بەرگێکی تردا. لەدوای نەمانی بۆریس یەلتسن و هاتنی پوتین لە سەدەی بیست و یەکەم، دیسانەوە ئەو جەنگە ساردە بە شێوەیەکی تر لەژێر ناو و بەرگێکی تردا سەری هەلداوەتەوە. ئەمەریکا بۆتە تاکە جەمسەری هێز لە دنیادا، بەلام هێشتا بەو جۆرە دەستی والا نەبووە لە جێبەجێکردنی نەخشەکانی سەبارەت بە کۆمەلێک بەلێن و پەیمان و یاسا و ڕێسای نەتەوە یەکگرتووەکان، بوونی ولاتانی ئەورووپای یەککرتوو، تەقەلای فەرەنسا و ئەلمانیا بۆ پاراستنی سەربەخۆیی یەکێتیی ئەورووپا.

ڕووداوی دووەم بریتی بوو لە پرکێشیکردنی سەدام بۆ شەڕفرۆشتن بە ولاتانی بچووک و کەمدەسەلاتیی سوپایی و کەم ئەزموونیی جەنگی، بەلام دەولەمەند و خاوەن نەوت و سەرمایەیەکی بێشومار. عێراق لە شەڕی عێراق-ئێراندا کەوتبووە ژێر باری قەرزێکی زۆرەوە کە بە بۆچوونێک ٤٨ بلیۆن و بۆ چوونێکی تر ٨٠ بلیۆن دۆلار دەیخەملێنێت، لە لایەکی ترەوە جەنگەکە ببووە هۆی دروستکردنی سوپایەکی چەکداری نزیک بە ملیۆنێک سەربازی. بە نەمانی شەڕ، عێراق بۆی نەدەکرا هەر وا بەئاسانی خۆی لەو سوپا زۆرە و گەڕاندنەوەیان بۆ ژیانی مەدەنی ڕزگار بکات کە

دەبووە مایەی دروستبوونی بێکارییەکی زۆر.

پشتئەستووریی سەدام بە پشتیوانیی ئەمەریکا و ئەورووپا لە شەڕی ئێران عێراق و یارمەتیدانی لە پێکهێنانی ئەو ژمارە قەبەیە لە چەکە کۆکوژ و ستراتیجیانە، وای لە سەدام کرد لە پێشدا پەلاماری کوێت بدا و پاشانیش گەر سەری گرت سعودیە و میرنشینەکانیش بگرێت. ئەمەریکا باش ئاگاداری مانۆڕەکانی سوپای عێراق بوو لە بەسرە و پاشان لەسەر سنووری کوێت، بێ ئەوەی بچووکترین ئاماژەی پێ بکات. عێراق لە ١٩٩٠/٨/٢دا چووە ناو کوێتەوە و کوێتی گرت. ئەمەریکا ئەوەی بە هەل زانی و سەرەتا ویستی لابەلایی لە سەدام بگەیەنێت کە بکشێتەوە. مەترسیی سەدام بۆ سەر سعودیە، وای لە پنتاگۆن کرد کە گرتنی کوێت بە گرنگ وەربگرێت، ئەمەریکا دەیویست ئەو هەلە لەدەست نەدات و بەو هۆیەوە جارێکی تر بگەڕێتەوە ناو ناوچەکە و ئەم جارەیان هەندێک گۆڕانکاری لە جۆری حوکمەکانی ناوچەکەدا بکات. بەڵام پێویستی هەم بە ڕەزامەندیی ئەمەریکییەکان و خاوەن بڕیارەکانی ئەمەریکا بوو، هەم بە پشتیوانیی وڵاتانی ئەورووپا، بەتایبەتی فەرەنسا و ئەڵمانیا، هەم پشتیوانیی وڵاتە عەرەبییەکان بەتایبەتی میسر و سعودیە، دەیویست بە تیرێک چەند نیشانێک بپێکێت:

١. باج و خەرجیی شەڕەکە بخاتە سەر وڵاتە عەرەبییەکان و هاوپەیمانان.
٢. دەست بخاتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاوە گەرمەکان بێ بەربەرەکانی لایەکی تر.
٣. دەست بگرێتەوە بەسەر نەوتی ناوچەکەدا بەتایبەتی عێراق.
٤. سنوورێکیش بۆ دەسەڵاتی ئێران لە ئایندەدا دابنێت.

عێراق لە کوێت نەکشایەوە، هێزی زەمینیی هاوپەیمانان پەلاماریان دا دوای ١٠٠ سەعات شەڕکردن، ئەمریکا یەک لایەنە لە ١٩٩١/٢/٢٨ بڕیاری ڕاگرتنی شەڕی دا پاش دەرکردنی سوپای عێراق لە کوێت. جۆرج بوش کەوتە ژێر فشارێکی بەهێزی ئەمەریکاییەکان بۆ ڕاگرتنی شەڕ و پەلاماردانی سوپای عێراق سەبارەت بەو فلیم و ڕەسمانەی کە پەیامنێران شەقامی نێوان کوێت-سەفوان-بەسرەیان گرتبوو کە بە هەزاران ئۆتۆمبێل و تانک و زرێپۆشی تێکشکاو هەزاران لاشەی سەربازی لێ

کەوتبوو. بۆش بەر لە ڕاگرتنی شەڕەکە، پێی وا بوو سوپای عێراقی بەتەواوی لاواز کردووە و گەلانی عێراق دەتوانن بێ شەڕی هاوپەیمانان؛ حوکمی بەغدا بڕووخێنن، بۆیە لە ٢/١٥ داوای لە گەلانی عێراق کرد کە وا ڕاپەڕن. سوپای بەدری سەر بە "مجلس الاعلی الاسلامی" لە ئێرانەوە دزەی کردە ناو عێراق و شیعەی ڕاپەڕاند، لە ٢/٢٥دا ڕاپەڕینی شیعە لە خواروو دەستی پێ کرد. درووشمی بنیادنانی دەوڵەتی ئیسلامی و ڕچەی شیعە بەرز کرایەوە، لە هەموو لایەکەوە وێنەی ئیمام خومەینی دەشەکایەوە. پنتاگۆن مەترسیی دروستبوونی دەوڵەتێکی ئیسلامی و ئوسووڵیش لە عێراقدا لێ نیشت و لە ٢/٢٨ بڕیاری شەڕڕاگرتنی دا. بوش مانەوەی دەوڵەتێکی لاواز و تێکشکاوی وەک سەدامی بەلاوە باشتر بوو تا بنیاتنانی دەوڵەتێکی ئیسلامیی ئوسووڵی. لەو مەرجانەی کە لە ڕاگرتنی شەڕەکەدا هاوپەیمانان و ئەمەریکا لەسەر عێراقیان دانا، باسی بەکارنەهێنانی کۆپتەری جەنگیی تیا نەبوو. ڕژێمی سەدام بەو هێزە کە لە پاشماوەی شەرەکەدا مابووی و بە پشتیوانیی کۆپتەر، کەوتە سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی شیعەکان. لە کوردستانەوە لە ١٩٩١/٣/٥وە تا ٣/٢١، ڕاپەڕین لە ڕانییەوە بۆ کەرکووک دەستی پێ کرد و درێژەی کێشا. کەرکووک و بیرە نەوتەکان لە ٣/١١ تا ٣/٢١ کەوتنە ژێر دەسەڵاتی کوردەوە. گرتنی کەرکووک لەلایەن کوردەکانەوە، جۆرە سڵەمینەوەیەکی لای پنتاگۆن دروست کرد، بەتایبەتی کە پەیوەندییەکی باش لەنێوان کوردەکان و حکومەتی ئیسلامیی ئێران هەبوو. سوپای عێراق و کۆپتەرەکان پاش سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی شیعە، کەوتنە لەشکرکێشی بۆ کوردستان و سەرەتا لە ٣/٢١دا کەرکووکی گرتەوە. بوش و پنتاگۆن هێندەی موویەک جووڵەیان لێوە نەهات، بەپێچەوانەوە لە دڵەوە خۆشحاڵ بوون بە مانەوەی سەدامی لاواز و لەناوچوونی تەقەڵای دروستبوونی دەوڵەتێکی شیعە لە عێراق و دەستبەسەرداگرتنی کەرکووک لەلایەن کوردەکانەوە. ئەمەریکا ئەو کاتە ڕەزامەندیی کوێت و سعودیەی بەلاوە گەلێک گرنگتر بوو لە گەلانی عێراق. سعودیە کە چەقی دەوڵەتی ئیسلامیی سوننی مەزهەبە و زۆر بە دەوڵەتی ئیسلامیی شیعە مەزهەبی ئێران ناڕەحەت بوو، هەرگیز نەیدەویست دەوڵەتێکی دووەمی شیعە لە دنیای ئیسلامدا دروست ببێت. تورکیا کە دراوسێی عێراق و ئەندامێکی پەیمانی ناتۆ و هاوکاریی ئەمەریکا و دوژمنی دێرینەی

کورد بوو بە ڕاپەڕینی کوردەکان، سەرۆک تورگۆت ئۆزال زۆر ژیرانە کەوتە هەوڵی بینینی سەرۆکە کوردەکان و شکاندنی ئەو نەریتە کۆنەی پاشماوەی ئەتاتورک کە بە هیچ جۆرێک دان بە بوونی نەتەوەیەک بە ناوی کورددا نەنرێت. ئۆزال هەستی بە مەترسیی ئایندەی ڕاپەڕینی کوردەکانی باشووری کوردستان بۆ سەر ئاسایشی تورکیا کردبوو، کە کوردەکانی باکووری کوردستانیش بە سەرکردایەتیی پەکەکە سوود لە ٢٠٦کم سنووری نێوان تورکیا و عێراق کە کەوتبووە ژێر دەستی کوردە ڕاپەڕیوەکانەوە بکەن و ڕاپەڕینەکەیان پەرە پێ بدەن. ئۆزال لە ٣/٨دا داوای بینینی جەلال تاڵەبانی و مەسعوود بارزانیی کرد بۆ کۆبوونەوە لەگەڵیاندا. جەلال تاڵەبانی پێی باش بوو کە پێش بینینی ئۆزال، سەر لە ئەمەریکا بدات، چونکە تاڵەبانی پێی وا بوو کە داواکارییەکەی ئۆزال بە ئیعازی پنتاگۆنە، بەڵام وا نەبوو، ئەمەریکا هەر سوور بوو لەسەر نەبینینی سەرکردە کوردەکان. کۆبوونەوەی تاڵەبانی و موحسین دزەیی لەگەڵ یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی تورکیا لە ٩ و ٣/١٠ و پاشان بەڕەسمی لەگەڵ ئۆزاڵ کۆ بوونەوە کە هێشتا ڕاپەڕین سەرکوت نەکرابوو. ئەمەریکا پاش ئەو هەموو گۆڕانکارییانەی سەر گۆڕەپانی عێراق و تورکیا و ناوچەکە، هێشتا نەخشەی لابردنی سەدام و ڕژێمەکەی و پشتگیریی کودەتایەکی سەربازی و ئاوڕدانەوەیەکی دۆستانەیان بۆ کوردەکان نەبوو. لە ١٩٩١/٣/٢٥ کۆڕەوە ملیۆنییەکە دەستی پێ کرد و ڕۆژانە هەزار کەسی کورد گیانیان لەدەست دەدا، لەم کۆڕەوەی کورد لە سەددا ١٢ی منداڵانی کورد گیانیان لەدەست دا. کارەساتی لەو جۆرە، لە کۆمەڵگای مەدەنیی ئەو ساتانەدا دەگمەن بوو. بێخۆراکی، بێنەوایی، بێبەرگی، سەرما و سۆڵەی شاخەکان، بێدەنگیی نەتەوە یەکگرتووەکان، کەڕی وڵاتە یەکگرتووەکان، دڕندەیی و پەلاماری سوپا داپڵۆسێنەرەکانی عێراق، پتر لە سێ ملیۆن کوردیان دووچار و ئاڕاستەی بێهیوایی و چارەنووسی نادیار و چاوەڕێکردنی مەرگ کرد. پشتگوێخستنە بەمەبەستەکەی ئەمەریکا لە ئاست ئەو تراژیدیایە، وەک بڵێیت ڕووداوەکان لە دوور و نزیکەوە هیچ پەیوەندییەکیان بەوانی دۆستی گەلان و مرۆڤ و مافی مرۆڤی دیموکراتخوازەوە نەبێت. لە ٢٦ /٣دا لەژێر پاڵەپەستۆی هەواڵنێرانی بیانی کە هەواڵەکانیان ڕادەگەیاند، بوش لەگەڵ ٧ ڕاوێژکاری خۆیدا کۆ بووەوە و بڕیاریان دا کار بکەن بۆ ئۆلتیماتۆم دان بە

عێراق، بۆ بەکارنەهێنانی کۆپتەرەکان لە لێدانی کوردەکاندا، بەڵام نە سەدام گوێی دایە ئەم داوایە و نە ئەمەریکاش دوای کەوت و پشتگوێیان خست. چی وای لە هاوپەیمانان و ئەمەریکا و نەتەوە یەکگرتووەکان کرد کە ناچار بن بە ئاوڕدانەوەیەکی بەبەزەییانە لە کورد. گومان لەوەدا نییە کە هیچ کام لەم وڵاتانە لە تەرازووی بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا، تای تەرازووی عێراقێکی تێکشکاو و بنیاتی ئابووریی ڕووخاو کە هیوایەکی یەکجار زۆریان بە بەشداریکردن لە بنیاتنانەوەیدا هەبوو، بە مەبەستی بەدەستهێنانی هەر چی بکرێت، زۆرتر لە دەستکەوت و سوود، بگۆڕنەوە بە تای تەرازووی کوردێکی دۆڕاو لە ڕاپەڕین و پەرشوبڵاوەپێکراو و خاوەن بستێک زەویی نەبوو و ئاوارە. بەڵام:

١. قەلاچۆی بەکۆمەڵی کوردان و مەترسیی بڵاوبوونەوەی گەورەترین کارەساتی مرۆیی و تەندروستی و کۆمەڵایەتی لە لایەک.

٢. لە لایەکی ترەوە مەترسیی تورکیا و ئێران و هاوپەیمانان، بەتایبەتی ئەورووپای ڕۆژئاوا و ئەمەریکا لەو لافاوە کۆڕەوە ملیۆنییە و داوای پەنابەریکردن لەو وڵاتانە.

٣. فشاری زۆر بەهێزی ڕای گشتیی گەلانی وڵاتە هاوپەیمانەکان بەتایبەتی ئەمەریکا، ئەڵمانیا، فەرەنسا، ئیتالیا بۆ سەر حکومەتەکانیان بۆ دانانی سنوورێک بۆ کارەساتە بێوێنەکە، بووە هۆی:

ا. لە ٥/٤ بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی دەرچوو.

ب. ئەمەریکا دەیویست ئەو شەرمەزارییەی کە بە هۆی داوای ڕاپەڕین لە خەڵک و پاشان پشتتێکردنیان و قەلاچۆکردنیان تووشی ببوو؛ بە کەمترین زیان لێی دەرچێ، ئەویش بە دیاریکردنی ناوچەیەکی ئارام بۆ گەڕانەوەی پەنابەرانی سەر سنوورەکان بۆ ئەو ناوچەیە، ئیتر خۆی لێ دەرباز بکات. سووربوونی کوردەکان لەسەر مانەوە لەسەر سنوورەکان، بووە هۆی بڕیاردانی «کۆلن پاول» بە هێشتنەوەی هێزێکی نزیکەی ٣٠٠٠ کەسیی هاوپەیمانان لەناو دهۆکدا بۆ دڵنیایی پەنابەران و گەڕانەوەیان بۆ ناوچەی ئارام لە ٤/١٦دا.

ج. لە ٤/١٩دا بڕیاری دیاریکردنی هێڵی دژەفڕین لە سەروو و خوارووی عێراقدا درا. لەگەڵ ئەو هەموو بڕیارانەش کە گوایە بۆ کورد دران، بەڵام هێشتا هیچ نەخشەیەکی ئەمەریکی نەبوو بۆ پشتگیریکردن لە گەلانی عێراق یان لە کورد.

ئەو بێهیواییەی سەرانی کورد لە ئەمەریکا و هاوپەیمانان لەناو بەرەی کوردستانیدا، بێ گوێدانە گرنگیی پشتیوانیی جەماوەری وڵاتە ئەورووپاییەکان و ئەمەریکییەکان بۆ مەسەلەی کورد و هەوڵ و تەقەللای ڕێکخراوە کوردییەکانی دەرەوە و ڕێکخراوە مرۆڤدۆست و خێرخوازەکانی بیانی، وای لە سەرانی کورد لەناو بەرەی کوردستانی کرد لەو کاتە ناسکەدا پاش دەرچوونی ئەو هەموو بڕیارە گرنگەی سەرەوە و ئەو هەموو پشتیوانییەی گەلان، بڕیار لەسەر وتووێژ لەگەڵ سەدام حسێندا بدەن. بۆیە لە ٤/٢٠، وەفدی بەرەی کوردستانی گەیشتە بەغدا. لە ٧/١٥ ، هێزەکانی ناوچەی ئارام لە کوردستان کشانەوە بۆ تورکیا و لە ٧/١٩ دوایین دانیشتنی وتووێژ کۆتایی هات. گەر خوێنەر لە مێژووی ڕۆیشتنی هێزەکانی ناوچەی ئارام و مێژووی دوا جەولەی وتووێژ ورد بێتەوە، بۆی دەردەکەوێت کە: ئەمەریکییەکان بەتایبەت «کۆڵن پاول» بێ گوێدانە پرسوڕا بە فەرەنسییەکان و ئینگلیزەکان پێش تەواوبوونی ئەنجامەکانی گفتوگۆ، هێزەکانی کشاندەوە. فەرەنسییەکان و ئینگلیزەکان بەهیوا بوون کە ئەو هێزە و مانەوەی لە کوردستاندا، ببێتە هۆی بەردەوامبوونی وتووێژ و سەدام ناچار بکات:

١. بە دانی ئۆتۆنۆمی بە کوردەکان.

٢. وردە وردەش کشانەوەی هێزەکانی لە کوردستان و بێ شەڕ، چۆڵکردنی کوردستان و گەڕانەوەی کۆڕەوەکەش لە ئێران و تورکیا و سنوورەکانەوە بۆ شارەکان، بەڵام کشانەوەی هێزەکان لەلایەن ئەمەریکاوە هەم سەدامی پشتئەستوور کرد لە بەردەوامبوون لە پەلاماردان و هەم پشتگوێخستنی خواستی کوردەکانیش.

دیاریکردنی هێزی دژەفڕین و ناوچەی ئارام و ڕووخانی و وتووێژ، بووە هۆی جارێکی تر ڕاپەڕینەوەی کورد و ڕزگارکردنەوەی ناوچە گیراوەکان، جگە لە کەرکووک و خانەقین و چەند ناوچەیەکی تریش.

وڵاتە هاوپەیمانییەکان بەگشتی و ئەمەریکا بەتایبەتی، کوردیان لەوە ئاگادار کردەوە کە بە هیچ جۆرێک لە ناوچە قەدەغەکراوەکان نزیک نەبنەوە، واتە کەرکووک و خانەقین و موسڵ (ناوچە نەوتییەکان) و تێیانگەیاندن کە بڕیاری دژەفڕین ئەو ناوچانە ناگرێتەوە. پاش ڕزگارکردنی هەولێر و سلێمانی و گەرمیان لە مانگی ١٩٩١/١١دا، ڕژێمی عێراق هەم بڕیاری کێشانەوەی ئیدارەکەی خۆی لەو ناوچانە دەرکرد و

مووچەی فەرمانبەرەکانی بڕی و هەم گەمارۆی ئابوورییشی خستنە سەر کوردستان. کوردەکان بەردەوام داوایان لە نەتەوە یەکگرتووەکان دەکرد کە ڕێگە بدرێن بۆ بردنی ئەو کەرەستانەی کە کارگە و کارخانەکانی کوردستانی پێ دەخرێتە گەڕ، بەڵام هەموو جارێک لەلایەن ئەمەریکاوە ڕەت دەکرایەوە. تاکە شتێک کە هاوپەیمانان بۆ کوردیان کرد لە ڕووی باشکردنی باری ئابووریی کوردستانەوە، ئەو چاونوقاندنە بوو کە لە ئاست ئەو لۆری و تانکەرە نەوتهەڵگرە تورکیاییەکانیان کرد، کە نەوت و گازی قاچاخیان لە عێراقەوە دەبردە تورکیا. بە ڕای من ئەوەش هەر لە بەرژەوەندیی کورد نەبوو کە گومرگەکەی وەردەگرت، بەڵکوو لە بەرژەوەندیی تورک بە پلەی یەکەم و ئینجا عێراقیش بوو، نەک لەبەر خاتری کوردان. لەقاڵبدانی کوردەکانی عێراق بە داخستنی سنوورەکان لێیان لە ترسی لافاوی پەنابەری، لەلایەن هاوپەیمانانەوە گەمارۆی ئابووریی خستە سەر کوردستان لەلایەن سەدامەوە و کشانەوەی ئیدارەی حکومەت لە کوردستان، وایان لەو کوردانەش کرد لە سەدام نائومێد بن کە تا دوا ڕۆژەکانی مانگی ١٩٩١/١١یش بڕوایان هەر بە وتوویژ بوو لەگەڵ سەدام و هەموو سەرکردە کوردەکانی ناو بەرەی کوردستانی بکەونە ناو جوغزی نەخشەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان، کە بیرۆکەی «یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان» بوو. لە مانگی ١٩٩٢/٥ کورد بووە خاوەن یەکەم پەرلەمانی خۆی. هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و بنیادنانی حکومەتێکی کوردی، واشنتۆنی خستە ناو تەڵەی ئاوڕدانەوەی لە «بەرهەڵستکاریی عێراقی» (موعارەزەی عێراقی) بە کوردەکانەوە، سەبارەت بەوەی کە ناوەندی بەرهەڵستکاریی عێراقی لە کوردستانی ئازاددا بوو. پەرلەمانی کوردستان و حکومەتی فیدڕاڵ (بەغدا، ئەنقەرە، شام، تاران)ی زۆر دڵگران کرد، بەڵام واشنتۆن ناچار بوو سیاسەتێکی نوێ بگرێتە بەر، سیاسەتی دابینکردنی لانی کەمی یارمەتیی ڕکابەر، واتە سیاسەتی مەمرە و مەژی. نە ئەمەریکا و نە هیچ وڵاتێکی ئەورووپای ڕۆژئاوا و نە هیچ وڵاتێکی هاوپەیمان و دەرودراوسێ و ئاسمان و ڕێسمان، دانیان بە حکومەتی فیدڕالی کورددا نەنا. هێندەی بەزەییهاتنەوە بە باڵندە و چوارپێییەکانیش، بەزەییان بەو دوو ئابڵوقەی سەر کورد نەهاتەوە. ڕێگەیان نەدا بە هیچ جۆرێک کورد دەروازەیەک یان دوو دەروازەی باوەڕپێکراو و ڕەسمیی بازرگانی

لەگەڵ دنیای دەرەوەدا هەبێت، ڕێگەیان نەدا کە بچووکترین کەرەستە و ئامێری یەدەگی پێویست بۆ بەگەڕخستنەوەی ئەو دوو کارگە بچووکەی کە هەبوو؛ پەیدا بکەن و لە دەرەوە بیگەیەننە ناو کوردستان. کارگەی چیمەنتۆ، شەکر، جگەرە، چنین، شیرینی... هتد، هەمووی وەستابوو، تەنیا ئاوڕێکی ئەمەریکا لە معارەزەی دایەوە، ئەو چەردە پارەیە بوو کە وەک خێر دەیدانێ. ئەنجامی ئەو سیاسەتەی ئەمەریکا، بووە هۆی سەرهەڵدانی دیاردەی کۆچ کە زۆربەی ڕۆشنبیران و چینی مامناوەندی گرتەوە. نامەوێت جارێکی تر قەتماغە لەسەر برینەکان هەڵدەمەوە و کۆنە زامەکان بکولێنمەوە، کە شەڕی ناوخۆش لە ١٩٩٤ بۆ ١٩٩٨ چیی بەسەر کورد و کێشەی کورد و دۆزی کورداندا هێنا لە ناوەوە و دەرەوەدا.

بەکورتی: ئەمەریکا نە لە حەفتاکان و نە لە هەشتاکان و نە لە نەوەدەکاندا بە هیچ جۆرێک بە کردەوە و بەڕاستگۆییانە بیریان لە مەسەلەی کورد نەکردۆتەوە لە ئاست کارەساتەکان و ئەو تاوانانەی بەرامبەر بە کورد کراوە بێدەنگ بوون، تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێت ئەویش گەر زانیبێتیان بەرژەوەندییان لەگەڵ کورد تا ڕادەیەک یەک بگرێتەوە.

## سەدەی بیست و یەک و پشتیوانیی ئەمەریکا

بۆ باسکردن لەسەر بیروڕای دەسەڵاتدارانی ئەمەریکا، واتە پنتاگۆن و CIA بەرامبەر بە کێشەی کورد لە سەدەی بیست و یەکەمدا، پێویستە یەک دوو هەنگاو بۆ ڕابردوو بگەڕێینەوە، واتە بۆ ساڵی ١٩٩٨-١٩٩٩، سیاسەتی بیل کلینتۆن لەسەر عێراق و ئۆپۆزسیۆنی عێراقی و کورد و ئێران و تورکیا لە ولایەتی یەکەمی و لە ولایەتی دووهەمیشیدا هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهات، لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەی کە لەو دوو ساڵەی دوایی ڕوویان دا. لە سووریا حافز ئەسەد کۆچی دوایی کرد و بەشار ئەسەدی میانڕەو هاتە جێگەی. لە ئێران ویلایەتی محەممەد خاتەمی بۆ جاری دووەم بە نەرمییەکی یەکجار زۆرەوە لە سیاسەتی ئێران بەرامبەر ڕۆژئاوا و ئەمەریکا، لە تورکیا سیناریۆی گرتنی ئۆجەلان و هەڵتەکاندنی پەکەکە و سوپا چەکدارەکەی، لە عێراق ئاشتبوونەوەی دوو لایەنە ناکۆکەکەی باشووری کوردستان، واتە پارتی و

یەکێتی، زیاتر ڕێکخستنەوەی ناوخۆی ماڵی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی. ئەمانە هەموو هیچی لە سیاسەتی ئەمەریکا لەسەر مەسەلەی کورد نەگۆڕی، نە لە تورکیا داوای چارەسەری کێشەی کورد (لانی کەم کولتووری) و پێشێلنەکردنی مافی مرۆڤی کوردی کرد و نە لە عێراقیش گۆڕانکارییەک لە سیاسەتیاندا بوو. سیاسەتی بیل کلینتۆن پێش و پاش ساڵەکانی ١٩٩٨-١٩٩٩ و ٢٠٠٠ هەمیشە بە سوود و بەرژەوەندیی سەدام بوو، چونکە:

١. دەیویست بەردەوام سەدامێکی لاواز لە عێراقدا لەمپەری بەردەم مەترسیی ئێران و ڕێگریی هاتنە سەر حوکمی ئۆپۆزسیۆنێک بوو، کە لە سەددا سەد سەربەخۆیی نەبێت.

٢. بەرامبەر بە سەدام پێویستی بەو پارچەیەی کوردستان بوو، کە ناوکی پلانێکی ئاینده بێت بۆ خۆی، بۆ هەر کاتێک کە گۆڕانێکی بەدڵنەبووی ئەمەریکا ڕوو بدات.

٣. ئاشتبوونەوەی پارتی و یەکێتی و ڕێککەوتن لەسەر شەڕنەکردن، تەنیا داخوازیی سیاسەتی ئەمەریکا بوو، بەڵام لە لایەکی ترەوە ڕێگەشی بۆ مانەوەی کێشەکانی نێوانیان خۆش دەکرد و پێی باش بوو گەوهەری کێشەی نێوان ئەو دوو لایەنەی کورد هەروەک خۆی بێت، کە:

١. جگە لە تەقەللای ئاشتکردنەوەی ئەو دووانە، کە وا دەستە گوڵەکەی بە بەشداریی مادلین ئۆل برایت؛ وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا هاتە دی، ئەمەریکا هیچ تەقەللا و فشارێکی بەخەرج نەدا بۆ یەکبوونەوەی ناوچە ئازادکراوە دوولەتکراوەکەی خوارووی کوردستان.

٢. پێداگرتنی ئەمەریکا لەسەر جێبەجێکردنی گرێ و کێشە لاوەکییەکانی وەک کردنەوەی بارەگای ئەملا و ئەولا، یان ئاساییکردنەوەی بارودۆخی سنووری نێوان هەردوو لایان.

٣. خەرجکردنی ڕاستەوخۆی بەشەکەی کوردستان لە بڕیاری ٩٨٦ی نەوت بەرامبەر بە خۆراک لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە لە کوردستاندا، بەم کارەی گەلێک مەسەلەی ڕووکەشیی وەک یارمەتیدانی دانیشتووانی کوردستان بەتایبەت هەژاران و بێکاران بە ئازووقە، ئاوەدانکردنەوەی گوندە وێرانکراوەکان، کردنەوەی ڕێگاوبان و قوتابخانە و نەخۆشخانە و... هتد، چارەسەر کرد.

## هەڵبژاردن و گۆڕینی دەسەڵات: سیاسەتی ئەمەریکای گۆڕی، یان ڕووداوە بێوێنەکەی ١١ی سێبتەمبەری ٢٠٠١؟

پێشتر بەدرێژی باسی سیاسەتی ئەمەریکی لەمەڕ کورد و مەسەلەکەیمان کرد لە سەرەتای شەست و حەفتاکانەوە تا سەرەتای سەدەی بیست و یەکەم. گەوهەری سیاسەتی ئەمەریکی وەک ستراتیج لەسەر مەسەلەی کورد و ئەو بەشە بچووکەی کوردستان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و نزیکدا، هیچ گۆڕانێکی ئەوتۆی تێدا نەبوو. با بزانین ڕووداوی ١١ی ئەیلوولی ٢٠٠١، چ جۆرە کاردانەوەیەکی لەسەر کورد و جیهان و دەسەڵاتداری جیهانگیریدا هەبوو. لەپاش نەمانی بە ڕواڵەت شەڕی سارد و ڕووخان و هەرەسهێنانی ئۆردووگای بەناو سۆسیالیستی و هەیبەت و دەسەڵاتی یەکێتیی سۆڤیەت، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەک دەسەڵاتداری یەکەمی جیهان لە هەردوو ڕووەکەی ئابووری و سیاسی، پاشانیش گەورەترین دەسەڵاتداری سوپایی و ئەتۆمیی جیهانی لە مەیدانەکەدا مایەوە، بەڵام بە توانایی ئەمەریکا و تاک و تەنیایی دەسەڵاتداری جیهانی لە مەیدانەکەدا، بە هەموو پێشکەوتن و بەهێزی و وردبینییەکی موخابەراتی و تەکنەلۆژی و گلۆبالیی خۆیەوە، کە بە درێژایی جەنگی سارد بەرامبەر یەکێتیی سۆڤیەت و ئۆردووگای سۆسیالیستیی بنیاتی نابوو و خودی سۆڤیەتیش سڵی لێ دەکردەوە، دەستەوەستان مایەوە لە ئاست سادەترین پلانی دواکەوتووترین بەشی سەلەفیەتدا. ڕووداوی ١١ی ئەیلوول لەگەڵ ئەوەی کە دەستەوەستانی هەموو تواناکانی ئەمەریکای خستەڕوو لە ئاستی ئەو ڕووداوە و بەرپێنەگرتنی پێشوەخت، بەڵام تەواویش ئەمەریکای وریا کردەوە و بیانووشی دایە دەست بۆ:

١. خۆسازدان بۆ بەرپاکردنی جەنگێکی نیمچەجیهانی.

٢. وریابوونەوە و خۆتەیارکردن بۆ بەگژداچوونەوەی جەمسەرێکی نوێی ناکۆکی کە ئۆردووگای سەلەفیەت وەک جێگرەوەی ئۆردووگای سۆسیالیستی.

٣. خۆخزاندنە ناو وڵاتانی ئاسیای بچووک و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەوڵدان بۆ گۆڕینی تەرازووی هێز تیایدا و پاشان گۆڕینی سروشتی پێکهاتەکانیان و تەنانەت نەخشە جوگرافییەکانیشیان. ڕووداوی ١١ی ئەیلوول، سیاسەتی ئەمەریکای بەرامبەر ئێران، عێراق، سووریا، لیبیا، ئەفغانستان، پاکستان و تەنانەت هیند و چینیش و هەندێ

لە دۆستە هەرە نزیکەکانیشی وەک تورکیا و سعودیە و ئەردەنیش گۆڕی. دیارە لەبەرامبەر ئەفغانستان و گۆڕینی دەسەڵات و شێوەی پەلاماردانی و جۆری بەکارهێنانی ئۆپۆزسیۆنی ئەفغانی و پاشانیش پرۆسەی دامەزراندنی دەسەڵاتی سیاسیی نوێی لە ناودا، بۆ خوێنەر ئاشکرایە. چاکتر وایە ئەوەی ئێمە بمانەوێ لەسەری بدوێین، کێشەی کورد و ئایندەی کوردستان و ئەو خەونە سەوزانەیە کە بە ئەمەریکایەوە دەبینین. سەبارەت بەوەی چمکێکی ناکۆکییە سەرەکییەکەی ئەمرۆی ئەمریکا دووان لەو وڵاتانە دەگرێتەوە کە کوردستانیان داگیر کردووە و گەلی کوردیان تێدا دەژی و هێزە سیاسییەکانی کوردیش و زۆربەی جەماوەرەکەشی بوونەتە بەشێکی ئۆپۆزسیۆنی ئەو دوو وڵاتە کە ئێران و عێراقن، بەناچاری کێشەی کوردیش تێکەڵ بە کێشەی نێوان ئەمەریکا و ئەو دوو وڵاتەش بووە و بۆتە بەشێکی سیاسەتی ئەمرۆی ئەمەریکا. سەبارەت بەوەی کە جەمسەرە پلە یەکە کەی ئەو چەمکەش لە باری ئێستادا عێراقە و کوردیش هێزێکی سەرەکیی ئۆپۆزسیۆنی ئەو جەمسەرەیە و لەناو مەیدانەکەشدایە نەک ئۆپۆزسیۆنێکی دەرەکیی تاراوگە. لەبەر ئەوەی کورد وەک بەشێکی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی خاوەن جۆرێک لە ئەزموونی حوکمڕانیی دەرەوەی شێوە حوکمی عێراق و خاوەن هێزێکی چەکداریی ڕێکخراوە و خاوەن ئەزموونی مەیدانی شەڕە. سەبارەت بەوەی کە بەشێکی فراوانی خوارووی کوردستانی بەزۆر بە عێراقەوە لکێنراوە، لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمی عێراقدا نییە و ئازادە و بۆتە مەیدانی چالاکیی هەموو حزب و ڕێکخراوە سیاسییەکانی سەرجەم ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، دیسان لەبەر ئەوەی ئەو ناوچە کوردییە بەشە دەوڵەمەندەکەی عێراق و دووهەم گەورەترین گەنجینەی یەدەگی نەوتی جیهانی تێ دەکەوێت. دیسانەوە هەر ئەو ناوچە کوردییە بە سنوورێکی دووروودرێژەوە بە جەمسەرە دووهەمەکەی چەمکە ناکۆکییەکەوە بەستراوەتەوە کە ئێرانە. ئەمانە و چەندین هۆکاری تریش بوونەتە مایەی خزانی مەسەلەی کورد لەو بەشە بچووکەی کوردستاندا کە بە عێراقەوە بەستراوە، بۆ ناو سیاسەتی ئەمەریکا لە حەنای ڕۆژهەڵات و عێراقدا. دیارە ئەمەریکاش بۆ پاساودانی دەستخستنەناو سیاسەت و سەربەخۆیی و ئیداریی عێراقەوە، پشتی بە دوو هۆکاری سەرەکی بەستووە کە:

یەکەم: لێدان و دژایەتیکردنی تیرۆر و تۆقاندن و حوکمی تیرۆریستی بە مەبەستی

داماڵینی چەکە کۆکوژەکانی عێراق و ڕزگارکردنی ناوچەکە لە مەترسیی ئایندەی عێراق لەسەریان. دووهەم: بوون بە بابانوئێل و هێنانی دیموکراتیەت و یەکسانیی کۆمەڵایەتی و دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنی و پێکهێنانی عێراقێکی خۆشگوزەران و ئاسوودە، عێراقێکی فرە حزبی و بێ جیاوازیی ئایینی و ڕەگەزی و نەتەوەیی و... هتد.

دەکرێت ئێمەش پرسیارێک لە خۆمان بکەین، داخۆ ئەمەریکا تا چەند توانیی دیموکراتیەتی ناو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای بە سەد ساڵ پتریش لەپێش ئەفغانستانەوە لەناو وڵاتێکی دواکەوتووی وەکوو ئەفغانستاندا ببەخشێتەوە و پاشانیش تیا بچەسپێنێت؟ یان هەر نەبێت پرسیار لە خۆمان بکەین و بزانین:

١. دەشێت دیموکراتیەت لەگەڵ نەریتێکی پەروەردەی دکتاتوریەتدا پێکەوە بلکێن؟

٢. دەکرێت یەکگرتن و پێکەوەژیان لەنێوان دەسەڵاتە دکتاتۆرییەکاندا پێک بێت؟

٣. دەکرێت ئەرکی سەقامگیرکردنی دیموکراتیەت بخرێتە ئەستۆی حزب و ڕێکخراوە سیاسییەکانی لە ناوەڕۆکدا و لە خودی خۆدا دکتاتۆر؟

٤. ئایا دیموکراتیەت کاڵایەکە و بردە و هاوردەی لەسەر دەکرێت؟ یان جۆرە ڕێسا و یاسایەکە کە لە پێناوی مرۆڤایەتی دا و بە قازانجی مرۆڤایەتی خولقێنراوە؟

٥. ئایا دیموکراتیەت شانۆگەرییەکە و بە سیناریۆ و نواندن و لاساییکردنەوە دەچەسپێت؟ یان شۆڕشێکی ڕۆشنبیرییەو لە دەروونی خودی تاکی مرۆڤ و پاشان خێزان و کۆمەڵەوە بەرپا دەبێت و بە پرۆسەیەکی دوورودرێژ دەچەسپێت؟

٦. ئایا دیموکراتیەت وەک یاسا و دەسەڵات و کولتوور لە هەموو هەڵسوکەوتێکی ڕۆژانەدا بنیاتنراوی سەر ژێرخانێکی ئابووریی دەرەبەگایەتی یان نیمچەسەرمایەداریی شێوە بەرهەمی ئاسیاییە، یان خاوەن بناغەیەکی ئابووریی سەرمایەداریی کامڵبووی شێوە بەرهەمی ئەورووپایی و ئەمەریکاییە؟

٧. ئایا چەسپاندنی دیموکراتیەت لە حزبێک، ڕێکخراوێک، دەوڵەتێک، وڵاتێکی وەک وڵاتانی ئاسیایی و ڕۆژهەڵاتی و ئەفەریقایی ڕەچاو دەکرێت کە خۆی بە دیموکراتیەت نامۆ بێت، هەتا بە زۆر و شەقی زەمانە گۆڕان لە دەسەڵاتەکەیدا نەکرێت، خۆی ئامادەی گۆڕان نەبێت؟

پاش ئەم پرسیارانە، دێینەوە سەر خەونە سەوزەکانمان داخوا دوای گرتنی عێراق و ڕووخاندنی ڕژێمە فاشیە، بەعسیە، نازییە، دکتاتۆرەکەی عێراق، دیموکراتییەکەی ئەمەریکا دادەمەزرێت، پایەدار و بەرقەرار دەبێت و لە سایەشیدا گەلی کورد بە خاوەندارێتیی خاکی خۆی و دەسەڵاتی حوکمڕانیی خۆی و ئازادی و سەرفرازیی خۆی شاد دەبێت؟ داخۆ ئەو ئەزموونە تاڵ و پڕ لە شەرمەزاری و زیانبەخشەی کە بەرهەمی ئاژاوە و شەڕوشۆڕی ناو ماڵی کوردان خۆی بوو، لەم کاتەی کە ئەمەریکا و پاڵپشتەکانی پێویستیان پێیەتی، دەیکەنە پلیکانەی سەرکەوتنی ئایندە؟ داخۆ کورد خۆی پلان دادەڕێژێت بۆ سوودوەرگرتن لەم دەرفەتە و هەموو هێزەکانی خۆی یەک پێ دەگرێت، یان پێی وایە ئەمەریکا لە داڕشتنەوەی نەخشەی جیۆپۆلیتیکیی عێراقی ئایندەدا، کوردستانێکی بەهەشت و هاوکار و پشتپێبەستووی خۆی بنیات دەنێت؟

دەبێت ئێمەی کورد ئەو ڕاستییە باش بزانین کە لە تورکیای ئەندامی پەیمانی ناتۆ، ئێرانێکی ناسراو بە دەوڵەتێکی ئیسلامی، عێراقێکی بە عەرەبی تاپۆکراو بە نیشتیمانێکی عەرەبی لەقاڵبدراودا هەین و کێشەشمان لەگەڵ هەموویاندا هەیە و هەموویان و هەموو وڵاتە عەرەبییەکان کامەیان کە زۆر خۆیان بە دۆستی ئەمڕۆمان دەزانن، سبەینێ لەگەڵ بوونی دەسەڵاتێکی سیاسی و ئیداریی کوردیدا نین لە هیچ پارچەیەکی کوردستاندا. دەبێت ئەو ڕاستییەش بزانین کە ئەمەریکاش لەسەر ئاستی سیاسەتی دووریدا، دەستبەرداری قازانج و بەرژەوەندییەکانی خۆی نابێت لەو سێ وڵاتەدا لەبەر خاتری کورد و دەبێت لەوەش وریا بین کە چارەنووسی برهان الدین ربانی و ئەحمەد شا مەسعوود لە ئەفغانستان نەبێتە جیازییەکی داسەپاو بەسەر چارەنووسی هێزە کوردییە ئۆپۆزسیۆنەکانی ئێمەشدا. دیسان با ئەو پرسیارەش کە هەر چەندە تفت و تاڵە و بە ئارەزوو و خەونە سەوزە خۆشەکانی ئێمە نییە، لە خۆمان بکەین: ئەگەر سەدام حسێنی کەللەڕەق و زۆر ئازا، ئەم جارە عەقڵ میوانی بوو، هاتە سەر ئەو ڕایەی کە ڕاستیی هەموو چەکە کۆکوژەکانی بڵێت و سیلاحەکەی شۆڕ بکاتەوە لوولەکەی بۆ زەوی و قۆنداغەکەی بۆ ئاسمان و هەمووی لە خۆی داماڵێت و لەناوی بەرێت و بە ئەمەریکاش بڵێت خۆت گەورە و سەروەری و هەر خۆیشت خاوەن نەوتەکەی عێراقیت و بە کێشی دەفرۆشیت؛ بیفرۆشە، بەس مەهێڵە ئێمە برسی

بین، تۆ بڵێیت ئەمەریکا هێندە بێعەقڵ بێت لەبەر خاتری چاوی جوانی شیعە و کورد دەستبەرداری ئەو نیعمەتە ببێت؟ یان هێندە عاشقی دیموکراتی و مافی مرۆڤ و مرۆڤدۆستی و دژە دکتاتۆریەت بێت، واز لەو بەرژەوەندییە چەورە بێنێت کە سەدام حسێن بیداتێ؟ بۆ وەڵامی ئەو هەموو داخوازی و پرسیار و ئەگەر و دیسانەوە و داخۆیانە، با ئاوڕێک لە ڕووداوەکانی کۆنگرەی یەکگرتووی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی ڕۆژی ٢٠٠٢/١٢/١٤ بدەینەوە.

## کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی و دەرەنجامەکانی

ڕۆژی ٢٠٠٢/١٢/١٤ تا ٢٠٠٢/١٢/١٧، کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا، پاش ٣ جار دواخستن و ئاڵوگۆڕکردنی کات و شوێنی کۆنگرە. دیارە هۆکارەکانی ئاڵوگۆڕەکان، هەم دەرەکی و هەم ناوەکییش بوو. هۆ دەرەکییەکە بریتیی بوو لە قایلنەبوونی وڵاتەکانی هۆڵەندا، بەلجیکا، ئیتالیا بەگرتنی کۆنگرە لەناویان دا، هۆ ناوەکییەکەش ڕێکنەکەوتنی لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆن لەسەر چەندایەتی و چۆنایەتیی بەشداربووانی کۆنگرە. فاکتەرە سەرەکییەکانی کارتێکەر لە گرتنی کۆنگرەش، هەم ناوەکی و هەم دەرەکییش بوون. وەک:

١. ناوەکییەکە: بریتی بوو لە قایلبوونی لیژنەی ئامادەکاریی کۆنگرە، کە لە نوێنەرانی هەر شەش لایەنە سەرەکییەکەی ئۆپۆزسیۆن پێک هاتبوون: ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی (محەممەد باقر حەکیم)، الوفاق الوطنی، المؤتمر الوطنی، یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان، پارتی دیموکراتی کوردستان، الحرکە الدستوریە الملکیە، بە زیادکردنی ژمارەی بەشداربووانی کۆنگرە لە ١٥٠ کەسەوە بۆ ٣٥٠ کەس و لە ڕووی چۆنایەتییشەوە بەشداریکردنی هەموو لایەنەکانی تری ئۆپۆزسیۆنی عێراقیی عەرەبی و کوردی و تورکمانی و ئاشووری و کەسانی بێلایەن.

٢. دەرەکییەکەی: نزیکبوونەوەی لێدانی عێراق و بەرەوخواربوونەوەی هێزەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا بەرەو سنوورەکانی میرنشینە عەرەبییەکان و تورکیا و دەریای سپیی ناوەڕاست، کە دەبێت پێش لێدانی عێراق جێبەجێ بکرێت، لە لایەک و لە لایەکی ترەوە قایلبوونی بەریتانیای نزیکترین هاوپەیمانی ئەمەریکا لەسەر میوانداریکردنی

کۆنگرە. ئامۆژگاریی ئەمەریکاش بۆ هەموو لایەنەکانی کۆنگرە بۆ ڕێککەوتن و جێبەجێکردنی گرتنی کۆنگرەکە.

## ئەرک و ئەنجامەکانی کۆنگرە

دەکرێت ئەرک و کار و ئەنجامی کۆنگرە، لە ٤ خاڵی سەرەکیدا کۆ بکرێتەوە:

١. ڕووداوەکانی دانیشتنەکانی کۆنگرە کە خۆی لە وتاری هەریەک لە زۆربەی بەشداربووواندا دەدۆزییەوە.

٢. بەیانی سیاسیی کۆنگرە کە خۆی لەو بۆچوون و بڕیارانەدا دەبینێتەوە، کە کۆنگرە داویەتی و پێشنیاری کردووە.

٣. پرۆژەی قۆناغی گواستنەوە، کە بریتییە لە دەسەڵاتەکانی قۆناغی گواستنەوەی پێش دانانی دەستوور، واتە:

ا. دیاریکردنی ماوەی گواستنەوە بە کەمتر لە دوو ساڵ، هەر لە ڕووخانی سەدام حسێنەوە تا دەستپێکردنی هەڵبژاردن و دانانی دەستووری هەمیشەیی.

ب. ئەو سەرەتایانەی کە دەزگاکانی قۆناغی گواستنەوە پێی پابەند دەبن.

ج. ئەنجوومەنی نشتیمانیی قۆناغی گواستنەوە کە بە دەستنیشانکردن دەبێت، نەک هەڵبژاردن لەناو لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقیدا.

د. دانانی ئەنجوومەنێکی سەرۆکایەتی لە سێ ئەندام بۆ سەرۆکایەتیکردنی حوکم لە عێراقدا لە ماوەی قۆناغی گواستنەوەدا.

هـ. بنیاتنانی حکومەتێکی مەدەنیی ئیئتیلافیی قۆناغی گواستنەوە لە شارەزایانی ناو لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆن و خاوەن ئەزموونەکانی حوکمڕانی.

و. دانانی دەستوورێکی کاتی.

ز. ئامادەکردنی پرۆژەی دەستوورێکی هەمیشەیی.

ح. گەل خاوەنی دەسەلاتە لەسەر دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی ڕژێمێکی کۆماری یان شایەتی (مەلەکی).

ت. بنیاتنانی ڕژێمێکی دیموکراتیی فرەلایەنی فیدڕالیی مەدەنی.

٤. دانانی لیژنەیەکی چاودێر و بەدواداچوونی بڕیارەکانی کۆنگرە. دیارە هەر

کەس بیەوێت بەدوای وردەکارییەکانی ئەرک و بڕیار و ئەنجامەکانی کۆنگرەدا بچێ و لە ڕۆژنامەکانەوە وەریبگرێت، بۆی دەردەکەوێت کە کۆنگرە لە ئاستی خواست و هیواکانی هەموو لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنی بەشداربووانی کۆنگرە و لەتوانادابوونی جێبەجێکردنی گەلانی عێراقیش بووە. بەڵام هەر کەس خۆی بەشداریی دانیشتنەکان و ڕووداوەکـان و دانوستانەکان و سەرئێشەکان و هاتوهاوارەکانی ناو کۆنگرەی کردبێت، دەکرێت چەند خاڵێکی زۆر گرنگی بەرچاو کەوتبێت کە لە کەموکوڕییە بەرچاوەکانی ناو کۆنگرە، فاکتەرەکانی کاڵبوونەوەی خەونە سەوزەکانی کوردیش بژ مێردرێن:

١. گرتـنـەبـەری سـەرەتـای ڕێککەوتنی ژێربـەژێری لایـەنـە سەرەکییەکانی کۆنگرە لـەسـەر سـاغـکـردنـەوەی بـەلاداخـسـتـنـی هـەر بـڕیـارێـک کـە مشتومڕی زۆری لـەسـەر کرابـێـت، بـێ پـەیـڕەوکـردنـی سـەرەتـا و پـڕۆسـەی دیموکراتییا نە.

٢. گرتنەبەری داسەپاندنی حزبییانە لە دەستنیشانکردن و دانانی ئەندامان بۆ هەر لیژنەیەک، جا چ تەنسیق و چاودێری و بەدواداچوون بووبێت یان ئەمانەتی گشتی بووبێت، لەباتیی گرتنەبەری سەرەتای دیموکراتیەت و ڕێگەدان بە بەکارهێنانی سادەترین مافی بەشداربووانی کۆنگرە کە مافی خۆهەڵبژاردن بووە.

٣. گوێڕایەڵیی کۆنگرە بۆ ئامۆژگارییەکانی نوێنەری ئیدارەی ئەمەریکا و بەتایبەتی جۆرج دەبلیو بوش، زەلمای خەلیل زادە لەسەر هەر خاڵێک کە کێشەیان زۆر لەسەر کردبێت. بۆ نموونە؛ کێشەی زیاد و کەم کردنی ژمارەی ئەندامانی لیژنەی بەدواداچوون، لەجیاتیی گرتنەبەری پڕۆسەی هەڵبژاردن و دەنگدان لەسەری.

ئەو خاڵانەی کە پەیوەندییان بە مەسەلەی کورد و ئایندەی کوردەوە لە عێراقێکی پاش سەدام هەبوو، زۆری لە خەونە سەوزەکان و هیوا گەشەکانمان کاڵ دەکەنەوە:

١. ڕێگەنەدان بە خستنەڕوو و تاووتوێکردن و قسەلەسەرکردنی ئەو پڕۆژەی دەستوورەی حکومەتی فیدڕاڵەی کە ئەنجوومەنی نیشتیمانیی کوردستان و هەردوو حزبە سەرەکییەکەی کوردستان ئامادە و پەسەندیان کردبوو بۆ ئایندەی حکومەتی فیدڕاڵیی کوردستان. هەرواش ڕێگەنەدان بە خستنەڕوو و تاووتوێکردن و مشتومڕ

لەسەر کردنی پڕۆژەی دەستووری عێراقی ئایندە، کە لەلایەن «ی ن ک» و «پ د ک»ەوە ئامادە کرابوون بۆ کۆنگرە.

٢. دیارینەکردنی سنووری حکومەتی فیدراڵیی کوردستان و بەدەرکردنی کەرکووک لە سنووری ئەو حکومەتە و ناونانی بە عێراقی بچووککراوە، واتە شاری نەتەوەکانی عەرەب، کورد، تورکمان، ئاشووری.

٣. دانەنانی حکومەتێکی کاتیی هەڵبژاردەی ناو کۆنگرە بۆ ئایندەی عێراقی پاش سەدام، ئەمەش بە ئامۆژگاریی هەردوو نوێنەرەکەی ئەمەریکا.

٤. دانپیانەنان و ئیقرارنەکردن بە هەردوو حکومەتەکەی فیدراڵیی کوردستان و دیسان بە شەرعیەتی حکومەتەکان، بەڵکوو تەنیا لە خاڵی ١٠دا لە بەیانی سیاسیدا تەنها ئاماژە بەوە کراوە کە پێویستە بڕیارەکەی سەلاحەددین و کۆبوونەوەکانی تری ئۆپۆزسیۆنی عێراقی و بڕیاری ئەنجوومەنی نیشتیمانیی کوردستانی عێراق ئیعتیباری بۆ بکرێت و بۆ سیفەیەکی گونجاوی حوکمی عێراقی دیار بکرێت.

٥. بە هیچ جۆرێک لە کۆنگرەدا ئاماژە بۆ ئەو چەند هەزار کەسە عێراقییانەی کە ئەمەریکا لەسەر خەرجیی خۆی لە ئەمەریکا و لە هەنگاریا مەشقیان پێ دەکات و پێ بکات، بۆ ئەوەی لە بەشی ئەو بەڕێوەبەرایەتییەی کە پاش سەدام جێگای حکومەتی عێراق دەگرنەوە؛ کار بکەن و هەروەها وەک وەرگێڕ و ڕێنیشاندەر لە کاتی شەڕدا سوودیان لێ ببینن. یان ڕاستتر بڵێین: ئەوانە مەشق پێ بکرێن و ڕابهێنرێن و فێر بکرێن کە لە ئایندەی عێراقی پاش سەدام چاودێر و ڕاوێژکار و چاوی سی ئای ئەی بن لە دامودەزگاکانی حکومەتی نوێدا، کە نازانرێت لەوانە کەس لەناو دوو لایەنە سەرەکییەکەی کوردی تێدایە یان دەبێت.

## کۆنگرە و کاردانەوەی دەوروبەر

لەگەڵ ئەو هەموو سوێندخواردن و دڵنیاییکردن و سەردانانەی هەردوو سەرکردە و نوێنەرانی یەکێتی و پارتی، بەر لە کۆنگرە بۆ حکومەتەکانی تورکی و ئێرانی و سووری و سعودی و میسری و کوێتی کردیان، کە هەرگیز گوایە کورد خۆی ناخوازێت حکومەتێکی سەربەخۆی هەبێت یان لە عێراقی نیشتمان جیا

بێتەوە، یان تەنانەت هەنگاوێکی گومانلێکراویش بەو مەبەستە نانێت. بەڵام هێشتا نە حکومەتەکانی عیلمانی و ئیسلامیی تورکیا و نە دۆستە زۆر نزیکەکەی کورد (سووریا) و نە دراوسێ بەوەفا و خاوەن چاکەکەی سەر کورد لە کاتی تەنگانەدا (ئێران) و نە دۆستە کۆنەکەی کورد (میسر و سعودیەش) لە حەنای کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی و مەسەلەی کورد لەناو ئەو کۆنگرەیەدا دەستەوەستان نەوەستان. لە سەفەر و سەردانی یەکتری، بە هیچ جۆرێک نارەزایی و دژایەتیی خۆیان نەشاردەوە. ئەمانە و چەندین وڵاتی تریش دژی لێدانی عێراقن و دژی ڕووخاندنی ڕژێمی سەدامن، دژی پێکهێنانی عێراقێکی دیموکراتیی فرەلایەنی فدراڵیین. بەڵام هەریەکە و هەر لایەک بە مەبەستێک و لەبەر هۆیەک:

١. تورکیا

لە سەردەمی ئەجەویدی دەوڵەتی گوایە عیلمانیدا، سەرەڕای ئەو هەموو سەردانەی سکرتێری گشتیی یەکێتیی نیشتیمانی و نوێنەرەکانی تری یەکێتی، وە سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و نوێنەرەکانی بۆ تورکیا و دڵنیاکردنەوەیان لە جودانەبوونەبوونەوەی کورد لە دژایەتیکردنی بیروڕای جیابوونەوە لە عێراق لەلایەن کورد خۆیەوە، لە دڵنەواییکردن و دڵنیاکردنیان لەوەی کە تورکمانی عێراق بەشی شێریان دەبێت لە حکومەتی فیدراڵیی ئایندەی کوردستان و بەتایبەت شاری کەرکووک.

وە لە سەردەمی ئەردۆغان و عەبدوڵڵا گولی دەوڵەتی ئیسلامییشدا، دیسان ئەو سوێندخواردنانەی کورد دووبارە بۆوە، کەچی هێشتا دڵی تورکیای دۆست و دراوسێمان ئاوی نەخواردەوە، هەر بەگومانەوە سەیری ڕووداوی لێدانی عێراق و ئایندەی دەکەن و دڵیان لێمان پیسە، سەد بڕوبیانووش بە ئەمریکا دەگرن گەر بە ناچاری و شەقی زەمانە نەبێ وڵاتەکەیان لە شەڕی دژی عێراق لەلایەن ئەمەریکا و بەریتانیاوە بەکار بهێنرێت. لەبەر:

ا. بە بۆچوونی ئەوان، عێراقێکی سەدامی دکتاتۆری سوننەمەزهەبی دژ بە شیعە و کورد و تەنانەت تورکمانە پووررزاکانی خۆیشیان، باشترە بۆ پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی گوایە «نەتەوەیی تورکی و خاکی تورکیا»، وەک لە بنیاتنانی حکومەتێکی عێراقیی تێکەڵ لە شیعە و سوننی و عەرەب و کورد و ئاشووری و تورکمان، کە

ڕەنگە نەتوانن سنوورەکانی تورکیا و ئاسایشی تورکیا بپارێزن.

ب. ئەو عێراقی ئایندەیەی کە ڕەنگە فیدراڵی بێت و خوارووی کوردستانیش حکومەتێکی فیدراڵیی ناو ئەو سیستمە فیدراڵە بێت، دەبێتە مایەی سەرئێشە بۆ ئەوان و هاندان و دنەدانی کوردەکانی ئەوێ بۆ داواکردنی لانی هەرە کەمی مافی نەتەوەیی خۆیان.

ج. گوایە لێدانی عێراق دەبێتە مایەی گەیاندنی زیانێکی ماددیی یەکجار گەورە و ئەوەندەی تر زیانەکانی تورکی کە لە ئەنجامی ئەو بارودۆخەی عێراق لەساڵی (١٩٩١)ەوە تا ئێستا کردوویەتی؛ پتر دەکات، کە بە چەندین ملیار دۆلار مەزەندە دە کرێت.

د. لەدەستدانی ئەو گرنگییەی ئێستای تورکیا کە هەیەتی لە پەیمانی ناتۆ و لەناو جوغزی سیاسەتی ئەمەریکاشدا، لە کاتی لێدانی عێراق و ڕووخاندنی و بنیاتنانی حکومەتێکی دەستکردی ئەمەریکا خۆی یان زۆر دۆست و پاڵپشت و منەتباری ئەمەریکا بێت.

هـ. لەلای عیلمانییەکانیان بەشداریکردنی شیعە لە حکومەتی ئایندەی عێراقدا، فاکتەرێکی بەهێز دەبێت بۆ پتەوبوونی دەسەڵاتی شیعە لە ناوچەکەدا، لەلای ئیسلامییەکانیشیان دیسان ئەوە بە لاوازییەک دەزانن بۆ دەسەڵاتی سوننە، هەر بۆیەش تورکیای پێشوو و ئێستاش درێغییان لە هەڵپەکردن بۆ گرتنەبەری ڕێگەی دبلۆماسییانە و بەرگرتن لە لێدانی عێراق نەکردووە. دوا تەقەللای تورکیا، سەفەری ئەردۆغانی سەرۆکی حزبی عەدالە بۆ ئەمەریکا و سەردانی عەبدوڵلا گولی سەرۆکوەزیرانی نوێیە بۆ سووریا، ئێران، میسر، سعودیە، ئوردن.

٢. سووریا

ئەو دۆستە دێرینەی کورد و ئۆپۆزسیۆنی عێراقی و دوژمنە فیکری و ئایدۆلۆژییە دێرینەکەی حکومەتی بەعسییان و سەدامییانی عێراق، دەبێت لە بێبەختی کورد و ئۆپۆزسیۆنی عێراقی کە ئەم جارە ئەویش دژی لێدانی عێراق و گۆڕینی شێوەی حوکمڕانییەکەیەتی، یان ئەویش هەندێک بەرژەوەندی و مەترسیی خۆی هەیە کە ئەو

هەڵوێستەی گرتووە.

ا. گەرچی کێشەی کورد لە سووریادا ئەو هەڵسانەی بەخۆوە نەگرتووە کە مەترسی لەسەر بەرژەوەندیی سووریا دروست بکات، بەڵام وەک دوومەڵێک وایە کەم و زۆر ئازاری خۆی هەیە، وەک مووی لووت لەبەردەم سووریادا هەمیشە قوت بۆتەوە و بۆتە بیانوو و فاکتەرێکیش بۆ هەر هاوپەیمانییەتێک کە لەنێوان ئێران-سووریا، عێراق-سووریا، تورکیا-سووریادا بکرێت. ئەوەتا یەک لە هەرە خاڵە هەرە گرنگەکانی سەفەری عەبدوڵڵا گولی سەرۆکوەزیری نوێی تورکیا بۆ سووریا لە ٢٠٠٣/١/٣دا، باسکردنی بەرگرتن بە لێدانی عێراق و مەترسیی ئایندەی کوردی عێراق بۆ سەر کوردی سووریا و تورکیا بووە.

ب. سووریا جگە لە مەسەلەی کورد وەک مەسەلەیەکی ناوکۆیی نێوان سووریا و تورکیا، گەلێک کێشەی تریشی هەیە لەگەڵ تورکیادا کە دەکرێت کوردی تیا بکرێتە فاکتەری گرژبوون و خاوبوونەوە، لەوانە کێشەی ئاو و کێشەی شاری ئەسکەندەرونە. سەرچاوەی ئاوی فورات کە لەسەرووی کوردستان ناسراوە بە ڕۆژهەڵاتی تورکیا، هەڵدەقوڵێت. بۆ سووریا تاکە گرنگترین سەرچاوەی ئاوی خواردنەوە و کشتوکاڵی و پیشەسازی پێک دەهێنێت و تورکیا لەم چەند ساڵەی دواییدا لە هەشتاکانی سەدەی بیستەوە پڕۆژەیەکی بەنداوی لەسەر فورات دروست کردووە بە ناوی پڕۆژەی «گاب» و دەتوانێت هەمیشە کۆنترۆڵی ئاوی هەناردەی فورات بکات بۆ سووریا و عێراقیش، ئەمیش فاکتەرێکی فشاری تورکیایە بۆ سەر سووریا، هەروەک لە لێدان و دەرکردنی پەکەکە و ئۆجەلاندا بەکاری هێنا.

ج. جگە لە کێشەی جۆری حوکم، لە ڕووی مەزهەبییەوە کە سووریا شیعە و تورکیا سوننین.

د. یەکێکی تر لە کێشە فیکری و سیاسییەکانی نێوان تورکیا و سووریا، بریتییە لە کێشەی جیاوازیی سەنگەرگەری لە مەسەلەی فەلەستیندا. تورکیا پەیمانی هاوکاریی لەگەڵ ئیسرائیلدا هەیە، سووریا هاوپەیمانێتیی لەگەڵ لوبنان و لەناو لوبنانیشدا لەگەڵ حزب الله و هەموو ڕێکخراوە فەلەستینییەکاندا هەیە. بۆیە تەقەللای ئەمڕۆی ڕژێمی ئیسلامیی تورکی لەو سەردانەی سەرۆکوەزیراندا، بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییەیە کە

تورکیای ئێستا نایەوێت بە هاوکاریی ئەمەریکا لە لێدانی عێراق، خۆی لەناو وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامیدا وەتەق بخات.

٣. سعودیە

یەکێکە لەو وڵاتە عەرەبییانەی کە بە درێژایی تەمەنی حوکمڕانیی ئالی سعود، دۆست و هاوکار و ملکەچی بڕیارەکانی ئەمەریکا بووە و ڕۆژێک لە ڕۆژان بە پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا نەجووڵاوەتەوە، بەڵام پاش کارەساتی ١١ی ئەیلوولی ٢٠٠١، کێشە و ناکۆکیی نێوان ئەمەریکا و سعودیە سەری هەڵدا. سعودیە یەک لەو وڵاتانەیە کە دژ بە لێدانی عێراق و گۆڕینی حوکمڕانیی عێراقە. سعودیە کە دووەم وڵات بوو پاش کوێت، کەوتبووە بەر مەترسیی لێدان و داگیرکردنەوە لەلایەن عێراقەوە و یەکەم وڵاتی عەرەبییش بوو کە سەرجەم فڕۆکەخانە و گۆڕەپانە سەربازی و هەموو خاکی سعودیەی خستە ژێر دەسەڵات و بەکارهێنانی سوپا و هێزی ئەمەریکاوە لە شەڕی کوێتدا. بۆ دەبێت ئەم جارە لە لێدانی عێراقدا دژ بێت و ئامادەی هیچ هاوکارییەکی ئەمەریکا نەبێت، گەر لەبەر ئەم هۆیانە نەبێت:

ا. سعودیە کە خۆی بە چەقی جیهانی ئیسلامی دەزانێت و مەزهەبەکەی سوننییە، نایەوێت سەرباری ئێران، وڵاتێکی تری حوکمبەدەستی شیعە پەیدا ببێت.

ب. سعودیە کە باشترین سەرچاوەی نەوتە بۆ بازاڕی ئەمەریکا و ئەورووپا، نایەوێت سەرچاوەیەکی باشتر بۆ ئەو بازاڕانە بێتە پێشەوە کە عێراقێکی بە دەست و بەدڵی ئەمەریکا دروستکرابێت.

ج. لەوانەش پتر بەتایبەت پاش ڕووداوەکەی ١١ی ئەیلوول و دەرکەوتنی چەند بەڵگەیەک لە دەستتێدابوونی سعودیە بەم یان بەو شێوە لە یارمەتیدانی بەشێکی ئەو ڕێکخراوە ئیسلامییانەی کە بە ناوی جیاجیاوە بوون و لە بناغەدا سەر بە قاعیدە بوون. مەترسیی سعودیە لە لێدان و ڕووخاندنی حوکمی عێراق لەوەدایە، کە ئەمەریکا بیرێک لە گۆڕانکارییەکیش لە سیستمی حوکمی سعودیە بکاتەوە.

٤. ئێران

لە زۆر ڕووەوە گۆڕانی حوکم لە عێراقدا، بە قازانجی ئێرانە کە پتر لە ٨ ساڵ بەدەست شەڕێکی داسەپاوی سەدامەوە دەیناڵاند و ئەنجامیش هەر بە دەستتێوەردانی ئەمەریکا؛ ناچاری ئاگربەست کرا و ئەو دەستکەوتانەی کە لە ڕێککەوتنی جەزائیر دەستی کەوتبوو، لەدەستی دا. بۆ نموونە؛ بەشێکی سەرەکیی ئەو ئۆپۆزسیۆنەی کە ڕەچاو دەکرێت بە دەسەڵاتەوە خاوەن بڕیار بێت و هاوبەشی حوکمڕانیی عێراقی ئایندە بکات، شیعەیە و ئەو حزب و ڕابەرەی شیعەش بە درێژایی دەیان ساڵ لەژێر باڵی ئێران و مەرحەمەتی بێسنووری ئێراندا گەشەیان کرد و خورت و بەهێز بوون و بوونە بە تاکە دەسەڵاتی داسەپاو بەسەر هەموو ڕێکخراوە سیاسییە ئیسلامییەکانی تری شیعەوە کە گەورەترین ژمارەی دانیشتووانی عێراق پێک دێنن، بەڵام هێشتا ئێرانیش دژی لێدانی عێراقە و ئامادەی هیچ بەشداریکردنێک و یارمەتیدانێکی ئەو لێدانە نییە.

ا. لە ئایندەی عێراقدا مەترسیی دەسەڵاتداریێتیی کورد لە ناوچەکانی کوردنشیندا دەبینێت، گەرچی پتر لە دە ساڵە بەشێکی گەورەی خوارووی کوردستان؛ تاکە ناوچەیە کە دەسەڵاتی عێراقی بەسەرەوە نییە و جۆرێک و لە خودموختاریی کوردی تیایە لەژێر ناوی حکومەتی فیدڕاڵ و لەجیاتیی یەک حکومەت، دووانیش بووە. بەڵام:

١. لە ئایندەی عێراقدا مەترسیی حوکمڕانییەکی بەهێز و یەک و یەکگرتووی کوردی لە خوارووی کوردستاندا دێتە ئاراوە کە نە ئێران و نە تورکیا و نە هیچ لایەک چیدی ڕەنگە نەتوانن ئەو دوو پارچەییەی جارانی کورد بە بەرژەوەندیی خۆیان بەکار بهێنن.

٢. هەردوو حکومەتە کەرتکراوەکە لەو ماوەیەدا سەبارەت بە دووریيان لە ئاو و گەمارۆدراوییان بە ئێران و تورکیا و سوریا و عێراق، ناچاری سەردانەواندن بوون بۆ زۆر بڕیاری داسەپاوی ئەو وڵاتە لە پێناو دابینکردنی ژیان و ئاسایشی ئەو دوو حکومەتە فیدڕاڵە. ئەو وڵاتانەش توانیویانە مەرجەکانی خۆیان بەسەر هەردووکیاندا بسەپێنن، بەڵام لە ڕووخانی عێراق و بوونی بە سیستمێکی دیموکراتیی فیدڕاڵی دانپێدانراوی کوردی دروست بوو، لەژێر لغاو و دەسەڵات و مەرجەکانی ئەو وڵاتانەدا دەردەچن.

٣. لە هەموویان گرنگتر ئەوەی کە پێی دەگوترێت «ئاسایشی نەتەوەیی»، ئێرانە. هەتا ئێستا واتە تا پەیدابوونی مەترسیی لێدانی عێراق، لە سەردەمی شا و حوکمی ئیسلامیدا بۆ سەرکوتکردن و کۆنترۆڵ و لغاوکردنی بزووتنەوەی ڕزگاری و ئازادیخوازی رۆژهەلاتی کوردستان، سوودیان لە شەڕی چەکداریی خوارووی کوردستان و پاشانیش لە نەوەدەکانەوە لە سەر و خوارووی کوردستان وەرگرتووە، بە ناوی پاراستنی سنوورەکان و ئاسایشی ئەو بەشەی ئێران کە کوردستانە، تەنانەت لە درێژایی تەمەنی حکومەتە فیدراله کەرتکراوەکەشدا.

بەڵام بە ڕووخانی عێراق و پایەداربوونی سیستمی حوکمڕانیی فدراڵیی دانپێدانراوی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی، حکومەتی فیدراڵیی کوردستانیش هیچ پێویستییەکی ئابووری و سیاسیی نە بە ئێران و نە بە هیچ لایەکی تر دەبێت، تا بزووتنەوە و چالاکیی هێزە سیاسییەکانی رۆژهەلاتی کوردستان سنووردار بکات، لەولاشەوە هێزەکانی سیاسیی کوردی رۆژهەلاتیش پابەندی بەناو پاراستنی ئەزموونی خوارووی کوردستان و خۆقەتیسکردن لەناو نواندنی چالاکیی سیاسیی ناو کوردەکاندا نابن.

ب. ڕووخانی عێراق و بوونی دەسەڵاتێکی ئەمەریکی لە ناویدا، دیارە مەترسییەکی گەورەشە بۆ سەر سیستمی حوکمی ئێران، بەتایبەت کە «بوش» بەئاشکرا لەگەڵ عێراقدا ناوی ئێرانیش بە تەوەری شەڕ لە دنیادا ناو دەبا.

## ئەرکە هەرە گەورە و پیرۆزەکانی ئەمرۆی دەسەڵاتدارانی کورد

گەرچی بەپێی لێکدانەوەی هەموو سیاسەتمەداران و وڵاتان و بەپێی جموجووڵە سوپاییەکانی دەریایی و زەمینیی ئەمەریکا و بەپێی مانۆڕە هاوبەشەکانی ئەمەریکا و قەتەر و ئەمەریکا و کوێت، بەپێی ئامۆژگارییەکانی ئەمەریکا بۆ ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە کۆنگرەی لەندەندا و بەپێی هەڵەداوان پێکەوتنی وڵاتانی تورکیا و سووریا ئەردەن و میسر و ئێران و بەپێی هەموو لێکدانەوەی رۆژنامەگەرییەکانی جیهان، لێدانی عێراق لەلایەن ئەمەریکاوە بۆتە یاسا و دەنگدانی کۆنگرێسی ئەمەریکا لەسەری و بڕیاری پنتاگۆن بۆ سەرپشککردنی سەرۆکی ئەمەریکا لە فەرماندەرکردن. بەڵام ڕەنگە فاکتەرێکی چاوەڕواننەکراو ببێتە مایەی وەرچەرخانێکی کتوپڕ، وەک بڕیاری ڕاگرتنی

شەڕ لە دواساتی جەنگی ساڵی ١٩٩١ی هاوپەیمانان و عێراقدا لە شەڕی کەنداوی دووهەمدا. لە هەردوو حاڵەتی لێدان و لێنەدانی عێراق، دۆزی کورد هەر هەمان دۆزە، بەڵام لە بارودۆخی جیاوازدا. لە لێنەدانی عێراقدا، واتە قایلبوونی ڕژێمی سەدام بە هەموو مەرجەکانی ئەمەریکا و نەتەوە یەکگرتووەکان، کە دامالینی چەکە کۆکوژییەکانی و گەڕانەوە بۆ یاسای هەڵبژاردن و ڕێزلێنان لە مافی مرۆڤ و قەرەبووکردنەوەی زیانەکان و... هتد، لەگەڵیدا گەڕانەوەی دەسەڵاتی ڕژێمی عێراقیش بۆ ناوچەکانی حکومەتەکانی فیدڕاڵ و لێبوردنی گشتی و ئاشتبوونەوەی گشتی، بەڵام بە مانەوەی ماکی کێشە سەرەکییەکانی کورد بێ چارەسەرکردنیان کە:

ا. مافی کورد لە هەڵبژاردنی چارەنووسی خۆی و جۆری پێکەوەژیانی لەگەڵ عێراقدا.

ب. دانپێدانەنانی عێراق و جیهانیش بە ئەنجامی ئەو مافە لە لێدانی عێراق و چوونە سەر کاری ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بە کوردیشەوە لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتی فرەلایەنی و سیستمێکی فیدڕالیدا. واتە:

ج. دانپێدانانی ڕەسمیی حکومەتی عێراقی لە بڕیار و بەرنامە و پرۆژەکانی دەستووری کاتی و هەمیشەیی، دانپێدانانی ئەنجوومەنی نیشتیمانیی عێراقی هەڵبژێردراو، بە شەرعیەتی حکومەتی فیدڕالیی خوارووی کوردستان لە چوارچێوەی عێراقێکی فیدڕالدا.

د. دانپێدانان و بەڕەسمی ناسینی ئەو مافەی کە کورد بۆ چارەنووسی خۆی لە ئەنجوومەنی نیشتیمانیی کوردستانی هەڵبژێردراودا داویەتی، کە حکومەتێکی فیدڕالە لە چوارچێوەی عێراقێکی فیدڕالدا لەلایەن عێراق و هەموو دامودەزگا دەوڵەتی و نەتەوەییەکانی دنیاوە کە عێراقێکی فیدڕال بەڕەسمی بناسن و دانی پێدا بنێن. لە هەردوو حاڵەتەکەشدا دیسان بردنەوەی کورد یان دۆڕانی، بەندە بە جێبەجێکردن و نەکردنی ئەرکە هەرە گەورە و پیرۆزەکانی ئەستۆی سەرانی کورد و لەم دووڕیانە هات و نەهاتەی مێژوودا.

١. هەنگاوی پێکەوەلکاندنەوەی دوو پارچەکەی پەرلەمان (سەوز و زەرد) بە هەموو کەموکوڕییەکانیشیەوە، لەوانە پەیڕەونەکردنی یاسای هەڵبژاردن لە پڕکردنەوەی

شوێنی ئەندامپەرلەمانە چۆڵکراوەکان، بەڵام تەقەللایەکی هەست بە بەرپرسیاری کردن بوو بەرامبەر بە مێژوو و لکاندنەوەی جەمسەرێکی قرتاوی شەرعیەتی ئەنجوومەنی نیشتیمانی و یەک دەنگیی کورد لە کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆندا بوو. پێویستە هەر چی زووتر و گەر بکرێت بەر لە لێدانی عێراق، تەقەللای هەڵبژاردنێکی یاساییانە و دیموکراتییانەی بەڕاستی پەرلەمانی کوردستان بدرێت، تا بە یەک هێز و یەک دەسەڵات و یەک شەرعیەتی یاساییەوە ڕووبەڕووی ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی پاش لێدانی عێراق ببێتەوە.

٢. پێش لێدانی عێراق، پێویستە هەردوو ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندنەکە، واتە هەردوو حکومەتە لەتکراوەکە بکرێنەوە بە یەک حکومەتی ژێر سایە و سێبەری یاساکانی یەک ئەنجوومەنی نیشتمانی (پەرلەمان)، واتە لکاندنەوەی جەمسەری دووهەم.

٣. بۆ ئامادەکاری و کارئاسانی لە لایەک و لە لایەکی تریشەوە کردنی بە «ئەمری واقیع» لە پێکهێنانەوەی سوپای عێراقی فیدڕالی ئایندەدا، سوپای ڕزگاریی حکومەتی فیدڕالیی کوردستانیش بەشێکی بەهێز و دەسەڵاتدار و پڕچەکی سوپای عێراق بێت، وە لە مانەوەی عێراقیشدا بەدەسەڵاتداماڵراوی، دیسان سەنگەر و سوپەری پارێزەری حکومەتی فیدڕال بێت.

پێویستە هەر چی زووترە بێ هیچ بروبیانوو و مەرج و مەرجکارییەک، هەردوو دامودەزگا پێشمەرگایەتی و سەربازی و پۆلیس و ئاسایش و چەکداری هەردوو لایەنەکە؛ پارتی و یەکێتی و هەموو لایەنەکانی تری سەر گۆڕەپانی کوردستان بکرێنە یەک سوپا، یەک دەزگای پۆلیس، یەک ئاسایش و یەک هێزی چەکدار.

٤. ئەرک و پێویستیی سەرشانی هەموو کوردە لەناو وڵات و لە دەرەوەی وڵاتدا، هەڵسن بە خۆپیشاندانی گەورە و بەردەوام و خۆڕێکخستن لەژێر یەک درووشمدا: «کەرکووک شاری کوردستانە، دەست لە یەک بستی خاکی کوردستان هەڵناگرین» و ئەرکی زۆر گەورە و مێژوویی ڕێکخراوە سیاسییەکانیشە لە ڕێکخستن و سەرپەرشتیکردنیدا. ئەرکی مێژوویی هێزە سیاسییەکانی کوردستانە جەماوەر ڕاپەڕێنن، لە حەنای ئەو بڕیارە نامێژووییەی کۆنگرەی لەندەن لەمەڕ کەرکووک داویەتی. گەل، جەماوەر سەرچاوەی دەسەڵاتە و با ئەم جارەش جەماوەر ئەو

دەسەڵاتەی خۆی تاقی بکاتەوە.

٥. بینینی بەرژەوەندییە حزبییە تەسکەکان لەناو و لە چوارچێوەی بەرژەوەندییە فراوان و پیرۆز و مێژووییە جەماوەرییەکەدا دابێ نەک بەپێچەوانەوە، واتە دەستهەڵگرتن لە پان حزبی و فراوانخوازی و پاوانکردنی ئەم یان ئەو ناوچە و گەڕانەوە بۆ بڕیاری گەل و یاسا و ڕێسا پیرۆزە بە هەق دیموکراتییەکان و سەرفرازیی تاکی کورد لە ژیان و کارکردن و گەڕان و نیشتەجێبوون لەسەر هەر بستێک و ناوچەیەکی خوارووی کوردستان و دەربڕینی بیروڕادا.

٦. بنیاتنانی یەک دەزگای ڕاگەیاندنی یەک حکومەتی فیدڕاڵ، واتە یەک دەزگای دەنگ و ڕەنگ و نووسین، لەگەڵ مانەوەی دەزگا ڕاگەیاندنەکانی تری حزبی، بەڵام بە مەرجێک دژ بە دەزگا سەرەکییەکەی ڕاگەیاندنی حکومەتی هەرێم نەبن.

٧. دیارە لە یەکگرتنەوەی هەردوو حکومەتە لەتکراوەکەی فیدڕاڵیی کوردستان، کەناڵی دیبلۆماسی یەک دەگرنەوە، واتە کەناڵە دیبلۆماسییەکانی کوردی خوارووی کوردستان (بەشی پەیوەندییەکانی دەرەوە)، چیدی نابێت دەزگایەکی حزبی بن و کار لە پێناو دروستکردن و بەهێزکردنی پەیوەندیی حزبەکانیان بکەن بەو کەناڵە جیاجیایانەی دەرەوەی حزبی، دەوڵەتی، ڕێکخراوی مرۆڤدۆستی، خێرخوازی، کولتووری، زانستی... هتد. بۆ ئەم قۆناغە و ئەم دەرفەتە گەورەیەی کە ئێستا هەڵکەوتووە، هەردوو حزبە سەرەکییەکە و بەتایبەت هەردوو سەرکردە سەرەکییەکەی خوارووی کوردستان، هەنگاوی پێکهێنانی یەک دەزگای پەیوەندی و یەک کەناڵی دیبلۆماسی بخەنە پێش هەنگاوی یەکگرتنەوەی دوو حکومەتەکە.

ئەمڕۆ تەقەللای دیبلۆماسسییانەی کورد لە دەرەوەی وڵات بۆ داننان بە مافی کورد لە هەڵبژاردنی چارەنووسی خۆیدا، یەکێکە لە فاکتەرە هەرە گرنگەکانی چارەسەری کێشەی کورد لەو پارچەیەی کوردستاندا. یەک دەنگی، یەک هەڵوێستی، یەک بڕیاری، یەک سەرەتایی، یەک ڕەنگیی کورد خۆی لە یەک دیبلۆماسییەتی کورددا دەنوێنێت. تەقەللای دیبلۆماسیی کورد نابێت هەر لە تەوەری دڵدانەوە و قایلکردنی ئێران، تورکیا، سووریا بخولێتەوە، یان هەر لە تەوەری پەیوەندی بەم کەسایەتی یان بەم ڕێکخراوی خێرخوازی یان مرۆڤدۆستی ئەورووپایی یان ئەمەریکاییەوە بێت، بگرە پێویستە ئەو

دیبلۆماسییە یەکگرتووە تەقەللای چوونە ناو پەیوەندییە بەهێز و بڕیاردەرەکانەوە بێت، واتە دەوڵەتی و حکومەتی و پارتی ئۆپۆزسیۆنەوە بێت، بەتایبەت لە ئەمەریکا و ئەورووپا و بەگشتییش لە ولاتانی ئاسیا و ڕووسیادا.

ئەڵمانیا

نورنبیرگ

٢٠٠٣/٣/٦

# بەشی دوازدەیەم

## بزووتنەوەی ڕیفراندم

هێرش و پەلامارەکانی سوپای ئەمەریکی و هاوپەیمانان، کەوتنە پێشڕەوی لە شاری بەسراوە، شار بە شار هەتا گەیشتنە بەغدا. لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بەغدا ڕووخا و سەدام و هەندێ لە دەستە و دایەرەکەی بەرەو ناوچەی سوننەنشینی لای تکریت و عوجە هەلاتن و خۆیان شاردەوە. کوڕەکانی سەدام، عودەی و قوصەی و مستەفای کچەزای لە موسڵ پاش بەرەنگاربوونەوەیەکی کەم، کوژران و تەرمەکانیان دەست ئەمەریکییەکان کەوت. عێراق وەک دەوڵەت و حکومەت، قەبارەیەکی یاسایی بەپێی پێوانەکانی نێودەوڵەتی نەما. وەزارەتەکان ڕووخان، پەرلەمانە دەستکردەکە هەڵوەشا، دادگا و دەسەلاتی دادوەری نەما، بانک و سیستمی بانکی و دیناری عێراقی نەما، سوپا و پۆلیس و ئاسایش و سوپای گەلی (جەیشی شەعبی) و جاش و دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی سەدام لەبەریەک هەڵوەشان، فڕۆکە شەڕکەرەکانی عێراقی، ئەوەی سەدام لە ترسی گرتنیان، ناردنی بۆ ئێران ڕۆیشت و ئەوەشی لە بۆمبارانی ئەمەریکییەکاندا لە فڕۆکەخانە سەربازی و مەدەنییەکاندا تێکوپێک شکێنرا، فەوتا. ئەو سوپایەی کە لە ناوچەکانی ژووروو (المنطقة الشمالیة) بوو، بە هەموو چەک و جبەخانە و سەرا و سەربازگە و فەرمانگەکانیانەوە، یا لەلایەن پێشمەرگەوە گیران، یا خۆیان دا بە دەست پێشمەرگەوە، ئاڵای عێراقی پارچە پارچە بوو و نەما، هەر چی سەفارات و پەیوەندیی دبلۆماسیی نێودەوڵەتیی عێراق هەبوو؛ نەما، واتە لە عێراقدا شتێک نەمایەوە ناوی دەوڵەتی عێراق بێت. ئا لەو کاتەدا بە دنەی جەلال تاڵەبانی و برەوپێدانی بیرۆکەی ڕیفراندم لەلایەن هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەدەوە بە دەستپێشخەریی چەند کەسانێکی کوردپەروەر و کوردستانپەروەر و ئازادی و سەربەخۆییخواز، لیژنەیەکی باڵای ڕیفراندم لەناو وڵات و لە دەرەوەی

وڵاتیش پێک هات، ئامانجیان هاندان و هۆشیارکردنەوەی جەماوەر بوو بۆ ڕیفراندم و بڕینی ڕێگای سەختی سەربەخۆیی کوردستان. لەناو وڵاتدا بێ جیاوازیی بیروباوەڕ و لایەنگریی حزبی و ئایین و مەزهەب، دکتۆر، مامۆستای زانکۆ، شاعیر، هونەرمەند و کاسبکار، واتە لە هەموو جۆرە پیشەکان بەشدار بوون، واتە بەڕێزەکانی وەک (شێرکۆ بێکەس، یاساناس حەمید کاکەمین، نووسەر هەڵکەوت عەبدوڵڵا، خوشکە دڵدار کەتانە، خوشکە شوکریە، مامۆستا شاڵی و خوشکە کنێر و مامۆستا سەردار، سامانی کەمئەندامان) و چەندانی تر کاریان دەکرد بۆ ڕاپەڕاندن و وشیارکردنەوەی جەماوەر لەو مافە سروشتییەی خۆیان کە ڕاپرسیکردنە بۆ مانەوە لەگەڵ عێراقێکی ژێر داگیرکاریی ئەمەریکا یان سەربەخۆبوون و جیابوونەوە لە عێراقێکی داڕووخاو و داڕماو لە ڕووی سیاسی و ئابووری و سەربازی و بەڕێوەبەرایەتی و دانپێدانانی نێودەوڵەتییەوە وەک دەوڵەت، بۆ کۆتاییهێنان بەو شەراکەتە لار و لاسەنگەی لە دروستبوونی عێراقەوە ئێمەی کورد و باشووری کوردستانیان بەزۆرەملێ پێوە لکاندووە.

لە دەرەوەی وڵاتیش وەک نوێنەری کوردانی ئاوارەی وڵاتە ئەورووپی و ئوستورالی و ئەمەریکی و ئەسکەندینافییەکان، کوردان کەوتنە خۆ بۆ قۆستنەوەی ئەو هەلە زێڕینەی کە بە هۆی ڕووخانی حوکم لە عێراقدا و نەمانی عێراق وەک دەوڵەتێکی خاوەن قەبارە و ناوەڕۆک و خاوەن سەروەری و سەربەخۆیی کار بکەن بۆ گەیاندنی بانگی مافی کوردان لە ڕاپرسیی گشتی (ڕیفراندم) بۆ سەربەخۆیی، بە هەموو وڵاتانی جیهان و بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان لە جنێف. لە دەرەوەی وڵات گەلێ خۆپیشاندان و مانگرتن لەبەردەم سەفارەتخانەکانی وڵاتان و نەتەوە یەکگرتووەکان کرا، گەلێ کۆڕ و کۆبوونەوە و سمینار بە پشتیوانیی ئەنستیوتی کورد لە پاریس کرا. ئەو بەڕێزانەی لە دەرەوەی وڵات زۆرتر هەڵدەسووڕان، بەڕێزان: (کامەران لە لەندەن، کامەران لە نەمسا، شێخ کامیل لە نەمسا، کەمال میراودەلی لە بەریتانیا، خۆشی شەوقی لە ئەڵمانیا، بەندە لە ئەڵمانیا)، چەندان بەڕێزی تر کە ناوەکانیانم بیر نەماوە لە خوشک و برای بەشداربوو. لە سەرجەمی ئەو وڵاتانە و لە باشووریش (باشووری کوردستان) بە سەدان هەزار واژوو کۆ کرایەوە، بەندە و خوشکە خۆشی شەوقی و هەڤاڵێکی تر

کە خۆی لە سویسرا لە جنێف دەژیا، هەموو واژووەکانمان گەیاندە بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان.

ڕووبەڕووی پرسیارێکی فەرمانبەری بارەگاکە بووینەوە کە ئایا: لە باشووری کوردستان، دوو حزبی سەرەکی لە هەرێمی کوردستان دەسەڵاتدار و خاوەن دەنگن، ئەوان و حزبەکانی تریش هاوڕان لەگەڵ گرووپی ڕیفراندم بۆ سەربەخۆیی و جیابوونەوە لە عێراق؟ ئەو پرسیارە بۆ ئێمە وەک لووتشکاندنێکمان وا بوو، چونکە ڕاستەوخۆ پێیان وتین کە نوێنەری پارتی دیمکراتی کوردستان لە سویسرا بەفەرمی ئاگاداریان کردوون کە پارتی و گەلی کورد دژی گشتپرسی (ڕیفراندم)ن بۆ سەربەخۆیی و لە ناویشیان دا کە ناوی ڕیفراندمخوازان لە زاری «دیندار زێباری» نوێنەریانەوە بە ئاژاوەگێڕ ناو بردووە، بەڵام ئێمە بەفەرمی واژووی سەدان هەزار کوردمان پێ دان. گرووپی ڕیفراندم لە دەرەوەی وڵات، بە گڕوتینێکی زۆر پترەوە کەوتینە وتار نووسین، بەهیوای سازکردنی هەلومەرجێکی ئەوتۆ کە فشارەکانمان بۆ سەر ڕای گشتیی نێودەوڵەتی کاریگەریی پتری هەبێت، لە بەهاناوەهاتنی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ بەشداریکردنی چاودێرییان لەو ڕاپرسییەی کە گەلی کورد بەنیاز بوو بیکات لە کاتی دەستپێکردنی هەڵبژاردنی پەرلەمان لە عێراق و باشووری کوردستاندا. هەر بۆ ئەو مەبەستە، «ناوەندی لێکۆڵینەوەی کوردی» سمینارێکی گەورەی ساز کرد لەژێر ناونیشانی «ئێستە و پاشەڕۆژی کوردستانی عێراق (ئایا ڕیفراندم پێویستە؟)»، ئەم ناوەندە سەر بە «ئنستیتوتی کوردی» لە فەرەنسا بوو. لەو سمینارە کە ئەو بەڕێزانە بە وتارەکانیان بەشدارییان تێدا کرد، کە هەموو وتارەکان لە دووتوێی کتێبێکی قەبارە مامناوەندی (١٩٥) لاپەڕەدا ڕێک خرا.

١. وتەیەک، ئاوات ئەسعەدی

٢. وتاری پارتی دیموکراتی کوردستان - دژ بە ڕیفراندم، محەممەد ئەمین دەلۆیی

٣. هاتنی سوپای تورک و هەڵوێستی ی. ن. ک، مەحموود ڕەزا ئەمین

٤. ڕیفراندم لە کوردستانی عێراقدا، ئاراس فەتاح

٥. لە ڕیفراندمدا کوردستانێکی سەربەخۆ، د. بورهان ئەمین

٦. ڕیفراندم لە ڕوانگەی قانونی نێودەوڵەتییەوە، پارێزەر بەختیار حەیدەر قازی

٧. ڕیفراندم لە دووتوێی باری ڕاستەقینە و خواستەکاندا، د. ڕێبوار فەتاح
٨. با تاقیکردنەوە تاڵەکانی ڕابردوومان بیر نەچێتەوە، جەمال خەزنەدار
٩. ڕیفراندم و سیاسەتی ناوچەکە، نزار خەیلانی
١٠. لە ڕێگەی ڕیفراندمەوە چارەسەری...، ئەدیب جەنگی
١١. ڕیفراندم و چەند پرسیارێکی چارەنووسساز، نەجات مەحوی
١٢. ڕیفراندم و بیرێک لە داهاتوو، ئیبراهیم جەلال
١٣. ڕیفراندم - فیدرالیەت - فێربوونێک لە مێژوو، سالار باسیرە
١٤. بەیاننامەی کۆتایی کۆڕ.

## ڕیفراندم و بیرێک لە داهاتوو

بە درێژایی مێژووی کورد، یەکەم هەلومەرجێکی لەبار کە گەلی کورد توانیبێتی لە لاوازبوونی دەسەڵاتی حکومەتی مەرکەزی و حوکمڕانیی خۆداسەپێنەردا بقۆزێتەوە، یەکەم جاریش بێ لە مێژووی خەباتی گەلی کورددا کە دەمڕاست و سەرانی کورد و حزبە کوردییەکان دەنگ و هێزیان بکەن بە یەک، ئەو هەلە بوو کە بەرەی کوردستانی لە ساڵی ١٩٩٢دا قۆستیەوە و یەکەم پەرلەمانی کوردستان و حکومەتی هەرێمی کوردستانی تیا لەدایک بوو. ئەمەش دوو ساڵ بە پینەوپەڕۆ، بە پشوودرێژی، بە لێخواردنەوە لە یەکتر، بە زۆرەملێ و بەڕێوەبەرایەتییەکی هەوێساردی پەنجا بە پەنجا حوکمیان لە کوردستان ڕاکێشا تا ساڵی ١٩٩٤ پەتی پەیوەندییەکان پچڕا و دەرفەتی پێکەوە کارکردن هێندە باریک و تەسک بۆوە، سەرئەنجام دیسان شەڕی ناوخۆی لێ کەوتەوە. لەگەڵ هەموو زیانە نەتەوەییەکان، لە مەیدانەکانی داهاتی نەتەوەیی و سیاسەتی نەتەوەیی و فەرهەنگی نەتەوەیی و نەریتی نەتەوەیی پاشماوەی سەقەت و قێزەونەکانی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، شارستانیەتی و بەرگری و ئاسایشی نەتەوەیی شەڕی ناوخۆ. بەڵام هێشتا ئەزموونی حکومەتی هەرێم و پەرلەمانی کوردستان، هێندە بەرز و پیرۆز و بەبەهایە کە دەکرێ لە مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی گەلی کورددا، تا ڕووخانی دەسەڵاتی بەعس، بە ڕووناکترین و بەهرەدارترین و زێڕینترین کاتی مێژووی ژیانی کورد بناسرێ. سەبارەت بە دارشتنی

یەکەم چوارچێوە و قەبارەی حوکمی خۆیی کوردەوە کە خۆی لە فیدراڵدا دەنواند و لە پراکتیکدا بۆ ماوەی ١٢ ساڵ، دوو حکومەتی نیوەسەربەخۆ بوون.

ئەگەر شەڕی ناوخۆ و دوو حکومەتی و لەتکردنی خوارووی کوردستان نەبووایە، دەکرا لانی کەم ئەو ئەنجامە خراپانەی نەدایە بەدەستەوە. بەپێچەوانەشەوە، ئێستا کە لەبەرامبەر ئەو بارودۆخەی ئێستای عێراقدا، کورد خاوەنی حکومەتێکی سەربەخۆ و بێ گرێوگۆڵ بووایە، بەڵام لەگەڵ هەموو دیاردە خراپ و زیانبەخشەکانی دوولەتبوون و دوو حکومەتی و دوو دەنگی و دووان و سیان و چوار هەموو شتێکی تریش، هێشتا لایەنی زۆر بەسوودی خۆشیان هەبووە. هەر لە ساڵی (١٩٩٢)ەوەوە، حکومەتی هەرێمی کوردستان قەبارەی نەتەوەیی گەلی کوردی لە ناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی هەردوو لایان لە مەترسیی لێدان و لەناوچوون و شاڵاوی تری ئەنفال و کیمیاباران و جینۆسایدکردن پاراست.

جەماوەری ناوچەکانی هەرێم لە نەداری و هەژارییەکی سەختی عێراق پاراست و بووش بە خاوەن ئابوورییەکی تایبەت و سەربەخۆ کە خۆی لە دراوە تایبەتەکەیدا دەنواند کە بەها دراوییەکەی سەدان جار لە دراوی عێراقی بەرزتر بوو.

بوون و سەپاندن و سەقامگیرکردنی سیستمی ئیداری لەو بەشە ڕزگاربووەی خوارووی کوردستان بۆتە ئەمرێکی واقع و دانپێدانراوی دەوڵەتانی دراوسێ و داگیرکەرەکانی بەشەکانی تری کوردستان. کردنەوەی ڕەسمیی بیرۆی هەردوو ڕێکخراوە سەرەکییەکەی کوردستان لە تاران و ئەنقەرە و دیمەشقدا، خۆی لە خۆیدا دانپیانانێکی ناڕاستەوخۆی سیاسی و دبلۆماسییانەی ئەو دەوڵەتانەیە بە حکومەتی کوردستان.

هەردوو حکومەتەکەی کوردستان دەرگایان لەبەردەم دیبلۆماسیەتی کورد و بەدەوڵەتیکردنی کێشەی کورددا کردەوە. کێشەی کورد لە چوارچێوە و قەبارەیەکی تەسکی داخراوی ناوخۆییەوە چووەتە ناو بازنەیەکی گەلێ فراوان و نێودەوڵەتییەوە، کە چەندین پەیمان و ڕێککەوتننامەی وەک دبلن و پاریس و واشنتۆن و ئەنقەرەی لێ کەوتەوە.

لە سایەی کێبڕکێ و ململانێ و باری نە ئاشتی و نە شەڕی نێوان ئەو دوو حکومەتە لەدوای ساڵی (١٩٩٨)ەوە، پێشبڕکێکردن لە کارکردن و خزمەتکردنی ناوچەکان، هەموو شار و شارۆچکە و گوندەکانی بەشە ڕزگاربووەکەی خوارووی کوردستانی گرتەوە. ئەم ناوچانە ئاوەدانکردنەوە و پێشکەوتنێکی بەرچاویان لە گەلێ ڕووەوە (ئاوەدانی، خزمەتگوزاری، کۆمەلایەتی، ڕۆشنبیری و پەروەردە و خوێندن، هونەری، تەندروستی... هتد) بەخۆوە بینیوە. بەڵام چ دۆکیومێنتێکی زامنکەری بەردەوامی حکومەتی هەرێم و پەرەپێدان و فراوانکردنی سنووری دەسەڵاتەکەیمان لە بەردەمدایە؟

چ فاکتەرێکی بە هێزی ئەوتۆ لەئارادایە کە زامنکەری پاراستنی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان بێت؟ ئایا یەکگرتنەوەی دوو حکومەتەکەیە؟ یان دەستووورە پێشنیازکراوە فیدڕالییەکەی کوردستان و عێراقە؟ یان پەرلەمانە هەڵبژێردراوەکەمانە کە نوێنەری جەماوەرە نەک حزب و لیستی ڕەنگەکان؟ چ پەیماننامەیەکی مۆرکراوی نێودەوڵەتی، نێونەتەوەیی یان لانی کەم نێوان کورد و هاوپەیمانان هەیە کە دوا بڕیاری پێکهێنانی حکومەتێکی عێراقی دەستووری دیموکراتیی فیدڕالی و هەمەلایەنەی تیا درابێ کە ڕوون و ئاشکرا تیایدا بڕیاری لەسەر حکومەتی فیدڕالیی جوگرافی و نەتەوەیی کوردستان درابێ؟

چ ڕێککەوتنامەیەکی ڕوون و ئاشکرا و بڕواپێکراوی مۆرکراوی نێوان لایەنە سیاسی و مەزهەبی و نەتەوەیی و ڕەگەزییەکانی ناو عێراق هەیە کە لەبەردەم و بە بەشداریی نوێنەری یاساییترین دەزگای نێودەوڵەتی و نێونەتەوەیی وەک UN دانی بە مافی گەلی کورددا نابێ لە چوارچێوەی حکومەتێکی فیدڕالیی کوردستاندا؟

ئەی چ پشتیوانییەکی لەوانەی سەرەوە بەهێزترمان هەیە کە دڵنیامان کات لە دەستکارینەکردنی سیستمی فیدڕالیی کوردستان و قارسنەکردنی دەسەڵاتەکانی حکومەتی هەرێم و گرێدانی ناوچە ڕزگاربووەکانی پاش ڕووخانی دەسەڵاتی بەعس بە هەرێمی کوردستانەوە؟

ئەگەر پەنا نەبەینە بەر ڕیفراندۆم و نەیکەینە قەڵغانی بەرپەرچدانەوەی ئەگەرە مەترسیدارەکان کە بەهێزترین توانا و بەرزترین دەسەڵاتی نەتەوەییە، پەنا بۆ چیی

تر بەرین؟

ئەی ئەگەر وەک چۆن لە کۆتایی مانگی ئەیلوولدا ئاڵا هەنووکە بەرزکراوەکەی کوردستانیان لەسەر شارەوانیی کەرکووک داگرت، ئاواش لەپڕێکا لە هەموو کوردستان قەدەغە کرا، چی بکەین؟

ئەی ئەگەر کوردستان چەک چن کرا و هێزی پێشمەرگەی خاوەن ئەزموونیش لە دامودەزگا و بەڕێوەبەرایەتییەکان جێ کرانەوە و پەرتوبڵاوەیان پێ کرا و خزێنرانە ناو سووپا دروستکراوەکەی ئایندەی عێراقەوە و دەسەڵاتی سووپای کوردیان لەبن دابڕی، چی بکەین؟

ئەی ئەگەر دەسەڵاتی ئابووریی حکومەتی هەرێم و سامانە نەتەوەییەکەی کوردیان بە عێراقەوە بەستەوە و خستەوە سەر عێراق و بچووکترین کاری ئابووری ناچار بە گەڕانەوە بۆ ناوەندیان کردینەوە، چی بکەین؟

ئەی ئەگەر حکومەت و بەڕێوبەرایەتییەکی فیدڕالیی بێ ناوک و دەسەڵات و قارسکراو و قەتیسکراوی سنووری سلێمانی-هەولێر-دهۆکیان پێ ڕەوا بینین و وەک ئەنجوومەنی تەشریعیی تەنفیزییەکەی هەولێری سەردەمی بەعسییان لغاویان کرد و کردیانە دەزگایەکی تەنفیزیی ناوەند لەو ناوچانە، چی بکەین؟

ئەی ئەگەر وەزارەتەکانی ناوەند لە بەغداد، لەپشتی وەزارەتەکانی حکومەتی فیدڕالەوە فەرمانەکانیان بەسەر پارێزگا و بەڕێوەبەرێتییەتەکانی ناوچەی فیدڕال داسەپاند و هەروەک ڕووی دا، پاش دوو هەفتە لە دروستکردنی وەزارەتی ناوخۆی عێراق، جەنابی وەزیر بێ ئاگادارکردنی وەزیرەکانی ناوخۆی هەولێر و سلێمانییش فەرمانی دابوو بە پارێزگای سلێمانی و هەولێر دهۆک بۆ چوون بۆ بەغدا و ئامادەبوون لە کۆبوونەوەی وەزارەتی ناوخۆی عێراق، چی بکەین؟

ئەی ئەگەر سەبارەت بە گۆڕانی بارودۆخی ناوچەی "اقلیمی" و نێودەوڵەتی و بە هۆی لاوازیی ئەنجوومەنی حکومڕانیی عێراق لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی دەوڵەتدا، هاوپەیمانان ڕایان لەسەر ئەو جۆر و شێوە حوکمە لە عێراقدا گۆڕی، بڕیاری دامەزراندنی حکومەتێکی ناوەندی و سەرتاسەری عێراقیی بەهێزیان دا، چی بکەین؟

ئەی ئەگەر تەنیا بە فیدڕالییەکی قارسکراو هەر لەو سنوورەی خۆیدا کە پێش

ڕووخانی ڕژێمی بەعسییان هەبوو، بە کوردیان ڕەوا نەبینی، چی بکەین؟

ئەی ئەگەر بڕوبیانووی خۆتێهەڵقورتان و دەستێوەردانی دراوسێکانیان لێ قوت کردینەوە و کردیانە بیانووی لەباربردنی فیدڕالیی کوردستان، چی بکەین؟

ئەی ئەگەر ناوەرۆکی سەربەخۆیی بەڕێوەبەرایەتیی کوردیان بێ ناوەرۆک کرد و لە هەموو دەزگایەکی حکومەتی هەرێمدا، نوێنەرێکی ئەمەریکییان کردە چاودێر و میری میران بەسەریانەوە، چی بکەین؟

ئەی ئەگەر باڵی عێراقچێتی زاڵ بوو و پاراستنی سەروەری و سەربەخۆیی و یەکپارچەیی خاکی عێراق و بەرژەوەندیی نەتەوەیی عەرەبی (لە دەریاوە بۆ کەنداو) و خۆتێهەڵقورتانی کۆماری عەرەب و بەرژەوندیی پێکەوەژیانی کورد و عەرەبیان لێ کردینە هۆ و بیانوو و فەرمان و بڕیاری دیسانەوە بەزۆر پێکەوەلکاندنی کوردستان و عێراقی عەرەبی و دووبارە عێراقێکی پاش یەکەم شەڕی جیهانییان لێ دروست کردین، چی بکەین؟

ئەی ئەگەر حزب و حکومەتەکانی کوردستان بە ڕێککەوتنێکی نێوان خۆیان و هاوپەیمانان و برا عەرەبە شیعە و سوننەکان و تورکمان و ئاشوور و کلدان و فلان و فیسارەکان، ئەم جارەش چارەنووسی کوردیان بە چارەنووسی عێراقەوە بەستەوە، چی بکەین؟

ئەی ئەگەر بەپلانێکی دوژمنکارانەی دژەکوردانە، ناحەزان کێشەیەکی ئاڵۆز و خوێناویی وەک ئەوەی کەرکووکی ساڵی ١٩٥٩ و ئەم دواییەی دیسانەوەی کەرکووک و ڕەنگە شاری تریشمان بۆ دروستکرا و کرایە کراسی عوسمان و بیانووگرتن بە کورد و فیدڕالیی کوردستان، چی بکەین؟

ئەی ئەگەر سوپای ئەمەریکا و هاوپەیمانان پاش جێبەجێکردنی مەبەستەکانیان و لەژێر فشاری نێودەوڵەتی و ناوخۆ و عێراقیان چۆڵ کرد و چارەنووسی عێراق و کوردستانیان بێ یەکلاکردنەوە بۆ ژێر ڕەحمەتی ئەنجوومەنی حوکم یا هەر جۆرە حکومەتێکی عێراقی بێ زامنکردنی خواستەکانی کورد بەجێ هێشت، چی بکەین؟

دیارە لە بارودۆخێکی وەک ئێستای عێراقدا، ڕووداو و گۆڕانکارییەکان هێندە خێرا و بەپەلە ڕوو دەدەن کە چاوەڕوان ناکرێت، ئەگەر ئەو تەباییەی تا ئێستا لەسەر

چۆنیەتیی دانانی پڕۆژەی دەستووری هەمیشەیی عێراق پێی گەیشتوون، پێویستی بە گۆڕانکارییەک نەما و دەستوور خرایە بەردەم ڕیفراندمی عێراقەوە، زۆرینەی دەنگی عێراقی بوو بە بڕیاری دانانی دەستوور، چی بکەین؟

ئەی ئەگەر دوو حکومەتەکەی کورد یەکیان نەگرتەوە و بوونە هۆی کردنی دوو حکومەتی و دوو پارچەیی و سێ پارچەیی خوارووی کوردستان بە ئەمری واقع، واتە بوون بە هۆی ئەوەی کە بڕیار لەسەر مانەوەی حکومەتەکەی یەکێتی و پارتی لە هەولێر و سلێمانی و هەرێمی سێیەمیش لە کەرکووک یان موسڵدا، چی بکەین؟

ڕیفراندم وەڵامی هەموو ئەو پرسیار و ئەگەرانەیە کە لە مێشک و بیر و هەستی هەموو کوردێکدا پەنگی خواردۆتەوە، بە باش و خراپ، لە بیروبۆچوونی هەموو کوردستانییەکدا هەن، تەنیا و تەنیا بە گرتنەبەری ڕێگای ڕیفراندم دەدرێتەوە.

ڕیفراندم ئەو دەسەڵاتە گەورەیەی جەماوەر، کە هیچ دەسەڵاتێکی تری لاوەکی یا ناوەکی و دەرەکی ناگاتە قولەپێ. ڕیفراندم گەورەترین لەمپەرە لەبەردەم هەر نەخشە و پلان و تەقەللایەکدا بدرێ بۆ لەبار بردنی دەستکەوتەکانی جەماوەری ئەنفالکراو و کیمیابارانکراو و جینۆسایدکراوی ڕاپەڕیوی کوردستان. ڕیفراندۆم هەوڵە، تەقەللایە، شێوەی خەباتی سەردەمە، فشاری جەماوەر و گەلێکی پێنج ملیۆنییە بۆ سەر دامودەزگا خاوەن بڕیارەکانی نێونەتەوەیی و نێودەوڵەتیی مرۆڤایەتی بۆ ئاوڕدانەوە و فەرامۆشنەکردنی خواستێکی نەتەوەیی هەق و ڕەوای سەدان ساڵ پێشێلکراو. ڕیفراندۆم ئەو هێزە گەورەیەیە کە هەموو حوکمبەدەستەکانی عێراق لە کوردستان و هەموو حزب و ڕێکخراوە عێراقی و کوردستانییەکان دەخاتە بەردەم باری حوکمی لۆژیک کە گوێڕایەڵی خواستەکانی جەماوەرین.

ڕیفراندۆم فاکتەری هەرە بەهێز و توانای پەلکێشکردنی دوو حزب و دوو حکومەتەکەی کوردستانە بۆ ناو مەیدانی یەکگرتنی و یەک دەنگی و یەک ڕەنگی.

## ڕیفراندم و ئامانجەکانی:

١. بەدیهێنانی یەک دەنگی و یەک ڕەنگی لە کوردستان و ڕێکخستنی ماڵی کورد.
٢. گەیاندنی گەلی کوردستان بە چارەنووسی خۆی و بە ویستی خۆی.

٣. بوونی بە فاکتەرێکی بەهێزی بەهێزکردنی هەڵوێستی حزبە کوردییەکان لە ناوەنددا، نەک جێگرەوەی پەرلەمان و حزب.

٤. یەکلاکەرەوەی چارەنووسی شار و شارۆچکە و ناوچە مشتومڕ لەسەر کراوەکانی کوردستان، کە پاش ڕووخانی بەعس ڕزگار بوون، وەک شار و شارۆچکەکانی کەرکووک و سەر بە موسڵ و دیالە.

٥. بەدیهێنەری یەکگرتنەوەی هەردوو پارچەکەیە، گەر لە جووڵانەوەیەکی نەتەوەیی ئازاد و سەربەخۆ و بێ دەستێوەردانی ئەملا و ئەولا بێت.

٦. ڕەنگدانەوەی خواستە مێژوویی و سروشتی و نەتەوەییەکەی خەڵکی کوردستانە بێ ئاڕاستەکردنی نوێنەرانی کورد بۆ ئاستەنگییەکی نەشیاو و نەگونجاوی بارودۆخی ئێستای عێراق.

٧. ڕیفراندم گەر پێش داڕشتنی دەستووری عێراقی و کوردستان بکەوێ، دەبێتە مایەی سەلماندن و سەقامگیرکردنی خواستەکانی گەلی کوردستان لەو دەستوورانەدا، ئەگەر دواش کەوت، ئەوسا دەبێتە لەمپەرێک لەنێوان دەستوور و جەماوەری کورد ستاندا.

٨. تاکی کورد لە کۆمەڵێک نەریتی نامۆ بەم سەدەیە و بەم بارودۆخ و هەلومەرجە ڕزگار دەکات، وەک: هەقم چییە، ئیشی من نییە، سیاسییەکان باشتر دەزانن، خوا دەزانێت ئەمەریکا پەیمانی چیی بە کورد داوە، مەسئوولەکان لە ئێمە باشتر دەزانن... هتد. جەماوەری کوردستانیش لە دیاردەی نهێنی و نهێنیکاری ڕزگار دەکات.

٩. بەشی هەرە زۆری ئەرکێکی گەورەی کورد چارەسەر دەکات، کە لەسەر ڕژێمی گشتیی کوردستانە.

١٠. یەکەم هەنگاوی دیموکراتیزەکردنی کاری جەماوەری بەکۆمەڵی کوردستان و ئاشناکردنی و ڕاهێنانی خەڵکی کوردستانیشە لەسەر نانی هەنگاوی یەکەمی تاکی کورد و جەماوەر بەرەو مەدەنیەت.

١١. وەڵامدانەوەیەکی دیموکراتی، نەتەوەیی، سروشتی، ئایینی و مەزهەبیی هاوچەرخی چارەسەرکردنی کێشەی کەمایەتیی نەتەوەیی و ئایینی تورکمان و عەرەب و ئاشووری و کلدانە لە کوردستان.

١٢. پەیامێکی ئاشکرای گشتیی کوردستانییە بۆ کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ بەئاگاهێنانەوەیان لە بێ دەوڵەتی و بێ کیانی سیاسیی نەتەوەیەکی چەند ملیۆنی.

٢٠٠٣/١٠/١٧

هانۆڤەر

## باشووری کوردستان و بەردەوامیم لە دەستەی باڵای ڕیفراندم

لە کاتی گرتنی سەدام حسێن و هێنانەدەرەوەی لەناو چاڵەکە، من لە شاری هانۆڤەر لە گێڕانی سمینارێکدا بووم لەسەر ڕیفراندم، بە هاوبەشیی دوو برای تریش کە یەکیان کوردی رۆژهەڵاتی کوردستان بوو، ئەوی تریشیان برای ئازیزم «بەختیار عەلی»؛ ڕۆماننووسی ناوداری گەلەکەمان بوو. هەواڵیان هێنا کە لە تەلەڤزیۆن وێنەی سەدام پیشان دەدرێت. هەر لەوێ لە کۆتایی سمینارەکەدا بە بەشداربووانم ڕاگەیاند کە ئیتر من دەگەڕێمەوە بۆ وڵات، چونکە هەر لە ڕۆژی هاتنم بۆ دەرەوەی وڵات، بڕیارم دابوو هەر کات سەدام و بەعس ڕووخان و لە دەسەڵاتدا نەمان، منیش بۆ یەکجاری دەگەڕێمەوە. لە ٢٠٠٣/١١/٢٥، لە ڕێگەی تورکیاوە گەڕامەوە باشووری کوردستان.

پێش گەڕانەوەم بە یەک دوو هەفتە، ئەو کارانەی پێویست بوو بۆ ئاگادارکردنەوەی حکومەتی ئەڵمانی لە دەرچوونم لە ئەڵمانیا و بەردەوام ژیانم لە باشوور، جێبەجێم کرد. هەفتەی یەکەمی گەڕانەوەم، پەیوەندیم بە لیژنەی باڵای ڕیفراندم لەناو وڵاتەکەوە کرد و کەوتمەوە کارکردن لەگەڵ بەڕێزان: (شێرکۆ بێکەس، فەتاح زاخۆیی؛ وەزیری ڕۆشنبیری، هەڵکەوت عەبدوڵڵا، حەمید کاکەمین؛ مافناس، ئەبو بەکر کاروانی، شوکریە شالی، دڵدار کەتانە، هاوسەری کاک ئازاد سەیید برایم، ناوەکەیم بیر چووە، سامان (سامانی خاوەنی پێداویستیی تایبەت)، مامۆستا سەرکەوت، نەژاد شمقار، کنێر عەبدوڵڵا، داوای لێبوردن لەو بەڕێزانەش دەکەم ناوەکانیانم بیر چووبێ).

هەموومان بەردەوام بووین لە بانگەشەکردن بۆ ڕیفراندم لە تەلەڤزیۆنەکان، لە سمینارەکان، لە ڕاستیدا یەکێتی لە پشتی پەردەوە هاوکاریی دەکردین، بەڵام بە

ڕاستەوخۆ خۆیان لێ نەدەداین. بەڵام پارتی بە ڕاستەوخۆ دژایەتییان دەکردین و هەوڵیان دەدا کە هەندێک کەسیان بخزێننە ناو بزووتنەوەکە بۆ تێکدانی، تەنانەت کاریان کرد بۆ کڕینی هەندێ لە ئەندامەکانمان و کاریگەریی خۆیشیان لە تێکداندا هەبوو.

بزووتنەوەی ڕیفراندم بەردەوام بوو، تا دەستپێکردنی هەڵبژاردنی گشتی لە عێراق و هەرێمی کوردستان لە ٢٠٠٤.

بزووتنەوەی ڕیفراندم بڕیاری دا لەتەنیشت هەموو بنکەیەکی دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق، بنکەیەکیش بۆ ڕیفراندم دابنێت کە دەنگدەران بتوانن دەنگی خۆیان بە «بەڵێ بۆ سەربەخۆیی» یان «نەخێر بۆ سەربەخۆیی» بدەن.

پاش تەواوبوونی دەنگدان، هەموو دەنگەکان بە سندووقەکانیانەوە برانە یانەی مامۆستایان، لەوێ بە بەشداریی چەند یاساناس و دادوەرێک، دەنگەکان بە سەرپەرشتیی لیژنەیەکی بێلایەن ژمێردران، ئەنجام «بەڵێ بۆ سەربەخۆیی» لە سەددا نەوەد و هەشت کۆما حەفتا و هەشتی هێنا (٧٨,٩٨٪)، ئەو دەنگانە هەمووی وێنە یان گیرا و بە "CD" نێردران بۆ بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان. لەدوای هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق و دامەزراندنی حکومەتی نوێی عێراق کە پاش دەسەڵاتی پاشایەتیی عێراق بۆ یەکەم جار بوو پەرلەمانێک و حکومەتێک بە شێوەی دیموکراتی هەڵبژێردرێت و دابنرێ، بزووتنەوەی ڕیفراندم بڵاوکراوەیەکی دەرکرد کە داوای لە پەرلەمانی عێراق کرد ڕێز لە خواست و داوای گەلی هەرێمی باشووری کوردستان بگرن کە بەو ڕێژە یەجگار زۆرە دەنگیان بە سەربەخۆیی داوە، پەرلەمانی عێراقیش پەسەندی بکات کە ئارەزومەندانە وەک دوو وڵات پێکەوە بەئاشتی بژین. بەڕێز سامانی ڕیفراندم؛ سکرتێری خاوەن پێداویستیی تایبەت، بڵاوکراوەکانی گەیاندە بەغدا و بەندەش بە هاوکاریی مامۆستا ڕەئووف عوسمان و عەبدولمەجید زەنگەنە بۆ هەر پەرلەمانتارێک دانەیەکمان خستە سەر کورسییەکەی، پێش دەستپێکردنی دانیشتنی ئەو ڕۆژەی پەرلەمان. لە ڕاستیدا بە بۆچوونی ئەوسای خۆم، وام هەست کرد کە یەکێتییش بزووتنەوەکەی وەک پیشاندانی کوتەکی بن عەبای بەکار هێنا لە دانوستاندنیدا لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی، جگە لەو مەبەستە هەرگیز بۆ مەبەستی سەربەخۆیی هاوکاریی بزووتنەوەکەی نەدەکرد.

## کاری فەرمیم لە حکومەتی هەرێمدا
## بەشی بەڕێوەبەرایەتیی سلێمانی

دوای گەڕانەوەم لە تاراوگە، بەندە هیچ نیاز و پلانێکی دیاریکراوم نەبوو کە چی بکەم و چۆن ژیان بەرمە سەر و بە چ کارێکی ترەوە جگە لە بزووتنەوەی ڕیفراندم، پێوەی خەریک بم. بە هۆی دووریم لە وڵات، وەک هەموو کەسە دڵسۆزەکانی تری دەرەوەی وڵات، لەچاو هاوڕێکانی ناو وڵات فەرامۆش کرابووین.

هاوڕێکانم، ئەوانەی کە لە من زیاتر شایستە بوون و لەوانەش کە لە من کەمتر شایستە بوون، شوێن و پلەوپایەی زۆر باشیان درابوویە، یان بە پلەی وەزیر یا بەڕێوەبەری گشتی، یا ئەندامی پەرلەمانی کوردستان دامەزرێنرابوون و خانەنشین کرابوون.

من نیازی ئەوانەم نەبوو، من بەهیوای ئەوە بووم کە لە ساڵی (١٩٦٢)ەوەوە کە خۆم جێگری ژمێریاری بووم لە فەرمانگەی خانەنشینی سلێمانی، ماوەی ساڵەکانی پێشمەرگایەتی و کاری سیاسیم بۆ ئەژمار بکرێ، بەپێی ساڵی کارکردنم بە پلەیەکی شایستە خانەنشین بکرێم. بەڵام هەر دوای گەڕانەوەم بۆ وڵات بە دوو مانگ، هاوڕێی دێرینم کاک عومەر فەتاح کە ئەو کاتە سەرۆکوەزیرانی حکومەتەکەی هەرێمی سلێمانی بوو، بە پلەی ڕاوێژکاری ئەنجوومەنی وەزیران فەرمانی بۆ دەرکردم.

بەو پلەیە، تا هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و عێراق مامەوە. من نەدەچووم بۆ ئەنجوومەنی وەزیران، ڕۆژێک کاک عومەر وەڵامی بۆ ناردم بڕۆم بۆ ئەنجوومەن، منیش چووم بۆ لای، وتی بۆ نایەی بۆ دەوام، تۆ ڕاوێژکار نییت؟ وتم بەڵێ، بەڵام خۆ تۆ ڕاوێـژم پێ ناکەیت، بۆ بێم؟ وتی فەرموو، ئامۆژگاریت و ڕاوێـژت چییە؟ وتم گەر بە ڕاوێـژی من دەکەیت، پێشنیار دەکەم لە ٢٠٪ی مووچەی پلە باڵاکان لە سەرۆکوەزیرانەوە کە خۆتی، هەموو پلە باڵاکان کەم بکەنەوە بە خۆیشمەوە، بەڵام ڕێژەی ٣٠٪ی مووچەی پلە کەمەکان پتر و بەرز بکەنەوە. بەڕاستی بێمانایە دەرچووی زانکۆیەک بە مووچەی ٣٥٠ هەزار دامەزرێ. بەپێکەنینەوە پێی وتم: حەی لەو ڕاوێژە! جا کێ قایلە بەو ڕاوێژەت، گەر پلە باڵاکان ئەو ڕاوێژە ببیستن، ڕاوت دەنێن تا دەتکەنەوە بە ئەڵمانیادا.

## پەرلەمانی عێراق و ئەندامێتیم

لە کاتی هەڵبژاردنەکان لە عێراق و هەرێم، پارتی و یەکێتی بڕیاریان دا کە هەردوو بەڕێوەبەرایەتییەکە بکەنەوە بە یەک، بۆ ئەو مەبەستەش هەڵبژاردنی گشتی ئەنجام بدرێ بۆ دانانی پەرلەمانی یەکگرتوو و حکومڕانیی یەکگرتووش مەرجی پارتی لەو هەڵبژاردنە ئەوە بوو کە بە لیستی داخراو بێت و پارتی و یەکێتییش یەک لیستیان هەبێت بۆ کوردستانیش و بۆ عێراقیش. من

لەلایەن م. س یەکێتییەوە بەربژێر کرابووم بۆ ئەندامێتیی پەرلەمانی کوردستان، بەڵام کە لیستی ناوەکان دەرچوو، ناوی منی تێدا نەبوو. لە ڕاستیدا پڕبەدڵ ئارەزووم بوو کە لە مێژووی ژیانمدا ئەندامێتیی خۆم لە پەرلەمانی یەکگرتووی وڵاتەکەمدا کە باشووری کوردستانە، ببینم. زۆر زۆریشم پێ ناخۆش بوو کە ناوم لە لیستەکەدا نەبوو، کە پرسیارم کرد، کاک عومەری سەیید عەلی پێی ڕاگەیاندم کە پارتی قایل نەبووە لەسەر ناوی من، وە ڕێککەوتنیش لەنێوان پارتی و یەکیەتی هەیە کە هەر ناوێک لە لیستە هاوبەشەکەدا قایلبوونی هەردوو لای لەسەر نەبێ ئەو ناوە لا دەبرێ، کاک عومەر پێی ڕاگەیاندم کە بچمە لای مام جەلال، داوای کردووم بمبینێ. ڕۆژی دواتر چووم بۆ لای بەڕێز مام جەلال، بانگێشتی کردم بۆ خوانی نیوەڕۆ، پاشان پێی وتم کە ناوی منیان بۆ لیستی هاوبەشی پەرلەمانی عێراق داناوە. بە بەڕێزیانم وت کە ئارەزوو ناکەم، ئەوەتەی خۆم دەناسم کەسێکی تا سەر ئێسقان کوردستانی بووم و هەم خوازیاری ڕاپرسیم لەسەر مانەوەمان لەگەڵ عێراق یا سەربەخۆیی، نامەوێ لە یەکەم حکومەت و پەرلەمانی دوای ڕووخانی دکتاتۆریەت لە عێراقدا ببمە بەشێک لەو داننان بە یەکپارچەیی خاکی عێراق، بە کوردستانیشەوە. مام جەلال وتی نەخێر وا نییە، بارودۆخی عێراق مەترسیدارە، بەتایبەت بەغداش بەدەست تاقمی "قاعدە"وەیە، بۆیە ناتەوێ بچی. ئیتر بێ هیچ سێ و دوو یەک قایل بووم، ناوم خرایە لیستە هاوبەشەکەی یەکێتی و پارتی و حزب و لایەنەکانی ترەوە، کە سەد ناو بوون، لەوانە ٧٨ کەسیان بەپێی تەسەلسولی ناوەکان دەبوونە ئەندامی پەرلەمان کە ناو نرابوو بە ناوی "کۆمەڵەی نیشتیمانی" (الجمعية الوطنية)، لە لیستەکەدا من ژمارە (٤٨) بووم.

## کۆمەڵەی نیشتمانی (الجمعیة الوطنیة)

لەدوای ڕووخانی حوکمی پاشایەتی، بۆ یەکەم جار بوو لە عێراقدا هەڵبژاردنێکی پاک و دیموکراتیانە بکرێت بۆ دانانی پەرلەمانی گەل و هەڵبژاردنی حکومەتی عێراق و سەرۆکی کۆمار، هەموو کەسێک لە عێراق و لە باشووری کوردستانیش ئەو ڕاستییە دەزانن کە حوکم لە عێراقدا لەدوای سیستمی پاشایەتی، یا بە کودەتای سەربازی و یا بە حوکمی عورفی؛ حوکمی عێراق کراوە.

پەرلەمان چ لە سەردەمی حوکمی زاتیی باشوور و حکومەتی دەسەڵاتی بەعسییان بە ناو و بە هەڵبژاردن، بەڵام بە ناوەڕۆک و بە دانان و لەسەر بنەمای پابەندبوونی ئەندامەکانەوە بە بیر و هزر و سیاسەتی بەعسەوە بووە.

ئەو هەڵبژاردنە لە هەلومەرجێکی زۆر سەخت و نائارام و ناسەقامگیری ئاسایشدا بوو. لە لایەکەوە قاعیدە و تاقمەکەی «زەرقاوی» تەنگیان بە ئارامی و ئاسایشی سەر وماڵی هاوڵاتیان و چەکدارانی ئەمەریکی و هاوپەیمانان هەڵچنیبوو، هەر کەس لە وەزارەتەکان و پەرلەماندا کاری بکردایە، وەک وەزیر یان ئەندامپەرلەمان یان فەرمانبەر، بە تاوانبار و خاک فرۆش ناوزەد دەکرا و کوشتن سزای بوو. ڕۆژانە بە دەیان تەقینەوە لەسەر شەقامەکان و شوێنە پڕ خەڵکەکان و گازینۆکان و چێشتخانە و ناوبازاڕەکان ڕووی دەدا. هەموو سەفارەت و دامودەزگا حکومییەکان و تەلاری پەرلەمان خرابوونە جوغزێکەوە کە پێی دەوترا ناوچەی سەوز (المنطقة الخضراء). لە لایەکی ترەوە فرۆکەخانە و شارێگاکانی ناو بەغدا و تەنانەت ئەنجوومەنی وەزیرەکان و پەرلەمان و پەرلەمانتارەکانیش بە ئاماژەیەکی پەنجەی حوکم و دەسەڵاتی حاکمی ئەمەریکی لە عێراق (پۆل بریمەر) دەچوو بەڕێوە. ئەو خولەی پەرلەمان ماوەکەی ساڵێک بوو، لەو خولەدا کاری سەرەکی؛ دانانی دەستووری عێراق بوو. نوێنەرانی باشووری کوردستان، حەفتا و هەشت ئەندام بوون کە نوێنەری هەموو حزب و قەوارەکان و تورکمان و مەسیحیی تێدا بوو (مام جەلال لە ٢٠٠٥/٤/٧دا بە ٢٢٧ دەنگ لە کۆی ٢٥٧ دەنگ، بوو بە سەرۆککۆمار). سەرەتای چوونمان بۆ بەغدا و دەستبەکاربوونمان، کەسمان شوێنی حەوانەوەی تایبەتمان نەبوو، چونکە هیچ میوانخانەیەک و تەنانەت هیچ خانوویەکیش سەلامەت نەبوو بۆ ئەندامان لەبەر هێرش

و پەلاماری تیرۆریستەکانی قاعدە.

سەدام حسێن بەڵێنی دابوو کە پاش خۆی دەبێت عێراقێکی کاول و پڕ ئاژاوە بەجێ بهێڵێ، بۆیە پێش ڕاکردنی خۆی، هەر چی بەندکراو و گیراوە، گومانلێکراوە بێرەوشتەکان (سەرسەری و چەقۆکێش و پیاوکوژ) هەبوو، هەمووی بەرەڵا کردن، ئەوانەش لە ٧٠٪ یان پتر بوونە چەکداری قاعدە و تیرۆرستانی تاقمی بن لادن و ئەیمەن ضەواهری و زەرقاوی.

بۆیە ئەو ئەندامپەرلەمانانەی سەر بە پارتی بوون، هەموویان لە ناوچەی سەوز لەو کۆشکانەدا دەژیان کە لە کاتی ڕووخانی بەعسدا دەستیان بەسەردا گرتبوو. ئەوانەش سەر بە یەکێتی بوون، لەو کۆشکەدا بووین کە میوانخانەی سەرۆککۆمار و بەتەنیشت کۆشکی سەرۆککۆمارەوە بوو. پاش دوو سێ مانگ، شوقەکانی ناو ناوچەی سەوزیان داینێ کە کاتی تالان و بڕۆکان، عەرەبە مەعدانەکان داگیریان کردبوو. هەر یەکێک لە ئێمە، بە نرخی جیاجیا لێمان کرینەوە نەک بە موڵکی، بەڵکوو وەک پێشەکییەک (سەرقفڵانە) بۆ یەکەم جار لە مێژووی عێراقدا سەرۆککۆماری عێراق بە دەنگدانی گشتی و نهێنی لەناو پەرلەمانەوە هەڵبژێردرا کە کورد بێت. سەرۆک تاڵەبانی لە یەکەم دانیشتنی پەرلەمان بۆ سەرۆکی کۆمار کاندید کرا و بە دەنگدانی گشتی و نهێنی، دەنگی هەموو ئەندامانی ئامادەبووی پەرلەمانی هێنا جگە لە ٣٠ دەنگ کە دوو دەنگیان کورد و یەکێتیش بوون. ئەگەرچی سیستمی حوکم لە عێراق بە سیستمی پەرلەمانی دیاری کرا کە سەرۆککۆمار لە پەرلەمانەوە هەڵبژێردرێت کە ئەرکە دەستوورییەکەی پتر کاری تەشریفاتییە و سەرۆککۆماریش کەسێک لە پەرلەمانەوە ڕادەسپێرێت بۆ پێکهێنانی وەزارەت کە ئەمیش دەزگایەکی جێبەجێکار (تنفیذی)، خاوەن زۆرترین دەسەڵاتە دەستوورییەکانە، بەڵام بەپێی ئەوەی کە پێکهاتەی عێراق پێکهاتەیەکی فرە نەتەوە و فرە ئایین و فرە مەزهەبە، بنەمای «توافقی» کراوە بە بنەمای دابەشکردنی دەسەڵاتەکان، واتە دەسەڵاتی سەرۆکایەتیی تەشریفاتی بۆ کوردە، دەسەڵاتی جێبەجێکاری (تنفیذی) بۆ عەرەبی شیعەیە کە حکومەتە، وە دەسەڵاتی یاسادانان (تشریعی) بۆ عەرەبی سوننەیە. بەپێی ئەم سیستمە، هەریەک لەو سەرۆکانەش دەبێت دوو جێگریان هەبێت، واتە سەرۆککۆمار کە پشکی کوردە، دەبێت جێگرێکی شیعە و جێگرێکی سوننەی هەبێت،

وە سەرۆکوەزیران کە پشکی شیعەیە، دەبێت دوو جێگری هەبێت، یەکیان کورد و یەکیان سوننە، هەرواش سەرۆکی پەرلەمان کە پشکی سوننەیە، دوو جێگری دەبێت، یەکیان شیعە و یەکیشیان کورد. سکرتێری پەرلەمانیش بەپێی خولەکان، یان تورکمان یان مەسیحی دەبێت.

واتە دانانی سەرۆکی کۆمار و سەرۆکوەزیران و سەرۆکی پەرلەمان و جێگرەکانیان لەسەر بنەمای (توافقی) رێککەوتنی ئەو سێ پێکهاتەیە دەبێت، نەک لەسەر بنەمای زۆرینە و کەمینەی دەنگەکان و دەنگدەران و نوێنەرانی کورد توانییان لە دیباجەی دەستوورەکەدا ئەو مافە بچەسپێنن کە هەر کاتێ کورد هیچ مەودایەکی پێکەوەژیانی بۆ نەمایەوە لەگەڵ عێراقدا، مافی ئەوەی هەیە کە خۆی چارەنووسی خۆی دیاری بکات، جا بە هەر شێوەیەک کە بیەوێت.

جگە لەوەش، لەناو دەستوورەکەدا (٢٤) مادەی دەستووری چەسپاند کە پەیوەندیی بە کێشە جوگرافی و سیاسی و بەڕێوەبەرایەتییەکانی هەرێمی کوردستانەوە هەیە، یەک لەو مادانە ئەوەیە کە هەر مادەیەکی عێراقی لە پەرلەمانی عێراقەوە دەربچێت، نابێ پێچەوانە یا دژ بە هەمان بڕگە و مادەیەوە بێ کە لە هەرێم دەرچووە.

یەکێک لە مادە هەرە گرنگەکان، مادەی (٥٨)ە، کە بریتییە لە سێ قۆناغ بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ناوچە ناکۆکیلەسەرەکان.

قۆناغی یەکەم: ئاساییکردنەوەی بارودۆخی پێکەوەژیانی دانیشووانەکەی و گەڕانەوەی کوردە بەزۆر ئاوارەکان بۆ زێد و سەر موڵک وماڵی خۆیان.

قۆناغی دووەم: قەرەبووکردنەوەی زیانلێدراوان لە کورد و عەرەبی ڕەسەن و تورکمان، بە هۆی شاڵاوی بەعەرەبکردن و ڕەوپێکردن و بەبەعسیکردنەوە تووشی بوون.

قۆناغی سێهەم: سەرژمێرییەکی گشتیی پاک و بێگەرد بۆ هەموو ئەو ناوچانەی کە کێشەیان لەسەرە، بە مەبەستی یەکلاییکردنەوەی زۆرینە و کەمینە و گەڕانەوەیان بۆ ناو سنووری هەرێمی کوردستان.

خولی ئێمە ١٣ مانگ بوو، کە بە یەکەم خولی پەرلەمانی عێراقی هەڵبژێردراو دادەنرێت لە ماوەی ئەو ١٣ مانگەدا ڕۆڵ و چالاکیی یەکە یەکەی ئەندامان لە پەرلەمان

دەرکەوت لەناو فراکسیۆنەکانی خۆیان و لە دانیشتنە ئاساییەکانی پەرلەماندا.

من لە فراکسیۆنی مادەی (٥٨) بووم، کە دواتر کرا بە مادەی (١٤٠). لە پشوویەکدا گەڕامەوە بۆ سلێمانی، سەردانێکی کاک نەوشیروانم کرد، لێی پرسیم لە چ فراکسۆنێکم، وتم فراکسیۆنی ناوچە دابڕێنراوەکان، کەچی بەلالوتێکەوە وتی: «جا ئەوە کەی شوێنە، دەبووایە بچوویتایەتە فراکسۆنێکەوە کە پەیوەندیی بە ئابووری و پارەوە هەبووایە.»

سەرۆکی فراکسیۆنی ئەندامانی یەکێتی، د. فۆاد مەعسوم بوو کە ڕێگەپێدراو بوو هەموو کاتێک سەردانی لای مام جەلال بکات و ورد و درشتی ڕووداوی ڕۆژانەی ناو پەرلەمانی بۆ باس بکات. ڕۆژێک «نووری کامل مالکی» کە ئەندامی پەرلەمان و سەرۆکی لیستی دەوڵەتی قانوون بوو، هەڵسا پڕۆژەبڕیارێکی دا بە سەرۆکایەتیی پەرلەمان، داوای کرد کە ئەو پڕۆژەبڕیارە بکرێت بە یاسا و دەنگی لەسەر بدرێت. پڕۆژەبڕیارەکەی (مشروع قرار) بریتی بوو لە: چەککردن و هەڵوەشاندنەوەی ئەو میلیشیا نایاساییانەی کە پاش ڕووخانی حوکمی سەدام دروست بوون، لە ناویاندا ئەوانەش کە گوایە پێیان دەڵێن پێشمەرگە (حل جميع المليشيات و تجريدهم من السلاح الذين شكلو بشكل غير قانوني بعد سقوط حكم صدام بما فيهم ما يسمى بالبيشمەرگە).

بەندە هەڵسام و داوام لە سەرۆکایەتیی پەرلەمان کرد کە:

١. ئەو پڕۆژەبڕیارەی مالکی نەخرێتە (محظر جلسة) ئەجەندای دانیشتنی ئەو ڕۆژەوە.

٢. ئەو پڕۆژەبڕیارە چاک بکرێت و ناوی پێشمەرگەی لێ بهێنرێتە دەرەوە، چونکە پێشمەرگە میلیشیا نییە، بەڵکوو هێزی چەکداری یاسایی هاوبەشە لە پرۆسەی ئازادکردنی عێراقدا.

٣. هێزی پێشمەرگە دەیان ساڵ پێش ڕووخانی ڕژێمی سەدام بە مەبەستی بەدیهێنانی دیموکراتی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان، دروست بووە.

٤. داوا دەکەم بەڕێز مالکی پۆزش بۆ هێزی پێشمەرگە بێنێتەوە کە ئەوی لە لەندەنەوە هێنایە کوردستانی ئازاد و پاشان ئەو شوێنەی ئێستای.

لەسەر ئەوە بوو بە کێشەمان لەنێوان بەندە و مالکیدا.

بۆ دانیشتنی دوای ئەوە، د. فۆاد مەعسوم پێی وتم کە مام جەلال ئەو «مرافعە»یەی

منی لەگەڵ مالکی پێ ناخۆش بووە، «مالکی سەرۆکی گەورەترین لیستی ناو پەرلەمانە و یەکێکە لە دۆستە نزیکەکان، با برایم ئاگای لە هەڵسوکەوتی بێت لەگەڵ ئەو سەرۆک کوتلانەدا».

لە دانیشتنێکی تردا کە ئیبراهیم جەعفەری لەلایەن پەرلەمانەوە بانگێشت کرابوو بۆ پرسیار و وەڵام، وە لە هەمان ڕۆژیشدا یادی کیمیابارانی هەڵەبجە بوو، زۆربەی ئەندامانی یەکێتی لە پەرلەمان خۆیان ئامادە کرد بۆ لێدوان لەسەر هەڵەبجە و قەرەبووکردنەوە و داواکردن بەفەرمی لە حکومەت کە داوای لێبوردن بکات لە دانیشتووانی هەڵەبجە. داواکاری و پرسیارەکانیش هەمووی ڕووبەڕووی ئیبراهیم جەعفەری دەکرایەوە، بەو پێیەی کە ئەو سەرۆکوەزیران بوو.

لەوێشدا دیسان دەمەبۆڵەیەک لە نێوانماندا دروست بوو لەسەر ئەوەی کە ئەو کەتنەکەی بە هیی سەدام دەزانی و حکومەتەکەی ئەو لێی بەرپرسیار نییە و داوای لێبوردنیش ناکات لە کورد و هەڵەبجە بە ناوی حکومەتەوە. منیش بەتوندی بەرپەرچیم دایەوە و داوام لە سەرۆکایەتیی پەرلەمان کرد کە بڕگەی بە جینۆساید ناساندنی کارەساتی کیمیاباران و ئەنفال بخرێتە ئەجندای کۆبوونەوەی دوایی پەرلەمان و داوا لە حکومەتی عێراق بکرێت کە بەفەرمی دان بەو ڕاستییەدا بنێت و داوای لێبوردن لە گەلی کورد بکات و بڕیاری قەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتووەکانی ماڵی و گیانییش بدرێت، بەڵام جەعفەری هەم داوای لێبوردنەکەی پەسەند نەکرد و هەم حکومەتی سەدامی تاوانبار کرد لە ئەنفالی کوردان و کیمیاباران و هیچ بە پێویستی نەزانی کە هیچ حکومەتێکی عێراقیی دوای سەدام، دان بە جینۆساید ناساندنی ئەنفال و کیمیاباراندا بنێت و هیچ حکومەتێکی دوای سەدامیش پابەند نییە بە قەرەبووی ئەو کارەساتەوە.

بەندە بەتوندی بەرپەرچی ئیبراهیم جەعفەریم دایەوە، داواشم لە سەرۆک و سەرۆکایەتیی پەرلەمان کرد کە پاش کۆکردنەوەی پتر لە (٥٠) واژۆ، بابەتی بە جینۆساید ناساندنی ئەنفال و کیمیاباران بخرێتە ئەجندای کۆبوونەوەی ئایندەی پەرلەمانەوە بۆ تاووتوێکردن و دەنگدان لەسەری. دوای ئەو دانیشتنە، فوئاد مەعسوم کە پاش هەموو دانیشتنێکی پەرلەمان دەچوو بۆ لای مام جەلال و تەواوی لێدوانەکانی

دانیشتنەکەی بە مام جەلال دەگەیاند، دیسانەوە بە ناوی مام جەلالەوە ئاگاداری کردم کە پێویستە لە گفتوگۆ و وتووێژدا ئاگاداری دۆستەکانمان بم و لە پەرلەماندا هەستیان بریندار نەبێت. بە د. فوئادم ڕاگەیاند لەمەودوا ڕۆژانە لیستێکمان بۆ بێنن کە ڕۆژانە چۆن بڕۆین و چی بکەین و چۆن ڕەفتار بکەین، پێم وت دیارە ئێمە نوێنەری هەرێمی کوردستان و جەماوەر نیین، دەبێت چۆن بۆ حزب باش بوو، ئاوا ڕەفتار بکەین.

## سوێندخواردنی پەرلەمان

خولەکەی ئێمە ناوی پەرلەمان نەبوو، ناوی کۆمەڵەی نیشتمانی بوو (الجمعية الوطنية). سوێندخواردنی پەرلەمانتارانیش بە تاک تاک نەبوو، بەڵکوو سەرۆکی پەرلەمان سوێندەکەی دەخوێندەوە و ئەندامەکانیش بـەدوای ئـەودا بڕگە بڕگە و پەرەگراف پەرەگرافیان دەوتـەوە. هەر ئەندامپەرلەمانێک دەیتوانی بێدەنگ بێت و سوێندەکە نەڵێتەوە، من کە هەرگیز بڕوام بە بوونی عێراقێکی یەکگرتوو نەبووە و هەمیشە لە نووسینەکانم و لە باوەڕی خۆم و بیری خۆمدا وشەی عێراقم بە عێراقی عەرەبی ناو بردووە، بەڵام لەو سوێندخواردنەش ئەو سوێندەم نەخوارد و بێدەنگیم هەڵبژارد.

## دوا هەفتەی پەرلەمان

بەر لە تەواوبوونی ئەو خولەی ئێمە کە بە خولی نووسینی دەستوور ناسرابوو بە هەفتەیەک، د. فوئاد مەعسوم پێی ڕاگەیاندم کە مام جەلال لە ئەدای من و چەند هاوڕێیەکی تر قایل بووە، بۆیە بۆ خولی دووهەمی پەرلەمانی عێراق کە ٤ ساڵ دەخایەنێ، کاندیدم. وەڵامی دکتۆرم دایەوە کە لەگەڵ ڕێزی زۆر زۆرم بۆ مام جەلال و سوپاسی بێپایانم بۆ ئەو متمانەیەی بە منی بەخشیوە، بەڵام بە داوای لێبوردنەوە ئامادا نیم جارێکی تر بچمە پەرلەمانێکەوە کە ئازاد نەبم لە چۆنیەتیی داکۆکیکردن لە کێشەکانی گەلەکەم.

## جیاوازیی دوو کولتوور

به داوای لێبوردنی زۆرەوه له خوێنەر که ئەم بابەته لێرەدا دەنووسم که دەبووایه ئەم بابەته ڕێک بکەوتایەته دوای گەڕانەوەی یەکجاریم بۆ وڵات و پێش کارکردنم له پەرلەمان. پێشتر باسم کرد که چۆن و لەبەر چی وڵاتم جێ هێشت و ڕووم له وڵاتێک کرد که بۆ ئەو کاتەی منێکی چەکداری نەتەوەیەکی ژێردەسته و خاک دابەشکراو، منێکی ئاڵوودەی شاخ و چۆڵەوانی و چەک و سەنگەر و شەڕ و ژیانی بزنەکێوی هەر له تەمەنی لاویمەوه، منێکی دوور له شارستانیەت و شار و ژیانی مرۆڤانه و دوور له دایک و باوک و ناز و باوەشیان، منێکی دوور له هاوسەر و چێژی خۆشەویستیی هاوسەری و دوور له وتەی خۆش و قاقای خۆش و گریانی خۆش و فرمێسکی جوانی چاوی منداڵەکانم، منێک تا سەر ئێسقان ئاڵووده به وشەکانی (خەبات، تێکۆشان، نەتەوەپەروەری و نیشتمانپەروەری)، منێک دوور له پاک و خاوێنی و پۆشاکێکی بەدڵی خۆم، منێک بێئاگا له گۆڕانکارییەکانی جیهان له هەموو ڕووەکانیەوه به بارە فەلسەفەکەشیەوه جگه لەو هەواڵانەی که له دەنگی دەنگەوەرەکانەوه (ڕادیۆ) دەمبیست که بەردەوام له ڕۆژا به شانمەوه هەڵواسرابوو، به شەویشدا لەباتیی باوک و دایک و برا و خوشک و هاوسەر و منداڵەکانم له تەنیشتمەوه ڕاکشابوو، وەک فیشەکدانەکەم و تفەنگەکەم و مەتارەی ئاوەکەم و تاکه نانه ڕەقەکەی ناو پشتێنەکەم، منێکی دوور له ڕووناکیی بەرهەمەکەی ئەدیسۆن، تەلەڤزیۆن، خانوو، ژووری ڕازاوەی هاوسەرگیری و کتێبخانەیەکی ئارەزوو تێرکەر، منێکی دوور له هەموو تەکنەلۆجیایەکی سەردەم و ژیانێکی مرۆڤانه، لەناو چوار دیواری ژوورێکی ئاژەڵی به نایلۆن دەورەدراو یا لەناو خەیمەیەکی (٣×٤م)ی ژێر باوبۆرانی زستان و تۆپ و دەستڕێژیی گوللەبارانی ڕەبایەکانی دوژمنەوه، لەپڕ بکەومه وڵاتێکی به هەزاران کیلۆمەتر ڕێگا له وڵاتی منەوه دوور، به دەیان ساڵیش له شارستانیەت و ئاوەدانی و کولتوورەوه له من و له وڵاتی من دوور، دوور دوور له منەوه له ڕووەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ئابووری و کشتوکاڵی و پیشەسازی و کولتووری و ئایینییەوه، چوومه وڵاتێک هەر چی جیاوازیی نێر و مێ هەیه؛ نەبوو، جگه له جیاوازیی فسیۆلۆجی. وڵاتێک نەمدی کەس لەدواوه ئاوڕ له کەس بداتەوه،

نەمدی کەس لە کەس بپرسێت ڕەنگت بۆ وایە، بەرگت بۆ وایە، ستایلی سەر و قژت بۆ وایە، باوەڕ و ئایین و مەزهەبت بۆ وایە، هەڵسوکەوتت بۆ وایە، ژیانت بۆ فەقیری، بۆ دەوڵەمەندیت،ماڵەکەت، ناوماڵەکەت، گەڕەکەکەت، شارەکەت، لادێ کەت بۆ وایە. کەوتمە ناو کولتوورێکەوە تا سەر ئێسقان بۆ من نامۆ بوو. لە «خڕی ناوزەنگەوە بۆ بەرلینی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا»، بۆ وڵاتێکی سۆشیالیستی، وڵاتێکی دیموکراتی. لە شاخێکی چۆڵەوانییەوە بۆ گەورەترین شاری ئەڵمانیا و چەقی هەموو ئەوروپا. ئاووهەوای ئەو وڵاتە زۆر زۆر بە ئێمە نامۆ بوو. مانگی ٥ی ١٩٨٧، ئاسمانێکی هەوراوی و کەشێکی باراناوی و سارد کە هەر لە کاتژمێر پێنجی بەیانییەوە تا هەشتی ئێوارە ڕووناک، لە هاوینیشدا لە کاتژمێر چواری بەیانییەوە تا یانزەی شەو هەر ڕووناک بوو، لە زستاندا، بەتایبەت لە مانگەکانی ١١، ١٢ و ١دا ڕووناکی لە (٨)ی بەیانییەوە دەبێ تا کاتژمێر (٤)ی ئێوارە.

تێکەڵبوونمان بە دانیشتووانی شارەکە لەسەر شەقامەکان و ناو باخچە (پارکە) کانی ئەملا و ئەولای شەقامەکانەوە سەرسامی کردبووین، کە لەبەرکردنی جلوبەرگ هەر کەس بە ئارەزووی خۆی بێ گوێدانە فەنتازیەت و فەرمییەتی کارەکانیان، پیر و گەنج، ژن، پیاو، کور و کچ، هەریەکە پانتۆڵێکی جینز و کراسێک یا قەمسەڵەیەک لەبەریاندا، بێ گوێدانە تەمەن.

لە هەموو کۆڵان و گەڕەکێک و لەسەر زۆربەی شەقامەکان، باخچەیەک هەیە کە پێی دەڵێن «پارک»، لەناو ئەو باخچانەدا جۆراوجۆر بابەتی یاری هەیە بۆ منداڵان کە گەورەکانیش چێژ لەو ئامێرانە دەبینن. منێکی بێبەش لە هەموو خۆشییەکانی منالیم، وەک منالەکانم نەدیوبدییانە دەچووینە سەر ئامێرەکان و گەمەمان پێ دەکرد، ئەوانەی کە لە منداڵیی خۆم و منالەکانم لێی بێبەری بووین، قەرەبوومان بۆ کردەوە. نازانم خوێنەری بەڕێز بڕوام پێ دەکات کە زۆر جار پێش منالەکانم پەلاماری ئامێرەکانم دەدا بۆ یارییپێکردن. ئێمە خێزانێکی پێنج کەسی بووین کە لە شاخ بووین لە یەک چادری (٢٠ م٢)دا دەحەواینەوە و هەر پێنجمان لەناو چاڵێکی (١×٣م) کونە فرۆکەدا دەژیاین و جێشمان دەبووەوە. کە لە شاریش بووینایە، هەموومان لە دوو ژووری (١٢م٢) دەژیاین، کە وڵاتی خۆمان، خاکی خۆمان، زێدی خۆمان بوو. بەڵام لە وڵاتی

کە ئێمەی نامۆ بە ئاووهەوا و خاک و کولتوور و خەڵک و دانیشتووانەکەی، ئێمەی پەنابەری سیاسی و بێگانە بەو وڵاتە، هەر پاش گەیشتنمان و نیشتەجێبوونمان، براینە خانوویەک لە باڵەخانەیەکی چوار نهۆمی، کە بەپێی سەری خێزان، ژووری حەوانەوەیان بۆ دابین کردبووین، واتە سێ ژوور بۆ سێ کچەکان، ژوورێک بۆ من و شوکری، ژوورێک بۆ میوان و دانیشتن (هۆڵ) و چێشتخانە و گەرماو و دەستشۆرین.

ئای کە ڕێزی مرۆڤ لەو وڵاتە هەیە (ڕێک وەک لای خۆمان هههههه). دانیشتووانی ئەوێ بە هۆی سەرقاڵییان بە کاری ڕۆژانەی خۆیان و دابینکردنی بژێوییان، کاتیان نەبوو کات بەسەر بەرن لەگەڵ دراوسێ و دۆستەکانیان، تەنانەت لەناو خودی خێزانی خۆشیان کاتی چەلەحانێ و مشتومڕیان ئەوەندە نەبوو، سەرجەم ڕۆژانی هەفتە جگە لە ڕۆژانی پشوو، سەرقاڵی کارکردنی زۆر و بژێوی پەیاکردن بوون، ڕۆژانی پشووشیان لە لادێکان بە خڕبوونەوەی خێزانەکانی ماڵێک، باوک یا دایک و بەسەربردنی کات بە گۆشت برژاندن و خواردنەوە و دەمەتەقێی خۆیان دەبردە سەر، لە شارەکانیش بە دیسکۆ و گازینۆ و چێشتخانە و قاوەخانە دەبردە سەر. ڕۆژانی یەکشەممە کە پێی دەوترێت «ڕۆژی بێدەنگی»، تاکوتەرایەکی کەم نەبێت، کەس بە کۆڵان و شەقامەکانەوە نابین یت.

ئێمە لە سەرەتاوە کە ئەو جۆرە ژیانەمان بینی، لامان سەیر بوو، پێمان وا بوو کە ئەوان لە قۆناغ و سەردەمێکدا دەژین کە پەیوەندیی خێزانی و کەسایەتی و خزمایەتی و دۆستایەتی و کۆمەڵایەتی و سۆز و خۆشەویستی بەسەر چووە، هەر چی پێی بڵێن هەستی خۆشەویستی و بەزەیی و خەمخۆری بۆ یەکتری، تەنانەت لەنێوان ئەندامانی یەک خێزانیش نەماوە. بەڵام کاتێ خۆمان کەوتینە ئەو بارودۆخەوە و مەیدانە پراکتیکییەکە و دەستمان بە کار کردن کرد بۆ پەیداکردنی بژێویی خۆمان و منداڵەکان کەوتنە مەیدانی خوێندنەوە، ئەوسا بۆمان دەرکەوت کە ژیان لەو وڵاتە چەند سەخت و هەر ڕاکەڕاکەیە.

ماوەی دوو ساڵمان بە تەمەڵی و سواڵی سۆسیال و نانی خوساو خواردن بردە سەر، هەر خەریکی گەڕان و زمان فێربوون و کاری سیاسی بووم بۆ یەکێتی، هۆکارەکەشی خودی یاسای پەنابەریی ئەوسا بوو کە تاکوو دان بە پەنابەرییە

سیاسییەکەت یا مرۆڤایەتییەکەتدا نەنرێ بە شێوەی یاسایی، بۆت نەبوو هیچ کارێک بکەیت، مەگەر بە ڕەش و کاری گەندەڵی.

ئێمە لەو ماوەیەی کە لە ئەڵمانیا ژیاوین، بە ڕەنجی شانی خۆمان ژیاوین، هەرگیز چاوەڕێی هاوکاریی سۆسیالمان نەکردووە. لە کارگەی دارتاشی، شووشەبڕین، شیرینی، کڤیلە، نانەواخانە، پاککردنەوەی نەخۆشخانە، قوتابخانە ، ڤێللا و باڵەخانە، دیسکۆ، گەورەترین مۆزەخانەی ناسراوی ئەڵمان بە «Messe" ئیشمان کردووە، تەنانەت ئاودەسەکانیشمان پاک کردۆتەوە، هەرگیز ئەو کارانەم لا شەرم نەبووە و نەنگی نەبووە، بەڵکوو ئەوەم لا شەرم بوو کە دەست بۆ حکومەتی ئەڵمان پان بکەمەوە، سواڵی سۆسیال وەربگرم، یان سواڵ لە حزبەکەم بکەم. بەپێچەوانەوە لە بەری ڕەنجی شانی خۆمان لە سەردەمی ئەنفالەکاندا هاوکاریی پێشمەرگەکانی بارەگای مەرزی "بلەکی" و هاوڕێکانی ناو ئێرانیشمان دەکرد بەپێی توانا بۆ دەرچوونیان بۆ وڵاتە ئەورووپاییەکان، هەرگیز چاوم لە پارە کۆکردنەوە و خۆدەوڵەمەنکردن نەبووە لەسەر کاری گەندەڵی و ڕەنجی مناڵەکانم،

بەپێچەوانەوە هەموو خواستێکی من جگە لە خەمخۆری بۆ وڵاتەکەم، خەمخۆری بووە بۆ مناڵەکانم کە بخوێنن نەک کار بکەن و پارەکەیان بخەنە دەستی منەوە. بەشانازییەوە دەڵێم کە ئەو کاتە واتە لە ساڵانی نەوەدەکاندا، بەدەگمەن خێزانی کوردی باشوور هەبوون کە مندالەکانیان بتوانن دانشگە تەواو بکەن، مناڵەکانی من توانییان خوێندن تەواو بکەن. زۆر مانگ بووە کە لە شەو و ڕۆژێکدا کەمتر لە شەش کاتژمێر پشووم داوە. لەو وڵاتە فێر بووم کە ناخۆشترین پرسیار لای ئەوان ئەوەیە کە پرسیاری تەمەن و مووچە و داهاتی ڕۆژانە یان مانگانە بکەیت. لەو وڵاتە ئەوەی کە زۆر سەرنجڕاکێش بوو بۆ من، هەرگیز دەوڵەت و وشەی «Hura" واتە "بێڕەوشت» یا «قەحبە» بۆ ئەو ژنانە بەکار ناهێنرێت کە بەئاشکرا و بە ئاگاداری، واتە بە یاسا و بە دانی باج، کاری لەشفرۆشی دەکەن، بەڵکوو ئەوە بە جۆرێک لە کار دادەنرێت بۆ ژیان، پێیان وایە کە هیچ جاوازییەک نییە لە فرۆشتنی هێزی بازوو و هێزی مێشک بەرامبەر بە داهاتێک بۆ ژیان، لەگەڵ فرۆشتنی لەش بۆ هەمان مەبەست.

لای ئەوان بەو ژنانە دەوترێت «قەحبە»، کە خاوەنی هاوسەرن و لەپشتی هاوسەرەکەیانەوە پەیوەندیی سێکسی لەگەڵ کەسێکی تردا دەبەستن.

دیاردەیەکی تری کولتووری ئەوان، دایک و باوک بە هەموو مانایەک خۆیان بە بەرپرسیار دەزانن بەرامبەر منداڵەکانیان لە دابینکردنی هەموو پێویستییەکانیان تا تەمەنی (١٨) ساڵ[٥٤]، دوای ئەوە منداڵەکانیان ئازادن لە هەڵبژاردنی ژیانی خۆیان، هەر بۆیەش زۆر بەدەگمەن دەبینرێت کە خێزانێکی ئەڵمان منداڵەکانیان گەیشتبنە ئەو تەمەنە و لەگەڵ باوک و دایکیان پێکەوە بن. ئەگەر کوڕ و ئەگەر کچ، خۆیان دوای هەژدە ساڵی ئازادن لە هەڵبژاردنی جۆری ژیانی خۆیان و هاوسەرگیرییان. ژیانی هاوسەرگیری لەو وڵاتە بەشی هەرە زۆریان دوای پتر لە چەندین ساڵ هاوڕێیەتیی کوڕ و کچ و ژیان پێکەوە یا بەجیا، ئەوسا گەر لە هەموو ڕوویەکەوە یان لە زۆربەی خەسڵەتەکانەوە لێک نزیک بوون، هاوسەرگیری دەکەن.

پاش ماوەیەک لە ئەڵمانیا لەوە گەیشتم کە خوێندنی باڵا، واتە بەکالۆریۆس و دبلۆم و ماستەر و دکتۆرا بە ڕێژەیەکی یەجگار زۆر بۆ کوڕانی سەرمایەدارەکانە، واتە ئەو پلە باڵایانە لە هەموو بوارەکانی خوێندندا لەسەر سەرمایەدار تاپۆ کراوە. هەژارەکان و مامناوەندەکان دەستی کارن و خاوەن پیشەن، کە هەر لە پاش ناوەندی و دواناوەندییەوە دەچنە بەر فێربوونی پیشەیەک و ئیتر ئەو پیشەوەرانەن کە دەبنە ماکی پێشکەوتن و بنیاتنان. بۆیە زۆربەی بیرمەندەکان و داهێنەرە هزری و زانستییەکان لە هەموو بوارەکان سەرمایەدارانن، کە بواری خوێندن و فێربوون و بەردەوامبوونیان پتر بۆ ڕەخساوە. هەر بۆیەش هەموو شادەمارە هەستیارەکانی ئابووری، پیشەسازی، سیاسی، بەڕێوەبەرایەتی، حوکمڕانی، دبلۆماسی، یاسایی، تەندروستی، بەدەست سەرمایەدارەکانەوەیە. لای ئێمە ئەوکات بەکەمی و بەدەگمەن مەگەر لە شوێنە دوورەدەستەکاندا لە قوتابخانە کوڕ و کچ پێکەوە بووبن، بەڵام لەم وڵاتە هەر لە باخچەی ساوایانەوە تا دانشگا، لە هەموو شوێنێک کور و کچ پێکەوەن و هەر لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە کوڕ و کچ وانەی بیولوگییان پێ دەڵێن و شارەزایان دەکەن لە بارەی پێکهاتەی کۆئەندامی نێر و مێ.

[٥٤] تێبینی: لە کاتی نووسینی ئەم بەشە کە ساڵی ٢٠١٩یە، ئەو (١٨) ساڵە بۆتە (١٦) ساڵ.

کولتووری ئەو وڵاتە، هەر چی توندوتیژیی ئایینی و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی و جێندەری و ڕەگەزی هەیە؛ بوونی نییە، دین بەتەواوی لە دەسەڵات و دەوڵەت جیایە. کەنیسە زۆرە و بوونی هەیە لە هەموو شوێنێک، بەڵام هەرگیز لە هیچ کاتێکدا نەمدیوە قەرەباڵغی و ڕاکەڕاکەی خەڵکی بۆ کەنیسە هەبێت. ڕۆژێک لە ڕۆژان لە هیچ ئەڵمانێکم نەبیست بە ئیسلامێک بڵێت لادەر لە دین یان کافر (گاور)، بەپێچەوانەی ئیسلامەوە کە بە هەموو مەسیحییەک دەڵێن گاور، تەنانەت ئەو شوێنەش کە زۆربەی مەسیحییەکانی تیا دەژین، پێی دەڵێن «گەڕەکی گاوران». لێدان لە منداڵ لە باخچەی ساوایان، یان قوتابخانە، یان لەلایەن دایک و باوکیشەوە، هێندە قەدەغە کراوە کە سزای یاسایی لەسەرە، بە پێچەوانەی لای خۆمان کە لەسەر فەلسەفەی «حوجرە»، ڕێککەوتن لەنێوان باوک و مامۆستا دەکرێت کە «گۆشتی منداڵەکە بۆ مامۆستاکە و ئێسقانەکەشی بۆ باوکی»، لە پێناو خوێندندا. ئەڵمان بۆنەیان زۆر زۆرە، هەندێکیان هەرێمی و ناوچەیین و هەندێکیشیان لەسەر ئاستی ئایینی و نەتەوەیین، بەڵام بۆ هەموو بۆنەکانیان دەیکەن بە ئاهەنگ و ڕازاندنەوەی خۆیان بە جلوبەرگی تایبەت بە بۆنەکە و بە ڕەسەنایەتیی جەرمانی، شەقام و شوێنی تایبەت دیاری دەکەن بۆ گێڕانی ئاهەنگەکانیان، بێ قڕە و ئاژاوە و تەقوتۆق.

یەک لە بۆنە زۆر پڕ بایەخەکان، تایبەتە بە نەتەوە و کولتوورە جیاجیاکان کە لە ئەڵمان دەژین. لەو بۆنەیەدا لە یەکێک لە مەیدانە سەرەکییەکانی هەر شارێک، بۆ ماوەی سێ بۆ چوار ڕۆژ، هەر نەتەوەیەک چادرێک بۆ خۆی بە ڕەزامەندیی شارەوانی دادەنێت و خواردن و جلوبەرگ و شتە تایبەتەکان بە نەتەوەی خۆی پیشانی بینەران دەدات، وەک هەڵپەڕکێ و شایی و گۆرانی و مۆزیک و جلوبەرگی ڕەسەنی خۆیان یا خۆراکی خۆیان. ئەوەیە تەقەللای نزیکخستنەوەی کولتوورە جیاوازەکان!

ڕاستە لە ئەڵمانیش کەسانی ڕەگەزپەرست و ڕاسیزم هەیە، بەڵام پتر لە سەددا ٩٠٪ی ئەڵمان دژیانن و بە لایەنگرانی نازیزم و فاشیزمیان دەزانن. گەلی ئەڵمان بەتایبەت بەتەمەنەکانیان کە سەردەمی جەنگی جیهانییان دیوە، لەبەر ئەوەی هێندە چەرمەسەری و دەردەسەری و پاشماوەکانی شەڕیان لە کاولکاری و هەژاری و بێدەرامەتی و کوشتار دیوە، تا سەر ئێسقان دژی شەڕن و هەرگیز خوازیاری

فراوانخوازی و ڕەگەزپەرستی نین، بەڵام شانازییش بە نەتەوە و ڕەگەزی خۆیانەوە دەکەن. ئەڵمان جگە لەوەی وڵاتێکی زۆر کۆن و پڕ لە شوێنەواری گرنگە، دەوڵەتێکیشە زۆر گرنگییان بە شوێنەوارە مێژووییەکانی خۆیان و ناودارەکانیان داوە، شارە کۆنەکان، شوورە و پرد و قەڵا و کەسە مێژووییەکان لە ڕووی بەڕێوەبەرایەتی و زانستی و مێژوییەوە، کە هەموو شەقام و شوێنە گشتییەکانیان بە پەیکەر و نووسین لەسەر برۆنز و دیوار و دارەکان رازاندۆتەوە.

ئەڵمان پێش یەکێتیی ئەڵمانی و یەکگرتنەوەی هەموو میرایەتییە جیاجیاکان و کایزەرییەکان و پاشایەتییەکان، هەر ناوچەیە و ناو و نازناوی خۆیان هەبووە کە تا ئێستاش هەر ماون و بە ناوی هەرێمە جیاجیاکانەوە ناو دەبرێن کە پێک هاتوون لە شانزە هەرێم و هەر هەرێمەش سنووری تایبەتی خۆیان هەیە و تەنانەت زاراوە و ئاخافتنی جیاجیاشیان هەیە و بە هەمووشیان یەک ناوەندی حوکمڕانییان هەیە. ئەڵمان لە کاتی خۆیدا لە چەندین میرنشینی و کایزەرنشینی و شانشینی پێک هاتبوو، بەڵام دوای یەکگرتنەوەیان کە ناوی لێ نرا «ئەڵمانیای یەکگرتوو»، هەموو هەرێمەکان کار بە دەستووری ئەڵمانیای یەکگرتوو دەکەن، جگە لە هەرێمی بایرن (باڤاریا) کە هەرێمێکی دەستوورییە، لەبەر ئەوە جۆری حوکمڕانی لە کۆندا پاشایەتیی دەستووری بووە.

ئەوەی من بەدیم کردووە لە ئەڵمان ، ئەڵمانەکان زۆر کەم بەشداریی سیاسەت و حزبایەتی دەکەن، وەک خۆیان دەڵێن «لێ گەڕێ سیاسەت بۆ سیاسییەکان». ڕێژەیەکی کەم سەروەر خۆیان بۆ سیاسەت تەرخان کردووە، بەتایبەت توێژی چینی سەرمایەداران و بەشێکی کەمیش لە توێژی خوێندەواران. بەڵام بەگشتی هەموو دانیشتووانی ئەڵمان زۆر بەتەنگ وڵاتەکەیان و ئایندەی وڵاتەکەیانەوەن، لە کاتی دەنگداندا بێ ئەوەی پەیوەندیی تا سەر ئێسقان بە حزبێکەوە هەبێت، دەنگ بە بەرنامەی ئەو حزبە دەدات کە بەدیهاتنی خواستەکانی خۆی تیا دەبینێتەوە، بێ گوێدانە «أنتماء»ی حزبی. چوار خووی سەیروسەمەرەی لای خۆمان کە زۆرترین کەس پێی ئالوودەن، لە ئەڵمانیا بەدیم نەکردووە ئەڵمانەکان ئالوودە بن پێی:

یەکەم: تەزبیح بادان و یاریکردن پێی، کە بە بڕوای من ئەم خووە ئێمەی کورد لە تورکەوە بۆمان ماوەتەوە و هۆکەشی بێئیشی و دەستبەتاڵییە.

دووهەم: ئاوڕدانەوە بۆ دواوە و سەیرکردن لە پشتەوە.

سێهەم: دەست خستنە گیرفان لە کاتی ڕۆیشتن یا وەستاندا.

چوارەم: توانجگرتنە ڕیبواران، بەتایبەت ژنان.

## گرووپی پەیڕەوانی پەیڕەوی ناوخۆ و ئەنجوومەنی ناوەندی

لەناو یەکێتیدا هەر پاش تێپەڕبوونی ماوەیەک بەسەر کۆنگرەی یەک و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەلە و شۆڕشگێڕان، بیرۆکەیەک هاتە ئاراوە بریتی بوو لە بیرۆکەی پێکهێنانی کۆمەڵێک یا ئەنجوومەنێک کە هەم ڕۆڵی چاودێر بگێڕێ بەسەر دامودەزگاکانی یەکێتییەوە و هەم بەشدار بێت لە داڕشتنی سیاسەتە گشتییەکانی یە کێتی.

ئەم بیرۆکەیە لە سەرەتاوە هیی د. فوئاد مەعسوم و پەسەندکراوی لای مام جەلال بوو. پاش تەواوبوونی خولی کۆمەڵەی نیشتمانیی عێراقی، گەڕامەوە سلێمانی. ماوەی چەند مانگێک چاوەڕێم کرد، داخۆ یەکێتی لە ئەندامپەرلەمانە بێکارەکانی دەپرسێتەوە، بەڵام ئەوانەی کە هیچ جۆرە پاڕانەوە و دەستماچکردنێکیان نەکرد بۆ دووبارە چوونەوە بۆ پەرلەمان، هەموویان بێ کار مانەوە و یەکێتی لێی نەپرسینەوە، جگە لە چەند دانەیەکی کەم کە بە زۆرەملێی خۆیان، خۆیان خزاندە نێو ئۆرگانەکانی یەکێتییەوە. من لەو کاتەدا چاوەڕێ بووم سەرکردایەتی کارێکم پێ بسپێرێ، بەڵام بێهیوا بووم. من و چەند ئەندامێکی کۆنی سەرکردایەتی و کادری پێشکەوتووی یەکێتی، گرووپێکمان پێک هێنا بە ناوی «پەیڕەوانی پەیڕەوی ناوخۆ» و ئەو گرووپە دانیشتن و کۆبوونەوە و مشتومڕی زۆری لەسەر ئەو بابەتە کرد، تا سەرئەنجام بە داڕشتنی بەرنامەیەکی کار گەیشت. پڕۆژەی بەرنامەکە برایە لای مام جەلال، مام جەلال پاش هەندێ پێشنیار و ئاڵوگۆڕکردن لە هەندێ برگە و بابەتیدا، بیرۆکەکە و بەرنامەکەی لا پەسەند بوو. بەندە، یەکێک بووم لە ئەندامانی ئەو گرووپە یا ئەو لیژنەیە و بەشدارییەکی چالاکانەم کرد لە داڕشتنی پەیڕەوی ناوخۆی ئۆرگانەکە،

واتە دارشتنی برگە و مادەکانی بەرنامەی کاری ئەنجوومەنی ناوەند. ئەو بەرنامەیە بە ماندووبوونی هەموو ئەندامانی گرووپەکە و بەتایبەت جەبار یاوەر و بەندە بە شێوەی نامیلکەیەک هاتە چاپکردن و بلاوکردنەوەی بەسەر ئۆرگانەکانی یەکێتیدا بە پشتیوانیکردنی مام جەلال. لەدوای پلینۆم، مام جەلال بە راوێژ لەگەڵ م. س بریاری دا بە دامەزراندنی ئەو ئەنجوومەنە وەک ئەزموونێکی نوێ لە ژیانی سیاسیی حزبدا لە باشووری کوردستان.

## پرۆژەی کاری لایەنگرانی پەیرەوکردنی پەیرەوی ناوخۆ و پێکهێنانی «ئەنجومەنی ناوەندی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان» ٢٠٠٦/٦/١

### پێشەکی

ئێمەی هەڤاڵانی خەباتی مەیدانە جیاجیاکانی مێژووی پر سەروەریی شار و شاخی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، بروای پتەو و نەگۆرمان بەوە هەیە کە مێژوو و ژیانی رابردوومان بۆتە بەشێکی مێژووی یەکێتی، و مێژووی ئایندەشمان هەر بەستراوەتەوە بە ئایندەی مێژووی یەکێتی و لای هەمووشمان روون و ئاشکرایە کە یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان وەک پێویستییەکی مێژوویی لەدوای کارەساتی نشوستی شۆرشی کورد لە ساڵی ١٩٧٥ لەدایک بوو و جگە لە گرنگی قۆناغی لەدایکبوونەکەی، نوێکارییەکی زۆر گرنگی لە شێوازی پێکهاتە سیاسی و فیکری و جۆری کارکردن و مامەلەکردن لەگەڵ رووداوەکان و بێسنووری لە خۆراگرتن و فرە مینبەری لە یەک رێکخراوی سیاسیی خاوەن یەک ئامانجدا لەگەڵ ئەو لەدایکبوونە؛ لەدایک بووە، هەر ئەو شێوازە نوێکارییە بۆتە هۆکاری خۆراگریی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەبەردەم ئاستەنگەکاندا، هەتاکوو گەیشتن بەم رۆژە.

ئێستاکەش و لەم قۆناغە گرنگ و ناسکەدا و پاش ئەو هەموو ئاڵوگۆرەی بەسەر هەلومەرجی کوردستان و عێراق بەتایبەت و ناوچەکە و جیهان بەگشتی هاتووە، یەکێتیی نیشتمانی کوردستان پێویستی بە نوێسازی هەیە لە گشت بوارەکاندا بە مەبەستی خۆگونجاندن لەگەڵ ئەم سەردەم و هەلومەرجە تازەدا کە ئامانجی

سەرەکیی خەباتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوون و هەر ئەم پێویستییانە بوونە هۆکار و زادەی ئەو هەموو داواکارییە جیاجیایانەی زۆربەی کادرانی بوارەکانی کاری دامودەزگا «حزبی و حکوومی و پێشمەرگەیی»ی یەکێتیی نیشتمانی کوردستانە بۆ چاکسازی و نوێسازی و خۆگونجاندنە لەگەڵ ئەم هەلومەرجە تازەیەدا، ئەم دیاردەیەش دیاردەیەکی زۆر ئاساییە و یەکێکە لە خەسڵەتە تایبەتییەکانی لە بازنەی ئەو ڕوونکردنەوەی سەرەوەدا وەکوو هەڤاڵانی یەکێتی و بە مەبەستی جووڵاندن و خرۆشاندنی خەسڵەتە نەگۆڕەکانی ڕێبازی نوێخوازی و نوێسازیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. لە مانگی (شوباتی ٢٠٠٦) پرۆژەیەکمان پێشکەش بە هەڤاڵانی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان کرد، لە بەڕێز هەڤاڵ سکرتێری گشتییەوە هەتاکوو هەڤاڵانی تری گشت ئۆرگانەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە ناومان نابوو «پرۆژەی کاری لایەنگرانی پەیڕەوکردنی پەیڕەوی ناوخۆ و پێکهێنانی ئەنجوومەنی ناوەندی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان» و لەو پرۆژە سەرەتاییەدا بەڵێنمان دا کە هەوڵ دەدەین ئەو پرۆژەیە دەوڵەمەند بکەین بە دیاریکردنی میکانیزمی پرۆسەی چاکسازی و نوێسازی و پێشنیازی هەندێ ئاڵوگۆڕ بەسەر پەیڕەو و پرۆگرامی یەکێتی.

ئێستاکە و لەپاش چەند دانیشتن و گفتوگۆیەک لەگەڵ هەڤاڵانی خاوەن بیرۆکە و پرۆژە و هەڤاڵانی مەکتەبی سیاسیی بەڕێز و لە پاشاندا لەگەڵ بەڕێز هەڤاڵ سکرتێری گشتی لە بارەی هەمان مەبەست و پاش کەڵکوەرگرتن لە هەندێ ڕا و پێشنیاز و ئامۆژگاری، ئەم پرۆژەیە بە شێوەی گشتی پێشکەش بە گشت هەڤاڵانی یەکێتی دەکەین لە گشت ئاستی لێپرسراوێتی و بواری کاردا، بۆ ئەوەی بەوردی بیخوێننەوە و ئەگەر سەرنجیان هەیە، دەوڵەمەند بکرێت بە ڕا و پێشنیازیان و لە پاشاندا کە متمانەی پێ درا، هەر هەڤاڵە لە سنوور و بوار و جێگای کاری خۆیدا بەوپەڕی دڵسۆزییەوە کار لە پێناوی جێبەجێکردنی ناوەڕۆکەکەی بکات.

### ئەنجوومەنی ناوەندی

لەدوای پلێنۆم و لەسەر پێشنیاری مام جەلال، بڕیار درا کە پێش بەستنی کۆنگرەی سێهەم، وەک ئەزموونێکی نوێ ئەنجوومەنێکی ناوەندی دابنرێت کە ژمارەیان لە ٨٠

بۆ ١٠١ ئەندام بێت و ئەو مەرجانەی خوارەوەیان تێدا بێت:

١. تەمەنی سیاسی لەناو یەکێتیدا گونجاو بێت.

٢. زیاتر لە ئەندام و کادرە پێشینەکانی سەرکردایەتی یا دەزگا باڵاکانی یەکێتی بن.

٣. بەپێی ناوچەکان، لە هەموو شارەکان و ناوچەکانی سۆران و بادینانی تێدا بێت.

٤. بەپێی ڕێژەکە، ٢٠٪ ی ئەندامان؛ ژن بن.

٥. کەسانێک بن کە لە ئاستی چاودێریکردن و بەدواداچوونی کارەکانی سەرکردایەتیدا بن.

٦. بەرپرسی یەکەم و ڕاستەوخۆی ئەنجوومەنەکەش، سکرتێری گشتی؛ مام جەلال دەبێت.

بەو جۆرە لە ڕۆژی ٢٠٠٩/١٢/٢٦، ناوی ئەندامانی ئەنجوومەن بە لیستێک ڕاگەیەنرا، یەکەم کۆبوونەوەی خۆی لە ٢٠٠٩/١٢/٢٧ کرد، سەرەتا دەستەی سکرتاریەتی ئەنجوومەن هەڵبژێردرا. لەو بەڕێزانە:

سکرتێر/سامان گەرمیانی

جێگری یەکەم/ئاڵا تاڵەبانی

جێگری دووەم/حاکم سابیر

بڕیاردەر/د. جوان ئیحسان

پاشان لە کۆبوونەوەی دووهەمی ئەنجوومەنی ناوەندda، بڕیار درا کە لیژنەیەک هەڵبژێردرێ بۆ نووسینەوەی بەرنامەی کاری ئەنجوومەن، بەندە یەکێک بووم لەو لیژنەیە. پاش تەواوبوونی ڕەشنوسی پڕۆژەکە، لە کۆبوونەوەی گشتیی ئەنجوومەنی ناوەندda پەسەند کرا. لەو پڕۆژەیەدا، ئەنجوومەنی ناوەند دابەش کران بەسەر چەند کۆمسیۆندا، هەر کۆمسیۆنە لە ٥-٧ ئەندام و پتر پێک هاتبوون، هەر کۆمسیۆنێکیش لەناو خۆیاندا بە دەنگدانی نهێنی لێپرسراو و جێگر و بڕیاردەرێکی هەڵدەبژارد. یەکێک لە کۆمسیۆنەکان، کۆمسیۆنی سکاڵا بوو. کۆمسیۆنی سکاڵا، بەپێی بەرنامەی

کاری ئەنجوومەن پێک هاتبوون لە ٦ ئەندام کە دەبووایە لانی کەم یەکیان یاسایی بووایە و یەک لە ئەندامەکانیشی ژن بووایە. ئەرکی ئەم کۆمسیۆنە، لێکۆڵینەوە و بەئەنجامگەیاندنی ئەو سکاڵایانە بوو کە لەلایەن ئەندامانی یەکێتی، چ لەناو هێزی پێشمەرگە و چ لەناو ریزەکانی رێکخستنەوە بە کۆمسیۆن دەگەیشتن. کۆمسیۆنی سکاڵا پێک هاتبوون لە: (بەندە، خوشکە ئەمیرە، یاساناس تەلار، پەخشان حەفید، د. شوان، د. وەلید). بەندە لێپرسراوی کۆمسیۆنەکە بووم. ئەندامانی ئەم کۆمسیۆنە هەموویان چالاک بوون، بەڵام خوشکە ئەمیرە بە هۆی ئەوەی بڕیاردەری کۆمسیۆن بوو، ئەرکی قورس کەوتبووە سەر ئەو. لە ماوەی دەستبەکاربوونی کۆمسیۆنەوە تا بەستنی کۆنگرەی (٣)، (٣٣٦) سکاڵای ئەندامان و کادر و پێشمەرگە هاتە کۆمسیۆن کە کۆمسیۆن توانیی بەشانازییەوە (٣٣٢) سکاڵایان بەئەنجام بگەیەنێت. ئەنجوومەنی ناوەند لەو ماوەی کارکردنەیدا، توانیی جێگەی خۆی بکاتەوە و ببێتە «امری واقع» لەناو یەکێتیدا بە پشتیوانیی مام جەلال. ئەندامەکانی ئەو خولەی ئەنجوومەن، زۆربەیان لە ئەندامانی سەرکردایەتیی پێشووی یەکێتی و شۆڕشگێران و کۆمەڵە بوون، کەسانی شارەزا و بەئەزموون لە سیاسەت و بەرنامەی یەکێتی بوون، یان لە کادرە هەرە پێشکەوتووەکان بوون. ئەندامانی ئەو ئەنجوومەنە لە ڕوی هەستکردن بە بەرپرسیاریەتییەوە کاریان دەکرد، هیچ کامیان چاوڕوانی مووچە و ئۆتۆمبێل و پاسەوان نەبوون، هەر کەسەیان بەو مووچانەوە کاریان دەکرد کە هەیانبوو پێش هاتنیان بۆ ئەنجوومەن، جا چ لە ئۆرگانەکانەوە هاتبن یا خانەنشینکراو بووبن. هەمووشیان کەسانی رابردوو دیار و تێکۆشەر و ماندووی ناو شۆڕشی نوێ و یەکێتی بوون و بە لێوەشاوەیی خۆیان گەیشتبوونە ئەو دەزگایە و جێگەی متمانەی سەرکردایەتی و م. س و مام جەلال بوون، بۆیەش هەم لە لایەکەوە ڕێزیان لێ دەگیرا و گوێش بۆ ڕاوبۆچوونەکانیان شل دەکرا، هەم خۆیشیان لە ئاستی چاودێریکردنی ئۆرگانەکانی یەکێتیدا بوون. بە سەرۆکایەتیی مام جەلال؛ سکرتێری گشتیی «ی. ن. ک»، ڕۆژی ١٢/٢٦ کۆمیتەی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کۆ بووەوە، لەو کۆبوونەوەیەدا کە لە بارەگای مەکتەبی سیاسیی «ی. ن. ک» لە سلێمانی بەڕێوە چوو، کۆمیتە باسی لە چەند مەسەلەیەکی هەستیار و گرنگ کرد و چەند

بڕیارێکی لە بارەی ئەو ڕاسپاردنانەوە دەرکرد کە پێشتر دەرچووبوون، هەروەها تێیدا ناوی ئەندامانی سەرەکی و یەدەگەکانی ئەنجوومەنی ناوەند پەسەند کرا.

## ناوی ئەندامەکان:

جەمال حەکیم، مامۆستا عەبدوڵڵا عومەر، بەکری حاجی سەفەر، شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵە، دارای شێخ جەلالی حەفید، حەمەی فەرەج کاکەسوور، ئاوات عەبدولغەفوور، شێخ محەممەدی سەرگەڵوو، کافیە سلێمان، د. جوان ئیحسان فەوزی، ڕووناکی شێخ جەناب، پەخشانی شێخ جەلال، کەلسوم کەریم، تەلار عەبدوڵڵا، ئەمیرە محەممەد، ئارامی شەهید شەوکەت، سۆرانی شەهید جەمال، سۆرانی شەهید شەهاب، جەمیل هەورامی، وریا سەعاتچی، نەوشیروان فوئاد مەستی، فەلاحی حەمەبۆر، هاوڕێ سوارە، مامۆستا شاهۆ، شوان موغانی، نوخشە فەتاح، ئیبراهیم جەلال، بێگەرد دڵشاد تاڵەبانی، مامەند ڕەسوول، کارزان موحسین، عەبدوڵڵا بۆر، مەلا ئاری، فارس محەممەد سادق، عەلی حەوێز، عەلی حەمە سالح، چەتۆ حەوێزی، حاجی مەمۆ، فارووق جەمیل، مەلا قادر محەممەد ئەحمەد، هالە سوهێل، ئەردەڵان محەممەد، هەژار کوێستانی، حاکم سابیر ئیسماعیل، د. سەباح ڕەشید، ئارێز عەبدوڵڵا، زرار جۆلا، فوئاد چەلەبی، فەرهاد کاوانی، جەمیل عیسا، مام غەفوور، هیوا حەمید، مامۆستا سەیفەددین، عەلی بچکۆل، ئاڵا تاڵەبانی، پۆلای شەهید سیروان، سەرکەوت حەمە غەفوور، سیروانی کوێخا نەجم، مامۆستا ئیکرام، مەلا شاخی، ڕەنجەی موهەندیس، ڕەمەزان کەرکووکی، شەریف کەچەڵ، دڵدار ئامێدی، هەڤاڵ بابە شێخ، مستەفا خوخی، سیار بامەڕنی، حسێن جەنبەڵی، دارا ئاکرێیی، حەیدەر قاسم شەشۆ، عادل ناسر، شێخ محەممەد شاکەلی، شیروان شێروەندی، تابان عەبدوڵڵا، عەدنانی حەمەی مینا، سامان گەرمیانی، کامەران باجەلان، میقداد بەهادین، باوە حەمید باوە ڕەشید، عەبدولڕەزاق عەزیز میرزا فەیلی، د. جنان قاسم.

### ئەندامە یەدەگەکان (أحتیاط):

ئیلهام سەبری، خوناو عوسمان، تایەر گومەشینی، نیاز دەرگەڵەیی، عەبدوڵلا سیاسی، ئەحمەد زرار، بێستوون سابوراوایی، فەرەیدوون دارتاش، سدقی ئیسماعیل، بێستوون عومەر.

### کۆنگرەی دووی «ی. ن. ک»

**٢٠٠١/٢/٥-١/٣٠**

لە ڕاستیدا ئەم کۆنگرەیە ناوی کۆنگرەی لێ نرا، دەنا هیچ مەرجێکی کۆنگرەی حزبێکی گەورەی وەک یەکێتیی تێدا نەبوو.

ئەم کۆنگرەیە تەنیا کۆبوونەوەیەکی فراوانی حزبی بوو، بۆ بەلاداخستنی ناکۆکییەکانی ناو ماڵی یەکێتی و هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی نوێ لە مێژووی خەباتی یەکێتیدا. ئەندامانی بەشداربووانی کۆنگرە زۆریان لە حیمایە و پاسەوانی سەرانی ناو سەرکردایەتی بوون، ژمارەیەکی زۆر کەمیان بە شێوەی حزبی و پرانسیپی کۆنگرە لە ئۆرگانەکانی خوارەوە و بە کۆنفرانسی ئۆرگانی و بە دڵگرانی ئەندامان؛ مافی بەشداریی کۆنگرەیان پێ درابوو. هەر لەدوای ڕاپەڕین و گرتنی هەموو دەزگا و فەرمانگە سیخوڕییەکانی ڕژێم و دەستبەسەرداگرتنی هەموو نامە و دۆکیۆمێنت و فایلەکانی ناو ئاسایش و هەواڵگری، کۆمەڵێک نامە و دۆکیۆمێنت کەوتنە دەست یەکێتی و بە تەقەللای نەوشیروان مستەفاش کۆ کرانەوە و پارێزران، تا لەدوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام بە سەرپەرشتیی شۆڕش حاجی نێردران بۆ ئەمەریکا بۆ لێکۆڵینەوە و بە دیکۆمێنتکردنی. لەناو هەندێ لەو نامە و دۆکیۆمێنتانە، ناوی چەندین ئەندامی حزبەکانی تێدا هاتبوو کە هەندێکیان بریتی بوون لە هەڵسەنگاندنی حزبی بەعس بۆ ئەو ئەندامانە، لە ڕووی فیکر و ڕادەی دڵسۆزی بۆ حزبەکەیان و ئارەزووەکانیان و بە چی دەگیرێن، بۆ نموونە؛ بە پارە یان بە سێکس و ئاستی وشیارییان و ڕابردووی ژیانیان و باری کەسایەتییان و... هتد.

وە هەندێ لە نامە و بەڵگەکانیش بریتی بوون لە پەیوەندیی ژێربەژێری ئەندامە پێشکەوتوو و کادرە سیاسی و سەربازی و سەرکردایەتییەکانی

حزبەکان بەگشتی، بە دامودەزگا جاسووسی و سیخوڕییەکانی بەعسەوە. لەناو یەکێتییشدا هەندێک لە ئەندامە پێشکەوتووەکان، بە نامە پەیوەندییان بە ڕژێمەوە کردبوو بەنهێنی لە کاتی دەسەڵاتداریی بەعسدا، لەوانە هەندێکیان بە مووچە وەرگرتن بۆ دانی زانیاری بە ڕژێم، هەندێک لە پێناو بەردانی خێزان و کەسوکاریان، هەندێک تا لە ڕێگەی ڕژێمەوە تۆڵە لە دوژمنەکانیان وەربگرنەوە، هەندێک لە (٣١)ی ئابدا کە لەلای پارتی لەلایەن ڕژێمەوە گیرابوون بۆ بەربوونیان، هەریەکەیان بە جۆرە پاساوێک بۆ پەیوەندیکردن بە ڕژێمەوە، ناویان لێ نرا «فایلدارەکان».

لە کۆنگرەی دوودا هەموو فایلدارەکانیش بەشدار بوون و خۆیان کاندید کردبوو بۆ سەرکردایەتی. مام جەلال ئەم جارەش فریای پینەوپەڕۆکردنی بارودۆخی ناو ماڵی یەکێتی کەوت. هەر لە یەکەم ڕۆژی کۆنگرە، پاش خوێندنەوەی ڕاپۆرتی سکرتێری گشتی و پەسەندکردنی لە دەنگدانێکی ئاشکرادا، لەسەر داوای مام جەلال بڕیار درا یەکەم کاری کۆنگرە؛ هەڵبژاردنی ئەندامانی سەرکردایەتی بێت. سەرەتا لەسەر داوا و پێشنیاری مام جەلال، دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی بێ دەنگدان لەسەریان، بە چەپڵەڕێزان بوونە ئەندامی سەرکردایەتی کە بریتی بوون لە: مام جەلال، نەوشیروان مستەفا، فوئاد مەعسوم، کەمال فوئاد، عادل موراد. دیسان هەر لەسەر داوای مام جەلال، کۆسرەت ڕەسوولیش بە چەپڵەڕێزان و بێ دەنگدان بووە ئەندامی سەرکردایەتی.

لەسەر خواستی کۆسرەتیش، جەبار فەرمان بە چەپڵەڕێزان بوو بە ئەندامی سەرکردایەتی. ئەم هەموو پێشێلکارییەی پەیڕەوی ناوخۆ، لە پێناو ئاوکردن بوو بەو ئاگرەی لەنێوان کۆسرەت و تاقمەکەی و نەوشیروان و تاقمەکەی و مام جەلال و کوتلەکەی و جەبار فەرمان و تاقمەکەی بوو. پاش ئەو پێشێلکارییانە، لەوەش گاڵتەجاڕی تر پرۆسەی دەنگدان لە ڕۆژی یەکەمی کۆنگرەدا کرا، کە پێشوەخت ناوی کاندیدکراوەکان بە لیست درابوو بە بەشداربووانی کۆنگرە، لەوانەی کە سەر بە کوتلە ڕێککەوتووەکان بوون پێشوەخت، بە فایلدارەکانیشەوە. دواتر نامۆترین و خراپترین پێشێلکاری ئەوە بوو هەر ئەو ڕۆژە پاش دەنگدانە گاڵتەجاڕییەکە، سندووقەکانی دەنگدەران برانە ماڵی مام جەلال، تا دوارۆژی کۆنگرە بهێنرێتەوە بەردەم کۆنگرە بۆ

جیاکردنەوەی دەنگەکان. بەو شێوەیە کۆنگرەی دوو، هەموو بنەماکانی دیموکراتیەت و پرانسیپی حزبی و پەیڕەوی حزبی خرایە ژێر پێی تەکەتولخوازان و مەسئولیەتپەرستان. ئەنجامی دەنگدانە پڕ لە ساختەکارییەکەش، دەرچوونی ئەو کەسانە بوو کە لە لیستە ڕێککەوتنلەسەرەکاندا هەبوون. ئەو لیستانەی کە زۆر پێش کۆنگرە ڕێککەوتنیان لەسەر کرابوو، بێ گوێدانە هیچ نرخێکی سیاسی و ویژدانی و دیمکراتی و حزبی. من لە سێهەم ڕۆژی کۆنگرەوە، ئەو گاڵتەجاڕییەم پێ هەرس نەکرا و کۆنگرەم بەجێ هێشت و گەڕامەوە بۆ ئەڵمانیا. لە ئەڵمانیاش بە هۆی تاکڕەویی بەرهەم ساڵحەوە کە بە بڕیاری خودی مام جەلال کرایە لێپرسراوی مەڵبەندی دەرەوەی وڵات، وازم لە مەڵبەندیش هێنا.

## کۆنگرەی سێ و لەدایکبوونی ئەنجوومەنی ناوەندی لەناو ژانی کۆنگرەدا

**٢٠١٠/٦/١**

بارودۆخی کۆنگرەی سێ، لە کەشوهەوای بەستنی کۆنگرەکانی تر باشتر و پرانسیپانەتر بوو.

ئەوەی لەم کۆنگرەیەدا جیاواز و دیار بوو، دوو گۆڕانکاری بوو:

١. دابەشکردنی ئەندامانی کۆنگرەیە بەسەر چەند لیژنەیەکدا کە ئامادەکارییان دەکرد بۆ بەرهەمهێنانی بابەتەکان و ئامادەکردنیان بۆ گفتوگۆ لەسەر کردن لەناو کۆنگرەدا، بە مەبەستی دەست بە وەختەوە گرتن و کاتبەفیڕۆنەدان.

٢. لەم کۆنگرەیەدا بەفەرمی دەنگ لەسەر لەدایکبوونی ئەنجوومەنێکی ناوەندی درا، کە بۆ یەکەم جار بوو لە کۆنگرەدا و بە دەنگدانی فەرمیی ئەندامانی کۆنگرە، ئۆرگانێکی چاودێری و بەدواداچوونی ئەرکەکانی سەرجەم ئۆرگانەکانی تری حزبەکە بێتە لەدایکبوون، پاش ئەو ئەزموونەی کە لە ئەنجوومەنی ناوەندی دروستکراوی پاش کۆنگرەی دوو وەرگیرابوو.

هەر پاش بڕیاردان لەسەر دانانی لیژنەکانی کۆنگرە، من خۆم کاندید کردبوو لیژنەی دارشتنی پرۆژەی رەشنووسی پەیڕەو، سەبارەت بەوەی کە لە کۆنگرەکانی پێشووتردا بەردەوام یەکێک بووم لە دارێژەرانی پەیڕەو، ئەم جارەش بە دەنگێکی زۆر پەسەند کرام بۆ ئەو لیژنەیە. لیژنەکە پێک هاتبوو لە: د. فوئاد مەعسوم، عارف رۆشدی، فەرید ئەسەسەرد، خەسرەو گوڵ محەممەد، بەندە. جاروبار هەندێ هەڤاڵی تری دەستبەتاڵیش بەشدارییان تێدا دەکرد، بە درێژایی رۆژانی کۆنگرە ئەو لیژنەیە لە ژوورێکی «ئوتێلی لالەزار» خەریکی مشتومڕ و نووسین و دارشتنی بڕگە و مادەکانی پەیڕەوی ناوخۆ بووین.

هەموو رۆژێک پتر لە چوار بۆ پێنج کاتژمێر کارمان دەکرد، پاشان شەو دوای کاتژمێر یانزە مام جەلال دەهاتە سەر هێڵی تەلەفۆن و کارەکەی ئەو رۆژەمان بۆ دەخوێندەوە، ئەویش دەکەوتە دەستکاریکردنی. بەو جۆرە رەشنووسی پرۆژەی پەیڕەو برایە کۆنگرە. رەشنووسی ئەم پرۆژەی پەیڕەوە، بەجیا لە هەموو پەیڕەوەکانی پێشووتر، بەشێکی پێک هاتبوو لە باسی ئۆرگانە نوێکە کە ئەنجوومەنی ناوەندیٔ بوو. پرۆژەی رەشنووسی پەیڕەو کە لەلایەن کۆنگرەوە لە دەنگدانێکی ئازاد و ئاشکرادا بە زۆربەی هەرە زۆری دەنگدەران پەسەند کرا و پاشان لەدوای کۆنگرە درا بە کارگێڕی مەکتەبی سیاسی بۆ پاکنووسکردن و چاپکردنی. بەڵام بەداخەوە، لێپرسراوی دەستەی کارگێڕ بە دەستکارییەکی زۆرەوە کە سەروگوێی شانزە مادە و بڕگەی کوتابوو، بە جۆرێک دەستکاریی کردبوو کە لە دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی کەم کردبۆوە و لە دەسەڵاتەکانی م. س و بەتایبەت کارگێڕیی زیاد کردبوو، واتە هێشتا نامیلکەی پەیڕەو نەکەوتبووە دەست ئۆرگانەکانی یەکێتی، پێشێل کرابوو.

کۆنگرە ئەنجامی هەڵبژاردنی سەرکردایەتیی دا بەدەستەوە، بە پێی پەیڕەو دەبووایە ئەندامانی م. س ژمارەیان لە ١٥ کەس تێنەپەڕێ، بەڵام کرا بە ١٩ و پاشان ٢١، ژمارەی ئەندامانی سەرکردایەتی دەبووایە لە ٤٥ تێنەپەڕێ، ئەویش کرا بە ٥١ ئەندام و پتریش. تەنیا ژمارەی ئەندامانی ئەنجوومەنی ناوەندی وەک خۆی مایەوە کە ٨١ ئەندام لە کۆنگرە هەڵبژێردران و ٢٠ ئەندامیش لەلایەن سکرتێری گشتییەوە دیاری کران، کە کۆنگرە ئەو دەسەڵاتەی دا بە سکرتێری گشتی. لە دەرچووانی سەرکردایەتی، هەمان دەموچاو و

هەمان تاس و هەمان حەمامی کۆنگرەکانی پێشوو بوون، جگە لە چەند ژنێک کە چووبوونە ناو لیستی تەکەتولەکانەوە وەک پاداشتێک بۆ خزمەتی باوک یا برای شەهیدیان. بەداخەوە زۆربەی ئەو ئەندامانەی کە ئەندامی سەرکردایەتیی ڕابردووی یەکێتی بوون، لە شۆڕشگێڕان و کۆمەڵەش و خۆیان هەڵبژاردبوو بۆ ئەنجوومەنی ناوەندی، دەنگیان پێ نەدران و دەرنەچوون کە خاوەنی ئەزموونێکی زۆری سیاسی و ڕێکخراوەیی و چاودێری بوون. ئەوانەی کە دەرچووبوون بۆ ئەنجوومەنی ناوەند و زۆرترین دەنگیان هێنابوو، تاکوتەرای پیاو یا ژنە بەئەزموونەکان و تێکۆشەرە دێرینەکانی تێدا بوو، زۆربەیان برای شەهید و کوڕی شەهید و ژنی شەهید و خوشکی شەهید بوون. کۆنگرە وای زانیبوو دەزگای شەهیدان هەڵدەبژێرن. من دەنگی ژمارە ٢٨م هێنابوو. لەبەر ئەوەی مام جەلال کە بەرپرسی یەکەمی ڕاستەوخۆی ئەنجوومەن بوو و بە هۆی کاری سەرۆکایەتیی عێراقەوە لە بەغدا بوو، نەیتوانی بەشداریی یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ناوەندی بکات. ئەنجوومەنی ناوەندی بە ئامادەبوونی دەستەی کارگێڕی، یەکەم کۆبوونەوەی خۆی بە دیاریکردنی بەتەمەنترین کەسی ئەنجوومەن بۆ بەڕێوەبردنی کۆبوونەوەی ئەنجوومەن تا هەڵبژاردنی سکرتاریەتی ئەنجوومەن دەستی پێ کرد و کاک بەکر حاجی سەفەر وەک بەتەمەنترین ئەندامی ئەنجوومەن بۆ سەرپەرشتیی کۆبوونەوەی ئەنجوومەن دیاری کرا. لەو کۆبوونەوەوە تاکوو کۆبوونەوەی دووهەم بۆ هەڵبژاردنی سکرتاریەت، چەند ڕۆژێکی خایاند. عادل موراد و فوئاد مەعسوم و د. کەمال فوئاد لە کۆنگرەی سێدا خۆیان کشاندەوە لە ئەندامی سەرکردایەتی و خۆشیان هەڵنەبژاردەوە، بەڵام د. فوئاد مەعسوم دەرچوو، بوو بە ئەندامی ئەنجوومەنی ناوەند. بە مەبەستی هەڵبژاردنی وەک سکرتێری ئەنجوومەن، د. فوئاد مەعسومیش بە هۆی بوونی بە ئەندامی پەرلەمانی عێراق و لێپرسراوی فراکسیۆنی یەکێتی، ئەویش نەیدەتوانی ئەو ئەرکە بەرێت بەڕێوە، بەڵام دەویسترا کە عادل موراد هەڵببژێردرێت بۆ سکرتێری. کاک بەکر کەوتە پەیوەندی بە عادل و کەسانی ترەوە، کە عادل موراد بکشێتەوە، عادل وەڵامی دایەوە کە نیازێکی وای نییە. بەر لە ڕۆژی کۆبوونەوەی ئەنجوومەن بە دوو ڕۆژ، دلێری سەیید مەجید لە حەوشەی م. س پێی وتم کە من خۆم هەڵبژێرم بۆ سکرتێری ئەنجوومەن، وەڵامی

من ئەوە بوو کە: ئەگەر کاندید بەتەنیا هەر کاک بەکر حاجی سەفەر بێت، من ئەو کارە ناکەم، ناچمە بەرامبەری، چونکە کاک بەکریش پیاوێکی تێکۆشەر و دێرینی مەیدانی خەبات و تێکۆشانە، وە هاورێی ساڵەکانی شەستەکانمە، بەڵام گەر کەسیک یا چەند کەسانی تر دێنە بەرامبەری، ئەوسا منیش خۆم هەڵدەبژێرم. هەر ئەو رۆژە بۆ شەوەکەی بە تێل لەگەڵ کاک بەکردا وتووێژمان کرد و ئەو رایەی خۆمم پێ وت، ئەویش زۆر پێی پەسەند بوو.

لە دووهەم دانیشتنی ئەنجوومەنی ناوەند بە سەرپەرشتیی چەند ئەندامێکی دەزگای هەڵبژاردنی یەکێتی کە یەکیان یاسایی بوو، بەرێز «شێخ عەبدول»، هەڵبژاردن کرا بۆ سکرتێری ئەنجوومەن و بێ رکابەری کاک بەکری حاجی سەفەر بە زۆربەی دەنگی ئامادەبووەکانی کۆبوونەوە، بۆ سکرتێری ئەنجوومەن هەڵبژێردرا.

دوای ئەوە، هەڵبژاردنی دووهەم کرا بۆ هەڵبژاردنی جێگرانی سکرتێر و بڕیاردەری ئەنجوومەنی ناوەند.

ئەنجام: زرار جۆلا بە جێگری یەکەم و بەندە بە جێگری دووهەم بە جیاوازیی تەنیا یەک دەنگ، کە ئەو دەنگەش خۆم بە خۆمم نەدابوو، وە بەختیار شاوەیس بۆ بڕیاردەری ئەنجومەن دەرچوو.

بەو جۆرە سکرتاریەتی ئەنجوومەنی ناوەندی پێک هات لە:

١. بەکری حاجی سەفەر/سکرتێر
٢. زرار جۆلا/جێگری سکرتێر
٣. ئیبراهیم جەلال/جێگری سکرتێر
٤. بەختیار شاوەیس/بڕیاردەر

لە کۆبوونەوەی سێهەمدا، ئەنجوومەن بە سەرپەرشتیی سکرتاریەت، هەڵسان بە دیاریکردنی لیژنەیەک بۆ دارشتنی پەیڕەوی کاری ئەنجوومەن بەو شێوەیەی کە لە پەیڕەوی ناوخۆدا ئەو مافەی پێ درابوو، بەو مەرجەی کە هیچ کام لە بڕگە و مادەکانی لەگەڵ پەیڕەودا دژ نەبن.

بەو پێیە جگە لەو پێنج کۆمسیۆنەی کە لە پەیڕەودا دیاری کرابوو، لە پەیڕەوی کاردا هەشت کۆمسیۆنی تریش هاتە دانان و بۆ هەموو کۆمسیۆنەکانیش ئەرک و

دەسەڵاتەکانیان دیاری کران.

١. کۆمسیۆنی ڕێکخستن

٢. کۆمسیۆنی ئەدای ئەندامان لە حکومەت و پەرلەمان

٣. کۆمسیۆنی پێشمەرگە

٤. کۆمسیۆنی ڕاگەیاندن

٥. کۆمسیۆنی کۆنگرە

٦. کۆمسیۆنی دەستپاکی

٧. کۆمسیۆنی ڕێکخراوە دیموکراتەکان

٨. کۆمسیۆنی پەیوەندییەکان

ئەنجوومەنی ناوەند زیاد لە پێویست بە ئەرکەکانی خۆی هەڵسا، ماوەیەکی زۆر باشمان لەگەڵ کاک بەکردا بەگونجاوی بردە سەر، تا ئەو کاتەی کە کێشەی پارە و مووچە و چاوچنۆکی هاتە ئاراوە.

هەندێ لە ئەندامانی ئەنجوومەن کەوتنە ڕکەبەرایەتیی سکرتاریەت سەبارەت بە دوو هۆی سەرەکی:

١. کێشەی مووچە و دەرماڵە کە دەیانویست ئەنجوومەنی ناوەندیش هاوتای سەرکردایەتی و م. س مووچەی مانگانەیان هەبێ لەگەڵ دەرماڵە بۆ هەموو کۆمسیۆنەکان بێ سنوور و بەبێ خەرجکردنیان.

تێچووی ڕۆژانەی کۆمسیۆن، تێچووی پێویستی ئۆتۆمبێلەکانیان، کە کاک بەکر و بەندەش پێمان وا بوو کە دەبێ کارێک نەکەین ئەنجوومەن ببێتە مەڵبەندی گەندەڵی، لە کاتێکدا کە ئەنجوومەن یەک لە ئەرکەکانی چاودێریی گەندەڵکاریی ئۆرگانەکان بکات و لێپێچینەوەیان لەگەڵ بکات. تا سەرئەنجام لەنێوان کاک بەکر و زرار جۆڵا، کێشە و قرە پەیدا بوو لەسەر پسووڵەی خەرجییەکانی کاک زرار. لە ڕاستییشدا هاندەری یەکەم بۆ کێشەی پارە و مووچە، کاک زرار بوو. بە هۆی بوونی مام جەلال لە بەغدا، ئەنجوومەنی ناوەند ڕووبەڕووی کارگێڕیی مەکتەب سیاسی کرایەوە لەلایەن مام جەلالەوە کە نامەیەکی فەرمی بۆ ئەنجوومەنی ناوەندی نێردرا، کە ئیتر هەموو پەیوەندییەکی ئەنجوومەن بە کارگێڕەوە دەبێت، واتە بە مەلا بەختیارەوە، لەبەر ئەوەی

کارگێڕ واتە مەلا بەختیار. وردە وردە بە دەستێوەردانی کارگێڕ و هاندانی هەندێک لە ئەندامانی ئەنجوومەن، کێشەکە کەوتە لێکۆڵینەوە و لیژنە دروستکردن لەلایەن کارگێڕەوە بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەکانی ئەنجوومەن.

٢. کێشەی کتێبەکەی بەندە (چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە)، کە ئەمەش کرا بە بیانوویەکی تر.

کتێبەکەی من نزیک بە ساڵێک پێش سەرهەڵدانی کێشەکە چاپ کرابوو و بڵاو کرابۆوە، بەڵام بۆ لێدانی سکرتاریەت، هەم کارگێڕ و هەم چەند ئەندامێکی بە پەنجەی دەست ژمێردراو و هاندراوی ئەنجوومەن. من پێم وا بوو ئەنجوومەنێک کە دووهەم گەورەترین ئۆرگانی یەکێتیی بێ پاش سەرکردایەتی، کارگێڕ بتوانێت لیژنەیان لەسەر دروست بکات بۆ لێکۆڵینەوە کە لیژنەکە لە کادرانی ناوەندی (وسطی) پێک هاتبن، ئیتر کارکردن لەو سکرتاریەتە بێسوودە. بۆیە لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی ئەنجوومەنی ناوەندا، من دەستلەکارکێشانەوەی خۆم دا بە ئەنجوومەن و کاک بەکریش لە ماڵەوە بە تەلەفۆن دەستلەکارکێشانەوەی خۆی ڕاگەیاند. بەو جۆرە سکرتاریەت خۆی لەکار خست. کاک بەکر دەستلەکارکێشانەوەی خۆی لە سکرتاریەت و لە ئەنجوومەن و تەنانەت لە یەکێتییش ڕاگەیاند، تا دوایی دڵیان دایەوە و ئاشتیان کردەوە. دوای دەستلەکارکێشانەوەی ئێمە، ئەنجوومەنی ناوەند کۆبوونەوەی فراوانی خۆی بەست بۆ هەڵبژاردنی سکرتاریەتێکی تر. ئەو کۆبوونەوەیە د. فوئاد مەعسوم بە نوێنەرایەتیی مام جەلال سەرپەرشتیی کرد، ویستی کە عادل موراد هەڵبژێردرێ بۆ سکرتێری ئەنجوومەن. من دژی ئەو هەڵبژاردنە لەسەری دوام، بەپێی پەیڕەوی ناوخۆ و بەرنامەی کاری ئەنجوومەن، سکرتێر و سکرتاریەت دەبێ لە کەسانێک بن کە یان لە کۆنگرە هەڵبژێردرابن یان لەو ٢٠ هەڤاڵەبن کە سکرتێری گشتی دایناون، عادل مورادیش لە هیچ کامیان نییە، بۆیە دەبێت یەکێک لە ٢٠ هەڤاڵەکەی دانراوی سکرتێری گشتی لە ئەنجوومەن، دەست لە ئەندامێتییەکەی بکێشێتەوە و سکرتێری گشتی؛ عادل موراد لە شوێنەکەی دابنێت، یان پێچەوانەی پەیڕەوە. بەڕێز مام جەلال ئاگادار کرا لەو خاڵەی پەیڕەو، مام جەلال و د. فوئاد مەعسوم، محەممەد دووشیوانیان تەکلیف کرد کە دەست لەکار بکێشێتەوە، عادل موراد خرایە شوێنەکەی. صەمەد دووشیوانی بەو

پەیمانە قایل کرا کە لە هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمانی عێراق لە کەرکووک، یەکێک بێت لەوانەی هەڵبژێردرێت.

بەو جۆرە عادل موراد بە دەنگی زۆر بوو بە سکرتێر، وە زوبێر عوسمان و چێنەر عەلی جۆلا بە جێگر و دیسان بەختیار شاوەیس بە بڕیاردەر.

## دەقی وەڵامی من بۆ کارگێڕ لەسەر ڕاپۆرتی لیژنەی لێکۆڵینەوە

ئەو لیژنەیەی کە بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەی نێوان کاک بەکر حاجی سەفەر و کاک زرار جۆلا لەلایەن کارگێڕەوە پێک هێنرابوو، لیژنەی لێکۆڵینەوە نەبوو لەو کێشەیە، بەڵکوو پلانێکی تایبەتی لێپرسراوی دەستەی کارگێڕ بوو بۆ لێدانی ئەنجوومەنی ناوەندی و بەتایبەتی من، وەک تۆڵەسەندنەوەیەک لەسەر ئەو ڕاستییانەی کە من لە کتێبی «چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە»دا لەسەر تاوانەکانی ئاش و بەتایبەت ئەو نو وسیبووم.

ئەنجوومەنی ناوەند ئۆرگانێکی باڵای یەکێتییە و لە کۆنگرەی سێدا تاکە ئۆرگانە کە لەگەڵ سەرکردایەتیدا بە دەنگی ئەندامانی کۆنگرە دەرچووبن، واتە لیژنەی لێکۆڵینەوە دەبێ یا لە ئەندامانی سەرکردایەتی پێک هاتبێ، یا لەناو ئەنجوومەنی ناوەندەوە دیاری کرابن. بەڵام کارگێڕ، لیژنەکەی لە ئەندامێکی دیاری سەرکردایەتی و دوو کادری ناوەندی (وسطی) پێک هێنابوو، کە هەرگیز جێگای شیاو نەبوو ئەوان لێکۆڵینەوە لە سکرتاریەتی ئەنجوومەن بکەن. بۆیە بەندە بە نامەیەک وەڵامی ڕاپۆرتی لیژنەکە و ڕای کارگێڕی م. س بەرامبەر ئەنجوومەن سەبارەت بە ئەنجامگیریی لیژنەکەم دایەوە، کە ئەمە دەقی وەڵامەکەی بەندەیە:

**بەڕێز: جەنابی مام جەلال**

**بەڕێز: هەڤاڵانی کارگێڕیی م. س**

**بابەت: ڕەتکردنەوەی ڕاپۆرت**

وەک لە نووسراوی ژمارە ١٢٣٢/ک، ڕۆژی ٢٠١١/١١/٢١ی کارگێڕدا هاتووە کە هەم بەڕێز مام جەلال و هەم بەڕێزیشتان بڕیارتان لەسەر ناردنەوەی ڕاپۆرت و

چارەسەری کێشەکە وەک گونجاندنێک لەگەڵ پەیڕەوی ناوخۆ داوە، بە پێویستم زانی هێندەی پەیوەندیی بە بەندەوە هەبێت بەم وەڵامە کە لە هەمان کاتیشدا ڕەتکردنەوەی ڕاپۆرتی لیژنەکەتانە، ئاگادار بکەمەوە:

١. کێشەی ڕوودا و لەنێوان بەڕێزان هەڤاڵ بەکری حاجی سەفەر و هەڤاڵ زرار جۆلادا بووە، کە بەندە ئەو کاتە لە پشوودا بووم و لێی بێئاگا بووم.

لە ڕووی یاساییەوە دەبووایە لیژنەکە لێکۆڵینەوەکەی تەنیا و تەنیا لە چوارچێوەی ئەو کێشەدا بووایە، نەک بە مەبەستێکی تایبەت کە پێشوەخت لیژنەکە ئامۆژگاری کرابن و بەسەریاندا سەپێنرابێت تەڕ و وشک پێکەوە بسووتێنن.

٢. باشتر وایە لیژنەیەکی چاودێریی دارایی، هەڵسەنگاندنی سەرفکردنی بڕە پارەی نێردراو بۆ ئەنجوومەنی ناوەند و بڕە پارەی دراو بە سەرکردایەتی بکات، کە ژمارەی ئەندامانی ئەنجوومەن دوو جار و پتر بەقەدەر ژمارەی ئەندامانی سەرکردایەتییە، وە هەر ئەو لیژنەیەش هەڵسەنگاندنی ژمارەی سەیارەی دراو بە ئەنجوومەن لەگەڵ سەیارەی دراو بە سەرکردایەتی بکات کە پێم وایە زۆربەتان ژمارەی سەیارەکانی خۆتان و حیمایەکانتان لە ژمارەی سەیارەکانی هەموو ئەنجوومەن زیاترە. جگە لەوەش لە پێکهاتنی ئەنجوومەنەوە تا ئێستا، (١٦) سەیارەتان داوە بە ئەنجوومەن لەسەر داوای ئەنجوومەن. سەیارەکانی تر یا ئەندامەکانی ئەنجوومەن پێش بوونیان بە ئەنجوومەن لە ئۆرگانەکانی ترەوە لەگەڵ خۆیان هێناویانە، یا خۆتان لەسەر بنەمای مەحسوبیەت و مەنسوبیەت بۆتان دابین کردوون.

٣. لەلایەن ئەنجوومەنەوە جگە لەم کێشەیە، هیچ کێشەیەکی تریان نەخستۆتە بەردەم بەڕێزتان، وە گەر هەشبووبێت، وەک سەرکردایەتی کێشەکانیان لەناو خۆیاندا چارەسەر کردووە، بەڵام بەداخەوە بە مەبەستی تایبەت و بە تێوەگلانی ئەنجوومەن لە کێشەکانی ناوخۆتان، کێشەتان بۆ ئەنجوومەن دروست کرد.

سەبارەت بە ڕاپۆرتی لیژنەی لێکۆڵینەوە لە کێشەی ئەنجوومەنی ناوەندی، پێشەکیی ڕاپۆرتەکەم بەم جۆرەیە:

لەبەر ڕۆشنایی بڕیاری بەڕێزتان، ژمارە (١٧٠/ن) لە ڕێکەوتی ٢٠١١/١٠/٢٠ (تایبەت) سەبارەت بە کێشەی نێوان هەڤاڵ (سکرتێری ئەنجوومەنی ناوەندی و

جێگرەکەی هەڤاڵ زرار جۆلا)، تەشکیلکردنی لیژنەیەک بۆ لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی ئەم کێشەیە.

لە خوارەوە پوختەی سەرنج و تێبینییەکانمان و هۆکار و پێشنیاری چارەسەرکردنی کێشەکە دەخەینە بەر دەستتان، هیواداریین جێگەی ڕەزامەندیتان بێت.

یەکەم: لەم پێشەکییەدا دەردەکەوێت کە بڕیاری ژمارە (١٧٠/ن) نهێنی و تایبەت لە ١٠/٢٠دا تەنیا سەبارەت بە کێشەی هەڤالان کاک بەکر و کاک زرار جۆلا دراوە و لیژنەکەش بۆ لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی ئەم کێشەیە دانراوە، گوایە پوختەی سەرنج و تێبینییەکانی لیژنەکەش و هۆکار و پێشنیارەکانیشیان بۆ «چارەسەرکردنی کێشەکە» نەک کێشەکانە.

من دەستخۆشی لە لیژنەکە دەکەم بۆ دانپێدانانیان بەو تۆزە ڕاستییەی کە نووسیویانە کێشەکە «نەک کێشەکان». بەڵام بەداخەوە جا بەمەبەست ڕاسپێردرابن یان لە نەشارەزاییان لەو مەبەستەی کە بڕیاری ژمارە (١٧٠/ن) بۆی دیاری کردوون، لایان داوە و بێویژدانانە یا نەشارەزایانە کەوتوونەتە ناو ئەنجوومەنەکە و «شەلم کوێرم» کۆمەڵێک ڕاوبۆچوونی دوور لە ڕاستییان لە ڕاپۆرتەکەیاندا نووسیوە کە ئەمانەی خوارەوەن:

١. دەربـارەی دوو پلەیی کە گوایە یەکێکە لـە هۆکـاری پەککەوتنی کـاری ئەنجوومەنەکە، بەڵام ئەمە نە ڕاستە و نە کاری ئەنجوومەنیش بەو هۆیەوە پەکی کە وتووە.

ئەوانە کە ئەندامی ئەنجوومەنن و کاری تریان هەبێت، تەنیا دوو کەس بوون (ئاسۆ شێخ نووری؛ ئەندامی مەکتەبی ڕێکخستن و جەمال تاڵەبانی؛ ئەندامی مەڵبەندی سلێمانی)، هەردووکیان نامەی فەرمییان هێناوە کە دەستیان لەو پۆستانە کێشاوەتەوە، لە ڕووی یاساییشەوە بە بەڵگەی دەستلەکارکێشانەوە دادەنرێت.

بەڵام لیژنەی بەڕێز، بێ ئەوەی لە سکرتاریەت بپرسێ تا بەڵگەکانیان نیشان بدات، بە قسەی دوو سێ ئەندامی ئەنجوومەن، ئەم خاڵەیان بە کۆسپی بەردەم کاری ئەنجوومەن پیشان داوە، کە لە ڕاستیدا ئەم خاڵە هێندەی موویەکیش کار لەسەر «بەشێکی زۆری ئەنجوومەن ناکات»، گەر خۆیان ویستبێتیان کار بکەن.

٢. دەربارەی ناتەبایی و ناکۆکیی نێوان هەڤاڵانی بەرپرس و جێگرانی، گوایە «زۆربەی کۆمسیۆنەکان کاتەکانیان بە ئاشتکردنەوە و سوڵحی ئەوانەوە خەریک کر دووە».

گەر ئەمە وایە، ئەی بۆ لێکۆڵینەوە لە کارەکانی ئەنجوومەن نەکرا، لەباتیی کون و کەلێن گەڕان بە مەبەستی شکستهێنان بە ئەنجوومەن. دەبووایە داوایان لە کۆمسیۆنەکان بکردایە یەک یەک چییان کردووە و سکرتاریەتیش چۆن ڕێنمایی و هاوکاریی کردوون، نەک حەق و ناحەق، ڕاست و ناڕاست، ئیشکەر و ئیشنەکەر، بە یەک چاو سەیر بکەن.

گەرچی و بە هیچ پێوەرێک بۆ لیژنەیەک کە لە ئەندامێکی سەرکردایەتی و دوو ئەندامی تری خوار ئەندام مەکتەبیش نەهاتووە، لێکۆڵینەوە لە هیچ ئەندامێکی ئەنجوومەن بکەن، چ جای سکرتاریەتی ئەنجوومەن کە تەنانەت م. س ئەو مافەی نییە.

٣. لە خاڵێکدا ڕاپۆرتەکە دەڵێت کۆمسیۆنەکان بەگشتی کارەکانی خۆیان دەکەن، بەڵام بە تێکڕایی ڕەخنەیان لە بەرپرس و جێگرانیان هەیە کە لە ئاستی ئەو بەرپرسیاریەتییەدا نین، کەچی لە شوێنێکی تردا دەڵێن کۆمسیۆنەکان ئیشی هەر سوڵحکردنی نێوان سکرتاریەتە (بانێکە و دوو هەوا)!

٤. لە خاڵێکی تردا نووسیویانە کە (ئەوەی جێگەی سەرنجی ئەندامانی ئەنجوومەنەکەیە، بە ئەندازەی ئەو بڕە پارەیەی بۆیان تەرخان کراوە؛ کاروچالاکییان نییە و ئەنجامیان نەداوە).

بەڕاستی زۆر بەلامەوە سەیرە کە م. س، لیژنەی لێکۆڵینەوەکە و بە وتەی لیژنەکە ئەندامانی ئەنجوومەنیش، کە باسی پارە و کاریان کردووە، پێدەچێ ئەوان ئەنجوومەن بە کرێگرتەی خۆیان بزانن و کاری ئۆرگانێکی وەک ئەنجوومەن بە پارە هەڵبسەنگێنن، پێدەچێ خاوەنەکانی ئەو جۆرە بۆچوونە، سەرجەم ئۆرگانەکانی یەکێتی بە کرێگرتەی خۆیان بزانن و خۆیشیان بە خاوەن کار.

٥. ئەرکی لێکۆڵینەوە لە داهات و خەرجیی ئەنجوومەن، ئەرکی ئەو لیژنەیە نییە، بەڵکوو ئەرکی دەزگای چاودێریی داراییە.

٦. سەبارەت بە هۆکاری کێشەکە «نەک کێشەکان».

ا. زۆر ڕاستە، سکرتاریەت نەگونجاو بوون، بەڵام لەسەر چی؟ لەسەر جیاوازیی ئەوەی ئەندامەکان لە ئیشکردندا، کە دەبووایە وا هەڵسەنگاندنی بۆ بکرایە، نەک لەسەر ڕاپرسی لە ٧-٨ ئەندامی ئەنجوومەن کە بە پلان و هاندانی ناحەزانم لەوانەی کە لە ناوەرۆکی کتێبەکەم دڵگران بوون.

ب. سەبارەت بە دیاردەی دەستەگەری لەناو ئەنجوومەن، زۆر ڕاستە کە هەیە، بەڵام ئەمیش پاشگری دیاردەی دەستەگەریی ناو سەرکردایەتییە. سەبارەت بە خۆم، ڕووبەڕووی هەر کەسێک دەبمەوە کە لەسەرم بسەلمێنێت کە بەندە دەستەگەری هیچ کەس و لایەنێک بم لە سەرکردایەتی و م. س. بەندە تەنیا دەستەگەری یەکێتی و بەرژەوەندیی یەکێتیم، ئۆباڵی ئەم تۆمەتە ناڕاستەش دەخەمەوە ئەستۆی ناڕاستی لیژنەکە و ئەوانەی کە ئامۆژگارییان کردوون.

ج. سەبارەت بە یەکلاکردنەوەی کەموکورتییەکانی بەردەم ئەنجوومەن.

١. یەکلایینەکردنەوەی ژمارەی ئەندامانی مەکتەبەکان کە پێشێلکارییەکی زۆر ڕوونی سەرکردایەتی و م. س و کارگێڕە لە پەیڕەو، بێ ئاگاداری ئەنجوومەن، بە ئارەزووی خۆیان ئەندام مەکتەب زیاد دەکەن و دادەنێن، بێ گوێدانە ئەنجوومەنی ناوەند و پەیڕەوی ناوخۆ.

٢. یەکلایینەکردنەوەی هۆکار و بەرپرسی ئەو پێشێلکارییانەی کە لەلایەن لیژنەی صیاغەی پەیڕەوەوە نووسینەوەی کراوە پاش دەنگدانی کۆنگرە لەسەری، واتە چەندین مادە و بڕگەیان لە پەیڕەوەکە گۆڕیوە لە بەرژەوەندیی دەسەڵاتەکانی کارگێڕ و م. س.

پاش چەندین جار داواکردنی لیژنەکە بۆ ڕوونکردنەوە لەبەردەم ئەنجوومەندا، بەڵام مەلا بەختیار کە بەرپرسی یەکەمی ئەو پێشێلکارییانە بوو، ئامادە نەبوو بێت و بۆ ئەنجوومەن ڕوونکردنەوە بدات.

سەبارەت بەو ناعەدالەتی و نایاسایی و بە کەم سەیرکردنی ئەنجوومەنی ناوەندی کە لە نامەکەی کارگێڕ و ڕاپۆرتی لیژنەکەدا هاتووە، بەندە ئەمڕۆ وەک هەڵوێستوەرگرتن و ناقایلیم لەو ڕاپۆرتە ناڕاست و ناواقعییە بەرامبەریان، بڕیاری دەستلەکارکێشانەوەی خۆم بە نوسراو و بە دەمییش لەبەردەم ئەنجوومەن ڕاگەیاند.

دووبارەی دەکەمەوە کە بەندە نە بە راپۆرتی لیژنەکە و نە بە نامەی کارگێڕیش قایلم و لیژنەکەش و راپۆرتەکەش بە پلانێکی پێشوەختە و داڕێژراو دەزانم لەسەر خۆم، ئەویش بە هۆی دەرچوونی کتێبەکەمەوە پێش دوو ساڵ، کە یەک بەشی پەیوەندیی بە پلان و تاوانکارییەکانی ئاشی ئەو سەردەمەوە هەیە.

هەڤاڵتان برایم جەلال
ئەندامی ئەنجوومەنی ناوەندی
یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان
٢٠١١/١١/٢٦

## ئەنجوومەنی ناوەند و ئەرکەکانی

ئەنجوومەنی ناوەند بەر لە هەڵبژاردنی لە کۆنگرەی (٣)، ئەرک و فەرمانەکانی بەشێکی لە پرۆژە داڕێژراوەکە وەرگیرابوو، وە بەشێکی تری لەسەر بڕیاری مام جەلال و پەسەندکردنی م. س و بەشێکی لە پەیڕەوی کاری ئەنجوومەندا هاتبوو، بەڵام دوای گرتنی کۆنگرەی (٣) و بوونی ئەنجوومەنی ناوەند بە ئۆرگانێکی سەرەکیی هەڵبژێردراوی کۆنگرە، هاوشانی سەرکردایەتی، ئەنجوومەن بوو بە ئۆرگانێکی دەسەڵاتداری چاودێری. بەپێی پەیڕەوی ناوخۆ، ئەرک و دەسەڵاتەکانی دیاری کرا، بە جۆرێک کە بوو بە دەزگایەکی چاودێری و ڕاوێژکاری بەسەر سەرکردایەتی و هەموو ئۆرگانەکانی تری یەکێتییەوە، کە ڕاستەوخۆ بەسترایەوە بە سکرتێری گشتیی یەکێتییەوە وەک بەرپرسی یەکەمی ئەنجوومەن. من لێرەدا نامەوێ مادە مادە و بڕگە بڕگەی پەیڕەو، هێندەی کە پەیوەندیی بە دەسەڵات و ئەرکی ئەنجوومەنی ناوەندە؛ شی بکەمەوە.

سەرکردایەتی و بەتایبەت م. س و کارگێڕیی م. س، هەر لە سەرەتاوە کەوتنە بەربەرەکانیی ئەنجوومەن و هەوڵدان بۆ لەکارخستنی، لە سەرەتای دەستبەکاربوونیەوە دەستی دەستیان بە دانی مووچەی ئەندامانی ئەنجوومەن و کارمەند و کارگوزارەکانی

کرد بۆ ماوەی شەش مانگ ئەنجوومەن بێ مووچە و خۆبەخش بەردەوام بوون لە کارکردن.

پاشان کارگێڕ و م. س وردە وردە کەوتنە پێشێلکردنی مادە و بڕگەکانی پەیوەست بە دەسەڵاتی ئەنجوومەنی ناوەند لە پەیڕەوی ناوخۆ، بە کورتییەکەی: وردە وردە ئەنجوومەنی ناوەند لە دەسەڵاتە سیاسی و چاودێری و ڕاوێژکارییەکەی خاڵی کرایەوە. دەتوانم بڵێم لە ئێستادا جگە لە دەزگایەکی کۆمەڵایەتی، شتێکی تر نییە بە ناوی دەزگایەکی چاودێری و ڕاوێژکاری و سیاسییەوە.

## بەندە و کاری خۆبەخشیم لە ئەنجوومەنی ناوەند

من هەر لە سەرەتای دروستبوونی ئەنجوومەنی ناوەندی پێش کۆنگرەی (٣) و پاش کۆنگرەش، تا نووسینی ئەم چەند دێڕەش، بەخۆبەخشی کارم کردووە و سوودمەند نەبووم لە هیچ ماف و ئیمتیازاتێکی یەکێتی، جگە لە ئۆتۆمبێلێک کە بۆ هاتوچۆی ئەنجوومەن بەکارم هێناوە کە تاپۆکەی (سەنەوییەکەی) لەسەر «ئیدارەی گشتی»یە.

تا ئێستاش لای من سیاسەت و کاری حزبی، کارێکی ڕەوشتی و نیشتمانپەروەری و گەلپەروەرییە. ئەم ڕوونکردنەوەیە کە دەنووسم، تەنیا بۆ ئەوەیە کە خوێنەران لەوە بگەن کە بەندە بە نەخۆشی و ٧٥ ساڵ تەمەنەوە، کار لە ئەنجوومەنی ناوەندیدا دەکەم، نە بە مووچەیە، نە بە سوودمەندبوونە لە ئەنجوومەن، نە پلەوپایەشە، بەڵکوو بەڵێنێکە بە خۆم و شەهیدەکانی برام داوە کە تا دوا ساتەکانی ژیانمان هەرسێکمان یەکێتی و کوردایەتی و کوردستانپەروەری بەجێ نەهێڵین.

بڕیارم داوە تا ئەو شوێنەی بشێ و بکرێ، پاسەوان و پارێزەری پەیڕەوی ناوخۆ و چاودێری پەیڕەوکردنی بم.

هەر بۆیەش لە کۆبوونەوەی ژمارە (٨٠)ی ئەنجوومەنی ناوەندی کە من لە ئەڵمانیا بووم بۆ چارەسەر، پێشێلکارییان کرد بەوەی ناویان نا کۆبوونەوەی "ئاسایی" و دەسەڵاتەکانی سکرتێری ئەنجوومەنیان ڕادەستی جێگری یەکەم کردبوو.

من ئاگادارم کردن ئەوە گەورەترین پێشێلکاریی پەیڕەوی ناوخۆیە، لەبەر:

١. لە پەیڕەودا وایە کە ئەگەر سکرتێر بە هەر هۆیەک لە ئەنجوومەن نەما لەپاش یەک مانگ، ئەنجوومەن لە یەکەم کۆبوونەوەی ئاسایی خۆیدا دەبێ هەڵبژاردن بکات بۆ هەڵبژاردنی سکرتێر، یان سکرتێر و هەموو سکرتاریەت.

٢. ئەوان بەو کارەیان مافێکی ڕەوا و حزبی و سیاسییانەی خۆیان پێشێل کرد، کە مافی هەڵبژاردن و خۆهەڵبژاردنە.

٣. بە هیچ شێوەیەک جێگری سکرتێری، مافی بەکارهێنانی ئەرک و دەسەڵاتەکانی سکرتێری نییە، بەتایبەتی ماف و دەسەڵاتی خەرج، مەگەر سکرتێر خۆی بە نووسراوی فەرمی ئەو مافەی بداتێ.

ئەنجوومەنی ناوەندی خۆی ئەرکی سەرەکیی چاودێریکردنی ئۆرگانەکانی حزبە لە پێشێلنەکردنی پەیڕەوی ناوخۆ لە هەموو ڕوویەکەوە، کەچی خۆی پێشێلکاری بکات و شەرعیەتی خۆی لەدەست بدات.

بۆیە هەر لەو کاتەوە، لەو کوبوونەوەیەوە بڕیارم دا بەشداریی هیچ کۆبوونەوەیەکی ئاسایی و نائاسایی و بەکۆمەڵی ئەنجوومەن و لێپرسراوی کۆمسیۆنەکان نەکەم.

بە لیباسی دیموکراسی یانە و خوسیارانە پیسەکرێن
لە ڕاپەڕین و بزوتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی خەڵکی
کوردستان و عێراق بکەن ..

دەنگیان بە جیهان ڕابگەیەنن ، کۆمەکی ماڵییان بکەن ، بیروڕا
ئاڵوگۆڕ بکەن ، خۆتانیان لێ ئاشنا بکەن ....



یەکێک لە ئۆردوگا کوڵەمەرگییەکانی ئاوارەکان لە
بۆکان « ئۆردوگای سەرای » لە کوردستانی ئێران ..

ناڤەند - ناوەندی لێکۆڵینەوەی کوردی

# ئێستەو پاشەڕۆژی کوردستانی عێراق

## ئایا ریفرەندوم پێویستە؟

دۆکیومێنتی سەمینارێکە لە رۆژی 2003/11/1
لە شاری بۆنی ئەڵمانیا بەستراوە




ناڤەند - دۆکیومێنتی ژمارە 10

پرۆژەی

کاری لایەنگرانی پەیرەو کردنی پەیرەوی ناوخۆ و

پێکهێنانی

## {ئەنجومەنی ناوەندی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان}

١ / ٦ / ٢٠٠٦

# کۆنگرەی کوردستان

پرۆژەی پەیمانی
کۆنگرەی کوردستان

١٩٩٩

سوێندی دەستووری بۆ ئەندامێتی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان:

بەکرمانجی خواروو Bi Kirmanciya Jêrîn

" بە شەرەفەم سوێند دەخۆم کە هەموو دەم بەرژەوەندی

خەڵکی کوردستان بپارێزم و ، خەبات بکەم بۆ پێشخستنی و ، پابەندبم

بە پەیمانی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان.



سوێندی دەستووری بۆ ئەندامێتی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان:

بەکرمانجی خواروو Bi Kirmanciya Jêrin



" بە شەرەفم سوێند دەخۆم کە هەموو دەمێنتمان و بەرژەوەندی خەڵکی کوردستان بپارێزم و ، خەبات بکەم بۆ پێشخستنی و ، پابەند بم بە پەیمانی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان.


کاک
فوئاد
مستەفا
سوڵتانی
کێ بوو،
ئامانجی چی بوو،
چۆن گیانی بەختکرد؟
نووسین و کۆکردنەوە:
مەلەکە، رەزا و حیشمەت مستەفا سوڵتانی

KOMÎTA AMADEKAR YA
KONGRA NETEWAYÎ KURDISTAN

KURDISTAN NATIONAL CONGRESS
PREPARATORY COMMITEE



**BELGENAMA HILBIJARTINA ENDAMETIYA CIVATA GIŞTÎ YA KONGRA NETEWIYA KURDISTAN**

*Birêz* ***Ibrahîm Celal***

*Ji nav şexsiyetên serbixwe jibo endametiya Civata Giştî ya Kongra Netewiya Kurdistan hatiye hilbijartin. 24 Gulan 1999*

Komîta Amadekar ya
Kongra Netewiya Kurdistan

*Avenue Louise 459* **1050 Brussels/ Belgium** **tel: +32 2 6473084/ fax: +32 2 6476849**



یەکەمین دۆشکە کە گەیشت بەدەستی هێزی پێشمەرگە ناوزەنگ 29-10-1978



عەشق و خەبات و ئازادی

ناوەڕۆکی ئەم کتێبە خۆی لە سێ قۆناغی ژیانم وەك بیرەوەری دەنوێنێ. قۆناغی منداڵی و مێردمنداڵی و پڕ لە هەست و خۆشەویستی عاشقانەم بۆ کوردایەتی و ئەوینی دڵداری.

قۆناغی دووهەم وەرچەرخانی خەباتی سیاسی و کوردایەتیم بۆ بەرزترین جۆری کە خەبای چەکداری و بەخوێن بەرگریکردنە لەبوونی نەتەوە و وڵاتەکەم کە خۆی لە خەباتی چەکداری و دەربەدەری و بەرەنگاربوونەوەی جەلادەکانی زیندانەکانی رژێمی فاشی رەفتاری بەعسیان و ژیانی مەنفا و بەشداریکردنی هەردوو شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێدا دەنوێنێ.

قۆناغی سێهەم، قۆناغی دوورکەوتنەوە لەشاخ و شۆڕش بەدەریم و گرتنەبەری ڕێگای هات و نەهاتی ئاوەرەیی و دەربەدەری بەرەو هەندەران و گیرسانەوەم لە وڵاتی ئەڵمانیا کە پتر لە پانزە ساڵی تەمەنمی کردە خۆراکی دەردی دوورە وڵاتی.

هەرچییەکی لەدووتوێی ئەم کتێبەدا نووسراوە، بەرپرسیاری سیاسی و ئەخلاقیم بەرامبەری هەیە و لەهیچیشی پەشیمان نیم.

هیوادارم خوێنەری ئازیز بەمەبەستی سوودوەرگرتن لەشرۆڤەکردنی و خوێندنەوەی بەگیانی لێبووردەیی لە کەموکورییەکان و دەوڵەمەندکردنی بەرەخنەی دروستکەرانە و دۆستانە، قۆڵی خوێندنەوەی لێ هەڵماڵێ.






کۆشکی سەرا
0750 1593939